# صحيح البخاري

## بە کوردی

وەرگێڕاوی هەموو فەرموودە صەحیحەکانی ئیمامی بوخارییە کە ژمارەیان (٧٥٦٣) فەرموودەیە

**بەرگی حەوتەم**

نووسینی
**أبو عبدالله محمد بن اسماعيل البخاري**

وەرگێڕانی
**محمد ملا صالح باموکی**





صحيح البخاري

# صحيح البخاري

## بەکوردی

### بەرگی حەوتەم

پەڕاوەکانی.. تەفسیر و ڕاڤەی قورئان، فەزڵ و گەورەیی قورئان، هاوسەرگیری

نوسینی

**أبو عبدالله محمد بن اسماعيل البخاري**

وەرگێڕانی

**محمد ملا صالح بامۆکی**



# ( صحيح البخاري ) به کوردی

## بەرگی حەوتەم


نووسینی..أبو عبدالله محمد بن اسماعیل البخاری

وەرگێڕانی.. محمد ملا صالح بامۆکی

چاپی یەکەم ٢٠٢٣

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

دیزاین .. ئەحمەد

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی تیشك




07719899402
07501122110

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٩ - سورة براءة

﴿ مَرْصَدٍ ﴿٥﴾ ﴾ التوبة: طريق ﴿ إِلًّا ﴿١٠﴾ ﴾ التوبة: الإل: القرابة و الذمة والعهد.

﴿ وَلِيجَةً ﴿١٦﴾ ﴾ التوبة: كُلُّ شَيء أَدْخَلْتَهُ فِي شَيء ﴿ ٱلشُّقَّةُ ﴿٤٢﴾ ﴾ التوبة: السَّفَرُ، الخَبَالُ الفَسَادُ، وَالْخَبَالُ المَوْتُ. ﴿ وَلَا تَفْتِنِّيٓ ﴿٤٩﴾ ﴾ التوبة: لَا تُوَبِّخْنِي.﴿ كَرْهًا ﴿٥٣﴾ ﴾ التوبة: وَكُرْهًا واحِدٌ. ﴿ مُدَّخَلًا ﴿٥٧﴾ ﴾ التوبة: يُدْخَلُونَ فِيهِ. ﴿ يَجْمَحُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ التوبة: يُسْرِعُونَ ﴿ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتِ ﴿٧٠﴾ ﴾ التوبة: ائْتَفَكَتْ أنْقَلَبَتْ بِهَا الأَرْضُ. ﴿ أَهْوَىٰ ﴿٥٣﴾ ﴾ النجم: أَلْقَاهُ فِي هُوَّةٍ. ﴿ عَدْنٍ ﴿٧٢﴾ ﴾ التوبة: خُلْدٍ، عَدَنْتُ بِأَرْضٍ أي أَقَمْتُ، وَمِنْهُ مَعْدِنٌ وَيُقَالُ فِي مَعْدِنِ صِدْقٍ. فِي مَنْبِتِ صِدْقٍ. ﴿ ٱلْخَوَالِفِ ﴿٩٣﴾ ﴾ التوبة: لخَالِفُ الذِي خَلَفَنِي فَقَعَدَ بَعْدِي، وَمِنْهُ يَخْلُفُهُ فِي الغَابِرِينَ، ويجُوزُ أَنْ يَكُونَ النِّسَاءُ مِنَ الخَالِفَةِ، وَإِنْ كَانَ جَمْعَ الذُّكُورِ فَإِنَّهُ لَمْ يُوجَدْ على تَقْدِيرِ جَمْعِهِ إِلَّا حَرْفَانِ فَارِسٌ وَفَوَارِسُ، وَهَالِكٌ وَهَوَالِكُ. ﴿ ٱلْخَيْرَٰتُ ﴿٨٨﴾ ﴾ التوبة: وَاحِدُهَا خَيْرَةٌ وَهْيَ الفَوَاضِلُ. ﴿ مُرْجَوْنَ ﴿١٠٦﴾ ﴾ التوبة: مُؤَخَّرُونَ. الشَّفَا شَفِيرٌ وَهْوَ حَدُّهُ، وَالْجُرُفُ مَا تَجَرَّفَ مِنَ السُّيُولِ وَالأَوْدِيَةِ. ﴿ هَارٍ ﴿١٠٩﴾ ﴾ التوبة: هَائِرٍ.يُقَالُ: تَهَوَّرَتِ البِئْرُ إذا أنْهَدَمَتْ،وَانْهَارَ مِثْلُهُ ﴿ لَأَوَّٰهٌ ﴿١١٤﴾ ﴾ التوبة شَفَقًا وَفَرَقًا.

وَقَالَ الشاعر:

إِذَا مَا قُمْتُ أَرْحَلُهَا بِلَيْلٍ... تَأَوَّهُ آهَةَ الرَّجُلِ الحَزِينِ

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٩ - ( تەفسیری) سوورەتی بەرائەت (تەوبە)

﴿ مَرْصَدٍ ﴾: واتە: ڕێگا. ﴿ إِلًّا ﴾: إل: واتە: خزمایەتی، لەئەستۆ بوون و پەیمان وبەڵێن.﴿ وَلِيجَةً ﴾: هەر شتێك بیخەیتە ناو شتێکی ترەوە. ﴿ ٱلشُّقَّةُ ﴾: سەفەر (الخَبال) خراپە، بەد (الْخَبَالُ) مردن. ﴿ وَلَا تَفْتِنِّيٓ ﴾: سەرزەنشتم مەکە.

﴿ كَرْهًا ﴾: لەگەڵ (كُرْهًا) مانایان یەکە: واتە: بەزۆر و ناچاری. ﴿ مُدَّخَلًا ﴾: (کون ونەفەقێك) کە بخرێنە ناویەوە (يَجمَحون): بە پەلە ڕادەکەن.

﴿ وَٱلْمُؤْتَفِكَـٰتِ ﴾: شارەکانی ژێرو زەبەرکراو لە (إئتفكتْ) هاتووە کە بە مانای زەوی بەسەریدا هەڵگەڕایەوە. ﴿ أَهْوَىٰ ﴾: لەسەرەوە فڕێی دایە خوارەوە. ﴿ عَدْنٍ ﴾: هەمیشەیی، (عَدَنْتُ بِأَرْضٍ) واتە: مامەوەو نیشتەجێ بووم تیایدا، وشەی: (مَعْدِنٌ)یش هەر لەم بابەتەیە (کەبەمانای ئەو شوێنەی کە ئاڵتوون و زیوو شتی وای لێ دەردەهێنرێ)، مانای (فِي مَعْدِنِ صِدْقٍ) شوێن ڕواندنێکی چاکە. ﴿ ٱلْخَوَالِفِ ﴾: کۆی: (الخَالِف)ـە واتە: ئەوە لە دوامەوەیە و دوا من دادەنیشێت. وهەر لە جۆری ئەو وشەیە: شوێنی پڕ دەکاتەوە لەوانەی ماوون، و دروستە ئەو وشە. ﴿ ٱلْخَوَالِفِ ﴾: مەبەست پێی ئافرەتان بێت لە وشە (الخَالِفَة) وە هاتبێ، یا وشەی (الْخَوَالِفِ) بۆ کۆی نێرینە دەبێژرێ چونکە ئەگەر بڵێین وشەکە کۆیە تەنها دوو وشە هەیە لەو جۆرە (فَارِسٌ) و (فَوَارِسُ) لەگەڵ (هَالِكٌ) و (هَوَالِكُ).

﴿ ٱلْخَيْرَٰتُ ﴾: کۆیە تاکەکەی (خَيْرَةٌ)ـە چاکە و باشەکان. ﴿ مُرْجَوْنَ ﴾: دواخراوەکان. (الشَّفَا) لیوار، قەراغ. بریتی لە لاریەکەی ( الْجُرُفُ) ئاو دایدەدڕێ

بە هۆی لافاو دۆڵاوەوە. ﴿ هَارٍ ﴾: فشەڵ، قەڵەشاو، دەوترێت: (تَهَوَّرَتِ الْبِئْرُ) بیرەکە ڕووخا. ﴿ لَأَوَّٰهٌ ﴾: بەسۆزو میهرەبان وەك شاعیر دەڵێ:

ئەگەر بەشەو هەستام کۆپانی لێنێم ئاهو کروزانەوەیەك دەکات وەك ئاهی کەسێکی بەسۆزو دڵ تەنگ.

**١ - بابُ قوله:** ﴿ بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾ ﴾ التوبة

وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ أُذُنٌ ﴿٦١﴾ ﴾ التوبة: يُصَدِّقُ. ﴿ تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ﴿١٠٣﴾ ﴾ التوبة: وَنَحْوُهَا كَثِيرٌ، وَالزَّكَاةُ: الطَّاعَةُ وَالإِخْلَاصُ ﴿ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ ﴿٧﴾ ﴾ فصلت: لَا يَشْهَدُونَ أَنْ لَا إله إِلَّا اللَّهُ. ﴿ يُضَٰهِـُٔونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ التوبة: يُشَبِّهُونَ.

## ١ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەمە بەری بوونێکی گەورە و گرنگە لە لایەن خوا و پێغەمبەرەکەیەوە بۆ ئەوانەی کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون لە هاوبەش دانەران)

ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ أُذُنٌ ﴾: باوەڕ دەکات، گوێ دەگرێ. ﴿ تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ﴾[1]هاوشێوەی زۆرە (لە قورئان هەردووکیان یەك مانایان هەیە) (الزَّكَاةُ) گوێڕایەڵی و دڵسۆزی یە. ﴿ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾: شایەتی نادەن کە هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خوا. ﴿ يُضَٰهِـُٔونَ ﴾: چاولێکەری دەکەن، وەکوو ئەوان دەڵێن.

(١) واتە: پاکیان دەکەیتەوە (لە گوناە) و (دڵیان) پوخت و خاوێن دەکەیتەوە.

٤٦٥٤ - حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ الْبَرَاءَ ﷺ يَقُول: آخِرُ آيَةٍ نَزَلَتْ ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ ﴿١٧٦﴾﴾ النساء: وَآخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ بَرَاءَةٌ[1].

**٤٦٥٤ -ئیسحاق دەڵێ: لە بەرائەم ﷺ بیست دەیوت: کۆتا هەمین ئایەتێك دابەزی (ئەی موحەممەد ﷺ داوای فەتوات لێ دەکەن بڵێ: خوا فەتواتان بۆ دەدات دەربارەی کەلالە)[2] وە کۆتاهەمین سوڕەتیش دابەزی سوڕەتی بەرائەت بوو.**

## ٢ - بابُ قوله تعالى: ﴿فَسِيحُوا فِي الْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللَّهِ وَأَنَّ اللَّهَ مُخْزِي الْكَافِرِينَ ﴿٢﴾﴾ التوبة

(سيحُوا): سِيرُوا.

٤٦٥٥ - حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ وَأَخْبَرَنِي حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ بَعَثَنِي أَبُو بَكْرٍ فِي تِلْكَ الْحَجَّةِ فِي مُؤَذِّنِينَ، بَعَثَهُمْ يَوْمَ النَّحْرِ يُؤَذِّنُونَ بِمِنًى أَنْ لاَ يَحُجَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلاَ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ. قَالَ حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ثُمَّ أَرْدَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَأَمَرَهُ أَنْ يُؤَذِّنَ بِبَرَاءَةَ. قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ فَأَذَّنَ مَعَنَا عَلِيٌّ يَوْمَ النَّحْرِ فِي أَهْلِ مِنًى بِبَرَاءَةَ، وَأَنْ لاَ يَحُجَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلاَ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ[3].

---

(١) بروانە: ٤٣٦٤.

(٢) کەلالە: کەسێکە نەوەو کوڕو باوك و باپیری نەبێت.

(٣) بروانە: ٣٦٩.

## ٢ - باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (جا (ئەی بێ بڕواکان ماوەی) چوار مانگ لە زەویدا بگەڕێن وە بزانن دڵنیابن ئێوە لە دەستی خوا دەرناچن، وە بەڕاستی خوا ڕیسواکەری بێ بڕوایانە)

## (سیحُوا) بگەڕێن، بڕۆن.

٤٦٥٥ -حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان گێڕایەوە کە ئەبو هوڕەیرە ﷺ وتی: لەو حەجەدا ئەبو بەکر[1] ﷺ منی نارد لەگەڵ کۆمەڵێ جاڕدەردا کە ناردبوونی ڕۆژی جەژنی قوربان لەمینا جاڕ بدەن (وبڵێن): کەلە ئەم ساڵ بەدواوە بتپەرەست حەج نەکات، وەکەس بەڕووتی تەواڤی کەعبە نەکات.

حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان وتی: لە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوای ئەبو بەکردا عەلی کوڕی ئەبی تالیبی ﷺ نارد و فەرمانی پێکرد سوورەتی بەرائەت ڕابگەیەن[2].

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: عەلیش لەگەڵ ئێمەدا لە ناو خەڵکی مینا دا لە ڕۆژی جەژنی قورباندا (سوڕەتی) بەرائەتی ڕاگەیاند (وتی:) لە ئەم ساڵ بەدواوە بتپەرەست حەج ناکات وە کەس بەڕووتی تەواڤی کەعبە نەکات.

## ٣ - بابُ قوله: ﴿ وَأَذَانٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِىٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ۙ وَرَسُولُهُۥ ۚ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣﴾ ﴾ التوبة

آذَنَهُمْ: أَعْلَمَهُمْ.

---

(١) کە پێغەمبەر ﷺ کردبویە لێپرسراوی پێش حەجی ماڵئاوایی.

(٢) ئایەتەکانی سورەتی تەوبە بخوێنێتەوە بۆ بتپەرستان و کافران.

٤٦٥٦ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأَخْبَرَنِي حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: بَعَثَنِي أَبُو بَكْرٍ ﷺ فِي تِلْكَ الْحَجَّةِ فِي الْمُؤَذِّنِينَ، بَعَثَهُمْ يَوْمَ النَّحْرِ يُؤَذِّنُونَ بِمِنًى: أَنْ لاَ يَحُجَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلاَ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ. قَالَ حُمَيْدٌ: ثُمَّ أَرْدَفَ النَّبِيُّ ﷺ بِعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُؤَذِّنَ بِبَرَاءَةَ. قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَأَذَّنَ مَعَنَا عَلِيٌّ فِي أَهْلِ مِنًى يَوْمَ النَّحْرِ بِبَرَاءَةَ، وَأَنْ لاَ يَحُجَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلاَ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ[1].

## ٣ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە ئەمە راگەیاندنێکە لە لایەن خوا و پێغەمبەرەکەیەوە بۆ گشت خەڵکی لە رۆژی حەجی گەورەدا کە بێگومان خوا و پێغەمبەرەکەی بەرین لە هاوبەش ڕەوادەرەکان، جا ئەگەر پەشیمان ببنەوە و تەوبە بکەن ئەوە چاکترە بۆتان، وە ئەگەر پشتی تێ بکەن ئەوە بزانن بەڕاستی ئێوە لە دەستی خوا دەرناچن، مژدەش بدە بەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە بە سزایەکی ئازاردەر) (آذنهم): ئاگاداری کردن.

**٤٦٥٦ - حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان گێڕایەوە کە ئەبو هوڕەیرە ﷺ وتی: لەو حەجەدا ئەبو بەکر ﷺ منی لەگەڵ کۆمەڵێ جاڕدەردا نارد کە ناردبوونی ڕۆژی جەژنی قوربان لەمینا جاڕ بدەن (و بڵێن): کە لە ئەم ساڵ بەدواوە بتپەرەست حەج نەکات، وەکەس بەڕووتی تەواف کەعبە نەکات.**

**حومەیدی وتی: لە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوای ئەبو بەکردا عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب ﷺ نارد و فەرمانی پێکرد سووڕەتی بەرائەت ڕابگەیەنێ.**

---

(١) بڕوانە: ٣٦٩.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: عەلیش لەگەڵ ئێمەدا لە ناو خەڵکی مینا دا لە ڕۆژی جەژنی قوربانددا (سورەتی) بەرائەتی ڕاگەیاندو (ئەوەی ڕاگەیاند کە) لە ئەم ساڵ بەدواوە بتپەرەست حەج ناکات، وە کەس بەڕووتی تەواف کەعبە نەکات.

## ٤ - بابٌ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٤﴾ ﴾ التوبة

٤٦٥٧ - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ حُمَيْدَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ بَعَثَهُ فِي الْحَجَّةِ الَّتِي أَمَّرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَيْهَا -قَبْلَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ - فِي رَهْطٍ يُؤَذِّنُ فِي النَّاسِ: أَنْ لاَ يَحُجَّنَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ وَلاَ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ. فَكَانَ حُمَيْدٌ يَقُولُ: يَوْمُ النَّحْرِ يَوْمُ الْحَجِّ الأَكْبَرِ. مِنْ أَجْلِ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ[1].

## ٤ - باسێک: (بێجگە لە وانەی کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون لە هاوبەش ڕەوادەرەکان)

٤٦٥٧ - ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە کە حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان بۆی گێڕایەوە، کە ئەبو هورەیرە ﷺ بۆی گێڕایەوە:کە ئەبو بەکر ﷺ لەوحەجەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێش حەجی ماڵئاوای کرا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەکری کردە لێپرسراوی حەجەکە، ئەویش ئەبو هورەیرەی نارد لە ناو کۆمەڵێکدا بەناو خەڵکیدا جاڕبدەن (و بڵێ) کە بێگومان لە ئەمساڵ بەدواوە بتپەرەست حەج نەکات، وە کەس بەڕووتی تەواف کەعبە نەکات، جا حومەید دەیوت: ڕۆژی جەژنی قوربان ڕۆژی حەجی هەرە گەورەیە لە بەر فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ[2].

(١) بروانە: ٣٦٩.

(٢) کە دەڵێ: ڕۆژی حەجی هەرە گەورە ڕۆژی جەژنی قوربانە: بروانە : إرشاد الساری، ١٠/٢٥٠.

**٥ - بابٌ:** ﴿فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ إِنَّهُمۡ لَآ أَيۡمَٰنَ لَهُمۡ ١٢﴾ التوبة

٤٦٥٨ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ وَهْبٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ حُذَيْفَةَ فَقَالَ: مَا بَقِيَ مِنْ أَصْحَابِ هَذِهِ الآيَةِ إِلاَّ ثَلاَثَةٌ، وَلاَ مِنَ الْمُنَافِقِينَ إِلاَّ أَرْبَعَةٌ. فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: إِنَّكُمْ أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ ﷺ تُخْبِرُونَا فَلاَ نَدْرِي، فَمَا بَالُ هَؤُلاَءِ الَّذِينَ يَبْقُرُونَ بُيُوتَنَا وَيَسْرِقُونَ أَعْلاَقَنَا؟ قَالَ: أُولَئِكَ الْفُسَّاقُ، أَجَلْ لَمْ يَبْقَ مِنْهُمْ إِلاَّ أَرْبَعَةٌ، أَحَدُهُمْ شَيْخٌ كَبِيرٌ لَوْ شَرِبَ الْمَاءَ الْبَارِدَ لَمَا وَجَدَ بَرْدَهُ.

## ٥ - باسێک: (جا لە دژی پێشەوایانی بێ باوەڕیی بجەنگن بەڕاستی ئەوانە هیچ جۆرە پەیمانێکیان نییە)

**٤٦٥٨ -زەیدی کوڕی وەهب وتی: ئێمە لای حوزەیفە ﷺ بووین جا وتی: لەوانەی مەبەستی ئەم ئایەتەن تەنها سێ کەسیان ماون، وە لە دوو ڕووەکانیش تەنها چوار کەسیان ماون، ئەنجا عەرەبێکی دەشتەکی وتی: بێگومان ئێوە هاوەڵانی موحەممەد ﷺ هەواڵمان بۆ دەگێڕنەوە (دەربارەی شتانێك) کەچی نازانین چییە، دەی ئائەوانە چیانە کە خانوەکانمان کون دەکەن و ماڵە بەنرخەکانمان دەدزن؟ (حوزەیفە) وتی: ئەوانە فاسقەکانن[1]، بەڵێ ئەوانە تەنها چوار کەسیان نەماون. یەکێکیان پیرێکی بەساڵاچووە ئەگەر ئاوی سارد بخواتەوە هەست بە ساردیەکەی ناکات[2].**

(١) واتە: ئەوانە نە پێشەوایانی بێ باوەڕانن نە دووڕووەکانن.
(٢) لەبەر ئەوەی ئارەزوی نەماوەو کۆ ئەندامی هەرسی تێکچووە.

## ٦ - بابُ قوله تعالى: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ۝٣٤ ﴾ التوبة

٤٦٥٩ - حَدَّثَنَا الْحَكَمُ بْنُ نَافِعٍ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ الأَعْرَجَ حَدَّثَهُ أَنَّهُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «يَكُونُ كَنْزُ أَحَدِكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ»[١].

## ٦ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە ئەوانەی ئاڵتون و زیوو سەریەک دەنێن و کۆدەکەنەوە بەختی ناکەن لە ڕێی خوادا، ئەوە موژدەیان پێ بدە بەسزایەکی ئازاردەر).

**٤٦٥٩ - ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیست دەیفەرموو:((لە ڕۆژی دوایی دا ئاڵتون وزیوی لەسەر یەك نراوی کەسانێك لە ئێوە دەبێتە مارێکی سەر کەچەڵ))[٢].**

٤٦٦٠ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ قَالَ مَرَرْتُ عَلَى أَبِي ذَرٍّ بِالرَّبَذَةِ فَقُلْتُ: مَا أَنْزَلَكَ بِهَذِهِ الأَرْضِ؟ قَالَ: كُنَّا بِالشَّأْمِ فَقَرَأْتُ ﴿ وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ۝٣٤ ﴾ التوبة: قَالَ مُعَاوِيَةُ: مَا هَذِهِ فِينَا، مَا هَذِهِ إِلاَّ فِي أَهْلِ الْكِتَابِ. قَالَ: قُلْتُ: إِنَّهَا لَفِينَا وَفِيهِمْ[٣].

**٤٦٦٠ -زەیدی کوڕی وەهب دەڵێ: لەرەبزە بە لای ئەبو زەڕدا ﷺ ڕۆیشتم وتم: چی لەم زەوی وشوێنە دایناوی[٤]؟ وتی من لەشام بووم وئەم ئایەتەم خوێندەوە**

---

(١) بڕوانە: ٢٣٧١.

(٢) سەری کەچەڵ بووە لەبەر زۆری ژەهرەکەی و تەمەن درێژییەکەی.

(٣) بڕوانە: ١٤٠٦.

(٤) واتە: چی وای لێکردنی لێرە نیشتەجێ بیت و دانیشیت.

**(وەئەوانەی ئاڵتون و زیوو سەریەك دەنێن و كۆ دەكەنەوە و بەختی ناكەن لە ڕێی خودا، ئەوە موژدەیان پێ بدە بە سزایەكی ئازاردەر)، موعاویە ﷺ وتی: ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمە نییە، ئەمە تەنها دەربارەی خاوەن نامەكانە، ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: منیش وتم: بێگومان ئەو ئایەتە دەربارەی ئێمەو ئەوانیشە.**

٧ - **بابُ قَوْلِه تعالى:** ﴿ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ التوبة

٤٦٦١ - وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ شَبِيبِ بْنِ سَعِيدٍ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ خَالِدِ بْنِ أَسْلَمَ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ فَقَالَ: هَذَا قَبْلَ أَنْ تُنْزَلَ الزَّكَاةُ، فَلَمَّا أُنْزِلَتْ جَعَلَهَا اللَّهُ طُهْرًا لِلأَمْوَالِ[١].

## ٧ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (لە ڕۆژێكدا (ئەو ئاڵتون و زیوە) لە ئاگری دۆزەخ دا سوور دەكرێتەوە و ئەوسا بەو (ئاڵتوون و زیوە سوورۆبووە) ڕوویان و تەنشتیان و پشتیانی پێ داخ دەكرێ (پێیان دەوترێ) ئەمە ئەو (سامانەیە) كۆتان دەكردەوە بۆ خۆتان، دەبچێژن (تۆڵەی) ئەوەی كۆتان دەكردەوە)

**٤٦٦١ -خایدی كوڕی ئەسلەم دەڵێ: لەگەڵ عەبدوڵڵای كوڕی عومەردا ﷺ دەرچووین و ڕۆیشتین[٢]، جا عەبدوڵڵا وتی: ئەمە پێش ئەوە بوو (ئایەتەكانی) زەكات دابەزێ، بەڵام كە زەكات دابەزێنرا خوا زەكاتی كردە پاككەرەوە بۆ ماڵ و سامانەكان.**

---

(١) بروانە: ١٤٠٤.

(٢) ئەم فەرموودەیە زیادەیەكی هەیە بەم جۆرەیە: عەرەبیەكی دەشتەكی بە عەبدوڵلای وت: هەواڵم پێبدە دەربارەی ئەم ئایەتە:﴿ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ ﴿٣٤﴾ ﴾ التوبة،تاكۆتایی ئایەتەكە.

**٨ - بابُ قوله:** ﴿إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثۡنَا عَشَرَ شَهۡرٗا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوۡمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٞ ﴿٣٦﴾﴾ التوبة

﴿ٱلۡقَيِّمُ ﴿٣٦﴾﴾ التوبة: القَائِمُ.

٤٦٦٢ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ عَنِ ابْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الزَّمَانَ قَدِ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللَّهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ، السَّنَةُ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا مِنْهَا، أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ، ثَلاَثٌ مُتَوَالِيَاتٌ: ذُو الْقَعْدَةِ وَذُو الْحِجَّةِ وَالْمُحَرَّمُ، وَرَجَبُ مُضَرَ الَّذِي بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ»[1].

## ٨ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (بەڕاستی ژمارەی مانگەکان (ی ساڵ) لای خوا دوانزە مانگە لە (لوح المحفوظ)ـدا دانراوە، لە ڕۆژێکەوە (خوا) ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە چوار لەو مانگانە گەورە و بەڕێزن (شەڕیان تێدا قەدەغە کراوە) ).

﴿ٱلۡقَيِّمُ﴾: ڕاست و دروست، **هەمیشەیی.**

**٤٦٦٢ - ئەبو بەکرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان چەرخ و زەمانە سووڕاوەتەوە وەك شێوەی ئەو ڕۆژەی لێ هاتووە کەخوا ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد، ساڵێك دوانزە مانگە، چوار لەو مانگانە گەورە بەرێزن (جەنگ تیایاندا حەرامە) سیانیان بەدوای یەکدا دێن: زولقەعدە و زولحیججە وموحەڕەم وە (مانگی) ڕەجەبی (مُضَرَ) یش[2] کە لە نێوان مانگی جومادی دووهەم و شەعبانەدایە)).**

---

(١) بڕوانە: ٦٧.

(٢) (مُضَر) هۆزێکی بەناوبانگە بۆیە مانگی ڕەجەب دراوەتە پاڵی چونکە ئەو هۆزە بەگەورەیان داناوە ڕێزیان لێ دەگرت. **بڕوانە : إرشاد الساري، ١٠/٢٥٦.**

**٩ - بابُ قوله:** ﴿ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ ﴿٤٠﴾﴾ التوبة

﴿مَعَنَا﴾: نَاصِرُنَا، السكينة: فعيلة من السكون.

٤٦٦٣ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا حَبَّانُ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا ثَابِتٌ، حَدَّثَنَا أَنَسٌ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو بَكْرٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْغَارِ، فَرَأَيْتُ آثَارَ الْمُشْرِكِينَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ رَفَعَ قَدَمَهُ رَآنَا. قَالَ: «مَا ظَنُّكَ بِاثْنَيْنِ اللَّهُ ثَالِثُهُمَا»[1].

## ٩ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (یەکێک بوو لەو دوو کەسە کاتێک ئەو دووانە (پێغەمبەرو ئەبو بەکر) لە ئەشکەوتی (سەور)ـدا بوون، ئەوکاتە بە هاوەڵەکەی دەوت خەم مەخۆ بێگومان خوا لەگەڵمانە)

﴿مَعَنَا﴾: **یارمەتیدەرمانە (السَّكينةُ) لەسەرکێشی (فَعِيلَةٌ)ە لە سرەوتن و نەبزوانەوە هاتووە[2].**

**٤٦٦٣ ـئەنەس ﷺ دەڵێ: ئەبو بەکر ﷺ بۆی گێڕامەوە وتی: من لەئەشکەوتەکەدا لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووم، ئەنجا ئاسەواری (پێیەکانی) بت پەرستانم دی وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر یەکێکیان قاچی بەرز کاتەوە دەمان بینێ، فەرمووی: ((گومانت چۆنە بە دوو کەس خوای گەورە سێیەمیان بێت؟)).**

---

(١) بروانە: ٣٦٥٣.

(٢) بەڵام لە ئایەتەکەدا بەمانای ئارامی و ئاسایشە کە خوا ناردویەتی بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ یان ئەبوبکرﷺ. **بروانە : إرشاد الساري: ١٠/٢٥٧.**

٤٦٦٤ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ حِينَ وَقَعَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ ابْنِ الزُّبَيْرِ قُلْتُ: أَبُوهُ الزُّبَيْرُ، وَأُمُّهُ أَسْمَاءُ، وَخَالَتُهُ عَائِشَةُ، وَجَدُّهُ أَبُو بَكْرٍ، وَجَدَّتُهُ صَفِيَّةُ. فَقُلْتُ لِسُفْيَانَ إِسْنَادُهُ. فَقَالَ: حَدَّثَنَا، فَشَغَلَهُ إِنْسَانٌ وَلَمْ يَقُلِ ابْنُ جُرَيْجٍ[1].

**٤٦٦٤ -ئیبنو ئەبی مولەیکە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کاتێ لە نێوان ئەو (ئیبنو عەبباس) و ئیبنو زوبەیردا ناکۆکیەك بوو دەڵێ: وتم (بە ئیبنو عەبباس) باوکی عەبدوڵلا کە زوبەیرە، دایکیشی ئەسمائە، پوریشی عائیشەیە باپیرەشی ئەبو بەکرە، نەنکیشی (دایکی باوکی) صەفییەیە ﷺ (عەبدوڵلای کوڕی موحەممەد دەڵێ) منیش وتم: بە سوفیان ڕشتەی ئەم فەرمودە کامەیە؟ سوفیانیش وتی: بۆی گێڕاینەوە ئەنجا کەسێك سەرقاڵی کردو نەیوت: ئیبنو جورەیج (بۆی گێڕاینەوە).**

٤٦٦٥ - حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ مَعِينٍ، حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: قَالَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ: وَكَانَ بَيْنَهُمَا شَيْءٌ فَغَدَوْتُ عَلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْتُ: أَتُرِيدُ أَنْ تُقَاتِلَ ابْنَ الزُّبَيْرِ فَتُحِلَّ حَرَمَ اللَّهِ؟. فَقَالَ: مَعَاذَ اللَّهِ! إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ ابْنَ الزُّبَيْرِ وَبَنِي أُمَيَّةَ مُحِلِّينَ، وَإِنِّي وَاللَّهِ لاَ أُحِلُّهُ أَبَدًا. قَالَ قَالَ النَّاسُ: بَايِعْ لاِبْنِ الزُّبَيْرِ. فَقُلْتُ: وَأَيْنَ بِهَذَا الأَمْرِ عَنْهُ؟ أَمَّا أَبُوهُ فَحَوَارِيُّ النَّبِيِّ ﷺيُرِيدُ الزُّبَيْرَ - وَأَمَّا جَدُّهُ فَصَاحِبُ الْغَارِ -يُرِيدُ أَبَا بَكْرٍ - وَأُمُّهُ فَذَاتُ النِّطَاقِ -يُرِيدُ أَسْمَاءَ - وَأَمَّا خَالَتُهُ فَأُمُّ الْمُؤْمِنِينَ -يُرِيدُ عَائِشَةَ - وَأَمَّا عَمَّتُهُ فَزَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ، يُرِيدُ خَدِيجَةَ، وَأَمَّا عَمَّةُ النَّبِيِّ ﷺ فَجَدَّتُهُ -يُرِيدُ صَفِيَّةَ - ثُمَّ عَفِيفٌ فِي الإِسْلاَمِ، قَارِئٌ لِلْقُرْآنِ. وَاللَّهِ إِنْ وَصَلُونِي وَصَلُونِي مِنْ قَرِيبٍ، وَإِنْ رَبُّونِي رَبَّنِي أَكْفَاءٌ كِرَامٌ، فَآثَرَ التُّوَيْتَاتِ وَالأُسَامَاتِ وَالْحُمَيْدَاتِ، يُرِيدُ أَبْطُنًا مِنْ بَنِي أَسَدٍ بَنِي تُوَيْتٍ وَبَنِي أُسَامَةَ

(١) بروانە: ٤٦٦٥، ٤٦٦٦.

وَبَنِى أَسَدٍ، إِنَّ ابْنَ أَبِي الْعَاصِ بَرَزَ يَمْشِي الْقُدَمِيَّةَ -يَعْنِي: عَبْدَ الْمَلِكِ بْنَ مَرْوَانَ، وَإِنَّهُ لَوَّى ذَنَبَهُ - يَعْنِي ابْنَ الزُّبَيْرِ[1].

٤٦٦٥ -ئیبنو جورەیج دەڵێ: ئیبنو ئەبی مولەیکە دەڵێ: لە نێوان ئەو دووانەدا (ئیبنو عەبباس و ئیبنو زوبەیردا ﷺ) شتێك (ناکوکیەك) هەبوو، منیش سەر لە بەیانیەك ڕۆیشتم بۆلای ئیبنو عەبباس ﷺ وتم: ئایا دەتەوێ لە دژی ئیبنو زوبەیر جەنگ بکەیت وڕێزی حەرەم و کەعبە بشکێنی؟ (ئیبنو عەبباس) وتی: پەنا بەخوا، بێگومان خوا حەڵاڵ کردنی (جەنگ لە کەعبەدا) لەسەر ئیبنو زوبەیر و بەنی ئومەییە نوسیوە، وبەڕاستی من وەڵڵاهی هەرگیز جەنگ بە حەڵاڵ نازانم تێیدا، وتی: خەڵکی دەڵێن: بەیعەت بدە بە ئیبنو زوبەیر. منیش وتم: ئەمە کاری خیلافەتە دوور نییە لەوەوە، چونکە باوکی پشتیوانی پێغەمبەر ﷺ بوو - مەبەستی زوبەیرە - باپیرەشی هاوڕێی ئەشکەوتە -مەبەستی ئەبو بەکرە - دایکیشی خاوەن دوو پشتێنەکەیە - مەبەستی ئەسمایە - پوریشی دایکی باوەڕدارانە - مەبەستی عائیشە یە - پوریشی (خوشکی باوکی) خێزانی پێغەمبەر ﷺ - مەبەستی خەدیجەیە - پوری پێغەمبەریش ﷺ نەنکێتی - مەبەستی صەفیەیە - لە پاشان کەسێکی پاکە[2] لە ئیسلامدا و قورئان خوێن (و شارەزایە تیایدا)، سوێند بەخوا ئەگەر ئەوان (بەنو ئومەییە) پەیوەندی خزمایەتیم لەگەڵ بەجێ بێنن، ئەوە بەهۆی نزیکی خزمایەتیەوە بەجێی دێنن، وە ئەگەر ئەمیرو لێپرسراو بن بەسەرمەوە ئەوە کەسانی شایستەو بەڕێز دەکەن بەئەمیرو گەورە بەسەرمەوە، بەڵام (ئیبنو زوبەیر) تومیتەکان وئوسامەکان وحومەیدەکانی پێشخست (بەسەرئێمەدا) - مەبەستی بەوانە چەند تیرەو

(١) بڕوانە: ٤٦٦٤.
(٢) هیچ ڕەوشتێکی خراپ و ناشرینی تیا نی یە.

**تایفەیەکی بەنی ئەسەد بوو[١]: کەبەنی توەیت و بەنی ئوسامەیە لە قبیلەی ئەسەد - بێگومان کوڕی ئەبی لعاص دەرکەوتووە بەرەو گەورەتر و پێشەوە دەڕوات (یان بەفیزو دەعەیە دەڕوات[٢] - مەبەستی عەبدولەلیکی کوڕی مەڕوانە - وە بێگومان ئەویش کلکی نوشتاندۆتەوە[٣] واتە: عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر.**

٤٦٦٦ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ بْنِ مَيْمُونٍ، حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ عُمَرَ بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ: دَخَلْنَا عَلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقَالَ: أَلاَ تَعْجَبُونَ لاِبْنِ الزُّبَيْرِ قَامَ فِي أَمْرِهِ هَذَا؟! فَقُلْتُ: لأُحَاسِبَنَّ نَفْسِي لَهُ، مَا حَاسَبْتُهَا لأَبِي بَكْرٍ وَلاَ لِعُمَرَ، وَلَهُمَا كَانَا أَوْلَى بِكُلِّ خَيْرٍ مِنْهُ، وَقُلْتُ: ابْنُ عَمَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، وَابْنُ الزُّبَيْرِ، وَابْنُ أَبِي بَكْرٍ، وَابْنُ أَخِي خَدِيجَةَ، وَابْنُ أُخْتِ عَائِشَةَ فَإِذَا هُوَ يَتَعَلَّى عَنِّي وَلاَ يُرِيدُ ذَلِكَ فَقُلْتُ: مَا كُنْتُ أَظُنُّ أَنِّي أَعْرِضُ هَذَا مِنْ نَفْسِي، فَيَدَعُهُ، وَمَا أُرَاهُ يُرِيدُ خَيْرًا، وَإِنْ كَانَ لاَ بُدَّ لأَنْ يَرُبَّنِي بَنُو عَمِّي أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يَرُبَّنِي غَيْرُهُمْ[٤].

**٤٦٦٦ - ئیبنو ئەبی مولەیکە دەڵێ: ڕۆشتینە لای ئیبنو عەبباس ﵄ و وتی: ئایا سەرسام نابن بە ئیبنو زوبەیر بەم کارەی (کە خیلافەتە) هەستاوە؟ (ئیبنو عەبباس دەڵێ) منیش وتم: سوێند بەخوا لێپرسینەوەیەکی وا لەگەڵ خۆمدا دەکەم بۆ پشتیوانی ئەو (ئیبنو زوبەیر) لێپرسینەوەی وام بۆ ئەبو بەکر و عومەر ﵄ نەکردبێ، با هەردووکیان لە هەموو چاکەیەکدا لەپێش ئیبنو زوبەیرەوەن، وتم: (عەبدوڵلا) کوڕی پوری پێغەمبەر ﷺ و کوڕی زوبەیرە ﵄ کوڕی ئەبو بەکرە ﵁ و برازای خەدیجەیە ﵂ خوشکەزای عائیشەیە ﵂ کەچی**

---

(١) کە لە خزمانی عبدوڵلای کوڕی زوبیرن ﵃.
(٢) واتە: دەستی داوەتە کاری گەورەو لە گەورەبوون لە ناو دەستەڵاتدا لە هاوڕێکانیدا پێشکەوتووە.
(٣) واتە: لەکاری گەورە ئەنجامدان دواکەوتووە، ناڕاستەو خۆیە لە ترسنۆکیدا وەك درەندە وایەکانی کاتێ بیەوێ بخەوێ یان بوەستێ پێش و دوا نەکات، وە شتەکانی لە جێی خۆیدا نیە ئەوەی ویستی بۆی نەکرا.
(٤) بڕوانە: ٤٦٦٤.

دەبینم (ئیبنو زوبەیر) خۆی بەگەورە دەزانێ بەسەرمدا نایەوێ من نزیك ودۆستی بم، منیش وتم: من گومانم وانەبوو ئەو خۆبەکەم زانینەم نیشان بدەم وئەو وازی لێ بێنێ (رازی نەبێ پێی لێم) وانازانم ئەو مەبەستی چاکەی هەبێ (بەمن) جا ئەگەر هەر ناچار بم ئەوە ئەگەر ئامۆزاکانی خۆم[1] ئەمیرو گەورەم بن، لام چاکترو خۆشترە لەوەی کەسانی تر ئەمیرو گەورەم بن.

## ١٠ – بابُ قوله: ﴿وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ ﴿٦٠﴾﴾ التوبة:

-قَالَ مُجَاهِدٌ: يَتَأَلَّفُهُمْ بِالْعَطِيَّةِ.

٤٦٦٧ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ أَبِي نُعْمٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: بُعِثَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِشَيْءٍ، فَقَسَمَهُ بَيْنَ أَرْبَعَةٍ وَقَالَ: «أَتَأَلَّفُهُمْ». فَقَالَ رَجُلٌ: مَا عَدَلْتَ. فَقَالَ: «يَخْرُجُ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْمٌ يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ»[2].

## ١٠ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەوانەی ئومێدە دڵیان هۆگری ئیسلام بێ)

- موجاهید دەڵێ: بەماڵ پێدان دڵیان ڕادەگرێ و هۆگری ئیسلامی دەکات.

٤٦٦٧ - ئەبو سەعید ﷺ وتی: شتێك (پارەچە ئاڵتونێك) نێردرا بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش لە نێوان چوار کەس دا دابەشی کردو فەرمووی: ((دڵیان دا ئەهێنم (بۆخۆش ویستنی ئیسلام) ))پیاوێکیش وتی: (لەودابەشکردنەتدا) دادگەر نەبووی، (پێغەمبەریش ﷺ ) فەرمووی: ((لەنەوەی ئەمە کەسانێك پەیدا دەبن لە ئاینی (ئیسلام) دەردەچن)).

---

(١) مەبەستی بەنو ئومەییەیە.

(٢) بڕوانە: ٣٣٤٤.

١١ - **بابُ قوله:** ﴿ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾ التوبة

﴿ يَلْمِزُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾: يَعِيبُونَ، وَ ﴿ جُهْدَهُمْ ﴿٧٩﴾ ﴾ التوبة: وَجَهْدَهُمْ: طَاقَتَهُمْ.

# ١١ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەو کەسانەی تانەو تەشەر دەدەن لەو باوەڕدارانەی جگە لە زەکات ماڵ و سامانیان دەبەخشن)

**﴿ يَلْمِزُونَ ﴾: تانەو تەشەر دەدەن. وە ﴿ جُهْدَهُمْ ﴾: و (جَهْدَهُمْ): هەردوو وشەکە بەواتای: ئەوەی لە توناياندايە.**

٤٦٦٨ - حَدَّثَنِي بِشْرُ بْنُ خَالِدٍ أَبُو مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ: لَمَّا أُمِرْنَا بِالصَّدَقَةِ كُنَّا نَتَحَامَلُ، فَجَاءَ أَبُو عَقِيلٍ بِنِصْفِ صَاعٍ، وَجَاءَ إِنْسَانٌ بِأَكْثَرَ مِنْهُ، فَقَالَ الْمُنَافِقُونَ: إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنْ صَدَقَةِ هَذَا، وَمَا فَعَلَ هَذَا الآخَرُ إِلاَّ رِئَاءً. فَنَزَلَتْ ﴿ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ ﴿٧٩﴾ ﴾ التوبة[1].

**٤٦٦٨ - ئەبو مەسعوود ﷺ دەڵێ: کاتێ فەرمانمان پێکرا بە ماڵ بەخشین، ئێمە حەماڵیمان دەکرد (تاماڵ ببەخشین) جا ئەبو عەقیل نیو ڕبە (خورمای) هێنا، وە کەسێکی تر لەو زیاتری هێنا، دووڕووەکان وتیان: بەڕاستی خوا بێ نیازە لەم بەخشینەی ئەم پیاوە[2]، وە ئەو کەسەی کەشیان هەر بۆ ڕووپامایی ئەوەی کرد، بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (ئەو کەسانەی تانەو تەشەر دەدەن لەو باوەڕدارانەی جگە لەزەکات ماڵ و سامانیان دەبەخشن، وە (تانەو تەشەر دەدەن)**

(١) بروانە: ١٤١٥.
(٢) یەکەمەکەیان نیو ڕبەی بەخشی.

**لەوانەی کە تەنها کەمێکیان هەیە بەزەحمەت پەیدایان کردووە) تاکۆتایی ئایەتەکە.**

٤٦٦٩ - حَدَّثَنَا إِسْحَاق بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: قلْت لأبِي أُسَامَةَ: أَحَدَّثَكُمْ زَائِدَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ شَقِيقٍ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأنصَارِيِّ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَأْمُرُ بِالصَّدَقَةِ، فَيَحْتَالُ أَحَدُنَا حَتَّى يَجِيءَ بِالْمُدِّ، وِإِنَّ لأَحَدِهِمِ اليَوْمَ مِائَةَ آلفٍ، كَأَنَّهُ يُعَرِّضُ بِنَفْسِهِ[1].

**٤٦٦٩ - ئەبو مەسعوودی ئەنصاری ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ جاران فەرمانی دەکرد بە ماڵ بەخشین جا هەریەك لە ئێمە زۆر کۆششی دەکرد هەوڵی دەدا تا مشتێ (خورما یا جۆی) دەهێنا (وپەیدا دەکرد)، کەچی ئەمڕۆ کەسێکیان سەد هەزار (دینار یان درهەمی) هەیە، وەکو ناڕاستەوخۆ مەبەستی خۆی بێت وایە.**

## ١٢ - بابُ قوله تعالى: ﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴿٨٠﴾﴾ التوبة

٤٦٧٠ - حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ أَبِي أُسَامَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ عَبْدُ اللهِ جَاءَ ابْنُهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَسَأَلَهُ أَنْ يُعْطِيَهُ قَمِيصَهُ يُكَفِّنُ فِيهِ أَبَاهُ فَأَعْطَاهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِيُصَلِّيَ فَقَامَ عُمَرُ فَأَخَذَ بِثَوْبِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ تُصَلِّي عَلَيْهِ وَقَدْ نَهَاكَ رَبُّكَ أَنْ تُصَلِّيَ عَلَيْهِ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِنَّمَا خَيَّرَنِي اللهُ فَقَالَ: ﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً ﴿٨٠﴾﴾ التوبة وَسَأَزِيدُهُ عَلَى السَّبْعِينَ». قَالَ: إِنَّهُ مُنَافِقٌ. قَالَ: فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَأَنْزَلَ اللهُ ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ﴿٨٤﴾﴾ التوبة.

---

(١) بروانە: ١٤١٥.

## ١٢ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: ( (ئەی موحەممەدﷺ) داوای لێبوردنیان بۆ بكەیت یا داوای لێبوردنیان بۆ نەكەیت (یەكسانە) ئەگەر حەفتا جار داوای لێبوردنیان بۆ بكەیت)

٤٦٧٠ -ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: كاتێ عەبدوڵلا (ی كوڕی ئوبەی) مرد، كوڕەكەی عەبدوڵلای كوڕی عەبدوڵلا هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای لێ كرد كە پێغەمبەر ﷺ كراسەكەی خۆی پێبدات بیكاتە كفنی باوكی، ئەویش كراسەكەی پێدا، لە پاشان داوای لێكرد كە نوێژی (لەسەر) بكات، پێغەمبەری خواش ﷺ هەستا نوێژی لەسەر بكات عومەر ﷺ هەستا وكراسەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ گرت و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن نوێژی لەسەر دەیكەیت لەكاتێكدا پەروەردگارت ڕێگری لێ كردویت كە نوێژی لەسەر بكەیت؟ پێغەمبەری خواش فەرمووی: ((بێگومان خوا منی سەرپشك كردووە و فەرموویەتی: (داوای لێبوردنیان بۆ بكەیت یان داوای لێبوردنیان بۆ نەكەیت (یەكسانە)، ئەگەر حەفتاجار داوای لێبوردنیان بۆ بكەیت)، جا من لە حەفتا جار زیاتر داوای لێبوردنی بۆ دەكەم))، (عومەر) وتی: بێگومان ئەو دووڕووە. (ئیبنو عومەر) وتی: ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر كرد بەوهۆیەوە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: (ئەی موحەممەد ﷺ) كاتێ یەكێ لەوانە[١] مرد، هەرگیز نوێژ مەكە لەسەری وە لەسەر گۆڕەكەی ڕامەوەستە)).

٤٦٧١ - حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ. وَقَالَ غَيْرُه: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ

---

(١) واتە، دوو ڕووەكان.

عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: لَمَّا مَاتَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ دُعِيَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ فَلَمَّا قَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَثَبْتُ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَتُصَلِّي عَلَى ابْنِ أُبَيٍّ وَقَدْ قَالَ يَوْمَ كَذَا كَذَا وَكَذَا؟! قَالَ: أُعَدِّدُ عَلَيْهِ قَوْلَهُ، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَقَالَ: «أَخِّرْ عَنِّي يَا عُمَرُ». فَلَمَّا أَكْثَرْتُ عَلَيْهِ قَالَ: «إِنِّي خُيِّرْتُ فَاخْتَرْتُ، لَوْ أَعْلَمُ أَنِّي إِنْ زِدْتُ عَلَى السَّبْعِينَ يُغْفَرْ لَهُ لَزِدْتُ عَلَيْهَا». قَالَ فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ ثُمَّ انْصَرَفَ فَلَمْ يَمْكُثْ إِلاَّ يَسِيرًا حَتَّى نَزَلَتِ الآيَتَانِ مِنْ بَرَاءَةَ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾ التوبة. قَالَ فَعَجِبْتُ بَعْدُ مِنْ جُرْأَتِي عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ وَاللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ.

**٤٦٧١ - - عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: کاتێ عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول مرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگ کرا تا نوێژی لەسەر بکات، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەستا (نوێژی لەسەر بکات) منیش چوومە خزمەتی و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا نوێژ دەکەین لەسەر عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی، لەکاتێکدا ئەو ڕۆژەو ئەوەو ئەوەو هەروەها ئەوەی وت؟ عومەر وتی: قسەکانی عەبدوڵلام بۆ گێڕایەوە (کەوتبووی) پێغەمبەری خواش ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: ((ئەی عومەر دوور کەوەرەوە لێم)) جا کە من زۆرم پێ ووت فەرمووی: ((من سەرپشك کراوم (لە نێوان کردن و نەکردن دا) منیش کردنم هەڵبژاردوە، ئەگەر بمزانیایە لە حەفتا جار زیاتر داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم خوا لێی خۆش دەبێ، زیاترم دەکرد لە حەفتاجار)) عومەر دەڵێ: ئیتر پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کردو پاشان لێ بوویەوە ئینجا زۆری پێ نەچوو ئەم دوو ئایەتەی سوڕەتی بەرائەت دابەزی: (ئەی موحەممەد ﷺ بۆ هەتا هەتایە نوێژ لەسەر هیچ کام لەو دوو ڕووانە مەکە کە مرد، وە لەسەر گۆڕەکەی**

ڕامەوەستە، بێگومان ئەوانە بێباوەڕبوون بەخوا و پێغەمبەرەکەی لەکاتێکدا مردن دەرچووبوون لەفەرمانی خوا (سنوورشکێن بوون)، عومەر دەڵێ: جا دواتر سەرم سوڕدەما لە زات وبوێری خۆم لەو ڕۆژەدا بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ وە خوا و پێغەمبەرەکەی زاناتر و شارەزاترن.

### ١٣ - بابُ قَوْلِه: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ﴿٨٤﴾ ﴾ التوبة

٤٦٧٢ - حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ أَنَّهُ قَالَ لَمَّا تُوُفِّيَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ جَاءَ ابْنُهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَعْطَاهُ قَمِيصَهُ وَأَمَرَهُ أَنْ يُكَفِّنَهُ فِيهِ ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي عَلَيْهِ، فَأَخَذَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ بِثَوْبِهِ فَقَالَ: تُصَلِّي عَلَيْهِ وَهْوَ مُنَافِقٌ وَقَدْ نَهَاكَ اللَّهُ أَنْ تَسْتَغْفِرَ لَهُمْ. قَالَ: «إِنَّمَا خَيَّرَنِي اللَّهُ أَوْ أَخْبَرَنِي فَقَالَ: ﴿ ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴿٨٠﴾ ﴾ التوبة. فَقَالَ: سَأَزِيدُهُ عَلَى سَبْعِينَ». قَالَ: فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَصَلَّيْنَا مَعَهُ ثُمَّ أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيْهِ ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾ التوبة[١].

## ١٣ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ( (ئەی موحەممەد ﷺ کاتێ یەکێک لەوانە مرد هەرگیز نوێژ مەکە لەسەر ی وە لەسەر گۆڕەکەی ڕامەوەستە)

٤٦٧٢ - نافیع گێڕایەوە لە ئیبنو عومەرەوە ﵄ کە وتی: کاتێ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی مرد، کوڕەکەی کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵایە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش کراسەکەی خۆی پێداو فەرمانی پێکرد کە (باوکی)

(١) بڕوانە: ١٢٦٩.

**تیا کفن بکات، پاشان هەستا نوێژی لەسەر بکات عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کراسەکەی گرت وتی: نوێژی لەسەر دەکەیت لەکاتێکدا ئەو دووڕووە، وە بێگومان خوا ڕێگری لێ کردوویت کە داوای لێبووردونیان بۆ بکەیت؟ فەرمووی: ((بێگومان خوا سەرپشکی کردووم - یان هەواڵی پێ داوم - و فەرموویەتی: (داوای لێبووردونیان بۆ بکەیت یان داوای لێبووردونیان بۆ نەکەیت (یەکسانە)، ئەگەر حەفتا جار داوای لێبوردونیان بۆ بکەیت خوا هەرگیز لێیان نابورێ))، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((من لە حەفتا جار زیاتر داوای لێبوردنی بۆ دەکەم))، (ئیبنو عومەر) وتی: جا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر کردو ئێمەش لەگەڵیدا نوێژمان لەسەر کرد، لە پاشان خوا ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاند: (وە (ئەی موحەممەد ﷺ) تۆ نوێژ مەکە لەسەر هیچ کەس لەوانە کە مرد هەتا هەتایە، وە لەسەر گۆڕەکەی ڕامەوەستە، بێگومان ئەوانە بێ باوەڕ بوون بە خوا و پێغەمبەرەکەی و مردوون لە کاتێکدا ئەوانە بەردەوام سنوور شکێن بوون).**

## ١٤ - بابُ قوْله: ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ ﴾ التوبة

٤٦٧٣ - حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ حِينَ تَخَلَّفَ عَنْ تَبُوكَ: وَاللَّهِ مَا أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنْ نِعْمَةٍ بَعْدَ إِذْ هَدَانِي أَعْظَمَ مِنْ صِدْقِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنْ لاَ أَكُونَ كَذَبْتُهُ فَأَهْلِكَ كَمَا هَلَكَ الَّذِينَ كَذَبُوا حِينَ أُنْزِلَ الْوَحْيُ ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ ﴿٩٥﴾ ﴾ التوبة: إلى: ﴿ الْفَاسِقِينَ ﴿٩٦﴾ ﴾ التوبة[1].

(١) بڕوانە: ٢٧٥٧.

## ١٤ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ( کاتێ گەڕانەوە بۆ لایان بە خوا سوێندتان بۆ دەخۆن بۆ ئەوەی چاوپۆشیان لێ بکەن، وە سەرزەنشتیان نەکەن ئێوەش ڕوویان لێ وەرگێڕن، بەڕاستی ئەو (دوو ڕوو) انە پیسن و جێگایان دۆزەخە (لە ڕۆژی دوایی دا) تۆڵەیان لێ دەسەنرێ، ئەو تۆڵەیە بەهۆی ئەو تاوان و خراپەی لە دونیا دەیان کرد)

٤٦٧٣ -عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیك وتی: لە کەعبی کوڕی مالیکم ﷺ بیست کاتێ لە (غەزای) تەبووك بەجێما (وتی) سوێند بەخوا، خوا هیچ بەهرەیەکی پێ نەبەخشیوم پاش ئەوەی ڕێنمونی کرد (بۆ باوەڕهێنان) گەورەتر بێت لە بەهرەی ڕاست کردنم لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کە درۆم لەگەڵیدا نەکرد کە بەهۆیەوە لەناوچم وەك لەوانەی درۆیان کردو لەناوچوون کاتێ نیگای دابەزێنرا (فەرمووی) (کاتێ گەڕانەوە بۆ لایان بەخوا سوێندتان بۆ دەخۆن) تا دەگاتە (لەسنوور دەرچووان).

– **بابٌ:** ﴿ يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ لِتَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡۖ فَإِن تَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرۡضَىٰ عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٩٦﴾ ﴾ التوبة

## باسێک: ( بە درۆ سوێندتان بۆ دەخۆن بۆ ئەوەی لێیان رازی بن جا ئەگەر ئێوەش لێیان رازی بن ئەوە بێگومان خوا رازی نابێ لە کەسانی دەرچوو لە سنوور)

١٥ - بابُ قوله تعالى ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا۟ عَمَلًا صَٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾ ﴾ التوبة:

٤٦٧٤ - حَدَّثَنَا مُؤَمَّلٌ -هُوَ ابْنُ هِشَامٍ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، وَحَدَّثَنَا عَوْفٌ، حَدَّثَنَا أَبُو رَجَاءٍ، حَدَّثَنَا سَمُرَةُ بْنُ جُنْدُبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَنَا «أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتِيَانِ فَابْتَعَثَانِي، فَانْتَهَيْنَا إِلَى مَدِينَةٍ مَبْنِيَّةٍ بِلَبِنِ ذَهَبٍ وَلَبِنِ فِضَّةٍ، فَتَلَقَّانَا رِجَالٌ شَطْرٌ مِنْ خَلْقِهِمْ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ، وَشَطْرٌ كَأَقْبَحِ مَا أَنْتَ رَاءٍ قَالاَ لَهُمُ اذْهَبُوا فَقَعُوا فِي ذَلِكَ النَّهْرِ. فَوَقَعُوا فِيهِ ثُمَّ رَجَعُوا إِلَيْنَا قَدْ ذَهَبَ ذَلِكَ السُّوءُ عَنْهُمْ، فَصَارُوا فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ قَالاَ لِي هَذِهِ جَنَّةُ عَدْنٍ، وَهَذَاكَ مَنْزِلُكَ قَالاَ: أَمَّا الْقَوْمُ الَّذِينَ كَانُوا شَطْرٌ مِنْهُمْ حَسَنٌ وَشَطْرٌ مِنْهُمْ قَبِيحٌ فَإِنَّهُمْ خَلَطُوا عَمَلاً صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا تَجَاوَزَ اللَّهُ عَنْهُمْ»[1].

## ١٥ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وەکەسانێکی تر هەن دانیان ناوە بە گوناهەکانیاندا، کردەوەی چاکیان تێکەڵ کردووە لەگەڵ کردەوەی تری خراپدا، ئومێد وایە خوا تۆبەیان لێ وەرگرێ بەڕاستی خوا لێبوردەی میهرەبانە)

**٤٦٧٤ -سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەم شەو دوو (فریشتە) هاتن بۆلام و لەخەو هەڵیان ساندم و (ڕۆشتین) تا گەشتینە شارێك (خانووەکانی) دروست کرابوو بە خشتێك لە ئاڵتوون وخشتێك لەزییو، جا پیاوانێك گەشتن پێمان نیوەی لاشەیان جوانترین لاشەیە کە تۆ بینیبێتت، نیوەکەی کەشی وەك ناشرینترین لاشە وابوو کە تۆ بینیبێتت، هەردووکیان[2]**

(١) بڕوانە: ٨٤٥.

(٢) دوو فریشتەکە.

**بەو پیاوانەیان وت: بڕۆن خۆتان بخەنە ناو ئەو ڕووبارەوە، ئەوانیش خۆیان خستە ناویەوە لە پاش گەڕانەوە بۆلامان و ئەو ناشرینیەی هەیانبوو نەما پێیانەوە و گۆڕان بۆ جوانترین شێوە، هەردووکیان پێیان وتم: ئەوە بەهەشتی هەمیشەیی یە و ئەوەش شوێنی تۆیە، وتیان بەڵام ئەو کەسانەی کە نیوەیان زۆر جوان بوو نیوەیان ناشرین بوو ئەوانە بێگومان کردەوەی چاکیان تێکەڵ کردبوو لەگەڵ کردەوەی تری خراپدا، خوا لێیان خۆش بوو بوو).**

**١٦ - بابُ قوله:** ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن يَسْتَغْفِرُوا۟ لِلْمُشْرِكِينَ ﴿١١٣﴾ ﴾ التوبة

٤٦٧٥ - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الْوَفَاةُ دَخَلَ عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ وَعِنْدَهُ أَبُو جَهْلٍ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَيْ عَمِّ، قُلْ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. أُحَاجُّ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ». فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ: يَا أَبَا طَالِبٍ، أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ مَا لَمْ أُنْهَ عَنْكَ». فَنَزَلَتْ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن يَسْتَغْفِرُوا۟ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓا۟ أُو۟لِى قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ ﴾ التوبة[1].

## ١٦ -باسی ئەم فەرمایشەی خوای گەورە: (ڕووداو و شایستە نییە بۆ پێغەمبەر و باوەڕداران کە داوای لێبووردن بکەن بۆ هاوبەش پەیداکەران)

**٤٦٧٥ -سەعیدی کوڕی موسەییەب لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێ ئەبو تالیب لە سەرەمەرگدا بوو پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بۆ لای لەوکاتەدا ئەبو جەهل و**

(١) بڕوانە: ١٣٦٠.

عەبدوڵڵاى كوڕى ئەبى ئومەييەى لابوو، پێغەمبەریش فەرمووى پێى: ((ئەى مامە بڵێ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ) بیکەمە بەڵگە بۆت لاى خودا، ئەبو جەهل و عەبدوڵڵاى كوڕى ئەبى ئومەييەش وتیان: ئەى ئەبو تالیب: ئایا وازدێنى لە ئاینى عەبدولموتەلیب؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووى: ((سوێند بەخوا داواى لێبوردنت بۆ دەكەم تا قەدەغە نەكرێ لێم))، بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزى: (وە ڕەوا و شایستە نییە بۆ پێغەمبەرو باوەڕداران كە داواى لێبووردن بكەن بۆ هاوبەش پەیداكەران با خزمى نزیكیشیان بن، لە پاش ئەوەى كەبۆیان دەركەوتووە كە بێگومان ئەو (هاوبەش دانەرانە) هاوەڵ وپێڕى دۆزەخن).

## ١٧ - بابُ قَوْلِه: ﴿ لَقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِى سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ ﴾ التوبة:

٤٦٧٦ - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي يُونُسُ، قَالَ أَحْمَد: حَدَّثَنَا عَنْبَسَةُ، حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ كَعْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ كَعْبٍ -وَكَانَ قَائِدَ كَعْبٍ مِنْ بَنِيهِ حِينَ عَمِيَ -، قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ فِي حَدِيثِهِ: ﴿ وَعَلَى ٱلثَّلَـٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟ ﴿١١٨﴾ ﴾ التوبة: قَالَ فِي آخِرِ حَدِيثِهِ: إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَمْسِكْ بَعْضَ مَالِكَ، فَهْوَ خَيْرٌ لَكَ»[1].

---

(١) بروانه: ٢٧٥٧.

## ١٧ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (بێگومان خوا تەوبەی وەرگرت لە پێغەمبەر ﷺو ئەو کۆچەر و یاریدەدەرانەی کە شوێنی (پێغەمبەرﷺ) کەوتن، لە کاتی سەختی و نارەحەتیدا پاش ئەوەی نزیک بوو دڵی کۆمەڵێکیان لە هەق لابدات پاشان خوا تەوبەی لێ وەرگرتن بەڕاستی خوا لەگەڵیان دڵسۆزو میهرەبانە)

٤٦٧٦ -عەبدوڕەحمانی کوڕی کەعب وتی: عەبدوڵڵای کوڕی کەعب - کە چاوساغی کەعب بوو لە کوڕەکانیدا کاتێ کوێر بوو بوو - بۆی گێڕامەوە وتی: لە کەعبی کوڕی مالیکم ﷺ بیست دەربارەی قسەکردن لەسەر (وە (خوا تەوبەی گیرا کرد) لەوسێ کەسەی کە فەرمان لە بارەیانەوە دواخرا)[1] لەکۆتایی قسەکانیدا وتی: بەڕاستی من لە تەوبەکردنەکەمدا (دەمەوێت) کە هەموو سامانەکەم بکەم بەخێر لە ڕێی خوا و پێغەمبەرەکەیدا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (( بەشێك لە ماڵەکەت بهێڵەرەوە بۆ خۆت، ئەوە بۆ تۆباشترە)).

١٨ – **بابُ قوله**: ﴿ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ التوبة

## ١٨ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (هەروەها (خوا تەوبەی وەرگرت) لەو سێ کەسەش کە فەرمان لە بارەیانەوە دواخرا (خوا دەربارەیان بڕیاری نەدابوو)، هەتا ئەو کاتەی

(١) کە خوای گەورە دەربارەیان بڕیاری نەدابوو.

## زەوی بەو فراوانیەی کە هەیەتی لێیان تەسک بوویەوە و بێزار بوون لەگیانی خۆشیان و زانیان هیچ پەناگەیەک نییە لە (سزا) خوا، مەگەر پەنایی خۆی پاشان پەشیمانی لێ وەرگرتن (بەدابەزاندنی چەند ئایەتێک) بۆ ئەوەی تۆبە بکەن بەڕاست، خوا هەمیشە تۆبە وەرگرو میهرەبانە)

٤٦٧٧ - حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي شُعَيْبٍ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ أَعْيَنَ، حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ رَاشِدٍ أَنَّ الزُّهْرِيَّ حَدَّثَهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ -وَهْوَ أَحَدُ الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ تِيبَ عَلَيْهِمْ- أَنَّهُ لَمْ يَتَخَلَّفْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا قَطُّ غَيْرَ غَزْوَتَيْنِ غَزْوَةِ الْعُسْرَةِ وَغَزْوَةِ بَدْرٍ. قَالَ: فَأَجْمَعْتُ صِدْقَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ضُحًى، وَكَانَ قَلَّمَا يَقْدَمُ مِنْ سَفَرٍ سَافَرَهُ إِلاَّ ضُحًى وَكَانَ يَبْدَأُ بِالْمَسْجِدِ، فَيَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ، وَنَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ كَلاَمِي وَكَلاَمِ صَاحِبَيَّ، وَلَمْ يَنْهَ عَنْ كَلاَمِ أَحَدٍ مِنَ الْمُتَخَلِّفِينَ غَيْرِنَا، فَاجْتَنَبَ النَّاسُ كَلاَمَنَا، فَلَبِثْتُ كَذَلِكَ حَتَّى طَالَ عَلَيَّ الأَمْرُ، وَمَا مِنْ شَيْءٍ أَهَمُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَمُوتَ فَلاَ يُصَلِّي عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ أَوْ يَمُوتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَكُونَ مِنَ النَّاسِ بِتِلْكَ الْمَنْزِلَةِ، فَلاَ يُكَلِّمُنِي أَحَدٌ مِنْهُمْ، وَلاَ يُصَلِّي عَلَيَّ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَوْبَتَنَا عَلَى نَبِيِّهِ ﷺ حِينَ بَقِيَ الثُّلُثُ الآخِرُ مِنَ اللَّيْلِ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ أُمِّ سَلَمَةَ، وَكَانَتْ أُمُّ سَلَمَةَ مُحْسِنَةً فِي شَأْنِي مَعْنِيَّةً فِي أَمْرِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا أُمَّ سَلَمَةَ تِيبَ عَلَى كَعْبٍ». قَالَتْ: أَفَلاَ أُرْسِلُ إِلَيْهِ فَأُبَشِّرَهُ قَالَ: «إِذًا يَحْطِمَكُمُ النَّاسُ فَيَمْنَعُونَكُمُ النَّوْمَ سَائِرَ اللَّيْلَةِ». حَتَّى إِذَا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلاَةَ الْفَجْرِ آذَنَ بِتَوْبَةِ اللَّهِ عَلَيْنَا، وَكَانَ إِذَا اسْتَبْشَرَ اسْتَنَارَ وَجْهُهُ حَتَّى كَأَنَّهُ قِطْعَةٌ مِنَ الْقَمَرِ، وَكُنَّا -أَيُّهَا الثَّلاَثَةُ- الَّذِينَ خُلِّفُوا عَنِ الأَمْرِ الَّذِي قُبِلَ مِنْ هَؤُلاَءِ الَّذِينَ اعْتَذَرُوا حِينَ أَنْزَلَ اللَّهُ لَنَا التَّوْبَةَ، فَلَمَّا ذُكِرَ الَّذِينَ كَذَبُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمُتَخَلِّفِينَ، وَاعْتَذَرُوا بِالْبَاطِلِ، ذُكِرُوا بِشَرِّ مَا ذُكِرَ بِهِ

أَحَدٌ قَالَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ ﴿ يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ ۚ قُل لَّا تَعْتَذِرُوا لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ ۚ وَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ ﴿٩٤﴾ ﴾ التوبة.

**٤٦٧٧ - عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیك لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە وتی: لە باوکم کە کەعبی کوڕی مالیکە ﷺ بیست - کە یەکێك بوو لەو سێ کەسەی تۆبەیان لێ گیرا کرا - (کەعب دەڵێ) ئەو هەرگیز لە هیچ غەزایەك پێغەمبەری خوا ﷺ کردبێتی بەجی نەماوە و دوانەکەوتووە جگەلە دوو غەزا: غەزای عوسرە و غەزای بەدر، وتی: لەناخمەوە بڕیارم دا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە چێشتەنگا (کە چوومە خزمەتی) ڕاستگۆبم[1]، وە پێغەمبەر (کەدەگەڕایەوە لە سەفەر) باوی وابوو بە چوونە مزگەوت دەستی پێدەکردو دوو ڕکات نوێژی دەکرد، وە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد قسە لەگەڵ من و دوو هاوڕێکەم بکرێ.**

**لە کاتێکدا ڕێگری نەکرد لە قسەکردن لەگەڵ هیچ کام لە بەجێ ماوەکاندا جگەلە ئێمە (ئەم سیانە)، بۆیە خەڵکیش خۆیان بەدوور گرت لە قسەکردن لەگەڵماندا، جا بەو شێوەیە مامەوە تا ئەو کارە (قسە لەگەڵ نەکردنە) درێژەی کێشا بەرانبەرم، هیچ شتێك بەلامەوە لەو گرنگتر نەبوو کە بمرم و پێغەمبەر ﷺ نوێژ نەکات لەسەرم، یان پێغەمبەری خوا ﷺ وەفات بکات منیش لای خەڵکی بەو ئاستە بم کەسیان قسەم لەگەڵ نەکەن و (پێغەمبەر ﷺ ) نوێژم لەسەر نەکات، ئەنجا کاتێ سێیەکی کۆتایی شەو مابوو خوا لێخۆشبوونمانی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ دابەزاندبوو، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ لای ئوممو سەلەمە**

---

(١) دوای ئەوەی هەواڵی زانی پێغەمبەر ﷺ بەرەو مەدینە گەڕاوەتەوە ئەمیش دواکەوتبوو بەبێ عوزر و بەهانە لەبیر ئەوەدا بوو چۆن خۆی لە تووڕەی پێغەمبەر ﷺ ڕزگار کات.

ﷺ بوو، ئوممو سەلەمەش چاکەکاربوو دەربارەی کارەکەی من گرنگی بەکارەکەم دەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەی ئوممو سەلمە کەعب تۆبەی لێ وەرگیرا))، (ئوممو سەلەمە) وتی: دەی ئایا کەسێك نەنێرم بۆ لای موژدەی پێ بدات؟ فەرمووی: (( (ئەگەر وابکەیت) ئەوکاتە خەڵکی پێشێلتان دەکەن وئەوەی ماوە لەشەوەکە ناهێڵن بخەون)) (ئاگاداری نەکرد) تا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی کرد ئاگاداری (خەڵکی) کرد کە خوا لێمان خۆش بووە، پێغەمبەر ﷺ هەمیشە دڵخۆش بوایە ڕووخساری دەدرەوشایەوە دەدوت پارچەیەکە لە مانگ، وە ئێمە ئەو سیانەمان دواخرا بووین[١] دەربارەی ئەو کارە لە عوزر و بەهانە وەرگیرا لەوانەی عوزریان هێنایەوە کاتێ لێبووردنی بۆ ئێمە دابەزاند، جا کاتێ باسی ئەوانە کرا درۆیان کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوادا لە بەجێماوان بەدرۆو دەلەسە عوزریان هێنایەوە بەخراپترین شێوە کە باسی کەسێك بکرێ باسکران، خوای پاك وبێگەرد فەرمووی: (عوزر و بەهانەتان بۆ دەهێننەوە کاتێ (لەجیهادو غەزا) گەڕانەوە بۆ لایان بڵێ: بە هانەو عوزر مەهێننەوە ئێمە هەرگیز باوەڕتان پێ ناکەین چونکە بەڕاستی خوا ئاگاداری کردوینەتەوەلە هەواڵەکانتان (کە ئێوە ناپاك و دووڕوون)، لە داهاتوودا خوا و پێغەمبەرەکەی کردەوەکانتان دەبینن). تاکۆتایی ئایەتەکە.

## ١٩ - **بابٌ قوله:** ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾ التوبة

٤٦٧٨ - حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ -وَكَانَ قَائِدَ

(١) بڕیار لە بارەمانەوە نەدرابوو.

كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ - قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ يُحَدِّثُ حِينَ تَخَلَّفَ عَنْ قِصَّةِ تَبُوكَ. فَوَاللَّهِ مَا أَعْلَمُ أَحَدًا أَبْلَاهُ اللَّهُ فِي صِدْقِ الْحَدِيثِ أَحْسَنَ مِمَّا أَبْلَانِي، مَا تَعَمَّدْتُ مُنْذُ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى يَوْمِي هَذَا كَذِبًا، وَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ عَلَى رَسُولِهِ ﷺ ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ ﴿١١٧﴾﴾ التوبة، إِلَى قَوْلِهِ ﴿وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾﴾ التوبة:

## ١٩ - باسێک:( دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوا): (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە خۆتان بپارێزن لە (تۆڵەی) خوا، وە لەگەڵ ڕاست گۆیاندا بن و لە ڕیزی ئەواندابن)

**٤٦٧٨ -عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیك - کە چاوساغی کەعبی کوڕی مالیك بوو -[1] وتی: لە کەعبی کوڕی مالیکم ﷺ بیست باسی ئەو کاتەی دەکرد کە بەجێما دەربارەی بەسەرهاتەکەی (بەجێمانی لە غەزای) تەبووك، (وتی): جا سوێند بەخوا نازانم کەسێك هەبێ خوا تاقی کردبێتەوە لە ڕاست کردنی لە قسەکانیدا چاکتر بێت لەوەی منی پێ تاقیکردەوە لەو کاتەوەی ئەوەم[2] بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کردووە، تا ئەمڕۆ بەدەستی ئەنقەست درۆیەکەم نەکردووە وە خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند بۆ پێغەمبەرەکەی: (بێگومان خوا تەوبەی وەرگرت لە پێغەمبەر ﷺ و ئەو کۆچەران) تا دەگاتە (لەگەڵ ڕاست گۆیاندا بن).**

(١) کاتێ کوێر بوو بوو.

(٢) ڕاستی دواکەوتنم لەرۆشتن بۆ غەزای تەبووك و درۆم نەکرد لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ.

## ٢٠ - بابُ قوْلِه: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ۝١٢٨﴾ التوبة:

﴿رَءُوفٌ ۝١٢٨﴾ التوبة: من الرأفة

٤٦٧٩ - حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ السَّبَّاقِ أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيَّ ﷺ وَكَانَ مِمَّنْ يَكْتُبُ الْوَحْيَ قَالَ: أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ مَقْتَلَ أَهْلِ الْيَمَامَةِ وَعِنْدَهُ عُمَرُ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّ عُمَرَ أَتَانِي فَقَالَ: إِنَّ الْقَتْلَ قَدِ اسْتَحَرَّ يَوْمَ الْيَمَامَةِ بِالنَّاسِ، وَإِنِّي أَخْشَى أَنْ يَسْتَحِرَّ الْقَتْلُ بِالْقُرَّاءِ فِي الْمَوَاطِنِ؛ فَيَذْهَبَ كَثِيرٌ مِنَ الْقُرْآنِ، إِلاَّ أَنْ تَجْمَعُوهُ، وَإِنِّي لأَرَى أَنْ تَجْمَعَ الْقُرْآنَ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قُلْتُ لِعُمَرَ: كَيْفَ أَفْعَلُ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَ عُمَرُ: هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ. فَلَمْ يَزَلْ عُمَرُ يُرَاجِعُنِي فِيهِ حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ لِذَلِكَ صَدْرِي، وَرَأَيْتُ الَّذِي رَأَى عُمَرُ. قَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ: وَعُمَرُ عِنْدَهُ جَالِسٌ لاَ يَتَكَلَّمُ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّكَ رَجُلٌ شَابٌّ عَاقِلٌ وَلاَ نَتَّهِمُكَ، كُنْتَ تَكْتُبُ الْوَحْيَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَتَتَبَّعِ الْقُرْآنَ فَاجْمَعْهُ. فَوَاللَّهِ لَوْ كَلَّفَنِي نَقْلَ جَبَلٍ مِنَ الْجِبَالِ مَا كَانَ أَثْقَلَ عَلَيَّ مِمَّا أَمَرَنِي بِهِ مِنْ جَمْعِ الْقُرْآنِ قُلْتُ: كَيْفَ تَفْعَلاَنِ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ، فَلَمْ أَزَلْ أُرَاجِعُهُ حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَدْرِي لِلَّذِى شَرَحَ اللَّهُ لَهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، فَقُمْتُ فَتَتَبَّعْتُ الْقُرْآنَ أَجْمَعُهُ مِنَ الرِّقَاعِ وَالأَكْتَافِ وَالْعُسُبِ وَصُدُورِ الرِّجَالِ، حَتَّى وَجَدْتُ مِنْ سُورَةِ التَّوْبَةِ آيَتَيْنِ مَعَ خُزَيْمَةَ الأَنْصَارِيِّ، لَمْ أَجِدْهُمَا مَعَ أَحَدٍ غَيْرِهِ ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم ۝١٢٨﴾ التوبة: إِلَى آخِرِهِمَا، وَكَانَتِ الصُّحُفُ الَّتِي جُمِعَ فِيهَا الْقُرْآنُ عِنْدَ أَبِي بَكْرٍ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ عِنْدَ عُمَرَ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ عِنْدَ حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ.

تَابَعَهُ عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ وَاللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ وَقَالَ: مَعَ أَبِي خُزَيْمَةَ الأَنْصَارِيِّ. وَقَالَ مُوسَى: عَنْ إِبْرَاهِيمَ حَدَّثَنَا ابْنُ شِهَابٍ: مَعَ أَبِي خُزَيْمَةَ. وَتَابَعَهُ يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ عَنْ أَبِيهِ. وَقَالَ أَبُو ثَابِتٍ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ وَقَالَ: مَعَ خُزَيْمَةَ، أَوْ أَبِي خُزَيْمَةَ[1].

## ٢٠ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (سوێند بەخوا بەڕاستی پێغەمبەرێکتان لەخۆتان بۆ هاتووە نارەحەتی و ناخۆشی ئێوە قورس و گرانە بەلایەوە زۆر سوورە لەسەر (باوەڕهێنان) تان بۆ بڕواداران دڵسۆزو میهرەبانە)

﴿ رَءُوفٌ ﴾: لە (الرأفةُ)ـەوە هاتووە کە بەمانای بەزەیی پێداهاتنەوە، میهرەبانی ودڵنەرمییە.

٤٦٧٩ -زوهری دەڵێ: ئیبنو سەبباق بۆی گێڕامەوە کە زیدی کوڕی سابیتی ئەنصاری ﷺ - لەو کەسانەبوو نیگای دەنوسییەوە -وتی: ئەبو بەکر ﷺ لەو ڕۆژانەی خەڵکی (لە) یەمامە کوژران ناردی بە شوێنم دا (و ڕۆشتم)، عومەریشی لابوو، ئەنجا ئەبو بەکر وتی: بێگومان عومەر هاتووە بۆلام و وتی: بەڕاستی لە ڕۆژی یەمامەدا کوشتار زۆر بوو لە خەڵکەکە (مسوڵمانان)، وە من دەترسم لە شوێنەکانی (جەنگ)ـدا کوشتن زۆر ببێ لە ناو قورئان خوێناندا، بەهۆیە زۆرێك لە قورئان بفەوتێت ونەمێنێ، مەگەر کۆیکەینەوە، وبەڕاستی من ڕام وایە قورئان کۆبکرێتەوە، ئەبو بەکر وتی: بە عومەرم وتووە: چۆن شتێك بکەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردووە، عومەریش وتی وەڵڵاهی ئەو (کۆکردنەوەیە) کارێکی چاکە، جا بەردەوام عومەر لەو بارەیەوە پێی دەوتمەوە

(١) بروانە: ٢٨٠٧.

تا خوا دڵمی بۆ ئەو کارە والآ کرد پێی ڕازی بوو، منیش ڕاو بۆچوونم وەك عومەری لێهات، زەیدی کوڕی سابیت وتی: لە کاتێکدا عومەریش لای ئەبو بەکر ﷺ دانیشتبوو قسەی نەدەکرد، ئەنجا ئەبو بەکر وتی: تۆ کەسێکی گەنج و ژیری گومانمان لێت نییە[1]، پێشتر نیگات بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەنوسیەوە کەواتە بگەڕێ بە شوێن (ئایەت و سوڕەتەکانی) قورئاندا کۆی بکەرەوە - (زەید وتی) جا سوێند بەخوا ئەگەر داوای گواستنەوەی شاخێك لە شاخەکانی لێ بکردمایە لەوەی فەرمانی پێکردم قورستر نەبوو بەلامەوە لە کۆکردنەوەی قورئان، (زەید دەڵێ) وتم: چۆن هەردووکتان شتێك دەکەن کە پێغەمبەر ﷺ نەیکردوە؟ جا ئەبو بەکر ﷺ وتی: وڵڵاهی ئەوە کارێکی چاکە، جا بەردەوام قسەم لەگەڵدا دەکرد تا خوا دڵی منیشی والآکرد و ڕازی بوو بۆ ئەو کارەی خوا دڵی ئەبو بەکرو دڵی عومەری بۆ والآکردبوو، ئیتر منیش هەستام و گەڕام بە شوێن (سوڕەت وئایەتەکانی) قورئاندا و کۆم دەکردەوە لە پێشت و ئێسکی دەفی شان (ی ئاژەڵ) و پەلی دارخورما[2]و سنگی کەسەکان[3]، (گەڕام) تا دوو ئایەتی سوڕەتی تەوبەم لای خوزەیمەی ئەنصاری دۆزیەوە جگەلە ئەو لای کەسی تر ئەو دوو ئایەتەم نەدی: (سوێند بەخوا بەڕاستی پێغەمەرێکتان لەخۆتان بۆهاتووە قورس وگرانە بەلایەوە ناڕەحەتی وناخۆشی ئێوە، زۆر سوورە لەسەر (باوەڕهێنان) تان) تا کۆتایی هەردوو ئایەتەکە، وە ئەو پێست و شتانەی کە قورئانیان تیادا کۆکرابۆوە لای ئەبو بەکر بوو تا وەفاتی کرد، لە پاشان لای عومەر تا وەفاتی کرد، لە پاشان لای حەفصەی کچی عومەر بوو ﵄.

---

(١) کە درۆبکەیت یان شتت لە بیر بچێت کە زیان بە قورئانەکە بگەیەنێت.

(٢) لقی دارخورماکە گەڵاکانی لێ کرابێتەوە تەنگ و ڕێکیان کردووە لەسەریان نووسیوە.

(٣) کە قورئانیان لەبەر کردووە لە سنگیاندا.

- عوسمانی کوڕی عومەرو لەیس ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوەو پاڵپشتی گێڕانەوەکەی شوعەیبیان کردووە، هەردووکیان گێڕاویانەتەوە لە یونسەوە ئەویش لە ئیبنو شیهابەوە.

- لەیس دەڵێ: عەبدوڕەحمانی کوڕی خالید بۆی گێڕامەوە لە ئیبنو شیهابەوە وتی: لەلای ئەبی[1] خوزەیمەی ئەنصاری بوو.

- مووسا دەڵێ: لە ئیبراهیمەوە گێڕایەوە و وتی: ئیبنو شیهاب بۆی گێڕاینەوە لە لای ئەبی خوزەیمە بوو.

- یەعقوبی کوڕی ئیبراهیم ئەم فەرموودەی گێڕایەوە لە باوکیەوە و پاڵپشتی فەرموودەکەی مووسای کردووە.

- وە ئەبو سابیت وتی: ئیبراهیم بۆی گێڕاینەوە و وتی (ئەو دوو ئایەتە) لە لای خوزەیمە بوو، یان: لای ئەبی خوزەیمە بوو.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١٠ - سُورة يُونُسَ ﷺ

## ١ - بابٌ

وَقَالَ ابن عَبَّاس: ﴿ فَٱخْتَلَطَ ﴿٢٤﴾ ﴾ يونس: فَنَبَتَ بِالْمَاءِ مِنْ كُلِّ لَوْنٍ. وَ ﴿ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا سُبْحَٰنَهُۥ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ﴿٦٨﴾ ﴾ يونس: وَقَالَ زيدُ بْنُ أَسْلَمَ: ﴿ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ ﴿٢﴾ ﴾ يونس: : مُحَمَّدٌ ﷺ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: خَيْرٌ. يُقَالُ: ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ﴿١﴾ ﴾ يونس: يَعْنِي هذه أَعْلَامُ القُرْآنِ وَمِثْلُهُ. ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمْ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم ﴿٢٢﴾ ﴾ يونس: المَعْنَى: بِكُمْ. ﴿

[1] گێڕانەوەکەی پێشوو وتی، لای خوزەیمە ئەممیان دەڵێ: ئەبی خوزەیمە.

دَعْوَىٰهُمْ ﴿١٠﴾ ﴾ يونس: دُعَاؤُهُمْ ﴿ أُحِيطَ بِهِمْ ﴿٢٢﴾ ﴾ يونس: دَنَوْا مِنَ الهَلَكَةِ ﴿ وَأَحَٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ ﴿٨١﴾ ﴾ البقرة: فَاتَّبَعَهُمْ وَأَتْبَعَهُمْ وَاحِدٌ ﴿ وَعَدْوًا ﴿٩٠﴾ ﴾ يونس: مِنَ العُدْوَانِ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ ٱسْتِعْجَالَهُم بِٱلْخَيْرِ ﴿١١﴾ ﴾ يونس: قَوْلُ الإِنْسَانِ لِوَلَدِهِ وَمَالِهِ إِذَا غَضِبَ: اللَّهُمَّ لَا تُبَارِكْ فِيهِ وَالْعَنْهُ ﴿ لَقُضِىَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ ﴿١١﴾ ﴾ يونس: لأُهْلِكُ مَنْ دُعِيَ عَلَيْهِ وَلأَمَاتَهُ. ﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ ﴿٢٦﴾ ﴾ يونس: مِثْلُهَا حُسْنَى ﴿ وَزِيَادَةٌ ﴿٢٦﴾ ﴾ يونس: مَغْفِرَةٌ. ﴿ ٱلْكِبْرِيَآءُ ﴿٧٨﴾ ﴾ يونس:: المُلْكُ.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٠ - (تەفسیری) سوڕەتی یونس ﷺ

### ١ - باسێک

**-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ فَٱخْتَلَطَ ﴾: هەموو جۆرە ڕووەکێکە بە ئاو ڕوابێت. وە (دەڵێن: خوا منداڵی بۆ خۆی هەڵبژاردووە! پاکی و بێگەردی بۆ خوا ئەو بێ نیازە).**

**-زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: ﴿ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ ﴾: واتە: موحەممەد ﷺ، موجاهید دەڵێ: واتە: خێر و چاکە. دەوترێت. ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ﴾: واتە ئەمە نیشانەکانی قورئانە، ئەم ئایەتەش هاوشێوەی ئەوە[1] ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمْ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم ﴾:[2] (بِهِم) واتە: (بِكُم). ﴿ دَعْوَىٰهُمْ ﴾: دوعاو پاڕانەوەکانیان. ﴿ أُحِيطَ بِهِمْ ﴾: لە تیاچوون نزیک دەبنەوە. ﴿ وَأَحَٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ ﴾: تاوانەکانی**

---

(١) کە (بهم) بەمانای (بکم) بەکارهاتووە هەرچۆنێك (تِلْكَ) بەمانای (هذه) بەکارهاتووە. بڕوانە : إرشاد الساري، ٢٨٤/٧.

(٢) واتە: (هەتا کاتێ ئێوە لە کەشتیدان (کەشتیەکان) دەتان گێڕێت).

له هەموو لايەكەوه دەورى بدات و لێى نزيك بێتەوه. (فَأَتَّبَعَهُمْ)[1] لەگەڵ (أتْبعهم) يەكێكن و به يەك مانا دێن واته: دوايان كەوتن وبەشوێنياندا ڕۆشتن. ﴿ وَعَدْوًا ﴾: له (العدوان)ەوه هاتووه واته: ناهەقى.

- موجاهيد دەڵێ: مەبەست به: ﴿ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ ٱسْتِعْجَالَهُم بِٱلْخَيْرِ ﴾: وتەى مرۆڤه كاتێ توڕه دەبێ به منداڵ و ماڵ و سامانى خۆى دەڵێ: فەڕو بەرەكەتى تێ نەكەوێ، خوا بيبڕێ نەفرينى (خوا) لێ بێ. ﴿ لَقُضِيَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ ﴾: ئەوەى دوعاى لێ كراوه (خوا) لەناوى دەبات ودەيمرێنێت. ﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾: (بۆ ئەوانەى چاكەيان كردووه) به وێنەى.

چاكەكەيان پاداشتى چاكەيان بۆ هەيه (كه بەهەشته). ﴿ وَزِيَادَةٌ ﴾: (لەگەڵ زيادەدا) كه لێبوردن و ڕەزامەندى خوايه، وه جگه لەموجاهيد وتوويەتى: (وَزِيَادَةٌ) واته: بينين و سەيركردنى خواى گەوره (له ڕۆژى دوايدا).

﴿ ٱلْكِبْرِيَآءُ ﴾: پاشايەتى و دەسەڵات.

٢ -بابُ قَوْله: ﴿ وَجَٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُۥ بَغْيًا وَعَدْوًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾ يونس

﴿ نُنَجِّيكَ ﴿٩٢﴾ ﴾ يونس: نُلْقِيكَ على نَجْوَةٍ مِنَ الأَرْضِ، وَهْوَ النَّشَزُ المَكَانُ المُرْتَفِعُ.

---

(١) (فَأَتْبَعَهُمْ) ئەو خوێندنەوەيەكى شاز كه حەسەنى بەسرى و قەتاده وايان خوێندۆتەوه، بەڵام ئەوانى تر به (فَأَتْبَعَهُم) خوێندويانەتەوه. بڕوانه : إرشاد السارى، ١٠/٢٨٥.

## ٢ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە نەوەی ئیسرائیلمان لە دەریاکە (ئاوی نیل) پەڕاندەوە ئینجا فیرعەون و لەشکرەکەی شوێنیان کەوتن بۆ ستەم و دەست درێژی کردن، هەتا ئەوە کاتەی خەریک بوو (فیرعەون) بخنکێ، ئەوسا وتی: بڕوام هێنا کە هیچ پەرستراوێک نییە جگە لە ئەو (خوایە) نەبێت کە نەوەی ئیسرائیل بڕوایان پێ هێناوە، وەمنیش لە مسوڵمانانم)

﴿ فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ ﴾: واتە: لاشەکەت فڕێ دەدەینە جێگایەکی بەرز لەسەر زەوی (نَجْوَة) واتە: (النَّشَز) کە بەجێگایەکی بەرز دەوترێ.

٤٦٨٠ - حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ وَالْيَهُودُ تَصُومُ عَاشُورَاءَ فَقَالُوا هَذَا يَوْمٌ ظَهَرَ فِيهِ مُوسَى عَلَى فِرْعَوْنَ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لأَصْحَابِهِ: «أَنْتُمْ أَحَقُّ بِمُوسَى مِنْهُمْ، فَصُومُوا»[1].

**٤٦٨٠ - ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: کە پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەدینە جولەکەکان ڕۆژی دەی موحەڕەم بەڕۆژوو دەبوون (پرسیاری لێ کردن ئەمە چییە)، ئەوانیش وتیان: ئەمە ڕۆژێکە خوا مووسای ﷺ زاڵ کرد و سەرخست بەسەر فیرعەون دا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئێوە لە پێشترن بە مووسا ﷺ لەوان لەبەر ئەوە بەڕۆژووبن (لەو ڕۆژەدا)).**

(١) بڕوانە: ٢٠٠٤.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١١ - سوره هود ﷺ

وَقَالَ أَبُو مَيْسَرَةَ: الأَوَّاهُ الرَّحِيمُ بِالْحَبَشِيَّةِ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ بَادِيَ ٱلرَّأۡيِ ﴿٢٧﴾ ﴾هود: مَا ظَهَرَ لَنَا. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ ٱلۡجُودِيِّ ﴿٤٤﴾ ﴾ هود: جَبَلٌ بِالْجَزِيرَةِ. وَقَالَ الحَسَنُ: ﴿ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ﴿٨٧﴾ ﴾ هود: يَسْتَهْزِئُونَ بِهِ، وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ أَقۡلِعِي ﴿٤٤﴾ ﴾ هود: أَمْسِكِي. ﴿ عَصِيبٌ ﴿٧٧﴾ ﴾ هود: شَدِيدٌ. ﴿ لَا جَرَمَ ﴿٢٢﴾ ﴾ هود: بَلَى. ﴿ وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ ﴿٤٠﴾ ﴾ هود: نَبَعَ المَاءُ. وَقَالَ عِكْرِمَةُ: وَجْهُ الأَرْضِ.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١١ - (تەفسیری) سورەتی هوود ﷺ

**- ئەبو مەیسەرە دەڵێ: (الأَوَّاهُ) بەزمانی حەبەشەیی واتا: بە بەزەیی و میهرەبان. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ بَادِيَ ٱلرَّأۡيِ ﴾: ئەوەی بۆ ئێمە ڕوون بۆتەوە و دیارە. موجاهید دەڵێ: ﴿ ٱلۡجُودِيِّ ﴾: شاخێکە لە جەزیرە (لە کوردستانی تورکیا). حەسەن دەڵێ: ﴿ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ﴾:[1]: کاڵتە بەشوعەیب (سەلامی خوای لێ بێ) دەکەن بەم وتەیەیان.**

**-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ أَقۡلِعِي ﴾: بیوەستێنە، ڕایگرە. ﴿ عَصِيبٌ ﴾: سەخت، نارەحەت. ﴿ لَا جَرَمَ ﴾: بەڵێ، بەڕاستی. ﴿ وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ ﴾: ئاو لە تەنورەوە هەڵقوڵا، عیکریمە دەڵێ: لە هەموو شوێنێکی زەوییەوە هەڵقوڵا.**

---

(١) واتە، بێگومان تۆ پەلەنەکەری و لەسەر خۆیی.

١ - **بابٌ:** ﴿ أَلَآ إِنَّهُمۡ يَثۡنُونَ صُدُورَهُمۡ لِيَسۡتَخۡفُواْ مِنۡهُۚ أَلَا حِينَ يَسۡتَغۡشُونَ ثِيَابَهُمۡ يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ۝٥ ﴾ هود

وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿ وَحَاقَ ۝٨ ﴾ هود: نَزَلَ، ﴿ يَحِيقُ ۝٤٣ ﴾ فاطر: يَنْزِلُ. (يؤوس): فَعُولٌ مِنْ يَئِسْتُ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ تَبۡتَئِسۡ ۝٣٦ ﴾ هود: تَحْزَنْ. ﴿ يَثۡنُونَ صُدُورَهُمۡ ۝٥ ﴾ هود: شَكٌّ وَامْتِرَاءٌ فِي الحَقِّ. ﴿ لِيَسۡتَخۡفُواْ مِنۡهُ ۝٥ ﴾ هود: مِنَ اللَّهِ إِنِ اسْتَطَاعُوا.

## ١ - باسێک: (ئاگادار بن بێگومان ئەوان سنگیان دەپێچنەوە (لەسەر کینەو دژایەتی ) بۆ ئەوەی خۆیان بشارنەوە لە خوا بێدار بن، کاتێ ئەوان بە پۆشاکەکانیان خۆیان دادەپۆشن، (خوا ) دەزانێ بەوەی دەیشارنەوە و ئەوەی ئاشکرای دەکەن، بێگومان ئەو (خوایە) بە ئاگاو زانایە بەوەی لە سینەو دڵەکاندایە)

**-جگە لەعیکریمە دەڵێ: ﴿ وَحَاقَ ﴾: دابەزی. ﴿ يَحِيقُ ﴾: دادەبەزێت. (یَؤوسٌ)[1] لەسەر کێشی (فَعُولٌ)ـە لە (يَئِسْتُ)ـەوە هاتووە واتە: بێ ئومێد بووم.موجاهید دەڵێ: ﴿ تَبۡتَئِسۡ ﴾: غەمبار دەبێت. ﴿ يَثۡنُونَ صُدُورَهُمۡ ﴾: دوو دڵی و گومان بوون لەهەق دا. ﴿ لِيَسۡتَخۡفُواْ مِنۡهُ ﴾: بۆ ئەوەی بۆیان بشارنەوە لەخوا ئەگەر بتوانن.**

٤٦٨١ - حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ صَبَّاحٍ، حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ قَالَ قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبَّادِ بْنِ جَعْفَرٍ أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقْرَأُ ﴿ أَلَآ إِنَّهُمۡ تَثْنَونِي صُدُرُهُم ۝٥ ﴾

(١) واتە، زۆر نا ئومێد و بێ هیوایە.

هود: قَالَ سَأَلْتُهُ عَنْهَا فَقَالَ أُنَاسٌ كَانُوا يَسْتَحْيُونَ أَنْ يَتَخَلَّوْا فَيُفْضُوا إِلَى السَّمَاءِ،وَأَنْ يُجَامِعُوا نِسَاءَهُمْ فَيُفْضُوا إِلَى السَّمَاءِ، فَنَزَلَ ذَلِكَ فِيهِمْ[1].

**٤٦٨١ - موحەممەدی کوڕی عەببادی کوڕی جەعفەر دەگێڕێتەوە کە لە ئیبنو عەبباس ﷺ ی بیست ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە** ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ تَثْنَونِي صُدُرُهُم ﴿٥﴾ ﴾ هود:[2] **(موحەممەدی کوڕی عەبباد دەڵێ): پرسیارم لێ کرد دەربارەی ئەو ئایەتە (ئیبنو عەبباس) دەڵێ: ئەوانە کەسانێك بوون شەرمیان دەکرد دەست بە ئاو بگەیەنن لە نێوان ئەوان ئاسمان دا هیچ بەربەستێك نەبێت، وە (شەرمیان دەکرد) لەگەڵ خێزانەکانیان دا جووت ببن لە نێوان ئەوان ئاسماندا هیچ بەربەستێك نەبێت، ئیتر بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی دەربارەیان.**

٤٦٨٢ - حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ وَأَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبَّادِ بْنِ جَعْفَرٍ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ قَرَأَ: ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ تَثْنَونِي صُدُرُهُم ﴿٥﴾ ﴾ هود: قُلْتُ يَا أَبَا الْعَبَّاسِ مَا تَثْنَوْنِي صُدُورُهُمْ؟ قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ يُجَامِعُ امْرَأَتَهُ فَيَسْتَحِي، أَوْ يَتَخَلَّى فَيَسْتَحِي، فَنَزَلَتْ ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ ﴿٥﴾ ﴾ هود:

**٤٦٨٢ -موحەممەدی کوڕی عەببادی کوڕی جەعفەر گێڕایەوە، کە ئیبنو عەبباس ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە** ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ تَثْنَونِي صُدُرُهُم ﴿٥﴾ ﴾ هود: **وتم: ئەی باوکی عەبباس مانای (تَثْنَونِي صُدُرُهُم) چییە؟ وتی: جاران پیاو لەگەڵ هاوسەری جووت دەبوو شەرمی دەکرد یان دەستی بە ئاودەگەیاند شەرمی دەکرد، بەهۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی:** ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ ﴾[3].

(١) بڕوانە: ٤٦٨٢، ٤٦٨٣.

(٢) ئەوە خوێندنەوەیەکی شازە بەڵام جەماوەری قورئان خوێنان بە (يَثْنونَ) خوێندویانەتەوە.

(٣) واتە: ئاگاداربن بێگومان ئەوان سنگیان دەپێچنەوە (لەسەر کینەو دژایەتی).

٤٦٨٣ - حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا عَمْرٌو قَالَ: قَرَأَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُواْ مِنْهُۚ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ ﴿٥﴾ ﴾ هود: وَقَالَ غَيْرُهُ: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﴿ يَسْتَغْشُونَ ﴿٥﴾ ﴾ هود: يُغَطُّونَ رُءُوسَهُمْ ﴿ سِيٓءَ بِهِمْ ﴿٧٧﴾ ﴾ هود: سَاءَ ظَنُّهُ بِقَوْمِهِ. ﴿ وَضَاقَ بِهِمْ ﴿٧٧﴾ ﴾ هود: بِأَضْيَافِهِ ﴿ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ ﴿٨١﴾ ﴾: بِسَوَادٍ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ ﴿ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾ ﴾ هود: أَرْجِعُ.

**٤٦٨٣ - سوفیان وتی: عەمر بۆی گێڕاینەوە وتی: ئیبنو عەبباس ئەم ئایەتەی (بەم شێوە) خوێندەوە** ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُواْ مِنْهُۚ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ ﴾[1].

**- جگە لە عەمر دەڵێ: ئیبنو عەبباس ﷺ وتی:** ﴿ يَسْتَغْشُونَ ﴾**: واتە: سەریان دادەپۆشن.** ﴿ سِيٓءَ بِهِمْ ﴾**: گومانی خراپی برد بەهۆزەکەی.** ﴿ وَضَاقَ بِهِمْ ﴾**: (وە دلگران بوو) بەمیوانەکانی.** ﴿ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ ﴾**: بە تاریکی شەو.**

**- موجاهید دەڵێ:** ﴿ أُنِيبُ ﴾**: دەگەڕێمەوە.**

## ٢ - بابُ قوله: ﴿ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ﴿٧﴾ ﴾ هود

٤٦٨٤ - حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ ﷻ: أَنْفِقْ أُنْفِقْ عَلَيْكَ" وَقَالَ: "يَدُ اللَّهِ مَلأَى لاَ تَغِيضُهَا نَفَقَةٌ، سَحَّاءُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ" وَقَالَ: "أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْفَقَ مُنْذُ خَلَقَ السَّمَاءَ وَالأَرْضَ فَإِنَّهُ لَمْ يَغِضْ مَا فِي يَدِهِ، وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ، وَبِيَدِهِ الْمِيزَانُ يَخْفِضُ وَيَرْفَعُ»[2].

---

(١) لەسەرەتا تەفسیری سورەتی هوددا ڕاڤەمان کرد.

(٢) بڕوانە: ٥٣٥٢، ٧٤١١، ٧٤١٩، ٧٤٩٦.

﴿ اَعۡتَرَىٰكَ ﴿٥٤﴾ ﴾ هود: افْتَعَلْتَ مِنْ عَرَوْتُهُ أَيْ: أَصَبْتُهُ،وَمِنْهُ: يَعْرُوهُ، وَاعْتَرَانِي﴿ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآ ﴿٥٦﴾ ﴾ هود: أَيْ: فِي مِلْكِهِ وَسُلْطَانِهِ. ﴿ عَنِيدٍ ﴿٥٩﴾ ﴾ هود: وَعَنُودٌ وَعَانِدٌ وَاحِدٌ، هُوَ تَأْكِيدُ التَّجَبُّرِ

﴿ وَيَقُولُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ ﴿١٨﴾ ﴾ هود: وَاحِدُهُ شَاهِدٌ مِثْلُ صَاحِبٍ. ﴿ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ ﴿٦١﴾ ﴾ هود: جَعَلَكُمْ عُمَّارًا، أَعْمَرْتُهُ الدَّارَ فَهِيَ عُمْرَى جَعَلْتُهَا لَهُ. ﴿ نَكِرَهُمۡ ﴿٧٠﴾ ﴾ هود: وَأَنْكَرَهُمْ وَاسْتَنْكَرَهُمْ وَاحِدٌ.﴿ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ ﴿٧٣﴾ ﴾ هود: كَأَنَّهُ فَعِيلٌ مِنْ مَاجِدٍ. مَحْمُودٌ مِنْ حَمِدَ.﴿ سِجِّيلٖ ﴿٨٢﴾ ﴾ هود:

الشَّدِيدُ الْكَبِيرُ. سِجِّيلٌ وَسِجِّينٌ، وَاللاَّمُ وَالنُّونُ أُخْتَانِ، وَقَالَ تَمِيمُ بْنُ مُقْبِلٍ:

وَرَجْلَةٍ يَضْرِبُونَ الْبَيْضَ ضَاحِيَةً... ضَرْبًا تَوَاصَى بِهِ الأَبْطَالُ سِجِّينَا

## ٢ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە عەرشی ئەو (خوا) لەسەر ئاو بوو)

**٤٦٨٤ - ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خوا ﷻ فەرموویەتی: (ئەی نەوەی ئادەم) [1] تۆ ببەخشە منیش پێت دەبەخشم ))، وە فەرمووی: ((دەستی خوا هەمیشە پڕە، بەخشین لێ کەم ناکاتەوە بەخۆڕەمیش شەو و ڕۆژ دەباری ودەبەخشێ))، وە فەرمووی: ((پێم بڵێن چەندی لێ کەم بۆتەوە لەوکاتەوەی ئاسمان و زەوی دروست کردووە؟ چونکە بەڕاستی ئەوە لەدەستی دایە هیچ کەمی نەکردووە وە عەرشی ئەو (خوا) لەسەر ئاوە، کێشانە و پێوەر بەدەستی خوایە، (هەرکەسی ویست) نزمی دەکات و (هەر کەسیشی ویست) بەرزی دەکات)).**

(١) ئەمە لە صەحیحی موسلیم دا هاتووە (٢٣٠٨).

﴿ أَعۡتَرَىٰكَ ﴾: لەسەر كێشی (افْتَعَلْتَ) یە لە (عَرَوْتُهُ) وەرگیراوە واتە: تووشم كردووە، دووچارم كردووە وە (يَعْرُوهُ) و (وَاعْتَرَانِي) ئەم دوو فیعلەش هەر لەوەوە وەرگیراون. ﴿ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآ ﴾: واتە: لە ناو موڵك ودەسەڵاتی ئەو دایە. ﴿ عَنِيدٍ ۝٥٩ ﴾: و (عَنُودٌ) و (عَانِدٌ) مانایان یەكە، كە بریتییە لە دوو پات كردنەوەی سەركەشی و لووت بەرزی. ﴿ وَيَقُولُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ ﴾: شایەتەكان[1] دەڵێن (الْأَشْهَادُ) كۆیە تاكەكەی (شَاهِدٌ)ـە لە سەركێشی (صَاحِبٍ) كە (أَصْحَابٍ) كۆیەكەیەتی. ﴿ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ ﴾[2]: كردوونی بە ئاوەدان كەرەوە (دەوترێت): (أَعْمَرْتُهُ الدَّارَ)، واتە: خانووەكەم پێدا تا لەژیان دایە (عُمْرَى) پێم دا بەدرێژایی تەمەنی. ﴿ نَكِرَهُمۡ ﴾: لەگەڵ (أَنْكَرَهُمْ) و (اسْتَنْكَرَهُمْ) بەیەك مانا دێن، نامۆ هاتنە پێش چاوی، لێیان ترسا. ﴿ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴾: (مَجِيدٌ) دەڵێی لەسەر كێشی (فَعِيلٌ)ـە لە (مَاجِدٍ)ـەوە[3] وەرگیرابێ (حَمِيدٌ): بەمانای (مَحْمُودٌ ((4) كە لە (حَمِدَ)ـەوە وەرگیراوە. (سِجِّيلٍ) (گڕكان وئاگر پژێنیكی) بەهێزی گەورە. وشەی: ﴿ سِجِّيلٍ ﴾: و (سِجِّينٌ) وپیتی (ل) وپیتی (ن) هەردووكیان خوشكی یەكترن، (چونكە هەردووكیان پیتی زیادەن وە دەگوڕدرێن بۆیەكتری)، تەمیمی كوڕی موقبیل لە هۆنراوەیەكدا دەڵێ:

وە (زۆر لە) پیادەیان لە چێشتەنگادا لە خودە (و سەرە) كان دەدەن
بەلێدانێك كە ئازایەتی بەهێز بەیەكتر دەڵێن

---

(١) لە فریشتە و پێغەمبەران و باوەڕداران.

(٢) هەندێك دەڵێن واتە: دەسەڵاتی پێدان ئاوەدانی بكەنەوە وفەرمانی پێكردن.

(٣) ماجد: واتە: گەورەی بەڕێز.

(٤) محمود: واتە سوپاس كراو.

## ٣ - بابٌ: ﴿وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗا ۝٨٤﴾ هود

﴿وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ ۝٨٤﴾ هود: إلى أَهْلِ مَدْيَنَ؛ لأَنَّ مَدْيَنَ بَلَدٌ، وَمِثْلُهُ ﴿وَسۡـَٔلِ ٱلۡقَرۡيَةَ ۝٨٢﴾ يوسف: وَاسْأَلِ العِيرَ يَعْنِي: أَهْلَ القَرْيَةِ وَأَصْحَابَ العِيرِ ﴿وَرَآءَكُمۡ ظِهۡرِيًّاۖ ۝٩٢﴾ هود: يَقُولُ: لَمْ تَلْتَفِتُوا إِلَيْهِ، وَيُقَالُ إِذَا لَمْ يَقْضِ الرَّجُلُ حَاجَتَهُ: ظَهَرْتَ بِحَاجَتِي وَجَعَلْتَنِي ظِهْرِيًّا، وَالظِّهْرِيُّ ههنا: أَنْ تَأْخُذَ مَعَكَ دَابَّةً أَوْ وِعَاءً تَسْتَظْهِرُ بِهِ. ﴿أَرَاذِلُنَا ۝٢٧﴾ هود: سُقَاطُنَا. ﴿إِجۡرَامِي ۝٣٥﴾ هود: هُوَ مَصْدَرٌ مِنْ أَجْرَمْتُ، وَبَعْضُهُمْ يَقُولُ: جَرَمْتُ. ﴿ٱلۡفُلۡكَ ۝٣٧﴾ هود: مُجْرَاهَا مَدْفَعُهَا وَهْوَ مَصدَرُ أَجْرَيْتُ، وَالْفَلَكُ: وَاحِدٌ وَهْيَ السَّفِينَةُ وَالسُّفُنُ. ﴿مُجۡرَاها ۝٤١﴾ هود: مِنْ جَرَتْ وَأَرْسَيْتُ حَبَسْتُ وَيُقْرَأُ: (مَرْسَاهَا) مِنْ رَسَتْ هِيَ، وَ هِيَ وَمُجْرِيهَا وَمُرْسِيهَا: مِنْ فُعِلَ بِهَا. الرَّاسِيَاتُ: ثَابِتَاتٌ.

## ٣ - باسێک: (وە (ناردمان ) بۆ (خەڵکی) مەدیەن شوعەیبی برایان)

**﴿وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ﴾: واتە: بۆخەڵکی مەدیەن، چونکە مەدیەن شارێکە. بە وێنەی: ﴿وَسۡـَٔلِ ٱلۡقَرۡيَةَ﴾: واتە: پرسیار لە خەڵکی شارەکە بکە (وَاسْأَلِ الْعِيرَ) پرسیار لە خەڵکی کاروانەکە بکە، واتە: خەڵکی شارەکەو خەڵکی کاروانەکە. ﴿وَرَآءَكُمۡ ظِهۡرِيًّاۖ﴾: دەڵێ: ئاوڕیان نەدایەوە بەلایدا وە ئەگەر کەسێك پێویستی کەسێك جێ بەجێ نەکات دەوترێت (ظَهَرْتَ بِحَاجَتِي وَجَعَلْتَنِي ظِهْرِيًّا)[1].وشەی (الظِهريُّ) ئالێرەدا ئەوەیە ئاژەڵێك یان دەفرێك لەگەڵ خۆت ببەیت (لەکاتێك پێویستت پێی بوو) دەری بخەی وبەکاری**

(١) واتە: پشتت کردە کارەکەی من و گوێت پێ نەدا، وە منت خستە پشتی خۆتە و گرنگیت پێ نەدام.

بێنیت[1].﴿ أَرَاذِلُنَا ﴾: سووك وڕیسواترینمان. ﴿ إِجْرَامِي ﴾[2] ئەم وشە چاوگە لە (أَجْرَمْتُ)[3]ـەوە وەرگیراوە، هەندێکی تر دەڵێن لە (جَرَمْتُ)ـەوە وەرگیراوە.﴿ ٱلْفُلْكَ ﴾:و (الفَلَك) مانایان یەکە واتە:کەشتیەك، کەشتیەکان[4] ﴿ مُجْرَاهَا ﴿٤١﴾ ﴾: ڕۆیشتنی کەشتیەکە (مجري) چاوگە بۆ (أَجْرَيْتُ) (وأرسَيتُ) ڕامگرت، وەستاندم، بە (مَرْساها)ـش دەخوێنرێتەوە واتە: کەشتێکە خۆی ڕۆیشت بەڵام (مُجريها) و (مُرسيها) لەوەوە هاتووە: کە ڕۆشتن و وەستانەکەی پێ کراوە[5]، (الرَّاسياتُ) (مەنجەڵی) دامەزراو و چەسپاو.

٤ - **بَابُ قَوْلِه**: ﴿ وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْۚ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ﴾ هود

وَاحِدُ الأَشْهَادِ: شَاهِدٌ، مِثْلُ: صَاحِبٍ وَأَصْحَابٍ.

## ٤ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە شایەتەکان[6] دەڵێن: ئا ئەوانە ئەو کەسانەن (لە دنیادا) درۆیان هەڵبەست بە ناوی پەروەردگاریانەوە، بێداربن نەفرینی خوا بۆ ستەمکارانە)

**تاکی (الأَشْهَاد) (شَاهِد)ـە وەك: (صَاحِب) لەگەڵ (أَصْحَاب)[7].**

٤٦٨٥ - حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ وَهِشَامٌ قَالاَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ قَالَ: بَيْنَا ابْنُ عُمَرَ يَطُوفُ إِذْ عَرَضَ رَجُلٌ فَقَالَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ -أَوْ

---

(١) بەڵام ئەو مانایە ناگونجێ (ظِهريا)ی لە ئایەتە قورئانیەکەدا پێ ماناکەیت بۆیە ئەو گێڕانەوە بە هێزە کە (ظهريا) ئا لێرەدای لە گەڵ نییە، کە گێڕانەوەی ئەبی زەڕ بۆ صەحیحی بوخاری.إرشاد الساري:١٠/٢٩٥..

(٢) تاوان و گوناهی خۆم.

(٣) (أجرمتُ) تاوانم کرد (جَرَمْتُ) تاوانم کرد.

(٤) (الفُلْك): کەشتێك، (الفَلَك) کەشتیەکان.

(٥) واتە: بکەر نادیارە ( مبني للمجهول).

(٦) لە فریشتەکان و پێغەمبەران و باوەڕداران.

(٧) (صاحب) تاکەو (أصحاب) کۆکەیەتی.

قَالَ يَا ابْنَ عُمَرَ - سَمِعْتَ النَّبِيَّ ﷺ فِي النَّجْوَى؟ فَقَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «يُدْنَى الْمُؤْمِنُ مِنْ رَبِّهِ -وَقَالَ هِشَامٌ يَدْنُو الْمُؤْمِنُ - حَتَّى يَضَعَ عَلَيْهِ كَنَفَهُ، فَيُقَرِّرُهُ بِذُنُوبِهِ: تَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ يَقُولُ: أَعْرِفُ، يَقُولُ: رَبِّ أَعْرِفُ -مَرَّتَيْنِ - فَيَقُولُ: سَتَرْتُهَا فِي الدُّنْيَا وَأَغْفِرُهَا لَكَ الْيَوْمَ - ثُمَّ تُطْوَى صَحِيفَةُ حَسَنَاتِهِ، وَأَمَّا الآخَرُونَ أَوِ الْكُفَّارُ فَيُنَادَى عَلَى رُءُوسِ الأَشْهَادِ: ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ ﴿١٨﴾ ﴾ هود: وَقَالَ شَيْبَانُ عَنْ قَتَادَةَ: حَدَّثَنَا صَفْوَانُ[1].

**٤٦٨٥ -صەفوانی کوڕی موحریز دەڵێ: لەکاتێکدا ئیبنو عومەر ﵄ تەواف دەکرد (لە کەعبەدا)، لە پڕ کابرایەك هاتە بەردەمی و وتی: ئەی ئەبو عەبدوڕەحمان -یان وتی: ئەی ئیبنو عومەر - دەربارەی چپەو سرتە چیت لە پێغەمبەر ﷺ بیستووە؟ (ئیبنو عومەر) ﵄ وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((باوەڕدار لە پەروەردگاری نزیك دەکرێتەوە -هیشام وتی باوەڕدار نزیك دەبێتەوە -هەتا (خوا) دایدەپۆشێت بە ڕەحمی خۆی، تاوای لێدەکات دان بە گوناهەکانیدا بنێت، (دەفەرمووی پێی): ئەو گوناهە دەزانیت و بیرت دێتەوە؟ دەڵێ: دەزانم -دووجار -دەڵێ: ئەی پەروەردگارم دەزانم، جاپەروەردگار دەفەرموێ: لەدونیا تاوانەکانتم بۆ پۆشیت، ئەمڕۆش لەتاوانەکانت خۆش دەبم، لە پاشان نامەی چاکەکانی دەپێچرێتەوە، بەڵام کەسانی تر -یان کافرەکان - بەدیار چاوی هەموو خەڵکەوە بانگ دەکرێن، (ئائەوانە ئەو کەسانەن (لە دونیادا) بەناوی پەروەردگاریانەوە درۆیان هەڵبەست).**

**- شەیبان دەڵێ:لە قەتادەوە گێڕایەوەو وتی: صەفوان بۆی گێڕاینەوە (فەرموودەکەی پێشوو دەگێڕێتەوە).**

(١) بڕوانە: ٢٤٤١.

٥ - **بابُ قوله:** ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾﴾ هود

﴿ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ ﴿٩٩﴾﴾ هود: العَوْنُ المُعِينُ. رَفَدْتُهُ: أَعَنْتُهُ ﴿تَرْكَنُوٓاْ ﴿١١٣﴾﴾ هود: تَمِيلُوا ﴿فَلَوْلَا كَانَ ﴿١١٦﴾﴾ هود: فَهَلَّا كَانَ ﴿أُتْرِفُواْ ﴿١١٦﴾﴾ هود: أُهْلِكُوا. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾﴾ هود: شَدِيدٌ وَصَوْتٌ ضَعِيفٌ.

## ٥ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (سزادانی پەروەردگارت ئابەو شێوەیە، کاتێ خەڵکی شارەکان سزا دەدات لە کاتێکدا ستەمکار بوون بەڕاستی تۆڵە سەندنی ئەو ئازاردەرو بەتینە)

**﴿ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ﴾: بەخشینی پێ بەخشراو، (رَفَدْتُهُ) یارمەتیم دا. ﴿تَرْكَنُوٓاْ﴾: پاڵ بدەن.﴿فَلَوْلَا كَانَ﴾: دەی باببوایە. ﴿أُتْرِفُواْ﴾: (خۆش ڕایان بوارد بۆیە) لەناو بران. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ. ﴿زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ﴾: (دەنگێکی) بەهێزو دەنگێکی لاواز.**

٤٦٨٦ - حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الْفَضْلِ، أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، حَدَّثَنَا بُرَيْدُ بْنُ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ لَيُمْلِي لِلظَّالِمِ حَتَّى إِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ». قَالَ ثُمَّ قَرَأَ ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾﴾ هود.

**٤٦٨٦ - ئەبو بوردە دەگێڕێتەوە لە ئەبی مووساوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی خوا مۆڵەتی ستەمکار دەدات تا کاتێ (سزای خوا) دەیگرێ بەهیچ جۆرێ ڕزگاری نابێت))، وتی: پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (سزادانی**

پەروەردگارت ئا بەو شێوەیە، كاتێ خەڵكی شارەكان سزا دەدات لە كاتێكدا ستەمكار بوون، بەڕاستی تۆڵە سەندنی ئەو ئازاردەر و بەتینە).

٦ - باب قَوْلِهِ: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾ هود:

﴿ وَزُلَفًا ﴿١١٤﴾ ﴾ هود: سَاعَاتٍ بَعْدَ سَاعَاتٍ، وَمِنْهُ سُمِّيَتِ الْمُزْدَلِفَةُ، الزُّلَفُ: مَنْزِلَةٌ بَعْدَ مَنْزِلَةٍ وَأَمَّا ﴿ زُلْفَىٰٓ ﴿٣٧﴾ ﴾ سبأ: فَمَصْدَرٌ مِنَ الْقُرْبَى، ازْدَلَفُوا: اجْتَمَعُوا ﴿ وَأَزْلَفْنَا ﴿٦٤﴾ ﴾ الشعراء: جَمَعْنَا.

## ٦ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (لەم سەرو ئەوسەری ڕۆژ و لە بەشێك لە شەودا نوێژ ئەنجام بدە، بێگومان (كردەوە) چاكەكان (كردەوە) خراپەكان لادەبەن ئەوە پەندو ئامۆژگاری یە بۆ پەندوەرگران)

﴿ وَزُلَفًا ﴾: كات وسات لە دوای كات وسات، موزدەلیفەش هەر لەمەوە ناونراوە بەموزدەلیفە[١] (الزّلف) واتە: شوێن لەپاش شوێن وسات لەدوای سات، بەڵام ﴿ زُلْفَىٰٓ ﴾: چاوگە بۆ نزیكتر (ازْدَلَفُوا) واتە: كۆبوونەوە. ﴿ وَأَزْلَفْنَا ﴾: واتە: كۆبووینەوە.

٤٦٨٧ - حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ -هُوَ ابْنُ زُرَيْعٍ - حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ التَّيْمِيُّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ أَنَّ رَجُلاً أَصَابَ مِنَ امْرَأَةٍ قُبْلَةً، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَأُنْزِلَتْ عَلَيْهِ ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِۚ إِنَّ

(١) چونكە خەڵكی دەچێت بۆ موزدەلیفە لەكاتی شەودا یان لەبەر نزیكیان لە یەكەوە.

ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾ هود: قَالَ الرَّجُلُ أَلِيَ هَذِهِ؟ قَالَ: «لِمَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ أُمَّتِي»[1].

**٤٦٨٧ -ئیبنو مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێ ماچێکی ئافرەتێکی کردبوو، ئەنجا هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وئەو کارەی بۆ باس کرد، ئەوسا ئەم ئایەتەی بۆ دابەزێنرا: (لەم سەرو ئەوسەری ڕۆژ و لەبەشێك لەشەودا نوێژ ئەنجام بدە، بێگومان کردەوە چاکەکان کردەوە خراپەکان لادەبەن ئەوە پەندو ئامۆژگاری یە بۆ پەند وەرگران)، پیاوەکە وتی: ئەمە هەر بۆ منە؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی (بۆهەر کەسێکە کاری پێ بکات لەئوممەتم)).**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١٢ - سورة يُوسُفَ عليه السلام

وقَالَ فُضَيْلٌ، عَنْ حُصيْنٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ: (مُتْكَأً) الأُتْرُجُ. قَالَ فُضَيْلٌ: الأُتْرُجُ بالْحَبَشِيَّةِ مُتْكًا. وَقَالَ ابن عُيَيْنَةَ عَنْ رَجُلٍ عَنْ مُجَاهِدٍ مُتْكًا كُلُّ شَيْءٍ قُطِعَ بِالسِّكِّينِ. وَقَالَ قَتَادَةُ ﴿ لَذُو عِلْمٍ ﴿٦٨﴾ ﴾ يوسف، عَامِلٌ بِمَا عَلِمَ. وَقَالَ ابن جُبَيْرٍ صُوَاعٌ مَكُّوكُ الفَارِسِيِّ الذِي يَلْتَقِي طَرَفَاهُ، كَانَتْ تَشْرَبُ بِهِ الأَعَاجِمُ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ تُفَنِّدُونِ ﴿٩٤﴾ ﴾ يوسف: تُجَهِّلُونِ. وَقَالَ غَيْرُهُ غَيَابَةٌ كُلُّ شَيء غَيَّبَ عَنْكَ شَيْئًا فَهْوَ غَيَابَةٌ. وَالْجُبُّ الرَّكِيَّةُ التِي لَمْ تُطْوَ. ﴿ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا ﴿١٧﴾ ﴾ يوسف: بِمُصَدِّقٍ. ﴿ أَشُدَّهُۥ ﴿٢٢﴾ ﴾ يوسف: قَبْلَ أَنْ يَأْخُذَ فِي النُّقْصَانِ،

(١) بڕوانە: ٥٢٦.

يُقَالُ بَلَغَ أَشُدَّهُ وَبَلَغُوا أَشُدَّهُمْ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: وَاحِدُهَا شَدٌّ، وَالْمُتَّكَأُ مَا اتَّكَأْتَ عَلَيْهِ لِشَرَابٍ أَوْ لِحَدِيثٍ أَوْ لِطَعَامٍ. وَأَبْطَلَ الذِي قَالَ الأُتْرُجُّ، وَلَيْسَ فِي كَلَامِ العَرَبِ الأُتْرُجُّ، فلَمَّا احْتُجَّ عَلَيْهِمْ بِأَنَّهُ المُتَّكَأُ مِنْ نَمَارِقَ فَرُّوا إلى شَرٍّ مِنْهُ، فَقَالُوا إِنَّمَا هُوَ المُتْكُ سَاكِنَةَ التَّاءِ، وَإِنَّمَا المُتْكُ طَرَفُ البَظْرِ وَمِنْ ذَلِكَ قِيلَ لَهَا مَتْكَاءُ وَابْنُ المَتْكَاءِ، فَإِنْ كَانَ ثَمَّ أُتْرُجٌّ فَإِنَّهُ بَعْدَ المُتَّكَإِ. ﴿ شَغَفَهَا ﴿٣٠﴾ ﴾ يوسف: يُقَالُ إِلَى شِغَافِهَا وَهْوَ غِلَافُ قَلْبِهَا، وَأَمَّا شَعَفَهَا فَمِنَ المَشْعُوفِ. ﴿ أَصْبُ ﴿٣٣﴾ ﴾ يوسف: أَمِيلُ. ﴿ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ ﴿٤٤﴾ ﴾ يوسف: مَا لَا تَأْوِيلَ لَهُ، وَالضِّغْثُ مِلْءُ اليَدِ مِنْ حَشِيشٍ وَمَا أَشْبَهَهُ، وَمِنْهُ ﴿ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا ﴿٤٤﴾ ﴾ ص: لَا مِنْ قوله: ﴿ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ ﴿٤٤﴾ ﴾ يوسف: وَاحِدُهَا ضِغْثٌ ﴿ وَنَمِيرُ ﴿٦٥﴾ ﴾ يوسف: مِنَ المِيرَةِ ﴿ وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ﴿٦٥﴾ ﴾ يوسف: مَا يَحْمِلُ بَعِيرٌ. ﴿ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ ﴿٦٩﴾ ﴾ يوسف: ضَمَّ إِلَيْهِ، السِّقَايَةُ: مِكْيَالٌ. ﴿ تَفْتَؤُا ﴿٨٥﴾ ﴾ يوسف: لَا تَزَالُ

﴿ حَرَضًا ﴿٨٥﴾ ﴾ يوسف: مُحْرَضًا، يُذِيبُكَ الهَمُّ.

﴿ فَتَحَسَّسُوا ﴿٨٧﴾ ﴾ يوسف: تَخَبَّرُوا ﴿ مُّزْجَىٰةٍ ﴿٨٨﴾ ﴾ يوسف: قَلِيلَةٍ ﴿ غَٰشِيَةٌ مِّنْ عَذَابِ ٱللَّهِ ﴿١٠٧﴾ ﴾ يوسف:

عَامَّةٌ مُجَلِّلَةٌ.

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٢ - (تەفسیری) سورەتی یوسف ﷺ

- فوزەیل گێڕاویەتیەوە لەحوصینەوە ئەویش لە موجاهیدەوە دەڵێ: (مُتْكَأً) نارنجە. فوزەیل دەڵێ: نارنج بە زمانی حەبەشی پێی دەڵێن: (مُتْكَأً). ئیبنو عویەینە دەگێڕێتەوە لە پیاوێکەوە ئەویش لە موجاهیدەوە دەڵێ: (مُتْكَأً): هەر میوەیەکە بە چەقۆ لەت بکرێت. قەتادە دەڵێ: ﴿لَذُو عِلْمٍ﴾: کەسێك کاربکات بەوەی زانایە پێی. ئیبنوجوبەیر دەڵێ: (صُواعٌ) مەککوکە بەفارسی هەردوولای دەگاتەوە بەیەك و فارسەکان ئاوی پێ دەخۆنەوە (بەکوردی پێی دەوترێت: مەن)[١]. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿تُفَنِّدُونِ﴾: بەخەڵفاو بێ عەقڵم دانێن. جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ:غَيَابَةٌ: هەر شتێك شتێك لە تۆ بشارێتەوە ئەوە غەیابەیە. (الجُبُّ) بیرێکە بە بەرد و شتی وا هەڵنەبەسترابێت.﴿بِمُؤْمِنٍ لَّنَا﴾: باوەڕکردن ومتمانە (بەئێمە). ﴿أَشُدَّهُۥ﴾: پێش ئەوەی دەست بەناتەواوی بکات دەوترێ (بَلَغَ أَشُدَّهُ)[٢] (وَبَلَغُوا أَشُدَّهُمْ)[٣] وە هەندێك لە زانایان دەڵێن: تاکی (أَشُدَّهُ) وشەی (شَدٌّ)ـە [٤]

وە (الْمُتَّكَأُ): ئەو شتەیە پاڵی پێوە دەدەیت بۆ خواردنەوە و خواردن و قسەکردن، وە ئەو قسەی پوچەڵ کردەوە کەدەڵێ: (الْمُتَّكَأُ) بەمانای (الأُتْرُجُّ)ـە چونکە لە زمانی عەرەبی دا وشەی (الأُتْرُجُّ) نییە، جا کاتێ بەڵگەیان لەسەر هێنرایەوە کە (الْمُتَّكَأُ) جۆرێکە لە پشتی، ڕایان کرد بۆشتێکی خراپتر لەوەی

---

(١) جامێك بووە پادشا ئاوی پێ خواردۆتەوە، دواتر کراوە بە پێوانە و خواردەمەنی پێ پێوراوە. إرشاد الساري:٣٠١/١٠.

(٢) بەکەماڵ گەیشت یا بەهێز و توانای خۆی گەیشت.

(٣) بەهێزو توانای خۆیان گەیشتن، کەواتە بۆ تاك و کۆ هەمان وشە بەکاردەهێنرێ.

(٤) کەواتە (اشد) کۆیە (شد) تاکەکەیەتی.

پێشوو وتیان: (المُتْكُ) بە ساكن كردنی تایەكەیە، وە بەراستی (المُتْكُ) فەراغی قیتكەیە، لەبەر ئەوەشە بەئافرەت وتراوە: (مَتْكَاءُ وَابْنُ المَتْكَاءِ) خەتەنە نەكراو وكوڕی ئافرەتی خەتەنە نەكراو[١]، جا ئەگەر لەوێ نارنج هەبێت ئەو پاش خواردن و پاڵدانەوەیە.

﴿ شَغَفَهَا ﴾: دەوترێ (إِلَى شِغَافِهَا) كە بریتییە لە پەردەی دڵی ئافرەتەكە، بەڵام (شعَفَهَا)[٢] ئەوە لە (المَشْعُوفِ)ـەوە وەرگیراوە (واتە:لەخۆشەویستی ئەو ئافرەتە بۆ یوسف دڵی سووتاوە). ﴿ أَصْبُ ﴾: بۆلای دەچم، دڵم بۆ لای دەڕوات. ﴿ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ ﴾: ئەو خەو بینینەی خەو پەرژینی نییە و ناكرێ. (الضِّغْثُ) چەپكێ لەگژوگیاو شتێ لەو جۆرە، هەر لەم مانایە ئەمەی لەم ئایەتەدا هاتووە. ﴿ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا ﴾: واتە: چەپكێ شووڵ بە دەستەوە بگرە ئەم ئایەتە لەگەڵ:

﴿ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ ﴾: ماناكەیان جیایە و یەك نییە، كە بەمانای خەوی تێكەڵ و پێكەڵە وشەی (أَضْغَاثُ) كۆیە و تاكەكەی (ضغث)ـە. ﴿ وَنَمِيرُ ﴾: لە (المِيرَةِ)ـەوە هاتووە واتە: خۆراك. ﴿ وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ﴾: ئەوەندەی وشترێك هەڵی بگرێت. ﴿ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ ﴾: بردیە لای خۆی. (السِّقَايَةُ): پێوانەكە. ﴿ تَفْتَؤُاْ ﴾: بەردەوام، هەمیشە. ﴿ حَرَضًا ﴾: تاخەفەت خواردن دەتپوكێنێتەوە[٣]. ﴿ فَتَحَسَّسُواْ ﴾: بڕۆن هەواڵ بزانن. ﴿ مُّزْجَىٰةٍ ﴾: كەم. ﴿ غَٰشِيَةٌ مِّنْ عَذَابِ ٱللَّهِ ﴾: سزایەكی گشتی داپۆشەر.

---

(١) واتە: دایكی خەتەنە نەكراوە.

(٢) (شعَفَهَا) لە خوێندنەوەیەكی شازدا هاتووە.

(٣) (حرضاً) واتە: نزیك بوونەوە لە مەرگ، كەسێك گەیشتۆتە سەرەمەرگ و گیانەڵا.

١ - بابُ قوله: ﴿وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ ۝٦﴾ يوسف:

٤٦٨٨ - وَقَالَ حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْكَرِيمُ بْنُ الْكَرِيمِ بْنِ الْكَرِيمِ بْنِ الْكَرِيمِ يُوسُفُ بْنُ يَعْقُوبَ بْنِ إِسْحَاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ»[1].

## ١-باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە بەهرەی خۆی تەواو دەکات بۆت، وە بۆ بنەماڵەی یەعقوب هەرچۆنێ تەواوی کرد بۆ هەردوو باپیرەت لە پێشدا کە ئیبراهیم و ئیسحاقن)

**٤٦٨٨ - عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بەڕێزترین کەسی کوڕی بەڕێزترین کەسی کوڕی بەڕێزترین کەسی کوڕی بەڕێزترین کەس یوسفی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە عليهم السلام)).**

٢ - بابُ قوله: ﴿۞ لَّقَدْ كَانَ فِى يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ ۝٧﴾ يوسف:

٤٦٨٩ - حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَيُّ النَّاسِ أَكْرَمُ؟ قَالَ: «أَكْرَمُهُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاهُمْ». قَالُوا: لَيْسَ عَنْ هَذَا نَسْأَلُكَ. قَالَ: «فَأَكْرَمُ النَّاسِ يُوسُفُ نَبِيُّ اللَّهِ ابْنُ نَبِيِّ اللَّهِ ابْنِ نَبِيِّ اللَّهِ ابْنِ خَلِيلِ اللَّهِ». قَالُوا لَيْسَ عَنْ هَذَا نَسْأَلُكَ. قَالَ: «فَعَنْ مَعَادِنِ الْعَرَبِ تَسْأَلُونِي؟». قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ: «فَخِيَارُكُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُكُمْ فِي الإِسْلَامِ إِذَا فَقِهُوا». تَابَعَهُ أَبُو أُسَامَةَ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ[2].

---

(١) بروانە: ٣٣٨٢.

(٢) بروانە: ٣٣٥٣.

## ٢-باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (سوێند بەخوا لەبەسەرهاتی یوسف و براکانیدا پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ پرسیارکەران)

٤٦٨٩ -ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا بەرێزترین کەس کێیە؟ فەرمووی: ((بەرێزترینیان لای خوا پارێزگارتینیانە)) وتیان: لەو بارەیەوە پرسیارت لێ ناکەین، فەرمووی: ((دەی بەرێزترین کەس یوسفی پێغەمبەری خوای کوڕی پێغەمبەری خوای کوڕی پێغەمبەری خوای کوڕی خۆشەویستی خوایە)) [1]. وتیان: پرسیاری ئەوەشت لێ ناکەین فەرمووی: ((کەواتە دەربارەی ئەسڵ و بنەچەی عەرەب پرسیارم لێ دەکەن؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (( چاکترینتان لە نەفامیدا چاکترینتانە لە ئیسلام دا ئەگەر شارەزا و تێگەیشتوو بن لە ئیسلام)).

-ئەبو ئوسامە لەعوبەیدوڵلاوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عەبدەی کردووە.

٣ - **بابُ قولِه:** ﴿قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ﴿١٨﴾﴾ يوسف

﴿سَوَّلَتْ ﴿١٨﴾﴾ يوسف: زَيَّنَتْ.

## ٣-باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وتی بەڵکو دڵ و دەروونی خۆتان ئەم کارە (ناپەسەندەی)ـی بۆ ئاسان و جوان کردوون، (وتی: جا ئارام دەگرم) بە ئارام گرتنێکی چاک و پەسەند)

﴿سَوَّلَتْ﴾: جوانی کردووە.

---

(١) مەبەست پێی ئیبراهیمە ﷺ.

٤٦٩٠ - حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ. قَالَ: وَحَدَّثَنَا الْحَجَّاجُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ النُّمَيْرِيُّ، حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ يَزِيدَ الأَيْلِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ سَمِعْتُ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ وَسَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ وَعَلْقَمَةَ بْنَ وَقَّاصٍ وَعُبَيْدَ اللهِ بْنَ عَبْدِ اللهِ، عَنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ قَالَ لَهَا أَهْلُ الإِفْكِ مَا قَالُوا فَبَرَّأَهَا اللهُ، كُلٌّ حَدَّثَنِي طَائِفَةً مِنَ الْحَدِيثِ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُكِ اللهُ، وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِي اللهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ». قُلْتُ: إِنِّي وَاللهِ لاَ أَجِدُ مَثَلاً إِلاَّ أَبَا يُوسُفَ ﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ يوسف، وَأَنْزَلَ اللهُ ﴿ إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ ﴿١١﴾ ﴾ النور. الْعَشْرَ الآيَاتِ[1].

**٤٦٩٠ -زوهری وتی[2]: بیستم لە هەریەك لە: عوروەی كوڕی زوبەیر و سەعیدی كوڕی موسەییەب عەلقەمەی كوڕی وەققاص و عوبەیدوڵڵای كوڕی عەبدوڵڵا دەربارەی فەرموودەكەی عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ كاتێ خەڵكە بوختان چیەكان ئەو قسە نابەجێیەیان پی وتبوو كەوتبوویان، ئەنجا خوا پاكێتی ئەو (عائیشە)ی دەرخست، هەر یەك لەو كەسانە بەشێك لە فەرموودەكەیان بۆ گێڕامەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر تۆ (عائیشە) بێ تاوان بیت ئەوە بێگومان خوا بێ تاوانیت ڕوون دەكاتەوە، خۆ ئەگەر تاوانێكیشت كردووە[3] ئەوە داوای لێخۆش بوون لە خوا بكە و پەشیمان بەرەوە))، وتم: وەڵڵاهی من نموونەیەكم دەست ناكەوێ (لەوەی من و ئێوە بچێت)، جگە لە باوكی یوسف ﵇ (كە خودا دەفەرموێ)، (جا ئارام دەگرم بە ئارام گرتنێكی چاك و پەسەند، خواش یارمەتی دەرمە لەسەر ئەوەی ئێوە باسی**

---

(١) بڕوانە: 2593.

(٢) ئەم فەرموودەیە بە دوو ڕێگە و سەنەد گێڕدراوەتەوە هەردوو ڕێگاكە دەچێتەوە سەر ئیبن و شیهابی زوهری.

(٣) كە یەكەم جارە بیكەت و عادەتت پێوە نەگرتووە.

دەکەن) خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند، (بێگومان کەسانێ کە ئەو بوهتانەیان ( بۆ عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ هەڵبەست کۆمەڵێك بوون) تاکۆتایی دە ئایەتەکە.

٤٦٩١ - حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مَسْرُوقُ بْنُ الأَجْدَعِ قَالَ حَدَّثَتْنِي أُمُّ رُومَانَ -وَهْيَ أُمُّ عَائِشَةَ - قَالَتْ بَيْنَا أَنَا وَعَائِشَةُ أَخَذَتْهَا الْحُمَّى، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَعَلَّ فِي حَدِيثٍ تُحُدِّثَ». قَالَتْ: نَعَمْ وَقَعَدَتْ عَائِشَةُ قَالَتْ مَثَلِي وَمَثَلُكُمْ كَيَعْقُوبَ وَبَنِيهِ ﴿قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾﴾ يوسف.

٤٦٩١ -مەسروقی کوڕی ئەجدەع وتی: ئومو رۆمان - کە دایکی عائیشەیە - بۆی گێڕامەوە و وتی: لەکاتێکدا من وعائیشە پێکەوە بووین تای لێهات، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (( لەوانەیە بەهۆی ئەو قسە و قسەلۆکەوە بێت باس دەکرێ؟)) (ئومو رۆمان) وتی: بەڵێ عائیشە دانیشت وتی نموونەی من و ئێوە وەك یەعقوب و کوڕەکانی وایە (فەرمووی بەڵکو دڵ و دەروونتان ئەم کارە (ناپەسەندە)ی بۆ ئاسان و جوان کردوون، (وتی: جا ئارام دەگرم) بە ئارام گرتنێکی چاك و پەسەند، خواش یارمەتی دەرمە لەسەر ئەوەی ئێوە باسی دەکەن).

## ٤ - بابُ قوله: ﴿وَرَٰوَدَتْهُ ٱلَّتِى هُوَ فِى بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلْأَبْوَٰبَ وَقَالَتْ هَيْتَ ﴿٢٣﴾﴾ يوسف

وَقَالَ عِكْرِمَةُ: ﴿هَيْتَ لَكَ ﴿٢٣﴾﴾ يوسف:بِالْحَوْرَانِيَّةِ هَلُمَّ.وَقَالَ ابن جُبَيْرٍ: تَعَالَهْ.

# ٤-باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەو ئافرەتەی یوسف ﷺ لە ماڵیدا بوو دەست تێکەڵاوی لە یوسف ویست و هەموو دەرگاکانی داخست وتی وەرە پێشەوە بە پەلە بۆ ئەوەی بۆت ئامادەیە)

- عیکریمە دەڵێ: ﴿ هَيْتَ لَكَ ﴾: بەزمانی حەورانی: وەرە پێشەوە، ئادەی وەرە. ئیبنو جوبەیر دەڵێ: واتە وەرە.

٤٦٩٢ - حَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: ﴿ هَيْتَ لَكَ ﴿٢٣﴾ ﴾ يوسف: قَالَ وَإِنَّمَا نَقْرَؤُهَا كَمَا عُلِّمْنَاهَا ﴿ مَثْوَنهُ ﴿٢١﴾ ﴾ يوسف: مُقَامُهُ ﴿ وَأَلْفَيَا ﴿٢٥﴾ ﴾ يوسف: وَجَدَا ﴿ أَلْفَوْا ءَابَآءَهُمْ ﴿٦٩﴾ ﴾ الصافات: ﴿ أَلْفَيْنَا ﴿١٧٠﴾ ﴾ البقرة: وَعَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﴿ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ الصافات:

٤٦٩٢ -ئەبو وائیل دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: ﴿ هَيْتَ لَكَ ﴾: وتی بێگومان بەو شێوە دەیخوێنینەوە کە فێرکراوین.﴿ مَثْوَنهُ ﴾: جێگاو شوێنی مانەوەی.﴿ وَأَلْفَيَا ﴾: هەردووکیان توشی بوون، پێی گەیشتن. ﴿ أَلْفَوْا ءَابَآءَهُمْ ﴾: [1] ﴿ أَلْفَيْنَا ﴾: [2] وە ئیبنو مەسعوود ﷺ ئەم ئایەتەی بەم شێوە خوێندوەتەوە: ﴿ بَلْ عَجِبْتُ [3] وَيَسْخَرُونَ ﴾

(١) واتە: بە باو باپیرانی خۆیان گەیشتون و بینیویانن.

(٢) دیوومانە، زانیومانە، پێی گەیشتووین.

(٣) جەماوەری قورئان خوێنان بەم شێوە خوێندویانەتەوە (عَجِبْتَ) کەسائی و خەلەف بە (عَجِبْتُ) خوێندویانەتەوە. بڕوانە ، إرشاد الساري، ٣٦١/١٠.

٤٦٩٣ - حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ قُرَيْشًا لَمَّا أَبْطَئُوا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِالإِسْلاَمِ قَالَ: «اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِسَبْعٍ كَسَبْعِ يُوسُفَ» فَأَصَابَتْهُمْ سَنَةٌ حَصَّتْ كُلَّ شَيْءٍ حَتَّى أَكَلُوا الْعِظَامَ حَتَّى جَعَلَ الرَّجُلُ يَنْظُرُ إِلَى السَّمَاءِ فَيَرَى بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا مِثْلَ الدُّخَانِ، قَالَ اللَّهُ: ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ ﴾ الدخان: قَالَ اللَّهُ ﴿ إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًاۚ إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ ﴾ الدخان أَفَيُكْشَفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ وَقَدْ مَضَى الدُّخَانُ وَمَضَتِ الْبَطْشَةُ[1].

**٤٦٩٣ -عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە: کاتێ کە قوڕەیشیەکان دواکەوتن لە (شوێن کەوتنی) پێغەمبەر ﷺ بەمسوڵمان بوونیان پێغەمبەر ﷺ (دوعای لێکردوون و) فەرمووی: ((خودایە بژێوییان نەهێڵی وحەوت ساڵی قات وقڕییان لەسەر دابنێ وەك حەوت ساڵەکەی سەردەمی یوسف ﷺ))، جا قات وقڕییەکیان تووش بوو هەموو شتێکی لەناوبرد (هیچیان نەما) هەتا ئێسقانیان دەخوارد، هەتا کەسی وایان هەبوو سەیری ئاسمانی دەکرد وای دەزانی لە نێوان ئەو ئاسماندا دوکەڵ هەیە، خوا فەرمووی: (جا چاوەڕوان بە ڕۆژی ئاسمان دوکەڵێکی ئاشکرای لێ پەیدا دەبێ)، خوا دەفەرموێ: (ئێمە بۆ ماوەیەکی کەم ئەم بەڵایەیان لەسەر لادەبەین، بێگومان ئێوە دەگەڕێنەوە (بۆ بێ باوەڕی) ) دەی ئایا لە ڕۆژی دواییدا بەڵاو سزاکەیان لەسەر لادەبردرێت؟ بێگومان دوکەڵەکە تێپەڕی توڵە (گەورە)کەش تێپەڕی و بەدوویدا.**

(١) بڕوانە: ١٠٠٧.

**٥ - بابُ قوله:** ﴿فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ ﴿٥٠﴾ قَالَ مَا خَطۡبُكُنَّ إِذۡ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفۡسِهِۦۚ قُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ ﴿٥١﴾﴾ **يوسف.**

﴿حَٰشَ ﴿٥١﴾﴾ يوسف و﴿حَاشَى﴿٥١﴾﴾ يوسف: تَنْزِيهٌ وَاسْتِثْنَاءٌ ﴿حَصۡحَصَ﴿٥١﴾﴾ يوسف: وَضَحَ.

## ٥ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (جا کاتێ نێردراوەکە(ی پادشا) هاتە لای (یوسف) وتی: بگەڕێوە بۆ لای گەورەکەت (پادشاکەت) ئەوسا پرسیاری لێ بکە هۆی چی بوو کە ئەو ژنانە دەستی خۆیانیان بڕی، بێگومان پەروەردگارم بە پیلانی ئەو ژنانە ئاگادارو زانایە (پاشا) وتی: (بەژنەکان) مەبەستان چی بوو کاتێ ویستتان یوسف ﷺ بخەڵەتێنن و کاری خراپی پێ بکەن، (ژنەکان) وتیان: پاکو بێگەردی بۆ خوا)

**﴿حَٰشَ﴾: و ﴿حَاشَى﴿٥١﴾﴾: پاك و بێگەردی و بەدوورگرتنە و هەڵاواردنە (لەخراپە). ﴿حَصۡحَصَ﴾: ڕوون بوویەوە، ئاشكرا بوو.**

٤٦٩٤ - حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ تَلِيدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الْقَاسِمِ، عَنْ بَكْرِ بْنِ مُضَرَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ يُونُسَ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَأَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَرْحَمُ اللَّهُ لُوطًا، لَقَدْ كَانَ يَأْوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ، وَلَوْ لَبِثْتُ فِي السِّجْنِ مَا لَبِثَ يُوسُفُ لأَجَبْتُ الدَّاعِيَ، وَنَحْنُ أَحَقُّ مِنْ إِبْرَاهِيمَ إِذْ قَالَ لَهُ: ﴿أَوَلَمۡ تُؤۡمِنۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِي ﴿٢٦٠﴾﴾ البقرة»[1].

---

(١) بروانە: ٣٣٧٢.

٤٦٩٤ -ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((رەحمەتی خوا لە لووت بێت، سوێند بەخوا بەڕاستی ئەو (لەتەنگانەدا) پەنای برد بۆپەناگایەکی بەهێز (کە خوایە)، وە ئەگەر ئەو ماوە درێژەی یوسف لەزینداندا مایەوە من بمابایەمەوە دەڕۆیشتم بەدەم بانگەرەکەوە، وە ئێمە لە پێشترین لە ئیبراهیم (بەدڵنیاکردنەوە لە زیندوو بوونەوە) کاتێ فەرمووی: (ئەی پەروەردگارم نیشانم بدە چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە؟ خواش پێی فەرموو: (ئایا بڕوات پێی نەهێناوە؟ فەرمووی: بەڵێ بڕوام پێ یەتی بەلاّم (ئەمەوێ ببینم) بۆ ئەوەی دڵنیابم).

## ٦ - باب قوله تعالى: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ ﴿١١٠﴾ ﴾ يوسف

٤٦٩٥ - حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ لَهُ وَهُوَ يَسْأَلُهَا عَنْ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ ﴿١١٠﴾ ﴾ يوسف. قَالَ: قُلْتُ: أَكُذِبُوا أَمْ كُذِّبُوا؟ قَالَتْ عَائِشَةُ: كُذِّبُوا. قُلْتُ: فَقَدِ اسْتَيْقَنُوا أَنَّ قَوْمَهُمْ كَذَّبُوهُمْ فَمَا هُوَ بِالظَّنِّ قَالَتْ: أَجَلْ لَعَمْرِي لَقَدِ اسْتَيْقَنُوا بِذَلِكَ. فَقُلْتُ لَهَا: وَظَنُّوا أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا قَالَتْ: مَعَاذَ اللَّهِ لَمْ تَكُنِ الرُّسُلُ تَظُنُّ ذَلِكَ بِرَبِّهَا. قُلْتُ: فَمَا هَذِهِ الآيَةُ؟ قَالَتْ: هُمْ أَتْبَاعُ الرُّسُلِ الَّذِينَ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَصَدَّقُوهُمْ، فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْبَلاَءُ، وَاسْتَأْخَرَ عَنْهُمُ النَّصْرُ حَتَّى اسْتَيْأَسَ الرُّسُلُ مِمَّنْ كَذَّبَهُمْ مِنْ قَوْمِهِمْ وَظَنَّتِ الرُّسُلُ أَنَّ أَتْبَاعَهُمْ قَدْ كَذَّبُوهُمْ جَاءَهُمْ نَصْرُ اللَّهِ عِنْدَ ذَلِكَ[1].

(١) بڕوانە: ٣٣٨٩.

## ٦ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (هەتا کاتێ پێغەمبەران نا ئومێد بوون (لەسەرکەوتن) )

٤٦٩٥ - ئیبنو شیهاب دەڵێ: عوروەی کوڕی زوبەیر گێڕایەوە لە عائیشەوە ﷺ بە عوروەی وت: لەکاتێکدا پرسیاری لە عائیشە ﷺ دەکرد دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (هەتا کاتێ پێغەمبەران نائومێد بوون (لەسەرکەوتن) )، عوروە دەڵێ:وتم: ئایا بە (كُذِبُوا) دەخوێنرێتەوە یان بە (كُذِّبُوا)[1]؟ عائیشە وتی: بە (كُذِّبُوا) دەخوێنرێتەوە (وانیەکە تۆ گومانت بۆی چووە)، منیش وتم: سوێند بەخوا پێغەمبەران دڵنیابوون کە گەلەکەیان باوەڕیان پێ نەکردوون، کەواتە ئەوە گومان نەبوو، (عائیشە) وتی: بەڵێ سوێند بەخوا بەڵنیاییەوە (پێغەمبەران لەوە دڵنیابوون منیش پێم وت: (پێغەمبەران) گومانیان وا بردبێ (بەڵێنێ پێیان دراوە) لەگەڵیاندا بەجێ نەهێنراوە؟ (عائیشە) وتی: پەنا بەخوا هەرگیز پێغەمبەران ﷺ ئەو جۆرە گومانە بە پەروەردگاریان نابەن، وتم: دەی کەواتە مەبەست لەم ئایەتە چییە؟ (عائیشە) وتی: ئەوانە شوێنکەوتوانی پێغەمبەرانن ئەو کەسانەن کەباوەڕیان بەپەروەردگاریان هێناوە پێغەمبەریان بەڕاست زانیوە، بەڵام بەڵا و تاقیکردنەوەیان درێژەی کێشاوە و سەرکەوتنیان داوکەوتووە، هەتا پێغەمبەرانیان بێ هیوا بوون لەو کەسانەی کە باوەڕیان پێی نەهێناون لەگەڵەکەیان. وە پێغەمبەرەکانیان گومانیان برد کە شوێن کەوتوانیان باوەڕیان پێیان نییە، ئا لەو کاتەدا سەرکەوتنی خوایان بۆ هاتووە (و سەرکەوتوون) ).

---

(١) ئەم وشە لە ئایەتەکەدا هاتووە بەکام جۆرەیان دەخوێنرێتەوە (وَظَنُّوا أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا).

٤٦٩٦ - حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ فَقُلْتُ لَعَلَّهَا ﴿ كُذِبُوا ﴿١١٠﴾ ﴾ يوسف: مُخَفَّفَةً. قَالَتْ: مَعَاذَ اللهِ[1].

**٤٦٩٦ -زوهری دەڵێ: عورووە بۆی گێڕامەوە دەڵێ: وتم (بە عائیشە) لەوانەیە: (كُذِبُوا) بێت، وتی: پەنا دەگرم بە خوا ئیتر فەرموودەكەی وەكو فەرموودەكەی پێشوو هێنا.**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ١٣ - سورة الرَّعْد

وقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ ﴿١٤﴾ ﴾ الرعد: مَثَلُ الْمُشْرِكِ الذِي عَبَدَ مَعَ اللهِ إِلَهًا غَيْرَهُ كَمَثَلِ العَطْشَانِ الذِي يَنْظُرُ إِلَى خَيَالِهِ فِي المَاءِ مِنْ بَعِيدٍ، وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يَتَنَاوَلَهُ وَلَا يَقْدِرُ. وَقَالَ غَيْرُهُ:

﴿وَسَخَّرَ ﴿٢﴾ ﴾ الرعد: ذَلَّلَ. ﴿مُّتَجَٰوِرَٰتٌ ﴿٤﴾ ﴾ الرعد: مُتَدَانِيَاتٌ. ﴿ٱلْمَثُلَٰتُ ﴿٦﴾ ﴾ الرعد: وَاحِدُهَا مَثُلَةٌ وَهِيَ الأَشْبَاهُ وَالأَمْثَالُ، وَقَالَ:﴿ إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوْا ﴿١٠٢﴾ ﴾ يونس: ﴿ بِمِقْدَارٍ ﴿٨﴾ ﴾ الرعد: بِقَدَرٍ ﴿ مُعَقِّبَٰتٌ ﴿١١﴾ ﴾ الرعد: مَلَائِكَةٌ حَفَظَةٌ تُعَقِّبُ الأُولَى مِنْهَا الأُخْرى، وَمِنْهُ قِيلَ العَقِيبُ. يُقَالُ عَقَّبْتُ فِي إِثْرِهِ، ﴿ المِحالُ﴿١٣﴾ ﴾ الرعد: العُقُوبَةُ. ﴿ كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ ﴿١٤﴾ ﴾ الرعد: لِيَقْبِضَ عَلَى المَاءِ. ﴿رَّابِيًا ﴿١٧﴾ ﴾ الرعد مِنْ رَبَا يَرْبُو. ﴿ أَوْ مَتَٰعٍ زَبَدٌ ﴿١٧﴾ ﴾ الرعد: المَتَاعُ مَا تَمَتَّعْتَ بِهِ. ﴿ جُفَآءً ﴿١٧﴾ ﴾ **الرعد:**

(١) بروانە: ٣٣٨٩.

أَجْفَأَتِ القِدْرُ إِذَا غَلَتْ فَعَلَاهَا الزَّبَدُ، ثُمَّ تَسْكُنُ فَيَذْهَبُ الزَّبَدُ بِلَا مَنْفَعَةٍ، فَكَذَلِكَ يُمَيِّزُ الحَقَّ مِنَ البَاطِلِ. ﴿ٱلْمِهَادُ ١٨﴾ الرعد: الفِرَاشُ. ﴿وَيَدْرَءُونَ ٢٢﴾ الرعد: يَدْفَعُونَ دَرَأْتُهُ دَفَعْتُهُ.﴿سَلَٰمٌ عَلَيْكُم ٢٤﴾ الرعد: أي يَقُولُونَ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ. ﴿وَإِلَيْهِ مَتَابِ ٣٠﴾ الرعد: تَوْبَتِي.﴿أَفَلَمْ يَاْيْـَٔسِ ٣١﴾ الرعد: لَمْ يَتَبَيَّنْ.﴿قَارِعَةٌ ٣١﴾ الرعد: دَاهِيَةٌ. ﴿فَأَمْلَيْتُ ٣٢﴾ الرعد: أَطَلْتُ مِنَ المَلِيِّ وَالْمُلَاوَةُ وَمِنْهُ ﴿مَلِيًّا ٤٦﴾ مريم: وَيُقَالُ لِلْوَاسِعِ الطَّوِيلِ مِنَ الأَرْضِ مَلًى مِنَ الأَرْضِ. ﴿أَشَقُّ ٣٤﴾ الرعد: أَشَدُّ مِنَ المَشَقَّةِ ﴿مُعَقِّبَ ٤١﴾ الرعد: مُغَيِّرٌ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿مُّتَجَٰوِرَٰتٌ ٤﴾ الرعد: طَيِّبُهَا، وَخَبِيثُهَا السِّبَاخُ، ﴿صِنْوَانٌ ٤﴾ الرعد: النَّخْلَتَانِ أَوْ أَكْثَرُ فِي أَصْلٍ وَاحِدٍ ﴿وَغَيْرُ صِنْوَانٍ ٤﴾ الرعد: وَحْدَهَا ﴿بِمَآءٍ وَٰحِدٍ ٤﴾ الرعد: كَصَالِحِ بَنِي آدَمَ وَخَبِيثِهِمْ أَبُوهُمْ وَاحِدٌ، ﴿السَّحَابُ ٱلثِّقَالَ ١٢﴾ الرعد: الذِي فِيهِ المَاءُ ﴿كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ ١٤﴾ الرعد: يَدْعُو المَاءَ بِلِسَانِهِ وَيُشِيرُ إِلَيْهِ فَلَا يَأْتِيهِ أَبَدًا، سَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا: تَمْلَأُ بَطْنَ وَادٍ،﴿زَبَدًا رَّابِيًا ١٧﴾ الرعد: زَبَدُ السَّيْلِ خَبَثُ الحَدِيدِ وَالْحِلْيَةِ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٣ - (تەفسیری) سوورەتی ڕەعد

**ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ ﴿كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ﴾: نموونەی ئەو هاوبەش دانەرەیە لەگەڵ خودا پەرستراوێکی تری پەرستووە، وە نموونەکەی وەك كەسێكی زۆر**

تینوو وایە سەیری وێنەی خۆی دەكات لە ئاوەكەدا [١] لە دورەوە، دەیەوێ بەدەستەكانی ئاوەكە بێنێ بۆ دەمی بەڵام ناتوانێ.

-جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: ﴿ وَسَخَّرَ ﴾: ڕای هێنا، گەردن كەچی كرد. ﴿ مُّتَجَٰوِرَٰتٌ ﴾: لە پاڵ یەكتریدان نزیك لە یەكتریەوە. ﴿ ٱلْمَثُلَٰتُ ﴾: كۆیە تاكەكەی: (مَثُلَةٌ) ئەو شتانەی هاوشێوەی یەكتری و لە یەكتری دەچن وە دەڵێ: (بێجگە لە هاوشێوەی ڕۆژگارانی ئەو كەسانەی لە پێشیانەوە ڕابوردن).﴿ بِمِقْدَارٍ ﴾: بە ئەندازە. ﴿ مُعَقِّبَٰتٌ ﴾: فریشتە چاودێرەكان كە یەكەمیان بە دوای ئەوەی كەیاندا دێت هەر لەمەوە هاتووە، كە وتراوە (العقیب) بەوەی لە دوا شتێكەوە دێت دەوترێت: من بەشوێنیدا هاتم (یان من شوێنی كەوتم ). ﴿ المِحالُ ﴾: سزا. ﴿ كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ ﴾: تا ئاوەكە بگرێ بەدەستی. ﴿ رَّابِيًا ﴾: جاوگە لە (ربا يربو)ەوە هاتووە بەمانای بەرزبووە و سەركەوتوو. ﴿ أَوْ مَتَٰعٍ زَبَدٌ ﴾: وشەی (متاع): ئەوەی سوودی لێ دەبینی و دەبێتە هۆی ژیان وژێوار. ﴿ جُفَآءً ﴾: دەوترێت: (أَجْفَأَتِ القِدْرُ ) كاتێ قابلەمەكە یا مەنجەڵەكە كوڵا كە فەكەی سەركەوت پاشان نیشتەوە، ئەنجا كەفەكە نامێنێ و هیچ سودێكی نابێ، هەر بەوشێوە هەق لە ناهەق جیا دەكرێتەوە ﴿ ٱلْمِهَادُ ﴾: نوێن و پێخەف[٢].﴿ وَيَدْرَءُونَ ﴾ الرعد: لایدەبەن ودەیسڕنەوە. (دَرَأْتُهُ) پاڵم پێوە نا، لام برد. ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ ﴾: واتە: دەڵێن ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ ﴾: ﴿ وَإِلَيْهِ مَتَابِ ﴾: تەوبەكردنی من وگەڕانەوەم هەر بۆ لای خوایە. ﴿ أَفَلَمْ يَاْيْـَٔسِ ﴾: دەی ئایا ڕوون نەبووەتەوە. ﴿ قَارِعَةٌ ﴾: بەڵایەكی سەخت. ﴿ فَأَمْلَيْتُ ﴾:

---

(١) واتە: وەك كەسێك وایە وێنەی خۆی لەناو ئاوێكدا ببینێت بیەوێ بە دەست درێژكردنی بۆ ئاوەكە ئاوەكە بگاتە دەمی بیخواتەوە، بەڵام ئاوەكە نایەت چونكە ئاوەكە هەست بە تینویەتی ودەست درێژكردنی ئەو ناكات.

(٢) بەڵام لە ئایەتەكەدا مەبەست پێی شوێنی ئەوانەیە شوێن پێغەمبەران نەكەوتوون لە دۆزەخدا بۆ گاڵتە پێكردنیانە.

مۆڵەتم داوە لە (الملِيّ و الْمُلَاوَةُ)ەوەیە وە ﴿ مَلِيًّا ﴾: ش هەر لەو ڕیشەوەیە، زەوی فراوانی درێژ پێی دەوترێت: (مليٌ من الارض). ﴿ أَشَقُّ ﴾: سەختر لە سەختی و نارەحەتیەوە، لە (المَشَقَّة) وەگیراوە. ﴿ مُعَقِّبَ ﴾: گۆڕەر[1].

-موجاهید دەڵێ: ﴿ مُّتَجَٰوِرَٰتٌ ﴾: (پارچە زەوی لە پاڵ یەکتری دا) پاك و چاکەکەی و خراپ و پیسەکەی زەوی لماوی (کە هیچ سەوز ناکات لەبەر سوێری). ﴿ صِنْوَانٌ ﴾: دوو دارخورما یان زیاتر کە لە بنەوە یەك بن. ﴿ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ ﴾: دارخورمایەکی تەنها[2]. ﴿ بِمَآءٍ وَٰحِدٍ ﴾: وەك چاك و خراپی بنیادەمەکان باوکی هەموویان یەکە (درەختەکانیش هەموویان لە یەك ئاو ئاو دەخۆنەوە). ﴿ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴾: (هەوری قورس) کە ئاوی بارانی تیایە. ﴿ كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ ﴾: بەزمانی ئاوەکە بانگ دەکات، بەدەستیش ئاماژەی بۆ دەکات، بەڵام هەرگیز (ئاوەکە) نایەت بۆلای ئەو کەسە. (سَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا) هەر شیو و دۆڵێك بە قوڵایی ئەو ئەندازەی خۆی پڕ دەکات لە ئاو. ﴿ زَبَدًا رَّابِيًا ﴾: واتە: کەفی لافاو، ژەنگ و خڵتەی ئاسن و خشڵ.

## ١ - بابُ قَوْلِه: ﴿ ٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ ﴿٨﴾ ﴾ الرعد ﴿ وَغِيضَ ﴿٤٤﴾ ﴾ هود:

٤٦٩٧ - حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، حَدَّثَنَا مَعْنٌ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَفَاتِيحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ اللَّهُ:

---

(١) (لا معقب لحكمه) کەس ناتوانێ فەرمانی خوا بگۆڕێ یان ڕێی بگرێ.

(٢) لەسەر و بنەوە یەك دار خورما بێت.

لاَ يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَتَى يَأْتِي الْمَطَرُ أَحَدٌ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَتَى تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ اللَّهُ»[1].

## ١ - باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (خوا دەزانێ هەموو مێینەیەک (لە منداڵدانیدا) چی هەڵگرتووە (کوڕ یان کچ)، هەروەها دەزانێ منداڵدانەکان چی لێ کەم دەبێتەوە )

﴿ وَغِيضَ ﴾: کەم کرایەوە.

**٤٦٩٧ -ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((کلیلەکانی نەزانراوەکان پێنجن، جگە لەخوا کەس نایانزانێت: جگە لە خوا کەس نازانێ لە سبەینێدا چی هەیە (ودەبێ) وە جگە لە خوا کەس نازانێ منداڵدانەکان چی کەم دەکەنەوە، وە جگە لە خوا کەس نازانێ کەی باران دەبارێت، وە هیچ کەس نازانێ لە چ زەوییەکدا دەمرێ، وە جگە لە خوا کەس نازانێ کەی قیامەت بەرپا دەبێت)).**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ١٤ - ومن سورة إِبْرَاهِيمَ عليه السلام

قَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ هَادٍ ﴿٧﴾ ﴾ الرعد: دَاعٍ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: صَدِيدٌ قَيْحٌ وَدَمٌ. وَقَالَ ابن عُيَيْنَةَ.﴿ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ ﴿٦﴾ ﴾ إبراهيم. أَيَادِيَ اللَّهِ عِنْدَكُمْ وَأَيَّامَهُ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ مِن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ﴿٣٤﴾ ﴾ إبراهيم: رَغِبْتُمْ إِلَيْهِ فِيهِ. ﴿ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ﴿٣﴾ ﴾ إبراهيم: يَلْتَمِسُونَ لَهَا عِوَجًا ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ ﴿٧﴾ ﴾ إبراهيم: أَعْلَمَكُمْ آذَنَكُمْ ﴿ فَرَدُّوا أَيْدِيَهُمْ فِي أَفْوَاهِهِمْ ﴿٩﴾ ﴾ إبراهيم:.هذا مَثَلٌ كَفُّوا عَمَّا أُمِرُوا بِهِ ﴿ مَقَامِي ﴿١٤﴾ ﴾

(١) بروانه: ١٠٣٩.

إبراهيم: حَيْثُ يُقِيمُهُ اللَّهُ بَيْنَ يَدَيْهِ ﴿ مِّن وَرَآئِهِۦ ﴿١٦﴾ ﴾ إبراهيم: قُدَّامِهِ ﴿ لَكُمْ تَبَعًا ﴿٢١﴾ ﴾ إبراهيم وَاحِدُهَا تَابِعٌ مِثْلُ غَيَبٍ وَغَائِبٍ ﴿ بِمُصْرِخِكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾ إبراهيم: اسْتَصْرَخَنِي اسْتَغَاثَنِي ﴿ يَسْتَصْرِخُهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ القصص: مِنَ الصُّرَاخِ.مَصْدَرُ خَالَلْتُهُ خِلَالًا، وَيَجُوزُ أَيْضًا جَمْعُ خُلَّةٍ وَخِلَالٍ ﴿ وَلَا خِلَٰلٌ ﴿٣١﴾ ﴿ ٱجْتُثَّتْ ﴿٢٦﴾ ﴾ إبراهيم: صِلَتْ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٤ - (تەفسیری) سورەتی ئیبراهیم عليه السلام

ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: ﴿ هَادٍ ﴾: بانگخوازێک. موجاهید دەڵێ: (صَدِيدٌ) كێم و زوخاوو تێکەڵ بەخوێن. ئیبنوعویەینە دەڵێ: ﴿ ٱذْكُرُواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ﴾ بیری بەهرە و چاکەکانی خوا و ڕووداوەکانی (گەلانی پێشوو) بکەن. موجاهید دەڵێ: ﴿ مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ﴾ إبراهيم: هەموو ئەو شتانەی حەزتان لێیەتی (و داواتان کردووە). ﴿ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ﴾ دەیانەوێ (ڕێگای خوا) لار و چەوت نیشاندەن، بەدوای لار و چەوتی دا دەگەڕێن (لە ڕێگای خوادا). ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ ﴾: ئاگاداری کردن، پێی ڕاگەیاندن. ﴿ فَرَدُّوٓاْ أَيْدِيَهُمْ فِىٓ أَفْوَٰهِهِمْ ﴾[1]: ئەمە پەند و نموونەیەکە: بۆ ئەوەی فەرمانیان پێکرا بەکردنی نەیانکرد وازیان لێ هێنا. ﴿ مَقَامِى ﴾: کاتێ خوا لەبەردەم خۆیدا ڕایدەگرێ (لە ڕۆژی دوایی دا).

(١) واتە، ئەوان دەست وپەنجەی خۆیان گەست لە ڕق وقینداا، یان ئەوان دەستەکانی خۆیان بە زاری پێغەمبەرانەوە ناوە ( لە دژیان ڕاوەستاون).

ئیبنو عویەینە دەڵێ: ﴿ مِّن وَرَآئِهِۦ ﴾: لەپێشەوە. ﴿ لَكُمْ تَبَعًا ﴾: تاکەکەی (تَابِعٌ) شوێن کەوتوو وەك (غَيَب وغَائِب)[1]. ﴿ بِمُصْرِخِكُمْ ﴾: هاواری بۆ هێنام، داوای یارمەتی لێ کردم. ﴿ يَسْتَصْرِخُهُۥ ﴾: هانای بۆ هێنا لە (الصُّرَاخِ) هاوار و قیژەوە هاتووە. ﴿ وَلَا خِلَٰلٌ ﴾: جاوگی (خَالَلْتُهُ خِلاَلًا)ـە هەروەها دروستە کۆی (خُلَّةٍ وَخِلَالٍ)[2] بێت. ﴿ ٱجْتُثَّتْ ﴾: لە بێخ هێنرا، ڕیشە کێش کرا.

## ١ - بابُ قوله ﴿ كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾ إبراهيم

٤٦٩٨ - حَدَّثَنِي عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ أَبِي أُسَامَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَخْبِرُونِي بِشَجَرَةٍ تُشْبِهُ أَوْ كَالرَّجُلِ الْمُسْلِمِ لاَ يَتَحَاتُّ وَرَقُهَا وَلاَ وَلاَ وَلاَ، تُؤْتِي أُكْلَهَا كُلَّ حِينٍ». قَالَ ابْنُ عُمَرَ فَوَقَعَ فِي نَفْسِي أَنَّهَا النَّخْلَةُ، وَرَأَيْتُ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ لاَ يَتَكَلَّمَانِ، فَكَرِهْتُ أَنْ أَتَكَلَّمَ، فَلَمَّا لَمْ يَقُولُوا شَيْئًا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هِيَ النَّخْلَةُ». فَلَمَّا قُمْنَا قُلْتُ لِعُمَرَ: يَا أَبَتَاهُ وَاللَّهِ لَقَدْ كَانَ وَقَعَ فِي نَفْسِي أَنَّهَا النَّخْلَةُ فَقَالَ: مَا مَنَعَكَ أَنْ تَكَلَّمَ؟ قَالَ: لَمْ أَرَكُمْ تَكَلَّمُونَ، فَكَرِهْتُ أَنْ أَتَكَلَّمَ أَوْ أَقُولَ شَيْئًا. قَالَ عُمَرُ: لأَنْ تَكُونَ قُلْتَهَا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ كَذَا وَكَذَا[3].

---

(١) (غَيَب) کۆیە و (غائب) تاکەکەیەتی.

(٢) (خِلال) کۆی (خُلَّة) بێت.

(٣) بڕوانە: ٦١.

## ١-باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وەک درەختێکی چاک و بەسوود وایە ڕەگی قایم (لەزەوی دا) داکوتابێ و لقی و پۆپەکانیشی (بەرز بوبێتەوە) بە ئاسماندا، ئەو (درەختە) هەموو کاتێک میوەو بەربگرێت)

٤٦٩٨ -نافیع گێڕایەوەکە ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین فەرمووی: ((پێم بڵێن ئەو درەختە چییە لە مسوڵمان دەچێت -یان وەك پیاوی - مسوڵمان وایە، درەختەکە گەڵای ناوەرێ وانیە و وانیە و وانیە، هەموو کاتێ بەر و میوە دەگرێ))، ئیبنو عومەر وتی: جا هات بەدڵمدا کە ئەو درەختە دارخورمایە، بەڵام بینیم ئەبوبەرکر وعومەر قسە ناکەن، بۆیە پێم جوان نەبوو قسە بکەم، جا کە هەردووکیان هیچیان نەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەو درەختە دارخورمایە)) ئەنجا کە هەستایین بە عومەرم وت: (ئەی بابە گیان وەڵڵاهی هات بەدڵمدا کە دارخورمایە، عومەریش وتی: ئەی چی وای لێکردنی قسە نەکەیت؟ وتی: ئێوەم نەدی قسە بکەن بۆیە من لام پەسەند نەبوو قسە بکەم یان شتێك بڵێم، عومەر وتی: ئەگەر بتوتایە لەوە و لەوە پێم خۆشتر بوو.

## ٢ - بابٌ: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ﴿٢٧﴾ ﴾ إبراهيم

٤٦٩٩ - حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَلْقَمَةُ بْنُ مَرْثَدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ سَعْدَ بْنَ عُبَيْدَةَ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْمُسْلِمُ إِذَا سُئِلَ فِي الْقَبْرِ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴿٢٧﴾ ﴾ إبراهيم[١].

---

(١) بروانە: ١٣٦٩.

## ٢ - باسێک: (ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە خوا دامەزراویان دەکات بەوتەی بەڕێوبەجێ (کەشایەتومانە) )

**٤٦٩٩ -بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مسوڵمان کاتێ لە گۆڕدا پرسیاری لێ کرا، شایەتی دەدات کە هیچ پەرستراوێك نییە لە جگە خوا، وە بێگومان موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، ئەو فەرمایشتەی خوایە (ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە خوا دامەزراویان دەکات بەوتەی بەڕێ و بەجێ (کەشایەتومانە) لە ژیانی دونیادا و لە ڕۆژی دواییشدا).**

﴿ أَلَمْ تَرَ ﴿٢٨﴾ ﴾ إبراهيم.: أَلَمْ تَعْلَمْ، كَقَوْلِهِ: ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ﴿٢٤﴾ ﴾ إبراهيم:﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُوا ﴿٢٤٣﴾ ﴾ البقرة: البَوَارُ: الهَلَاكُ، بَارَ يَبُورُ بَوْرًا ﴿ قَوْمًا بُورًا ﴿١٨﴾ ﴾ الفرقان:. هَالِكِينَ.

٤٧٠٠ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ عَطَاءٍ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ:

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَتَ اللَّهِ كُفْرًا ﴿٢٨﴾ ﴾ إبراهيم، قَالَ: هُمْ كُفَّارُ أَهْلِ مَكَّةَ.

## ٣ -باسێک: (ئایا سەیری ئەوانەت نەکردووە (سوپاسی) بەهرەو چاکەی خوایان گۆڕیوە بە بێ باوەڕ و سپڵەیی)

**﴿ أَلَمْ تَرَ ﴾: ئایا نەتزانیوە، وەك ئەم فەرمانیشتە وایە: ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ﴾[1] و ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُوا ﴾: [2]. (البَوَارُ): لەناوچوون، دەوترێت: (بَارَ يَبُورُ بَوْرًا) ﴿ قَوْمًا بُورًا ﴾: لەناوچووان.**

(١) واتە، ئایا نەتزانیوە چۆن.

(٢) ئایا ورد نەبوویتەوە لەوانەی کە لەوڵاتی خۆیان دەرچوون.

**٤٧٠٠ ـعەتا دەڵێ: لە ئیبنو عەبباسم ﷺ بیست (دەربارەی ئەم ئایەتە): (ئایا سەیری ئەوانەت نەکردووە (سوپاس ) بەهرە و چاکەی خوایان گۆڕیوە بە بێ باوەڕیی وسپڵەیی) وتی: ئەوانە کافرانی خەڵکی مەککەن.**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١٥ - سورة الحِجْر

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسْتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ ﴾ الحجر. الحَقُّ يَرْجِعُ إلى اللهِ وَعَلَيْهِ طَرِيقُهُ. ﴿ لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿٧٩﴾ ﴾ الحجر. عَلَى الطَّرِيقِ وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ لَعَمْرُكَ ﴿٧٢﴾ ﴾ الحجر: لَعَيْشُكَ ﴿ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾ الحجر: أَنْكَرَهُمْ لُوطٌ، وَقَالَ غَيْرُهُ ﴿ كِتَابٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤﴾ ﴾ الحجر: أَجَلٌ ﴿ لَّوْ مَا تَأْتِينَا ﴿٧﴾ ﴾ الحجر: هَلَّا تَأْتِينَا شِيَعٌ أُمَمٌ وَللأَوْلِيَاءِ أَيْضًا شِيَعٌ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ يُهْرَعُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾ هود: مُسْرِعِينَ ﴿ لِلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾ الحجر: لِلنَّاظِرِينَ ﴿ سُكِّرَتْ ﴿١٥﴾ ﴾ الحجر: غُشِّيَتْ ﴿ بُرُوجًا ﴿١٦﴾ ﴾ الحجر: مَنَازِلَ لِلشَّمْسِ وَالْقَمَرِ ﴿ لَوَٰقِحَ ﴿٢٢﴾ ﴾ الحجر: مَلَاقِحَ مُلْقَحَةً ﴿ حَمَإٍ ﴿٢٦﴾ ﴾ الحجر: جَمَاعَةُ حَمْأَةٍ وَهْوَ الطِّينُ المُتَغَيِّرُ وَالْمَسْنُونُ المَصْبُوبُ ﴿ تَوْجَلْ ﴿٥٣﴾ ﴾ الحجر، تَخَفْ ﴿ دَابِرَ ﴿٦٦﴾ ﴾ الحجر: آخِرَ ﴿ لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿٧٩﴾ ﴾ الحجر: الإِمَامُ كُلُّ مَا ائْتَمَمْتَ وَاهْتَدَدتَ بِهِ ﴿ ٱلصَّيْحَةُ ﴿٨٣﴾ ﴾ الحجر، الهَلَكَةُ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٥ - (تەفسیری) سوڕەتی حیجر

موجاهید دەڵێ: ﴿ صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسۡتَقِيمٌ ﴾ هەقە بۆلای خوا دەگەڕێتەوە و ڕێگاکەی بەرەو ئەوە. ﴿ لَبِإِمَامٖ مُّبِينٖ ﴾ لەسەر ڕێگایەکی ڕوون.ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ لَعَمۡرُكَ ﴾ سوێند بە ژیانت (ئەی موحەممەد ﷺ) ﴿ قَوۡمٞ مُّنكَرُونَ ﴾ لووت ﷺ نەیناسین. جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: ﴿كِتَابٞ مَّعۡلُومٞ ﴾ واتە: کاتێکی (دیاری کراو). ﴿ لَّوۡ مَا تَأۡتِينَا ﴾ دەی بۆ (فریشتەمان) بۆ ناهێنێ. (شِيَعٌ) هۆز و گەلاندا (أَوْلِيَاءِ) یش پێی دەڵێن: (شِيَعٌ). ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ يُهۡرَعُونَ ﴾ بەپەلە هاتن. ﴿لِلۡمُتَوَسِّمِينَ ﴾ بۆ بینەران و سەرنج دەران. ﴿ سُكِّرَتۡ ﴾ پەردەی بەسەردا دراوە، داپۆشراوە. ﴿ بُرُوجٗا ﴾ چەند بورجێك بۆ خۆر و مانگ. ﴿لَوَٰقِحَ ﴾ پیتێنەری پیتێنراو، ئاوسکەری ئاوسکراو.

﴿ حَمَإٖ ﴾: کۆی (حَمْأَةٍ) کە بریتییە لە قوڕی (ڕەشی) ترشاو. (الْمَسْنُونُ): ڕەق بوو. ﴿ تَوۡجَلۡ ﴾ دەترسی. ﴿ دَابِرَ ﴾ کۆتایی شوێنەوار. ﴿ لَبِإِمَامٖ مُّبِينٖ ﴾ الإِمَامُ: هەرشتێکە شوێنی بکەوی و پێی ڕێنموون ببی. ﴿ ٱلصَّيۡحَةُ ﴾ لەناوچوون، پیا هەڵشاخاندن.

### ١ - بابُ قوله: ﴿ إِلَّا مَنِ ٱسۡتَرَقَ ٱلسَّمۡعَ فَأَتۡبَعَهُۥ شِهَابٞ مُّبِينٞ ﴿١٨﴾ ﴾ الحجر

٤٧٠١ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَضَى اللَّهُ الأَمْرَ فِي السَّمَاءِ ضَرَبَتِ الْمَلاَئِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خُضْعَانًا

لِقَوْلِهِ كَالسِّلْسِلَةِ عَلَى صَفْوَانٍ -قَالَ عَلِيٌّ، وَقَالَ غَيْرُهُ: صَفْوَانٍ - يَنْفُذُهُمْ ذَلِكَ فَإِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا: مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قَالُوا لِلَّذِي قَالَ: الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ، فَيَسْمَعُهَا مُسْتَرِقُو السَّمْعِ، وَمُسْتَرِقُو السَّمْعِ هَكَذَا وَاحِدٌ فَوْقَ آخَرَ - وَوَصَفَ سُفْيَانُ بِيَدِهِ، وَفَرَّجَ بَيْنَ أَصَابِعِ يَدِهِ الْيُمْنَى، نَصَبَهَا بَعْضَهَا فَوْقَ بَعْضٍ - فَرُبَّمَا أَدْرَكَ الشِّهَابُ الْمُسْتَمِعَ، قَبْلَ أَنْ يَرْمِيَ بِهَا إِلَى صَاحِبِهِ، فَيُحْرِقَهُ وَرُبَّمَا لَمْ يُدْرِكْهُ حَتَّى يَرْمِيَ بِهَا إِلَى الَّذِي يَلِيهِ إِلَى الَّذِي هُوَ أَسْفَلُ مِنْهُ حَتَّى يُلْقُوهَا إِلَى الأَرْضِ -وَرُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ: حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى الأَرْضِ - فَتُلْقَى عَلَى فَمِ السَّاحِرِ، فَيَكْذِبُ مَعَهَا مِائَةَ كَذْبَةٍ فَيَصْدُقُ، فَيَقُولُونَ أَلَمْ يُخْبِرْنَا يَوْمَ كَذَا وَكَذَا يَكُونُ كَذَا وَكَذَا، فَوَجَدْنَاهُ حَقًّا لِلْكَلِمَةِ الَّتِي سُمِعَتْ مِنَ السَّمَاءِ».حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا عَمْرٌو، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ إِذَا قَضَى اللَّهُ الأَمْرَ - وَزَادَ: والْكَاهِنِ - وَحَدَّثَنَا سُفْيَانُ فَقَالَ قَالَ عَمْرٌو: سَمِعْتُ عِكْرِمَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ قَالَ: إِذَا قَضَى اللَّهُ الأَمْرَ وَقَالَ عَلَى فَمِ السَّاحِرِ. قُلْتُ: لِسُفْيَانَ: قَالَ: سَمِعْتُ عِكْرِمَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ؛ قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ لِسُفْيَانَ: إِنَّ إِنْسَانًا رَوَى عَنْكَ عَنْ عَمْرٍو عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَيَرْفَعُهُ أَنَّهُ قَرَأَ فُزِّعَ. قَالَ سُفْيَانُ: هَكَذَا قَرَأَ عَمْرٌو. فَلاَ أَدْرِي سَمِعَهُ هَكَذَا أَمْ لاَ. قَالَ سُفْيَانُ: وَهْيَ قِرَاءَتُنَا[1].

## ١ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (مەگەر ئەوانەی کە بەدزیەوە گوێ دەگرن یەکسەر گڕ و ئاگرێکی دیار دوای دەکەوێ (و ڕاوی دەنێت))

**٤٧٠١ -ئەبو هورەیرە ﷺ فەرموودەکە دەباتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ کە فەرمووی: ((کاتێ خوا لە ئاسمان بڕیاری کارێکی دا، فریشتەکان باڵەکانیان دەدەن بەیەکدا بەمل کەچی بۆ فەرمایشتەی خودا (دەنگی ئەو فەرمایشتەی خوا) وەك دەنگ و**

(١) بڕوانە: ٧٤٨١، ٤٨٠٠.

زرەی زنجیرێك وایە بدرێت بەسەر تاوێرە بەردێکی سافدا - عەلی (مەدینی) دەڵێ جگە لەو (سوفیان) وتی: تاوێرە بەردێکی ساف ئەو دەنگەیان دەگاتێ - کە ترسەکەی دڵیان ناهێڵرێت. (فریشەکان) دەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرمووە؟ دەڵێن بەوەی ئەم پرسیارەی کردووە: خوا وتەی هەقی فەرمووە، ئەو (خوایە) بەرز و بڵند و گەورەیە، جا ئەو (شەیتانانەی) بەدزیەوە گوێ دەگرن، ئەو وتەیە دەبیستن ئەوانیش بەدزیەوە گوێ دەگرن ئابەو جۆرە یەك لە سەروو یەکەوەن - سوفیان بەدەستی ئەوەی باس کرد، پەنجەکانی دەستی ڕاستی لەیەکتری جیاکردەوە و ڕاستی کردنەوە لەسەر یەکتری دانان - جا لەوانەیە نێزەکی ئاگرین بەر شەیتانە گوێ هەڵخەرەکە بکەوێ پێش ئەوەی وتەکە بگەیەنێ بە هاوڕێکەی و بیسوتێنێ، وە لەوانەشە لێی نەدات هەتا وتەکە دەگەیەنێ بەوەی لەخواریەوەیە، ئەویش بۆ ئەوەی خوارەوەی خۆی هەتا دەیگەیەننە سەر زەوی. هەندێ جار سوفیان وتویەتی: هەتا دەگاتە سەر زەوی - وە دەیخاتە سەردەمی جادووگەر، ئەویش لەگەڵ ئەو (هەواڵە)دا سەد درۆی لەگەڵدا دەکات، جابڕوای پێ دەکرێ [1]، ئەنجا (گوێگرەکان) دەڵێن: ئایا ئەو ڕۆژە و ئەو ڕۆژە هەواڵی پێنەداین وا دەبێ و وا دەبێ ئێمەش بینیمان ڕاست دەرچوو؟ مەبەستیان ئەو وتەیەیە کەلە ئاسمانەوە بیسرابوو)).

(ئیمامی بوخاری دەڵێ) عەلی کوڕی عەبدوڵلا بۆی گێڕاینەوە وتی: سوفیان بۆی گێڕاینەوە وتی: عەمر بۆی گێڕاینەوە لەعیکریمەوە لە ئەبو هورەیرەوە (دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی): ((کاتێ خوا بڕیاری کارێکی دا)) ئەمەی لێ زیاد کردووە ((کۆڵە نانی)).

وە سوفیان بۆی گێڕاینەوە و وتی: عەمر وتی: لە عیکریمەم بیست وتی: ئەبو هورەیرە ﷺ بۆی گێڕاینەوە وتی: ((کاتێ خوا بڕیارێکی دا)) و فەرمووی

(١) یان: (جا ڕاست دەکات لەوەدا کە بیستوویەتی).

((دەیخاتە سەردەمی جادووگەرێك))، (عەلی کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ) وتم: بەسوفیان (ئایا تۆ لەعەمرت بیستووە)؟ وتی: لە عیکریمەم بیستووە وتی: لە ئەبو هوڕەیرەم ﷺ بیستووە؟ (سوفیان) وتی: بەڵێ، بەسوفیانم وت: بێگومان کەسێك گێڕاویەتیەوە لە تۆوە لە عەمرەوە لە عیکریمەوە لە ئەبو هوڕەیرەوە دەیباتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ، کە ئەو (پێغەمبەر ﷺ بە (فُرِّغَ)[1] خوێندیەوە، سوفیان وتی: عەمر ئاوەها خوێندیەوە، جا نازانم ئابەو جۆرە بیستویەتی یان نا، سوفیان دەڵێ: خوێندنەوەی ئێمەش ئەو خوێندنەوەیە (فُزِّغَ).

٢ - بابُ قوله: ﴿ وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ ٱلْحِجْرِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾ الحجر

٤٧٠٢ - حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، حَدَّثَنَا مَعْنٌ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لأَصْحَابِ الْحِجْرِ: «لاَ تَدْخُلُوا عَلَى هَؤُلاَءِ الْقَوْمِ إِلاَّ أَنْ تَكُونُوا بَاكِينَ، فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا بَاكِينَ فَلاَ تَدْخُلُوا عَلَيْهِمْ أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَهُمْ»[2].

## ٢ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (سوێند بە خوا بێگومان خەڵکی حیجریش بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان نەکرد)

٤٧٠٢ -عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە هاوەڵانی (کاتێ چوونە شاری) حیجر: ((مەڕۆنە (وڵات و شوێنی) ئا ئەو گەلەوە مەگەر بەگریانەوە بڕۆن، جا ئەگەر بە گریانەوە نەڕۆشتن ئەوە مەڕۆنە لایان، نەوەك ئەو سزایەی توشی ئەوان بووە تووشی ئێوەش ببێت)).

(١) (فُرِّغَ) بەڵام خوێندنەوەی زۆربەی قورئان خوێنان (فُزِّعَ)ـەیە. بڕوانە : إرشاد الساری: ٣٣٤/١.

(٢) بڕوانە: ٤٣٣.

**٣ - بابُ قوله:** ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَـٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الحجر

٤٧٠٣ - حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ خُبَيْبِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّى قَالَ: مَرَّ بِيَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا أُصَلِّي فَدَعَانِي فَلَمْ آتِهِ حَتَّى صَلَّيْتُ ثُمَّ أَتَيْتُ فَقَالَ: «مَا مَنَعَكَ أَنْ تَأْتِيَ؟». فَقُلْتُ: كُنْتُ أُصَلِّي. فَقَالَ: «أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ ﴿٢٤﴾ ﴾ الأنفال. ثُمَّ قَالَ: أَلاَ أُعَلِّمُكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ قَبْلَ أَنْ أَخْرُجَ مِنَ الْمَسْجِدِ» فَذَهَبَ النَّبِيُّ ﷺ لِيَخْرُجَ مِنَ الْمَسْجِدِ فَذَكَّرْتُهُ فَقَالَ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ﴾ الفاتحة هِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ»[1].

## ٣ - باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (سوێند بە خوا بەڕاستی حەوت ئایەتی دووبارە کراوەمان پێ بەخشیت لەگەڵ قورئانی گەورەدا)

**٤٧٠٣ -ئەبو سەعیدی کوڕی موعەللا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بە لامدا لەو کاتەدا من نوێژم دەکرد بانگی کردم، منیش نەهاتم بۆ خزمەتی تا نوێژەکەم کرد، لە پاشان هاتمە خزمەتی، جا فەرمووی: ((چی ڕێگرت بوو بێیت بۆ لام؟)) منیش وتم: نوێژم دەکرد، ئەنجا فەرمووی: ((ئایا خوا نەیفەرمووە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە وەڵامی خوا و پێغەمبەر بدەنەوە کاتێك بانگتان دەکات بۆلای ئەو (ئایینەی) کە زیندوتان دەکاتەوە؟)) پاشان فەرمووی: ((ئایا گەورەترین سوڕەتی قورئانت فێر بکەم پێش ئەوەی کە لە مزگەوت بڕۆیتە دەرەوە؟)). جا پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت (ویستی) لە مزگەوت بڕواتە دەرەوە منیش (فەرموودەکەم) بیرخستەوە جا فەرمووی: ((سوڕەتی) ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ﴾ ئەو سوڕەتە حەوت ئایەتی دووبارە بوو وەیە و ئەو قورئانە گەورەیە کە بەمن بەخشراوە)).**

---

(١) بڕوانە: ٤٤٧٤.

٤٧٠٤ - حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ الْمَقْبُرِيُّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أُمُّ الْقُرْآنِ هِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ».

**٤٧٠٤ -ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( (سورەتی فاتیحە) ئوممو لقورئانە[1] ئەو حەوت ئایەتی دووبارە بوو وەیە و قورئانی گەورەیە)).**

**٤ - بابُ قوله:** ﴿ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾﴾ الحجر ﴿ٱلْمُقْتَسِمِينَ ﴿٩٠﴾﴾ الحجر **الذين حلفوا ومنه** ﴿لَآ أُقْسِمُ ﴿١﴾﴾ البلد **أي: أُقْسِمُ، وتُقْرَأُ (لأُقْسِمُ).** ﴿وَقَاسَمَهُمَآ ﴿٢١﴾﴾ الأعراف **حلف لهما ولم يحلفا له. وقال مجاهد:** ﴿تَقَاسَمُوا۟ ﴿٤٩﴾﴾ النمل **تحالفوا.**

## ٤ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەوانەی قورئانیان کردە چەند بەشەوە) ﴿ٱلْمُقْتَسِمِينَ﴾ ئەوانەی سوێندیان خواردوە، لەو مانەیەیە: ﴿لَآ أُقْسِمُ﴾ واتە: سوێند دەخۆم، بەم شێوەش خوێنراوەتەوە: (لأُقْسِمُ) واتە: سوێند دەخۆم. ﴿وَقَاسَمَهُمَآ﴾ واتە: شەیتان سوێندی بۆ هەردووکیان (ئادەم و حەووا) خوارد، نەک هەردووکیان سوێندیان بۆ ئەو خواردبێ.

**موجاهید دەڵێ: ﴿تَقَاسَمُوا۟﴾ هەموویان سوێندیان بۆ یەکدی خوارد.**

٤٧٠٥ - حَدَّثَنِي يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ ﴿ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾﴾ الحجر قَالَ هُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ، جَزَّءُوهُ أَجْزَاءً، فَآمَنُوا بِبَعْضِهِ وَكَفَرُوا بِبَعْضِهِ.

---

(١) (أم القران) بۆیە وای پێ دەوترێت، چونکە یەکەم سورەتی قورئانە و سەرەتای قورئانە، وە لەنوێژ بەوە دەست پێدەکرێت، وە وشەی (ام) واتە، کۆکەرەوە و گشت گیر.

٤٧٠٥ - سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە (دەربارەی ئەم ئایەتە): ﴿ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾﴾ الحجر، واتە: ئەوانەی قورئانیان کردە چەند بەشەوە) وتی: ئەوانە خاوەن کتێبەکانن (کتێبەکەیان) بەشیان کرد بەچەند بەشێکەوە، جا بڕوایان هێنا بەهەندێکی و بێ بڕوا بوون بەهەندێکی.
موجاهید دەڵێ: هەموویان سوێندیان بۆ یەکدی خوارد.

٤٧٠٦ - حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي ظَبْيَانَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ ﴿كَمَآ أَنزَلْنَا عَلَى ٱلْمُقْتَسِمِينَ ﴿٩٠﴾﴾ الحجر: قَالَ آمَنُوا بِبَعْضٍ وَكَفَرُوا بِبَعْضٍ، الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى.

٤٧٠٦ -ئەبو زەبیان لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە (دەربارەی ئەم ئایەتە) ﴿كَمَآ أَنزَلْنَا عَلَى ٱلْمُقْتَسِمِينَ﴾ وتی: ئەوانە جوولەکە و گاوورەکان بوون بڕوایان هێنا بە هەندێکی (کتێبەکەیان) و بێ بڕوا بوون بە هەندێکی.

## ٥ - باب قَوْلِه: ﴿وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾﴾ الحجر

قَالَ سَالِمٌ: ﴿ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾﴾ الحجر الْمَوْتُ.

## ٥ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە پەروەدگارت بپەرەستە هەتا مردن یەخەت پێ دەگرێت)

سالیم دەڵێ: ﴿ٱلْيَقِينُ﴾ مردنە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١٦ - ومن سورة النَّحْلِ

﴿ رُوحُ ٱلْقُدُسِ ﴿١٠٢﴾ ﴾ النحل، جِبْرِيلُ ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ ﴾ الشعراء. ﴿ فِي ضَيْقٍ ﴿١٢٧﴾ ﴾ النحل : يُقَالُ أَمْر ضَيْقٌ وَضَيِّقٌ، مِثْلُ هَيْنٍ وَهَيِّنٍ وَلَيْنٍ وَلَيِّنٍ، وَمَيْتٍ وَمَيِّتٍ. قَالَ ابن عَبَّاس: ﴿ يَتَفَيَّؤُا ظِلَٰلُهُۥ ﴿٤٨﴾ ﴾: تَتَهَيَّأُ. ﴿ سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ﴿٦٩﴾ ﴾ النحل: لا يتوَعَّرُ عَلَيْهَا مَكَانٌ سَلَكَتْهُ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ فِي تَقَلُّبِهِمْ ﴿٤٦﴾ ﴾ النحل: اخْتِلَافِهِمْ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ تَمِيدَ ﴿١٥﴾ ﴾ النحل: تَكَفَّأُ

﴿ مُّفْرَطُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾ النحل: مَنْسِيُّونَ. وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ﴿٩٨﴾ ﴾ النحل: هذا مُقَدَّمٌ وَمُؤَخَّرٌ وَذَلِكَ أَنَّ الاسْتِعَاذَةَ قَبْلَ القِرَاءَةِ وَمَعْنَاهَا الاعْتِصَامُ باللهِ. وقَالَ ابن عبَّاسٍ:

﴿ تُسِيمُونَ ﴿١٠﴾ ﴾ النحل: تَرْعَونَ. ﴿ شَاكِلَتِهِۦ ﴿٨٤﴾ ﴾ الإسراء: نَاحِيَتِهِ ﴿ قَصْدُ ٱلسَّبِيلِ ﴿٩﴾ ﴾ النحل: البَيَانُ. الدِّفْءُ: مَا اسْتَدْفَأْتَ ﴿ تُرِيحُونَ ﴿٦﴾ ﴾ النحل: بِالْعَشِيِّ وَ ﴿ تَسْرَحُونَ ﴿٦﴾ ﴾ النحل: بِالْغَدَاةِ ﴿ بِشِقِّ ﴿٧﴾ ﴾ النحل: المَشَقَّةَ. ﴿ عَلَىٰ تَخَوُّفٍ ﴿٤٧﴾ ﴾ النحل: تَنَقُّصٍ ﴿ ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ﴿٦٦﴾ ﴾ النحل: وَهْيَ تُؤَنَّثُ وَتُذَكَّرُ، كَذَلِكَ النَّعَمُ ﴿ ٱلْأَنْعَٰمِ ﴿٦٦﴾ ﴾ النحل: جَمَاعَةُ النَّعَمِ ﴿ أَكْنَٰنًا ﴿٨١﴾ ﴾ النحل: وَاحِدُها كِنٌّ، مثلُ: حِمْلٍ وأحْمَالٍ ﴿ سَرَٰبِيلَ ﴿٨١﴾ ﴾ النحل: قُمُصٌ ﴿ تَقِيكُمُ ٱلْحَرَّ ﴿٨١﴾ ﴾ النحل:

وَأَمَّا ﴿ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ ﴿٨١﴾ ﴾ النحل: فَإِنَّهَا الدُّرُوعُ. ﴿ دَخَلًا بَيْنَكُمْ ﴿٩٤﴾ ﴾ النحل:كُلُّ شَيْءٍ لَمْ يَصِحَّ فَهْوَ دَخَلٌ. قَالَ ابن عَبَّاسٍ﴿ وَحَفَدَةً ﴿٧٢﴾ ﴾ النحل: مَنْ وَلَدَ الرَّجُلُ. السَّكَرُ مَا حُرِّمَ مِنْ ثَمَرَتِهَا، وَالرِّزْقُ الحَسَنُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ، وَقَالَ ابن عُيَيْنَةَ عَنْ صَدَقَةَ ﴿ أَنكَٰثًا ﴿٩٢﴾ ﴾ النحل:هِيَ خَرْقَاءُ، كَانَتْ إِذَا أَبْرَمَتْ غَزْلَهَا نَقَضَتْهُ. وَقَالَ ابن مَسْعُودٍ: الأُمَّةُ مُعَلِّمُ الخَيْرِ. وَالْقَانِتُ المُطِيعُ.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٦ - (تەفسیری) سوڕەتی نەحل

**﴿ رُوحُ ٱلْقُدُسِ ﴾ واته: جوبرەئیل.﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴾واته: جوبرەئیلی ئەمین ئەو (قورئانەی) هێنایە خوارەوە. ﴿ فِى ضَيْقٍ ﴾ دەوترێت:** أمرٌ ضَيْقٌ وضَيِّقٌ. **وەكو:** هَيْنٌ وهَيِّنٌ، ولَيْنٌ ولَيِّنٌ، ومَيْتٌ ومَيِّتٌ[1].

**ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ يَتَفَيَّؤُا۟ ظِلَٰلُهُۥ ﴾ (سێبەرەكانیان) پەیدا بوو[2] سێبەری كرد. ﴿ سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ﴿٦٩﴾ ﴾ بۆ هەر شوێن و جێگایەك بڕوات ڕێگری نابێت و ئاسان كراوە بۆی. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ فِى تَقَلُّبِهِمْ ﴾ لە جیاوازیان دا[3]. موجاهید دەڵێ: ﴿ تَمِيدَ ﴾: بلەرزێنێت. تاسە و لەنگەری پێ بكات. ﴿ مُّفْرَطُونَ ﴾ لە بیركراوان. جگە لە موجاهید دەڵێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ**

---

(١) (فِي ضيْق) دڵتەنگ، خەفەت خواردن، هەموو ئەو نمونانە هێناویەتی بۆ ئەوەیە بڵێ: (ضيْق) لەگەڵ (ضَيْق) جیاوازیان نییە هەر هەمان مانا دەگەیەنێت، هەروەها نمونەكانی هَین و هیّن تا كۆتایی مانای وشەكانیش بەم جۆرەیە: هین، ئاسان و سانایی، لین: نەرم و نیان، شل و شێوان، میت: مردوو.

(٢) ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دەڵێ: (تتفيأ): واته، لابوویەوە نەك پەیدابوو. فتح الباري:٤٩١/١٠.

(٣) لەسەفەرو هامۆشۆیاندا.

﴿ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ ﴾ ئەم پێش و دواخستنە، چونکە (أَعوذُ باللهِ منَ الشَيطانِ الرَّجيم) کردن پێش قورئان خوێندنە (بەڵام لە ئایەتەکەدا بە پێچەوانەیە)، (فَاسْتَعِذْ بِاللهِ) ماناکەی واتە: پەناگرتن بە خوا (لە شەیتان). ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ تُسِيمُونَ ﴾ (مەڕ و ماڵاتی لێ) دەلەوەڕێنن

﴿ شَاكِلَتِهِۦ ﴾ لای خۆیەوە ﴿ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ ﴾ ڕوونکردنەوە (ی ڕێگای ڕاست) (الدِّفْءُ) ئەوەی خۆتی پێ گەرم دەکەیتەوە ﴿ تُرِيحُونَ ﴾ (دەیهێننەوە لەوەڕگا) بە ئێواران دا. ﴿ تَسۡرَحُونَ ﴾ (دەیبەن بۆ لەوەڕگا) بە بەیانیاندا. ﴿ بِشِقِّ ﴾ واتە: بەناڕەحەتی و قورسی. ﴿ عَلَىٰ تَخَوُّفٖ ﴾ (لە ترسی) کەم بوونەوە[1]. ﴿ ٱلۡأَنۡعَٰمِ لَعِبۡرَةٗ ﴾ وشەی (الْأَنْعَام) دەکرێتە مێینە و نێرینەش (بۆهەردووکیان بەکاردەهێنرێ)، هەروەها وشەی (النَّعَمُ) بەهەمان شێوە بو هەردووکیان بەکار دەهێنرێ. ﴿ ٱلۡأَنۡعَٰمِ ﴾ کۆی وشەی (النَّعَمُ )ـە بەمانای ئاژەڵ و ماڵاتە.

﴿ أَكۡنَٰنٗا ﴾ کۆی (كِنٌّ) (بەمانای پەناگا و ئەشکەوتە) لەسەر کێشی: (حِمْلٍ) بۆ تاك (وأحْمَالٍ) بۆ کۆکەی. ﴿ سَرَٰبِيلَ ﴾ جل وپۆشاکە ﴿ تَقِيكُمُ ٱلۡحَرَّ ﴾ لە گەرما دەتان پارێزێت. ﴿ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡ ﴾[2] بەڵام ئەمەیان کراسی زرێیە. ﴿ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ ﴾ هەر شتێك ڕاست نەبێ ئەوە دەخەلە. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ وَحَفَدَةٗ ﴾: کوڕەزا و کچەزا، منداڵی پیاو (السَّكَرُ) :ئەوەی کە حەرام کراوە لە بەروبومی دار خورما (کەعارەقە)، (وَالرِّزْقُ الحَسَنُ) ئەومیە خوا حەڵاڵی کردووە (لە بەروبومی دارخورما).

(١) دەترسن وردە وردە خۆتان و سامانەکانتان لەناوچن.

(٢) جل و پۆشاکێك لە کاتی جەنگدا دەتان پارێزێ وەك زرێ.

- ئیبنو عویەینە دەڵێ: ﴿أَنكَٰثًا﴾: ئافرەتێکی گەوج و نەزانە هەمیشە کە خورییەکەی ڕێسا هەڵیدەوەشێنێتەوە.

- ئیبنو مەسعوود ﷺ دەڵێ: (الأُمَّةُ) مامۆستا و فێرکەری چاکەیە. (وَالْقَانِتُ) فەرمانبەردارە.

## ١ - بابُ قوله: ﴿وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ ﴿٧٠﴾﴾ النحل

٤٧٠٧ - حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ مُوسَى أَبُو عَبْدِ اللَّهِ الأَعْوَرُ، عَنْ شُعَيْبٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَدْعُو «أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ وَالْكَسَلِ، وَأَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَفِتْنَةِ الدَّجَّالِ، وَفِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ»[1].

## ١ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (هەندێ لە ئێوە (زۆر پیر دەبێت تا ) دەگەڕێنرێتەوە بۆ لاوازترین تەمەن)

٤٧٠٧ - ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە ئەم دوعایەی دەکرد: (( (خوایە) پەنات پێ دەگرم لە ڕژدەیی و تەمەڵی و سستی و لاوازترینی تەمەن (کەنەفتی) و سزای (ناو) گۆڕ و لە بەڵا و تاقیکردنەوەی دەجال و ئاشوب و تاقیکردنەوەی ژیان و مردن)).

(١) بروانە: ٢٨٢٣.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ١٧ - سورة بني إسرائيل [١]

## ١ - بابٌ

٤٧٠٨ - حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ يَزِيدَ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ وَالْكَهْفِ وَمَرْيَمَ إِنَّهُنَّ مِنَ الْعِتَاقِ الأُوَلِ، وَهُنَّ مِنْ تِلَادِي.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﴿فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ ﴿٥١﴾﴾ الإسراء، يَهُزُّونَ. وَقَالَ غَيْرُهُ: نَغَضَتْ سِنُّكَ أَيْ: تَحَرَّكَتْ[٢].

# بەناوى خواى بەخشندەى میهرەبان

# ١٧ - (تەفسیرى) سورەتى بەنى ئیسرائیل

## ١ - باسێک

**٤٧٠٨ -عەبدورەحمانى کورى یەزید دەڵێ: لە ئیبنو مەسعوودم ﷺ بیست دەربارەى (سورەتى) بەنى ئیسرائیل و کەهف و مەریەم وتى: بێگومان ئەمانە لە سورەتە دێرینە نایابەکانى سەرەتان وە لەو سورەتانەن لە مێژە لەبەرم کردوون.**

(١) لە قورئاندا بە ناوى سورەتى (الإسراء) نوسراوە.
(٢) بروانە: ٤٧٣٩، ٤٩٩٤.

**ـئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ ﴾ سەرت بۆ دەلەقێنن (بەلاقرتیەوە). جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: نَغَضَتْ سِنُّكَ: ددانت جوڵا.**

## ٢ - بابٌ: ﴿ وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٤﴾ ﴾ الإسراء

أخبَرْنَاهُمْ أَنَّهُمْ سَيُفْسِدُونَ، وَالْقَضَاءُ عَلَى وُجُوهٍ ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الإسراء: أَمَرَ رَبُّكَ، وَمِنْهُ الْحكْمُ ﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُمْ ﴿٩٣﴾ ﴾ يونس: وَمِنْهُ الخَلْقُ ﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ ﴿١٢﴾ ﴾ فصلت: خَلَقَهُنَّ ﴿ نَفِيرًا ﴿٦﴾ ﴾ الإسراء: مَنْ يَنْفِرُ مَعَهُ. ﴿ وَلِيُتَبِّرُواْ ﴿٧﴾ ﴾ الإسراء:يُدَمِّرُوا ﴿ مَا عَلَوْاْ ﴿٧﴾ ﴾ الإسراء: ﴿ حَصِيرًا ﴿٨﴾ ﴾ الإسراء: مَحْبِسًا مَحْصَرًا ﴿ حَقَّ ﴿١٦﴾ ﴾ الإسراء: وَجَبَ ﴿ مَّيْسُورًا ﴿٢٨﴾ ﴾ الإسراء: لَيِّنًا. ﴿ خِطْـًٔا ﴿٣١﴾ ﴾ الإسراء: إِثْمًا، وَهْوَ اسْمٌ مِنْ خَطِئْتُ، وَالْخَطأُ مَفْتُوحٌ مَصْدَرُهُ مِنَ الإِثْمِ، خَطِئْتُ بِمَعْنَى أَخْطَأْتُ. ﴿ تَخْرِقَ ﴿٣٧﴾ ﴾ الإسراء: تَقْطَعَ. ﴿ وَإِذْ هُمْ نَجْوَىٰٓ ﴿٤٧﴾ ﴾ الإسراء: مَصْدَرٌ مِنْ نَاجَيْتُ، فَوَصَفَهُمْ بِهَا، وَالمَعْنَى: يَتَنَاجَوْنَ ﴿ وَرُفَٰتًا ﴿٤٩﴾ ﴾ الإسراء: حُطَامًا ﴿ وَٱسْتَفْزِزْ ﴿٦٤﴾ ﴾ الإسراء: اسْتَخِفَّ ﴿ بِخَيْلِكَ ﴿٦٤﴾ ﴾ الإسراء: الفُرْسَانِ، وَالرَّجْلُ: الرَّجَّالَةُ وَاحِدُهَا رَاجِلٌ مِثْلُ صَاحِبٍ وَصَحْبٍ، وَتَاجِرٍ وَتَجْرٍ. ﴿ حَاصِبًا ﴿٦٨﴾ ﴾ الإسراء: الرِّيحُ العَاصِفُ، وَالحَاصِبُ أَيْضًا مَا تَرْمِي بِهِ الرِّيحُ وَمِنْهُ ﴿ حَصَبُ جَهَنَّمَ ﴿٩٨﴾ ﴾ الأنبياء: يُرْمَى بِهِ فِي جَهَنَّمَ، وَهْوَ حَصَبُهَا، وُيقَالَ: حَصَبَ فِي الأَرْضِ ذَهَبَ، وَالحَصبُ مُشْتَقٌّ مِنَ الحَصْبَاءِ وَالحِجَارَةِ.﴿ تَارَةً ﴿٦٩﴾ ﴾ الإسراء: مَرَّةً وَجَمَاعَتُهُ تِيَرَةٌ وَتَارَاتٌ ﴿ لَأَحْتَنِكَنَّ ﴿٦٢﴾ ﴾ الإسراء: لأستَأْصِلَنَّهُمْ يُقَالُ احْتَنَكَ فلَأنٌ مَا عِنْدَ فُلَانٍ مِنْ عِلْمٍ اسْتَقْصَاهُ. ﴿ طَٰٓئِرَهُۥ ﴿١٣﴾ ﴾ الإسراء: حَظُّهُ. قَالَ

ابن عَبَّاسٍ: كُلُّ ﴿ سُلْطَٰنٌ ﴾ الإسراء: فِي القُرْآنِ فَهُوَ حُجَّةٌ. ﴿ وَلِيٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ ﴾ الإسراء: لَمْ يُحَالِفْ أَحَدًا.

**٢ - باسێک: (ئیسرائیلیەکانمان ئاگادار کرد و هەواڵمان پێدان )**

هەواڵمان پێدان ئەوان بەم نزیکانە (لەزەویدا) خراپەکاری دەکەن. وە (الْقَضَاءُ) بەچەند مانایەک هاتووە: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ ﴾ پەروەردگارت فەرمانی کرد. مانایەکی تری حوکم و بڕیار دانە: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ ﴾ واتە: بەڕاستی پەروەردگارت بڕیار دەدات لە نێوانیاندا. مانایەکی تری دروستکردنە: ﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ ﴾ واتە: بەحەوت ئاسمان دروستی کردن. ﴿ نَفِيرًا ﴾ ئەو کەسەی لە گەڵیدا دەردەچێت. ﴿ وَلِيُتَبِّرُواْ ﴾ وێرانی بکە.: ﴿ مَا عَلَوْاْ ﴾: (ئەوەی بەسەریدا زاڵ دەبن) ﴿ حَصِيرًا ﴾ زیندانێکی تەنگ، زیندانێکی سەخت. (حَقَّ): پێویست بوو، چەسپا ﴿ مَّيْسُورًا ﴾: نەرم و نیان. ﴿ خِطْـًٔا ﴾: هەڵە و تاوانێک، ناوێکە لە (خَطِئْتُ)ـەوە وەرگیراوە، چاوگەکەشی ﴿ خِطْـًٔا ﴾ کەپیتی (ط) سەری هەیە واتە: تاوان. وە (خَطِئْتُ): بەمانای (أَخْطَأْتُ) دێت. ﴿ تَخْرِقَ ﴾، بیبڕی و کونی کەیت. ﴿ وَإِذْ هُمْ نَجْوَىٰٓ ﴾ (نَجْوَى) چاوگە لە (نَاجَيْتُ)ـەوە وەرگیراوە چپە کەرەکانی پێ وەسف کراوە ماناکەشی لە نێوان خۆیاندا چپە دەکەن. ﴿ وَرُفَٰتًا ﴾ ڕزیو ﴿ وَٱسْتَفْزِزْ ﴾: بترسێنە ﴿ بِخَيْلِكَ ﴾ بەسواران (وَالرَّجْلُ) کەسانی پیادە،

تاکەکەی (رَاجِلٌ) وەک (صَاحِب) لەگەڵ (صَحْب) وە (تَاجِر) لەگەڵ (تَجْر)[1].﴿ حَاصِبًا ﴾بای توند و ڕەشەبا (کە وردە بەرد و زیخ هەڵدەگرێت)، هەورەها بەوەش ئەوترێت با فڕێی دەدات. لەو مانایەیە: ﴿ حَصَبُ جَهَنَّمَ ﴾ ، يُرْمَى ئەوەی فڕی دەدرێتە دۆزەخەوە کە سوتەمەنی دۆزەخە، وە دەوترێ: (حَصَبَ فِي الأَرْضِ) ڕۆشت (بەزەویدا وتێپەڕی) وە (الَحصَبُ) لە (الحَصْبَاءِ وَالِحْجَارَةِ) وەرگیراوە کە چەو و وردە بەردە. ﴿ تَارَةً ﴾ جارێک، کەڕەتێک، کۆکەشی (تِيَرَةٌ) و (تَارَاتٌ)ـە. ﴿ لَأَحْتَنِكَنَّ ﴾ بێگومان لە ڕەگەوە دەریان دێنم، کەسیان ناهێڵم، دەوترێت (احْتَنَكَ فلَاَنٌ مَا عِنْدَ فُلَانٍ مِنْ عِلْمٍ)[2] هەمووی وەرگرت و شارەزابوو لێی.

﴿ طَٰٓئِرَهُۥ ﴾ بەهرە و بەش، چانس و بەخت.

-ئيبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: هەموو وشەیەکی (سُلْطَانٍ) لە قورئاندا واتە: بەڵگە و دەلیل. ﴿ وَلِيٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ ﴾:کەسی نەکردووە بە یاریدەدەری خۆی (لەبەر زەبوونی تا بەیارمەتی ئەو زەبونییەکە لەسەر خۆی لابات).

٣ - باب قوله: ﴿ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴿١﴾ ﴾ الإسراء:

٤٧٠٩ - حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ ح. وَحَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا عَنْبَسَةُ، حَدَّثَنَا يُونُس، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ

---

(١) (صحب) كۆی (صاحب)ـەوە (تَجْر) كۆی (تاجِر) ە وە (رَجْل) وایەكەكۆی (راجِل) ە.

(٢) واته: هەرچی زانستی فلانە كەس بوو هەمووی فێربوو وەری گرت.

ﷺ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ بِإِيلِيَاءَ بِقَدَحَيْنِ مِنْ خَمْرٍ وَلَبَنٍ، فَنَظَرَ إِلَيْهِمَا فَأَخَذَ اللَّبَنَ قَالَ جِبْرِيلُ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَاكَ لِلْفِطْرَةِ، لَوْ أَخَذْتَ الْخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ[1].

# ٣ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (كە شەوڕەوی كرد بە بەندەی خۆی لەشەوێكدا لەمزگەوتی بەڕێزو پیرۆزەوە (كەعبە) )

**٤٧٠٩ -ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شەوەی شەو ڕەوی پێ كرا لە ئیلیا (بەیتولوقەدیس) وە دوو جامی بۆ هێنرا، یەكیان عارەق و ئەوەی تریان شیر بوو، پێغەمبەریش ﷺ سەیری هەردووكیانی كرد و شیرەكەیانی هەڵگرت، جوبرەئیل ﷺ فەرمووی سوپاس بۆ خوا كە ڕێنموونی كردی بۆسروشتی (ئیسلامەتی) ئەگەر عارەقەكەت هەڵگرتایە ئوممەتەكەت سەرلێشێواو و لاڕێ دەبوون.**

٤٧١٠ - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَمَّا كَذَّبَنِي قُرَيْشٌ قُمْتُ فِي الْحِجْرِ، فَجَلَّى اللَّهُ لِي بَيْتَ الْمَقْدِسِ فَطَفِقْتُ أُخْبِرُهُمْ عَنْ آيَاتِهِ وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَيْهِ». زَادَ يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَخِي ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَمِّهِ «لَمَّا كَذَّبَنِي قُرَيْشٌ حِينَ أُسْرِيَ بِي إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ». نَحْوَهُ[2]. ﴿قَاصِفًا ﴿٦٩﴾﴾ الإسراء: ريحٌ تَقصِفُ كلَّ شيءٍ.

**٤٧١٠ - جابیری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((كاتێ قوڕەیشیەكان باوەڕیان پێ نەكردم[3] لای حیجر (ی ئیسماعیل دا لەپەنا كەعبە)دا وەستام، خوا مزگەوتی ئەقصای هێنایە پێش**

---

(١) بڕوانە: ٣٣٩٤.

(٢) بڕوانە: ٣٨٨٦.

(٣) كە باسی ئیسراو میعراجم بۆ كردن.

چاوم، منيش دەستم كرد بەباسكردنی نیشانەكانی بۆيان و لەو كاتەدا (بەپێش چاومەوە بوو) سەیرم دەكرد)).

-یەعقوبی كوڕی ئیبراهیم وتی:كوڕی برای ئیبنو شیهاب بۆی گێڕامەوە لەمامەیەوە (بەم ڕێگەیە) ئەمەی بۆ زیاد كردووە: (كاتێ قورەیشیەكان كەشەو ڕەویم پێ كرا بۆ بەیتولموقەدیس باوەڕیان پێ نەكردم...))وەك فەرموودەكەی پێشوو دەیگێڕێتەوە.

(قاصِفاً) بایەكی توند هەموو شت تێكدەشكێنێ و وێرانی دەكات.

## ٤ - بابُ قوله تعالى: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾ ﴾ الإسراء

﴿كَرَّمْنَا ﴿٧٠﴾ ﴾ الإسراء: وَأَكْرَمْنَا وَاحِدٌ.﴿ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ﴿٧٥﴾ ﴾ الإسراء: عَذَابَ الحَيَاةِ وَعَذَابَ المَمَاتِ ﴿ خِلَٰفَكَ ﴿٧٦﴾ ﴾ الإسراء وَخَلْفَكَ سَوَاءٌ ﴿ وَنَـَٔا ﴿٨٣﴾ ﴾ الإسراء تَبَاعَدَ ﴿ شَاكِلَتِهِۦ ﴿٨٤﴾ ﴾ الإسراءنَاحِيَتِهِ، وَهْيَ مِنْ شَكْلِهِ ﴿ صَرَّفْنَا ﴿٤١﴾ ﴾ الإسراء وَجَّهْنَا ﴿ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ ﴾ الإسراء: مُعَايَنَةً وَمُقَابَلَةً، وَقِيلَ: القَابِلَةُ؛ لأَنَّهَا مُقَابِلَتُهَا وَتَقْبَلُ وَلَدَهَا ﴿ خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ ﴿١٠٠﴾ ﴾ الإسراء: أَنْفَقَ الرَّجُلُ: أَمْلَقَ، وَنَفِقَ الشَّيْءُ: ذَهَبَ ﴿ قَتُورًا ﴿١٠٠﴾ ﴾ الإسراء: مُقَتِّرًا. ﴿ لِلْأَذْقَانِ ﴿١٠٧﴾ ﴾ الإسراء: مُجْتَمَعُ اللَّحْيَيْنِ، وَالْوَاحِدُ: ذَقَنٌ. وَقَالَ مُجَاهِد: ﴿ مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ ﴾ الإسراء: وَافِرًا ﴿ تَبِيعًا ﴿٦٩﴾ ﴾ الإسراء: ثَائِرًا، وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: نَصِيرًا. ﴿ خَبَتْ ﴿٩٧﴾ ﴾ الإسراء: طَفِئَتْ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ وَلَا تُبَذِّرْ ﴿٢٦﴾ ﴾ الإسراء: لَا تُنْفِقْ فِي البَاطِلِ ﴿ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ ﴿٢٨﴾ ﴾ الإسراء: رِزْقٍ ﴿ مَثْبُورًا ﴿١٠٢﴾ ﴾ الإسراء مَلْعُونًا ﴿ وَلَا تَقْفُ ﴿٣٦﴾ ﴾ الإسراء: لَا تَقُلْ ﴿ فَجَاسُوا۟ ﴿٥﴾ ﴾ الإسراء تَيَمَّمُوا. ﴿ يُزْجِى ﴿٦٦﴾ ﴾ الإسراء: الفُلْكَ: يُجْرِي الفُلْكَ ﴿ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ ﴿١٠٩﴾ ﴾ الإسراء: لِلْوُجُوهِ.

## ٤ -باسی ئەم فەرمايشتەی خوای بەرز و بڵند: (سوێند بە خوا بێگومان ڕێزمان (لە نەوەی ئادەم) گرت)

﴿كَرَّمْنَا﴾ و (أَكْرَمْنَا) یەك مانایان هەیە، واتە: ڕێزمان گرت. ﴿ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ﴾ الإسراء: سزای ژیان و سزای مردن. ﴿خِلَٰفَكَ﴾ لەگەڵ (خَلْفَكَ) یەكسان، وە لە پاش تۆ (دەمانەوە). ﴿وَنَـَٔا﴾ دوور دەكەوێتەوە. ﴿شَاكِلَتِهِۦ﴾: شێوە و ڕێبازی خۆی ئەم وشەیە لە (شَكْلِهِ) وەرگیراوە، واتە شێوە و سروشتی خۆی. ﴿صَرَّفْنَا﴾ بەشێوەی جۆراوجۆر هێناومانە. ﴿قَبِيلًا﴾: بینینی ڕووبەڕوو، وتراوە: واتە: مامان چونكە ڕووبەڕوو ئافرەتەكە و منداڵەكە وەردەگرێ كە لە دایك بوو. ﴿خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ﴾[1] أَنْفَقَ الرَّجُلُ: هەژاركەوت، وَنَفِقَ الشَّيْءُ: ڕۆشت و تەواو بوو. ﴿قَتُورًا﴾: ڕژدە و چروكە. ﴿لِلْأَذْقَانِ﴾: شوێنی بەیەكگەیشتنی هەردوو شەویلگە، چەناكە (الأَذْقَانِ): كۆیە تاكەكەی (ذَقَنٌ)ـە. موجاهید دەڵێ: ﴿مَّوْفُورًا﴾: زۆر و زەبەند، پڕ بەپڕ. ﴿تَبِيعًا﴾ تۆڵەسێن، تۆڵە وەرگر، ئیبنو عەبباس دەڵێ: پشتیوان و یارمەتیدەر. ﴿خَبَتْ﴾: دامركا، بڵێسەی نیشتەوە. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ:﴿وَلَا تُبَذِّرْ﴾: خەرج كردنی سامان لە شتی ناڕەوادا ﴿ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ﴾ رسق و ڕۆزی ﴿مَثْبُورًا﴾ نەفرین لێكراو. ﴿وَلَا تَقْفُ﴾ مەیلێ. ﴿فَجَاسُوا۟﴾ گەڕان و ڕۆشتن. ﴿يُزْجِى﴾ الفُلْكَ: (خوا) كەشتی هاتوچۆ پێدەكات (لە دەریادا). ﴿يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ﴾: بەسەر و ڕووخساریاندا دەكەون.

---

(١) لەترسی خەرج بوون و تەواو بوون.

**بابُ قَوْلِهِ:** ﴿ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا ﴿١٧﴾ ﴾ الآية، الإسراء

**٤٧١١** - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، أَخْبَرَنَا مَنْصُورٌ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كُنَّا نَقُولُ لِلْحَيِّ إِذَا كَثُرُوا فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَمِرَ بَنُو فُلاَنٍ. حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ وَقَالَ أَمِرَ.

## باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە ئەگەر بمانەوێ (دانیشتوانی) شار و وڵاتێ لەناو ببەین خۆشگوزەران و دەوڵەمەندانی زۆر دەكەین) [1] تاكۆتای ئایەتەكە

**٤٧١١ - عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: ئێمە جاران لەسەردەمی نەفامیدا دەمان وت بە تیرەو هۆزێك ئەگەر زۆر ببونایە** (أَمِرَ بنو فلان)[2] **نەوەی فلان زۆر بوون. (ئیمامی بوخاری دەڵێ): حومەیدی بۆی گێڕاینەوە وتی: سوفیان بۆی گێڕاینەوە.. (عەبدوڵلا وتی):** (أَمِرَ).

**٥ - بابٌ:** ﴿ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴿٣﴾ ﴾ الإسراء

**٤٧١٢** - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا أَبُو حَيَّانَ التَّيْمِيُّ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ بْنِ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِلَحْمٍ، فَرُفِعَ إِلَيْهِ الذِّرَاعُ، وَكَانَتْ تُعْجِبُهُ، فَنَهَسَ مِنْهَا نَهْسَةً ثُمَّ قَالَ: «أَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَهَلْ تَدْرُونَ مِمَّ ذَلِكَ؟ يُجْمَعُ النَّاسُ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، يُسْمِعُهُمُ الدَّاعِي، وَيَنْفُذُهُمُ الْبَصَرُ، وَتَدْنُو الشَّمْسُ، فَيَبْلُغُ النَّاسَ مِنَ الْغَمِّ وَالْكَرْبِ مَا لاَ يُطِيقُونَ وَلاَ يَحْتَمِلُونَ فَيَقُولُ النَّاسُ أَلاَ تَرَوْنَ مَا قَدْ بَلَغَكُمْ؟ أَلاَ تَنْظُرُونَ مَنْ يَشْفَعُ لَكُمْ إِلَى رَبِّكُمْ؟ فَيَقُولُ بَعْضُ النَّاسِ لِبَعْضٍ عَلَيْكُمْ بِآدَمَ فَيَأْتُونَ

---

(١) بەم جۆرەش مانا كراوە: (وەكاتێ بمانەوێ (دانیشتوانی) شارو وڵاتێ لەناو ببەین، فەرمان دەدەین (بەگوێڕایەڵی و كردەوەی چاك) بەدەوڵەمەندە خراپەكار و زۆردارەكانی).

(٢) وشەی (أمِرَ) واتە: زۆر بوو.

آدَمَ ﷺ فَيَقُولُونَ لَهُ أَنْتَ أَبُو الْبَشَرِ خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ. وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، وَأَمَرَ الْمَلاَئِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلاَ تَرَى إِلَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ آدَمُ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ نَهَانِي عَنِ الشَّجَرَةِ فَعَصَيْتُهُ، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى نُوحٍ، فَيَأْتُونَ نُوحًا فَيَقُولُونَ: يَا نُوحُ إِنَّكَ أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ، وَقَدْ سَمَّاكَ اللَّهُ عَبْدًا شَكُورًا اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: إِنَّ رَبِّي ﷻ قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ قَدْ كَانَتْ لِي دَعْوَةٌ دَعَوْتُهَا عَلَى قَوْمِي، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى إِبْرَاهِيمَ، فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ، فَيَقُولُونَ: يَا إِبْرَاهِيمُ، أَنْتَ نَبِيُّ اللَّهِ وَخَلِيلُهُ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ لَهُمْ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنِّي قَدْ كُنْتُ كَذَبْتُ ثَلاَثَ كَذَبَاتٍ - فَذَكَرَهُنَّ أَبُو حَيَّانَ فِي الْحَدِيثِ - نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي اذْهَبُوا إِلَى مُوسَى، فَيَأْتُونَ مُوسَى، فَيَقُولُونَ: يَا مُوسَى أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، فَضَّلَكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلاَمِهِ عَلَى النَّاسِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنِّي قَدْ قَتَلْتُ نَفْسًا لَمْ أُومَرْ بِقَتْلِهَا، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى عِيسَى، فَيَأْتُونَ عِيسَى فَيَقُولُونَ: يَا عِيسَى أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ، وَكَلَّمْتَ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا، اشْفَعْ لَنَا، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ عِيسَى: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ - وَلَمْ يَذْكُرْ ذَنْبًا - نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي اذْهَبُوا إِلَى مُحَمَّدٍ ﷺ فَيَأْتُونَ مُحَمَّدًا ﷺ فَيَقُولُونَ: يَا مُحَمَّدُ أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ وَخَاتَمُ الأَنْبِيَاءِ، وَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَأَنْطَلِقُ فَآتِي تَحْتَ الْعَرْشِ، فَأَقَعُ سَاجِدًا لِرَبِّي ﷻ ثُمَّ يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَيَّ مِنْ مَحَامِدِهِ وَحُسْنِ الثَّنَاءِ عَلَيْهِ شَيْئًا لَمْ يَفْتَحْهُ عَلَى أَحَدٍ قَبْلِي، ثُمَّ يُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ، سَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَرْفَعُ رَأْسِي، فَأَقُولُ أُمَّتِي يَا رَبِّ، أُمَّتِي يَا رَبِّ فَيُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ، أَدْخِلْ مِنْ أُمَّتِكَ مَنْ لاَ حِسَابَ عَلَيْهِمْ مِنَ الْبَابِ الأَيْمَنِ مِنْ أَبْوَابِ

الْجَنَّةِ وَهُمْ شُرَكَاءُ النَّاسِ فِيمَا سِوَى ذَلِكَ مِنَ الأَبْوَابِ، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ مَا بَيْنَ الْمِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الْجَنَّةِ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَحِمْيَرَ، أَوْ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَبُصْرَى»[١].

## ٥ - باسێک: (ئەی نەوەی ئەو کەسانەی کە لەگەڵ نووح ﷺ (لە کەشتیدا) هەڵمان گرتن، بەڕاستی ئەو (نووح ﷺ) بەندەیەکی زۆر سوپاس گوزار بوو)

**٤٧١٢ -ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گۆشتیان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجا دەستێکیان پێدا - حەزی لەدەستی ئاژەڵ بوو - جا قەپێکی لێ گرت، لە پاشان فەرمووی: ((من گەورەی هەموو خەڵکم لە ڕۆژی دواییدا، ئایا دەزانن ئەوە بە هۆی چییەوەیە؟ هەموو خەڵکی پێشینان و پاشینان لەدەشتێکی فراواندا کۆدەکرێنەوە، دەنگی جاڕدەر دەگاتە گوێی هەمووان، چاویش هەموویان دەبینێت، خۆریش نزیك دەبێتەوە، ئەوسا خەڵکی تووشی غەم پەژارەیەك دەبن کەبەرگەی ناگرن و لە توانایاندا نییە، ئەنجا خەڵکی (هەندێکیان بە هەندێکیان)[٢] دەڵێن: ئایا نابینن نارەحەتیتان گەشتۆتە چ ڕادەیەك؟ ئایا ناگەڕێن بەدوای کەسێکدا لای پەروەردگارتان تکاتان بۆ بکات. جا هەندێك خەڵك بە بەهەندێکی تریان دەڵێن: بڕۆین بۆ لای ئادەم ﷺ، ئینجا دەڕۆن بۆ لای ئادەم ﷺ و پێی دەڵێن: (ئەی ئادەم) تۆ باوکی مرۆڤەکانیت، خوا بە دەستی خۆی دروستی کردویت، لەڕوحی خۆی گیانی بەبەردا کردووی، وەفەرمانی کرد بە فریشتەکان کڕنوشیان بۆ بردی، لای پەروەردگارت تکامان بۆ بکە، ئایا نابینی ئێمە لە چ نارەحەتیەك داین؟ ئایا نابینی نارەحەتیمان گەشتۆتە چ ڕادەیەك؟ ئادەمیش ﷺ دەڵێ: بێگومان پەروەردگارم (ئەمڕۆ) بەڕادەیەك تورە بووە کە**

---

(١) بڕوانە: ٣٣٤٠.

(٢) ئەم زیادەیە لە صەحیحی موسلیم دایە.

پێشتر بەو شێوە تورە نەبووە و دواتریش بەوشێوە تورە نابێت، خوا (خواردنی) ئەو درەختەی لەمن قەدەغە کرد منیش سەرپێچیم کرد (و خواردم)، هەر خەمی خۆمە هەرخەمی خۆمە هەر خەمی خۆمە (تکای بۆبکەم)، برۆن بۆ لای یەکێکی تر جگەلە من، برۆن بۆ لای نووح ﷺ، ئەنجا دەرۆن بۆ لای نووح ﷺ و پێی دەڵێن: ئەی نووح بێگومان تۆ یەکەم پێغەمبەری نێردراوی بۆلای خەڵکی سەر زەوی، وە خوا بەبەندەی سوپاس گوزار ناوی ناوی ، لای پەروەردگارت تکامان بۆ بکە، ئایا نابینی ئێمە لەچ ناڕەحەتیەك داین؟ نووحیش دەڵێ: بێگومان پەروەردگارم ﷻ (ئەمڕۆ) بە ڕاددەیەك تورە بووە کە پێشتر بەو شێوەی تورە نەبووە و دواتریش بەو شێوە تورە نابێت، وە بەڕاستی من یەك دوعا و نزام هەبوو ئەو دوعایەشم لەگەلەکەم کرد. من هەر خەمی خۆمە هەر خەمی خۆمە هەر خەمی خۆمە، برۆن بۆ لای یەکێکی تر جگە لە من، برۆن بۆلای ئیبراهیم ﷺ ئەنجا دەرۆن بۆ لای ئیبراهیم ﷺ و پێی دەڵێن: ئەی ئیبراهیم تۆ پێغەمبەری خوایت وخۆشەویستی ئەوی لە ناو خەڵکی سەر زەویدا، لای پەروەردگارت تکامان بۆ بکە، ئایا نابینی ئێمە لە چ ناڕەحەتیەك داین؟ ئیبراهیمش پێیان دەڵێ: بێگومان پەروەردگارم (ئەمڕۆ) بەڕاددەیەك تورە بووە کەپێشتر بەو شێوە تورە نەبووەو دواتریش بەو شێوە تورە نابێت. بەڕاستی من لە ڕابردوودا سێ درۆم کرد - جا ئەبو حەییان لە فەرموودەکەدا باسی کردن - (ئیبراهیم وتی) من هەر خەمی خۆمە هەر خەمی خۆمە هەر خەمی خۆمە، برۆن بۆ لای کەسێکی تر جگە لە من، برۆن بۆ لای مووسا ﷺ، ئەنجا دەرۆن بۆلای مووسا ﷺ وپێی دەڵێن: ئەی مووسا تۆ پێغەمبەری خوایت، خوای گەورە بە پەیامەکەی و قسەکردنی لەگەڵتدا ڕێزی داوی بەسەر هەموو خەڵکیدا، لای پەروەردگارت تکامان بۆ بکە، ئایا نابینی ئێمە لەچ ناڕەحەتیەك داین؟ مووساش ﷺ دەڵێ: بێگومان پەروەردگارم (ئەمڕۆ) بەڕادەیەك تورە بووە

كە پێشتر بەو شێوە تورە نەبووە دواتریش بەو شێوە تورە نابێت، وەبەڕاستی من کەسێکم کوشت کە فەرمانم پێنەکرابوو بەکوشتنی، من هەر خەمی خۆمە هەرخەمی خۆمە هەر خەمی خۆمە، بڕۆن بۆ لای کەسێکی تر جگە لە من، بڕۆن بۆ لای عیسا ﷺ، جا دەڕۆن بۆ لای عیسا ﷺو پێی دەڵێن: ئەی عیسا تۆ پێغەمبەری خوایت وە فەرمایشتی خوایت کە ناردوویەتی بۆ مەریەم، وە لە خۆیەوە ڕووحت پێ بەخشراوە، وە لە بێشکەدا قسەت لەگەڵ خەڵکیدا کردووە، (لای پەروەردگارت) تکامان بۆ بکە، ئایا نابینی ئێمە لەچ نارەحەتیەك داین؟ عیسا ﷺ دەڵێ: بێگومان پەروەردگارم (ئەمڕۆ) بەرادەیەك تورە بووە کەپێشتر بەو شێوە تورە نەبووە دواتریش بەو شێوە تورە نابێت - هیچ تاوانێکی خۆی باس نەکرد - من هەر خەمی خۆمە هەرخەمی خۆمە هەر خەمی خۆمە. بڕۆن بۆ لای کەسێکی تر جگە لە من، بڕۆن بۆ لای موحەممەد ﷺ، ئەنجا دەڕۆن بۆ لای موحەممەد ﷺ و پێی دەڵێن: ئەی موحەممەد تۆ پێغەمبەری خوایت کۆتایی پێغەمبەرانی و بێگومان خوا لە گوناهەکانی ڕابردوو و داهاتووت خۆش بووە، لای پەروەردگارت تکامان بۆ بکە، ئایا نابینی ئێمە لەچ نارەحەتیەك داین؟ منیش بەخێرایی دەردەچم و دەڕۆمە ژێر عەرش دەکەوم بە سوژدەدا بۆ پەروەردگارم ﷻ لە پاشان خوای گەورە فێری جۆرە سوپاس و ستایش کردنی پیرۆز و جوانی خۆیم دەکات، کە فێری هیچ کەسی نەکردووە لە پێش مندا. پاشان دەوترێت پێم: ئەی موحەممەد سەرت بەرزکەرەوە داوا بکە دەتدرێتێ، تکا بکە لێت وەردەگیرێ، منیش سەرم بەرز دەکەمەوە و دەڵێم: ئەی پەروەردگارم ئوممەتەکەم ئەی پەروەردگارم ئوممەتەکەم، جا پێم دەوترێت: ئەی موحەممەد لە ئوممەتەکەت و ئەوانەی لێپرسینەوەیان لەسەر نییە لە

دەرگای ڕاستی دەرگاکانی بەهەشتەوە بیانخەرە ناو بەهەشتەوە[1]، ئەوانە جگە لەم دەرگا لە دەرگاکانی تری بەهەشتیشدا بەشدارن لەگەڵ خەڵکیدا. لە پاشان (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((وە سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، بێگومان نێوان دوو لاشیپانی دەرگاکانی بەهەشت وەك نێوانی مەککە و حیمیەر پانە))، یان ((وەك نێوان مەککەو بوصرا پانە)).

## ٦ - بابُ قوله: ﴿وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾﴾ الإسراء

٤٧١٣ - حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خُفِّفَ عَلَى دَاوُدَ الْقِرَاءَةُ، فَكَانَ يَأْمُرُ بِدَابَّتِهِ لِتُسْرَجَ، فَكَانَ يَقْرَأُ قَبْلَ أَنْ يَفْرُغَ». يَعْنِي: الْقُرْآنَ[2].

## ٦-باسی ئە فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە زەبورمان بەخشی بە داوود ﷺ)

٤٣١٣ - ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خوێندنەوەی (ی زەبور) بۆ داوود ﷺ ئاسان کرابوو، جا ئەو فەرمانی دەکرد وڵاخەکەی زێن کرێ، جا (هەموو زەبووری) دەخوێندەوە پێش ئەوەی (زێن کردنەکە) تەواو ببێت))، مەبەستی خوێندنەوەی زەبورە [3].

(١) کە حەفتا هەزار کەسن.

(٢) بڕوانە: ٢٠٧٣.

(٣) مەبەست لە وشەی (القرآن) خوێندنەوەیە نەك قورئانی پیرۆز، خوێنراوەکەش زەبوورە.

## ٧ - بابٌ: ﴿ قُلِ ٱدْعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾ ﴾ الإسراء

٤٧١٤ - حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ: ﴿ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ ﴿٥٧﴾ ﴾ الإسراء. قَالَ: كَانَ نَاسٌ مِنَ الإِنْسِ يَعْبُدُونَ نَاسًا مِنَ الْجِنِّ، فَأَسْلَمَ الْجِنُّ، وَتَمَسَّكَ هَؤُلاَءِ بِدِينِهِمْ. زَادَ الأَشْجَعِيُّ عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ. ﴿ قُلِ ٱدْعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم ﴿٥٦﴾ ﴾ الإسراء[1].

## ٧ -ئەمە باسێکە: (ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ (بێ باوەڕان) هاوار بکەن لە ئەوانەی کە ئێوە بەخواتان دەزانین بێجگە لە خوا، جا ئەوانە دەسەڵاتیان نیە بەڵاو و زیانتان لەسەر لابەن وە (دەسەڵاتی) گۆڕانیشیان نییە[2])

**٤٧١٤ - عەبدوڵڵا دەربارەی ئەم ئایەتە: (هۆکارێك لای پەروەردگاریان) دەڵێ: ئەوانە خەڵکانێك بوون لە مرۆڤەکان چەن کەسێکی جنۆکەیان دەپەرست، ئەنجا جنۆکەکان مسوڵمان بوون، بەڵام ئا ئەوانە (مرۆڤەکان کە جنۆکەیان دەپەرست) دەستیان گرت بەئاینەکەیانەوە.**

**- ئەشجەعی لە سوفیانەوە لە ئەعمەشەوە ئەم زیادەیی هێناوە: (ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ (بێباوەڕان) هاوار بکەن لە ئەوانەی کە ئێوە بەخواتان دەزانین).**

---

(١) بڕوانە: ٤٧١٥.

(٢) واتە، دەسەڵاتیان نییە بەڵا و زیان لە ئێوە لادەن و بیدەن بەسەر کەسانی تردا.

**٨ - بابُ قوله:** ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴿٥٧﴾ ﴾ الإسراء، الآية

٤٧١٥ - حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ خَالِدٍ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ فِي هَذِهِ الآيَةِ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴿٥٧﴾ ﴾ الإسراء، قَالَ: نَاسٌ مِنَ الْجِنِّ كَانُوا يُعْبَدُونَ فَأَسْلَمُوا[1].

## ٨ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەوانەی کە ئەو (نەفامانە) هاواریان لێ دەکەن، ئەوانە بەدوای هۆکارێکدا دەگەڕێن کە نزیکیان کاتەوە لە پەروەردگاریان) تاکۆتایی ئایەتەکە

**٤٧١٥ - عەبدوڵڵا دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێ: (ئەوانەی کە ئەو (نەفامانە) هاواریان لێ دەکەن ئەوانە بەدوای هۆکارێکدا دەگەڕێن کە نزیکیان کاتەوە لە پەروەردگاریان)، وتی: ئەوانە کەسانێك بوون لە جنۆکە دەپەرستران، ئینجا مسوڵمان بوون[2].**

**٩ - بابٌ:** ﴿ وَمَا جَعَلۡنَا ٱلرُّءۡيَا ٱلَّتِيٓ أَرَيۡنَٰكَ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلنَّاسِ ﴿٦٠﴾ ﴾ الإسراء

٤٧١٦ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ ﴿ وَمَا جَعَلۡنَا ٱلرُّءۡيَا ٱلَّتِيٓ أَرَيۡنَٰكَ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلنَّاسِ ﴿٦٠﴾ ﴾ الإسراء: قَالَ: هِيَ رُؤْيَا عَيْنٍ أُرِيَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ ﴿ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلۡمَلۡعُونَةَ ﴿٦٠﴾ ﴾ الإسراء: شَجَرَةُ الزَّقُّومِ[3].

---

(١) بروانە: ٤٧١٤.

(٢) واتە: جنۆکەکان مسوڵمان بوون.

(٣) بروانە: ٣٨٨٨.

## ٩ - باسێک: (وه ئەو خەو بینینەی کە پیشانی تۆمان دا (لەو شەو ڕەویەدا) هەر لەبەر تاقیکردنەوەی خەڵکی بوو)

**٤٧١٦ ـئیبنو عەبباس ﷺ دەربارەی ئەم ئایەتە (وە ئەو خەو بینینەی کە پیشانی تۆمان دا (لەو شەو ڕەویەدا) هەر لەبەر تاقیکردنەوەی خەڵکی بوو)، وتی: بریتی بوو لە بینین بە چاو لەو شەوەدا شەو ڕەوی بە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا، پیشانی درا (وە درەختە نەفرین لێکراوەکەش) دەرەختی زەقوم بوو.**

١٠ - **بابُ قوله:** ﴿ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ ﴾ الإسراء

قَالَ مُجَاهِدٌ:﴿ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ﴿٧٨﴾ ﴾ الإسراء

صَلَاةَ الفَجْرِ.

٤٧١٧ - حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ وَابْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «فَضْلُ صَلاَةِ الْجَمِيعِ عَلَى صَلاَةِ الْوَاحِدِ خَمْسٌ وَعِشْرُونَ دَرَجَةً، وَتَجْتَمِعُ مَلاَئِكَةُ اللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةُ النَّهَارِ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ». يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ ﴿ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ ﴾ الإسراء[1].

## ١٠ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (بەڕاستی قورئان (خوێندنی نوێژی بەیانیان) هەمیشە دەبینرێت (لە لایەن فریشتەکانی شەو ڕۆژەوە))

**ـموجاهید دەڵێ: ﴿ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ﴾: واتە: نوێژی بەیانی.**

---

(١) بروانە: ١٧٦.

٤٧١٧ - ئەبو سەلەمە و ئیبنو لموسەییەب لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمووی: ((فەزڵ وگەورەیی نوێژی جەماعەت بەسەر نوێژی کەسێك بەتەنها، بیست وپێنج پلەیە، وە فریشتەکانی شەو فریشتەکانی ڕۆژ لە نوێژی بەیانیدا کۆدەبنەوە وبەیەك دەگەن))، وە ئەبو هوڕەیرە دەڵێ: ئەگەر دەتانەوێ (ڕاستی ئەم فەرمووده بزانن) ئەم ئایەتە بخوێننەوە: (بێگومان نوێژی بەیانی فریشتەکان ئامادەی دەبن).

١١ - **بابُ قوله:** ﴿ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴿٧٩﴾ ﴾ الإسراء

٤٧١٨ - حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبَانَ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ آدَمَ بْنِ عَلِيٍّ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ إِنَّ النَّاسَ يَصِيرُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ جُثًا، كُلُّ أُمَّةٍ تَتْبَعُ نَبِيَّهَا، يَقُولُونَ يَا فُلاَنُ اشْفَعْ، حَتَّى تَنْتَهِيَ الشَّفَاعَةُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَذَلِكَ يَوْمَ يَبْعَثُهُ اللَّهُ الْمَقَامَ الْمَحْمُودَ[1].

## ١١ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (بەڵکو پەروەردگارت بتگەیەنێتە پلەو جێگایەکی پەسەندکراو)

٤٧١٨ -ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: بێگومان خەڵکی لە ڕۆژی قیامەت دا دەبن بە چەند کۆمەڵێکەوە، هەر ئوممەتێك شوێن پێغەمبەرەکەیان دەکەون، دەڵێن: ئەی فلانەکەس تکامان بۆ بکە (کەسیان تکایان بۆناکەن) هەتا تکا کردنەکە دەگاتە پێغەمبەر ﷺ، ئەوە ئەو ڕۆژەیە خوای گەورە پێغەمبەر ﷺ دەگەیەنێتە پلە و جێگای پەسەندکراو.

٤٧١٩ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَيَّاشٍ،حَدَّثَنَا شُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ

(١) بروانە: ١٤٧٥.

النِّدَاءَ اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[1].

رَوَاهُ حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النبِيِّ ﷺ[2].

**٤٧١٩ - جابیری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەركەس كاتێ گوێی لە بانگە بڵێت: ئەی خودایە، پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوە (كە یەكتاپەرستیە)، وە ئەم نوێژە كە ئەنجام دەدرێت، پلەی بەرز و بڵند بدە بە موحەممەد و بیبەرە ئەو جێگا پەسەندەی كە خۆت بەڵێنت پێداوە، ئەو كەسە لە ڕۆژی دواییدا تكا و شەفاعەتی من دەیگرێتەوە.**

**- (ئەم فەرموودەیە) حەمزەی كوڕی عەبدوڵلا گێڕاویەتیەوە لە باوكیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

## ١٢ - **بابٌ:** ﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾ ﴾ الإسراء

يَزْهَقُ: يَهْلِكُ.

٤٧٢٠ - حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ مَكَّةَ وَحَوْلَ الْبَيْتِ سِتُّونَ وَثَلَاثُمِائَةِ نُصُبٍ فَجَعَلَ يَطْعُنُهَا بِعُودٍ فِي يَدِهِ وَيَقُولُ: ﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾ ﴾ الإسراء: ﴿ قُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ ﴾ سبأ[3].

(١) بڕوانە: ٦١٤.
(٢) بڕوانە: ١٤٧٤.
(٣) بڕوانە: ٢٤٧٨.

## ١٢ - باسێک: (وە بڵێ ئایینی ڕاست هات و ئایینی ناحەق و بەتاڵ نەماو و ڕۆشت بەڕاستی بەتاڵ هەمیشە لەناوچووە)

٤٧٢٠ - عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە ناو شاری مەککە و بەچوار دەوری کەعبەدا سێ سەد و شەست بتی تێدابوو، جا پێغەمبەر ﷺ بەدارێك کە بەدەستیەوە بوو دەستی کرد بەپیاکێشانیان و دەیفەرموو: ((ئایینی ڕاست هات و ئایینی ناحەق و بەتاڵ نەما و ڕۆشت))، ((بڵێ (ئاینی) ڕاست هات و بەتاڵ (نەما) و دروست نابێتەوە و ناگەڕێتەوە)).

### ١٣ - بابٌ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء

٤٧٢١ - حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: بَيْنَا أَنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي حَرْثٍ وَهْوَ مُتَّكِئٌ عَلَى عَسِيبٍ إِذْ مَرَّ الْيَهُودُ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: سَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ، فَقَالَ: مَا رَابَكُمْ إِلَيْهِ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ يَسْتَقْبِلُكُمْ بِشَيْءٍ تَكْرَهُونَهُ فَقَالُوا: سَلُوهُ. فَسَأَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ فَأَمْسَكَ النَّبِيُّ ﷺ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِمْ شَيْئًا، فَعَلِمْتُ أَنَّهُ يُوحَى إِلَيْهِ، فَقُمْتُ مَقَامِي، فَلَمَّا نَزَلَ الْوَحْيُ قَالَ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء[1].

## ١٣ - باسێک: (وە (ئەی موحەممەد ﷺ) پرسیارت لێ دەکەن لە بارەی ڕۆحەوە (کەچی یە))

٤٧٢١ -عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: لەکاتێکدا من لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووم لە ناو کێڵگەیەکدا پێغەمبەر ﷺ خۆی دابوو بەسەر پەلی دار خورمایەکدا لەپڕ

(١) بروانە: ١٢٥.

چەند جوولەکەیەك تێپەڕین، بەهەندێکی تریان وت: (پرسیاری لێ مەکەن) نەوەك بەشتێك ڕووبەڕووتان بێتەوە کە پێتان ناخۆشە، وتیان: پرسیاری لێ بکەن جا پرسیاریان لێ کرد لەبارەی ڕوحەوە، پێغەمبەریش ﷺ قسەی نەکرد و هیچ وەڵامێکی نەدانەوە، ئیتر زانیم کە نیگای بۆ دێت بۆیە لەجێگای خۆم وەستام ئینجا کە نیگا دابەزی فەرمووی: (وە (ئەی موحەممەد ﷺ) پرسیارت لێ دەکەن لە بارەی ڕوحەوە (کەچییە)؟ بڵێ ڕۆح لەکارو فەرمانی تایبەت بە پەروەردگارمە، وە ئێوە تەنها کەمێك لە زانیاریتان پێ بەخشراوە).

## ١٤ - بابٌ: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء

٤٧٢٢ - حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، حَدَّثَنَا أَبُو بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء: قَالَ: نَزَلَتْ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُخْتَفٍ بِمَكَّةَ، كَانَ إِذَا صَلَّى بِأَصْحَابِهِ رَفَعَ صَوْتَهُ بِالْقُرْآنِ فَإِذَا سَمِعَهُ الْمُشْرِكُونَ سَبُّوا الْقُرْآنَ وَمَنْ أَنْزَلَهُ، وَمَنْ جَاءَ بِهِ، فَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى لِنَبِيِّهِ ﷺ: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء: أَيْ: بِقِرَاءَتِكَ، فَيَسْمَعَ الْمُشْرِكُونَ، فَيَسُبُّوا الْقُرْآنَ، ﴿وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء: عَنْ أَصْحَابِكَ فَلَا تُسْمِعُهُمْ ﴿وَابْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء[1].

## ١٤ - باسێک: (لە نوێژکردنتدا دەنگ بەرز مەکەرەوە و بە نهێنیش مەیکە)

٤٧٢٢ - ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (لە نوێژکردنتدا دەنگ بەرز مەکەرەوە و بە نهێنیش مەیکە) دەڵێ: کاتێ دابەزی

(١) بروانە: ٧٤٩٠، ٧٥٢٥، ٧٥٤٧.

کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەدا خۆی دەشاردەوە [1] کە پێشنوێژی بۆ هاوەڵانی دەکرد بە قورئان خوێندنەکەی دەنگی بەرز دەکردەوە، جا کە بتەپەرستان گوێیان لێی دەبوو جنێویان دەدا بە قورئان و ئەوەی دایبەزاندووە و ئەوەشی هێناویەتی، بۆیە خوای بەرز و بڵندیش فەرمووی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ: (لە نوێژکردنتدا دەنگ بەرز مەکەرەوە)، واتە: بە قورئان خوێندنت، جا هاوبەش دانەران گوێبیستی دەبن و جنێو دەدەن بە قورئان (وە بەنهێنیش مەیکە) کە هاوەڵەکانت لێت نەبیستن (لەو نێوانەدا ڕێگایەك هەڵبژێرە).

٤٧٢٣ - حَدَّثَنِي طَلْقُ بْنُ غَنَّامٍ، حَدَّثَنَا زَائِدَةُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: أُنْزِلَ ذَلِكَ فِي الدُّعَاءِ[2].

٤٧٢٣ - عائیشە ﵂ دەڵێ: ئەو ئایەتە[3] دەربارەی دوعا و نزا دابەزی.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١٨ - سورة الكَهْف

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿تَّقْرِضُهُمْ ﴿١٧﴾﴾ الكهف، تَتْرُكُهُمْ. ﴿وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٌ ﴿٣٤﴾﴾ الكهف، ذَهَبٌ وَفِضَّةٌ. وَقَالَ غَيْرُهُ: جَمَاعَةُ الثَّمَرِ. ﴿بَٰخِعٌ ﴿٦﴾﴾ الكهف، مُهْلِكٌ ﴿أَسَفًا ﴿٦﴾﴾ الكهف، نَدَمًا. الكَهْفُ: الفَتْحُ فِي الجَبَلِ. وَالرَّقِيمُ: الكِتَابُ، ﴿مَّرْقُومٌ ﴿٩﴾﴾ المطففين: مَكْتُوبٌ مِنَ الرَّقْمِ

---

(١) لەسەرتای ئیسلام دا.

(٢) بڕوانە: ٦٣٢٧، ٧٥٢٦.

(٣) (ولا تجهر بصلاتك ولا تخافت بها) تاکۆتایی ئایەتەکە.

﴿ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴿١٤﴾ ﴾ الكهف، أَلْهَمْنَاهُمْ صَبْرًا.: ﴿ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا ﴿١٠﴾ ﴾ القصص ﴿ شَطَطًا ﴿١٤﴾ ﴾ الكهف، إِفْرَاطًا. (الْوَصِيدِ): الفِنَاءُ جَمْعُهُ وَصَائِدُ وَوُصُدٌ وَيُقَالُ: الوَصِيدُ البَابُ. ﴿ مُّؤْصَدَةٌ ﴿٢٠﴾ ﴾ البلد مُطْبَقَة آصَدَ البَابَ وَأَوْصَدَ ﴿ بَعَثْنَٰهُمْ ﴿١٩﴾ ﴾ الكهف، أَحْيَيْنَاهُمْ ﴿ أَزْكَىٰ ﴿١٩﴾ ﴾ الكهف، أَكْثَرُ، وَيُقَالُ: أَحَلُّ، وَيُقَالُ: أَكْثَرُ رِيعًا. قَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِم ﴿٣٣﴾ ﴾ الكهف: لَمْ تَنْقُصْ. وَقَالَ سَعِيدٌ عَنِ ابن عَبَّاسٍ: (الرَّقِيمُ) اللَّوْحُ مِنْ رَصَاصٍ، كَتَبَ عَامِلُهُمْ أَسْمَاءَهُمْ ثُمَّ طَرَحَهُ فِي خِزَانَتِهِ، فَضَرَبَ اللهُ عَلَى آذَانِهِمْ فَنَامُوا. وَقَالَ غَيْرُهُ: وَأَلَتْ تَئِلُ تَنْجُو. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ مَوْئِلًا ﴿٥٨﴾ ﴾ الكهف، مَحْرِزًا ﴿ لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا ﴿١٠١﴾ ﴾ الكهف: لَا يَعْقِلُونَ.

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٨ - (تەفسیری) سورەتی کەهف

**-موجاهید دەڵێ ﴿ تَّقْرِضُهُمْ ﴾ لای دەدا لێیان، لێیان تێپەڕ دەبێ.﴿ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٌ ﴾[1] ئاڵتون و زیو جگە لە موجاهید دەڵێ: هەموو جۆرەکانی ماڵ و سامانی مەبەستە. ﴿ بَٰخِعٌ ﴾لەناوبەر، کوژەر. ﴿ أَسَفًا ﴾ لە پەشیمانی دا (لە خەم و خەفەتدا) (الكَهْفُ) ئەشکەوت، غار (الرَّقِيمُ) تابلۆ (ئەو بەردەی ناویانی تیا نوسرابوو). ﴿ مَّرْقُومٌ ﴾ نوسراو لە (الرَّقْمِ) وەرگێراوە بەمانای نوسینە. ﴿ وَرَبَطْنَا**

---

(١) ئیبنو عامیر و ئیبنو کەسیر و نافیع و حەمزە و کیسائی بە: ﴿ ثُمُرٌ ﴾ خوێندویانەتەوە، عاسیم و ئەبو جەعفەر و یەعقوب بە ﴿ ثَمَرٌ ﴾ خوێندویانەتەوە، ئەبو عەمریش بە ﴿ ثُمْرٌ ﴾ خوێندویەتیەوە.

عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴾ دڵەكانیانمان بەهێزكرد بەدان بەخۆداگرتن.﴿ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا ﴾[1] ﴿ شَطَطًا ﴾: تێپەڕاندن (الْوَصِيدِ) بۆشایی كۆكەی (وَصَائِدُ) و (وُصُدٌ) وە (الوصید) بەمانای دەرگایە، ﴿ مُّؤْصَدَةٌ ﴾ داخراو، بەسراو. لە (آصَدَ البَابَ وَأَوْصَدَ)[2] ﴿ بَعَثْنَٰهُمْ ﴾ زیندوومان كردنەوە. ﴿ أَزْكَىٰ ﴾ زۆرتر وە بەمانای حەڵاڵ تریش وتراوە، هەروەها وتراوە بەمانای زۆرتر گەشەكردن و گەورە بوونە.ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِم ﴾ كەم نەبۆتەوە. سەعید دەڵێ: لە ئیبنو عەبباسەوە: (الرَّقِيمُ ) تابلۆیەك لە قورقوشم بەرپرسەكەیان ناوەكانی نوسین، پاشان خستیە ناو گەنجینەكەیەوە، ئەنجا خوا پەردەی دا بەسەر گوێیاندا و خەوتن. جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: وَأَلَتْ تَئِلُ: ڕزگاری دەبێ. موجاهید دەڵێ: ﴿ مَوْئِلًا ﴾ پەناگایەك. ﴿ لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا ﴾ تێناگەن.

## ١ - بابٌ: ﴿ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَىْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾ ﴾ الكهف

٤٧٢٤ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَلِيُّ بْنُ حُسَيْنٍ أَنَّ حُسَيْنَ بْنَ عَلِيٍّ أَخْبَرَهُ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طَرَقَهُ وَفَاطِمَةَ قَالَ: «أَلَا تُصَلِّيَانِ؟».

## ١ - باسێک: (ئادەمی لە هەموو شتێ زیاتر موجادەلە دەکات)

٤٧٢٤ - عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك هات بۆلای ئەو (عەلی) و فاتیمە و فەرمووی: ((ئەوە هەردووكتان هەڵناسن شەونوێژ بكەن؟)).

---

(١) واتە ئەگەر ئۆقرەمان نەدایە بەدڵی.

(٢) ئەو دوو وشەیە (آصَدَ) و (أوصَدَ) هەردووكیان بەمانای داخستن و پێودانی دەرگا دێن (مؤصدة) لەو دووانەوە هاتووە و وەرگیراوە.

﴿ رَجۡمَۢا بِٱلۡغَيۡبِ ﴿٢٢﴾ ﴾ الكهف: لَمْ يَسْتَبِنْ. ﴿ فُرُطًا ﴿٢٨﴾ ﴾ الكهف: نَدَمًا ﴿ سُرَادِقُهَا ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف: مِثْلُ السُّرَادِقِ، وَالْحُجْرَةِ الَّتِي تُطِيفُ بِالْفَسَاطِيطِ، ﴿ يُحَاوِرُهُۥٓ ﴿٣٤﴾ ﴾ الكهف: مِنَ الْمُحَاوَرَةِ ﴿ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي ﴿٣٨﴾ ﴾ الكهف: أَيْ: لَكِنْ أَنَا هُوَ اللَّهُ رَبِّي، ثُمَّ حَذَفَ الأَلِفَ وَأَدْغَمَ إِحْدَى النُّونَيْنِ فِي الأُخْرَى. ﴿ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا ﴿٣٣﴾ ﴾ الكهف: يقول: بينهما نهراً ﴿ زَلَقًا ﴿٤٠﴾ ﴾ الكهف: لاَ يَثْبُتُ فِيهِ قَدَمٌ. ﴿ هُنَالِكَ ٱلۡوَلَٰيَةُ ﴿٤٤﴾ ﴾ الكهف: مَصْدَرُ وَلِيَ الْوَلِيُّ ولاء. ﴿ عُقۡبٗا ﴿٤٤﴾ ﴾ الكهف: عَاقِبَةٌ وَعُقْبَى وَعُقْبَةٌ وَاحِدٌ، وَهْيَ الآخِرَةُ ﴿ قِبَلاً ﴾ وَ ﴿ قُبُلٗا ﴿٥٥﴾ ﴾ الكهف: وَقَبَلاً: اسْتِئْنَافًا. ﴿ لِيُدۡحِضُواْ ﴿٥٦﴾ ﴾ الكهف:لِيُزِيلُوا، الدَّحْضُ الزَّلَقُ.

**﴿ رَجۡمَۢا بِٱلۡغَيۡبِ ﴾ لای ڕوون نەبوو (قسەی بێ بەڵگە). ﴿ فُرُطًا ﴾ پەشیمانی. ﴿ سُرَادِقُهَا ﴾ (چوار دەوریان دەدات) وەك ڕەشماڵ و دەوار، (یان وەك ئەو دیوارەی بە چواردەوری ڕەشماڵ و دەوارەدایە [1]. ﴿ يُحَاوِرُهُۥٓ ﴾ لە (مُحَاوَرَة)ـەوە هاتوە (بەمانای گفت و گۆ و قسە لەگەڵ کردن دێت). ﴿ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي ﴾ واتە: بەڵام من ئەو خودایە پەروەردگارمە، لە پاشان ئەلیفەکە (أ) لابراوە، نونێکیان لە نونەکەی پاشی خۆیدا تێهەڵکێش کراوە[2]. ﴿ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا ﴾ دەڵێ: لە نێوانیاندا کانیاوەیکمان هەڵقوڵاندووە. ﴿ زَلَقًا ﴾ (ساف و خلیسك) پێی لەسەر ڕاناوەستێ. ﴿ هُنَالِكَ ٱلۡوَلَٰيَةُ ﴾ چاوگی وشەی (الْوَلِيِّ)ـە واتە: پشتیوان و یارمەتیدەر. ﴿ عُقۡبٗا ﴾ سەرئەنجام، دوارِۆژ (عُقْبَى) و (عُقْبَةٌ) بەیەك مانا دێن کە ڕۆژی دواییە.**

---

(١) بيضاوي لە تەفسیری ﴿ سُرَادِقُهَا ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف دەڵێ: فسطاطها، وقيل السرادق الحجرة التي تكون حول الفسطاط، وقيل سرادقها دخانها وقيل حائط من نار. واتە: ﴿ سُرَادِقُهَا ﴾ وەک ڕەشماڵ و دەوارە، وە وتراوە ﴿ سُرَادِقُهَا ﴾ ئەو دیوارەیە بە چواردەوری ڕەشماڵ و دەوار دایە، وە وتراوە ﴿ سُرَادِقُهَا ﴾ دوکەڵی ئاگرەکەیە، وە وتراوە دیوارێکە لە ئاگر. (تفسير البيضاوي المسمى بأنوار التنزيل وأسرار التأويل:٣/٤٩٤ ).

**(٢) واتە، (لكن انا) بووە سەرەتا ئەلفەکە لابراوە بوومتە (لكن نا) پاشان نونەکان تێ هەڵکێش کراون بوومتە (لكنا).**

﴿ قِبَلاً ﴾ وَ﴿ قُبُلًا ﴾ (قَبَلاً) دەست پێكردنەوە، دووبارە بوونەوە. ﴿ لِيُدۡحِضُواْ ﴾ لەناوی بەرن پوچەڵی بكەنەوە. (الدَّحْضُ ) ساف و خلیسك.

## ٢ - بابٌ: ﴿ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبۡرَحُ حَتَّىٰٓ أَبۡلُغَ مَجۡمَعَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ أَوۡ أَمۡضِيَ حُقُبٗا ﴿٦٠﴾ ﴾ الكهف، زَمَانًا، وَجَمْعُهُ: أَحْقَابٌ.

٤٧٢٥ - حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ قَالَ قُلْتُ لابْنِ عَبَّاسٍ: إِنَّ نَوْفًا الْبَكَالِيَّ يَزْعُمُ أَنَّ مُوسَى صَاحِبَ الْخَضِرِ لَيْسَ هُوَ مُوسَى صَاحِبَ بَنِي إِسْرَائِيلَ. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: كَذَبَ عَدُوُّ اللَّهِ حَدَّثَنِي أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ مُوسَى قَامَ خَطِيبًا فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ فَسُئِلَ: أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ؟ فَقَالَ: أَنَا. فَعَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِ؛ إِذْ لَمْ يَرُدَّ الْعِلْمَ إِلَيْهِ، فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ: إِنَّ لِي عَبْدًا بِمَجْمَعِ الْبَحْرَيْنِ، هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ. قَالَ مُوسَى: يَا رَبِّ، فَكَيْفَ لِي بِهِ؟ قَالَ: تَأْخُذُ مَعَكَ حُوتًا فَتَجْعَلُهُ فِي مِكْتَلٍ، فَحَيْثُمَا فَقَدْتَ الْحُوتَ فَهُوَ ثَمَّ، فَأَخَذَ حُوتًا فَجَعَلَهُ فِي مِكْتَلٍ ثُمَّ انْطَلَقَ، وَانْطَلَقَ مَعَهُ بِفَتَاهُ يُوشَعَ بْنِ نُونٍ، حَتَّى إِذَا أَتَيَا الصَّخْرَةَ وَضَعَا رُءُوسَهُمَا فَنَامَا، وَاضْطَرَبَ الْحُوتُ فِي الْمِكْتَلِ، فَخَرَجَ مِنْهُ، فَسَقَطَ فِي الْبَحْرِ، فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا، وَأَمْسَكَ اللَّهُ عَنِ الْحُوتِ جِرْيَةَ الْمَاءِ فَصَارَ عَلَيْهِ مِثْلَ الطَّاقِ، فَلَمَّا اسْتَيْقَظَ، نَسِيَ صَاحِبُهُ أَنْ يُخْبِرَهُ بِالْحُوتِ، فَانْطَلَقَا بَقِيَّةَ يَوْمِهِمَا وَلَيْلَتَهُمَا، حَتَّى إِذَا كَانَ مِنَ الْغَدِ قَالَ مُوسَى لِفَتَاهُ ﴿ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدۡ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبٗا ﴿٦٢﴾ ﴾ الكهف. قَالَ: وَلَمْ يَجِدْ مُوسَى النَّصَبَ حَتَّى جَاوَزَ الْمَكَانَ الَّذِي أَمَرَ اللَّهُ بِهِ. فَقَالَ لَهُ فَتَاهُ:﴿ قَالَ أَرَءَيۡتَ إِذۡ أَوَيۡنَآ إِلَى ٱلصَّخۡرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ ٱلۡحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيۡطَٰنُ أَنۡ أَذۡكُرَهُۥۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلۡبَحۡرِ عَجَبٗا ﴿٦٣﴾ ﴾ الكهف قَالَ:

فَكَانَ لِلْحُوتِ سَرَبًا وَلِمُوسَى وَلِفَتَاهُ عَجَبًا فَقَالَ مُوسَى:﴿ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا ﴿٦٤﴾ ﴾ الكهف قَالَ: رَجَعَا يَقُصَّانِ آثَارَهُمَا حَتَّى انْتَهَيَا إِلَى الصَّخْرَةِ، فَإِذَا رَجُلٌ مُسَجًّى ثَوْبًا، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ مُوسَى. فَقَالَ الخَضِرُ: وَأَنَّى بِأَرْضِكَ السَّلَامُ؟ قَالَ: أَنَا مُوسَى. قَالَ: مُوسَى بَنِي إِسْرَائِيلَ؟ قَالَ: نَعَمْ، أتيْتُكَ لِتُعَلِّمَني مِمَّا عُلِّمْتَ رَشَدًا. قَالَ: ﴿ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ ﴾ الكهف: يَا مُوسَى إِنِّي على عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللهِ عَلَّمَنِيهِ لَا تَعْلَمُهُ أَنْتَ، وَأَنْتَ على عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللهِ عَلَّمَكَ اللهُ لَا أَعْلَمُهُ. فَقَالَ مُوسَى:﴿ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعْصِى لَكَ أَمْرًا ﴿٦٩﴾ ﴾ الكهف.

. فَقَالَ لَهُ الخَضِرُ: ﴿ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِى فَلَا تَسْـَٔلْنِى عَن شَىْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الكهف، فَانْطَلَقَا يَمْشِيَانِ على سَاحِلِ البَحْرِ، فَمَرَّتْ سَفِينَةٌ فَكَلَّمُوهُمْ أَنْ يَحْمِلُوهُمْ، فَعَرَفُوا الخَضِرَ، فَحَمَلُوهُ بِغَيْرِ نَوْلٍ، فَلَمَّا رَكِبَا فِي السَّفِينَةِ لَمْ يَفْجَأْ إِلَّا وَالْخَضِرُ قَدْ قَلَعَ لَوْحًا مِنْ أَلْوَاحِ السَّفِينَةِ بِالْقَدُومِ. فَقَالَ لَهُ مُوسَى قَوْمٌ حَمَلُونَا بِغَيْرِ نَوْلٍ، عَمَدْتَ إلى سَفِينَتِهِمْ ﴿ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا إِمْرًا ﴿٧١﴾ ﴾ الكهف قَالَ: ﴿ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٧٢﴾ ﴾ الكهف. قَالَ: ﴿ لَا تُؤَاخِذْنِى بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِى مِنْ أَمْرِى عُسْرًا ﴿٧٣﴾ ﴾ الكهف: قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: "وَكَانَتِ الأُولَى مِنْ مُوسَى نِسْيَانًا" قَالَ: "وَجَاءَ عُصْفُورٌ فَوَقَعَ على حَرْفِ السَّفِينَةِ فَنَقَرَ فِي البَحْرِ نَقْرَةً، فَقَالَ لَهُ الخَضِرُ: مَا عِلْمِي وَعِلْمُكَ مِنْ عِلْمِ اللهِ إِلَّا مِثْلُ مَا نَقَصَ هذا العُصْفُورُ مِنْ هذا البَحْرِ. ثُمَّ خَرَجَا مِنَ السَّفِينَةِ، فَبَيْنَا هُمَا يَمْشِيَانِ عَلَى السَّاحِلِ، إِذْ أَبْصَرَ الخَضِرُ غُلَامًا يَلْعَبُ مَعَ الغِلْمَانِ، فَأَخَذَ الخَضِرُ رَأْسَهُ

بِيَدِهِ فَاقْتَلَعَهُ بِيَدِهِ فَقَتَلَهُ. فَقَالَ لَهُ مُوسَى:﴿ وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرٗا ٦٩ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعۡتَنِي فَلَا تَسۡـَٔلۡنِي عَن شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ أُحۡدِثَ لَكَ مِنۡهُ ذِكۡرٗا ٧٠ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَاۖ قَالَ أَخَرَقۡتَهَا لِتُغۡرِقَ أَهۡلَهَا لَقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـًٔا إِمۡرٗا ٧١ قَالَ أَلَمۡ أَقُلۡ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ٧٢ قَالَ لَا تُؤَاخِذۡنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرۡهِقۡنِي مِنۡ أَمۡرِي عُسۡرٗا ٧٣ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمٗا فَقَتَلَهُۥ قَالَ أَقَتَلۡتَ نَفۡسٗا زَكِيَّةَۢ بِغَيۡرِ نَفۡسٖ لَّقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـٔٗا نُّكۡرٗا ٧٤ ۞ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ٧٥ ﴾ الكهف. قَالَ: وهذا أَشَدُّ مِنَ الأُولَى، قَالَ: ﴿ قَالَ إِن سَأَلۡتُكَ عَن شَيۡءِۭ بَعۡدَهَا فَلَا تُصَٰحِبۡنِيۖ قَدۡ بَلَغۡتَ مِن لَّدُنِّي عُذۡرٗا ٧٦ ﴾ الكهف.﴿ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهۡلَ قَرۡيَةٍ ٱسۡتَطۡعَمَآ أَهۡلَهَا فَأَبَوۡاْ أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارٗا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ ٧٧ ﴾ الكهف: -قَالَ مَائِلٌ - فَقَامَ الخَضِرُ ﴿ فَأَقَامَهُۥ ٧٧ ﴾ الكهف بِيَدِهِ. فَقَالَ مُوسَى: قَوْمٌ أَتَيْنَاهُمْ فَلَمْ يُطْعِمُونَا، وَلَمْ يُضَيِّفُونَا، ﴿ لَوۡ شِئۡتَ لَتَخَذۡتَ عَلَيۡهِ أَجۡرٗا ٧٧ ﴾ الكهف. قَالَ:﴿ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيۡنِي وَبَيۡنِكَ ٧٨ ﴾ الكهف: إلى قَوْلِهِ: ﴿ ذَٰلِكَ تَأۡوِيلُ مَا لَمۡ تَسۡطِع عَّلَيۡهِ صَبۡرٗا ٨٢ ﴾ الكهف. فَقَالَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ: "وَدِدْنَا أَنَّ مُوسَى كَانَ صَبَرَ حَتَّى يَقُصَّ اللَّهُ عَلَيْنَا مِنْ خَبَرِهِمَا". قَالَ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ: فَكَانَ ابن عَبَّاسٍ يَقْرَأُ: وَكَانَ أَمَامَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا، وَكَانَ يَقْرَأُ وَأَمَّا الغُلَامُ فَكَانَ كَافِرًا وَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ[1].

(١) بروانه: ٧٤.

## ٢ - باسێک: (باسی ئەو کاتە بکە کە مووسا ﷺ بەلاوە بەردەستەکەی خۆی وت: من هەر دەڕۆم هەتا دەگەمە شوێنی بەیەک گەیشتنی دوو دەریاکە یان ماوەیەکی دوور و درێژ دەڕۆم)

٤٧٢٥ - سعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: بە ئیبنو عەبباسم ﷺ وت: نەوفی بیکالی[١] دەڵێ: مووسای هاوڕێی خزر مووساکەی هاوڕێی بەنو ئیسرائل نییە، ئیبنو عەبباس وتی: دوژمنی خوا درۆی کرد، ئوبەیی کوڕی کەعب ﷺ بۆی گێڕامەوە کە ئەو لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بەڕاستی (جارێك) مووسا ﷺ لەناو بەنی ئیسرائیلدا هەستا وتاری دا، جا پرسیاری لێ کرا: کێ زاناترین کەسە؟ ئەویش وتی: من، خواش سەرزەنشتی کرد لەبەر ئەوەی کەزانیاری (باسەکەی) نەگەڕاندەوە بۆ لای خوا، جا خودا سروشتی بۆ کرد (فەرمووی): بێگومان بەندەیەکم هەیە لەو شوێنەی دوو دەریاکە بەیەك دەگەن[٢]، ئەو کەسە لە تۆ زاناترە، مووسا ﷺ وتی:ئەی پەروەردگارم من چۆن پێی بگەم؟ (خوا) فەرمووی: ماسییەك لەگەڵ خۆت هەڵبگرە و بیخە زەمیلەیەکەوە، جا لە شوێنێکدا ماسییەکەت لێ ون بوو ئەو ئەو کەسە لەوێدایە، مووساش ﷺ ماسییەکی هەلگرت و خستیە زەمیلەیەکەوە لەپاش دەستی بە ڕۆشتن کردو لاوەکەی بەردەستیشی: یوشەعی کوڕی نوون لەگەڵیدا ڕۆشتن هەتا گەشتنە پەنا گابەردێك (لەماندوویەتیدا) هەردووکیان سەریان خستە سەر زەوی و خەوتن، جا ماسییەکە لەزەمیلەکەدا جولایەوە و هاتە دەرەوە لێی ئەنجا کەوتە ناو دەریاکە (جا (ماسییەکە خۆی فرێ داو) ڕێگەی خۆی گرتەبەر لەناو دەریاکەدا، (ئاوەکە) لەت دەبوو وەك خۆی لێ نەدەهاتەوە)، خواش ئاوە ڕەوانەکەی وەستاند

(١) بە بەکالیش ڕیوایەت کراوە. هەردوو شێوەکە ڕاستە:(بەکالی و بیکالی).

(٢) قەتادە دەڵێ، ئەو شوێنە دەریای فارس و دەریای ڕۆمە بەیەك دەگەن.

لەبەر ماسییەکە، ئەنجا وەك تاقێکی سەرگیراوی لێهات جا کاتێ مووسا ﷺ لە خەو هەستا هاوڕێکەی مووسا لەبیری چوو هەواڵی ماسیەکەی پێبدات، جا هەردووکیان ئەو ڕۆژ و شەوە ڕێیان دەکرد، هەتا کات گەشتە سبەینێ مووسا ﷺ بە هاوڕێکەی فەرموو: (خواردنەکەمان بۆ بێنە سوێند بەخوا بەڕاستی لەم سەفەرەماندا دووچاری ماندووی و زەحمەت بووین)، دەڵێ: مووسا ﷺ هەستی بە ماندووبوون نەکرد هەتا لەو شوێنە تێپەڕی کە خوا فەرمانی پێکردبوو، جا هاوڕێکەی بە مووسای وت: (لەبیرتە کاتێ ڕۆشتینە پەنا گابەردەکە (بۆ پشوودان) جا بەڕاستی من (لەوێدا) ماسییەکەم لەبیر چوو، هیچ شتێك ئەو (ماسییەکە)ی لە بیر نەبردمەوە کە باسی بکەم بۆت بێجگە لە شەیتان، (ماسییەکە زیندوو بوویەوە و) بە شێوەیەکی سەیر ڕێگای خۆی لە دەریاکە گرتبەر) جا بۆ ماسییەکە بوو بەڕێگا وە بۆ مووسا و لاوە بەردەستەکەی جێگای سەرسوڕمان بوو، ئەنجا مووسا ﷺ وتی: (ئێمەش ئەوەمان دەویست، ئینجا بەشوێنی خۆیاندا گەڕانەوە بەسەرنج دان) دەڵێ: هەردووکیان گەڕانەوە شوێن پێی خۆیان هەڵدەگرت هەتا گەشتنە لای گا بەردەکە، جا لەوێدا پیاوێکیان بینی بەقوماشێك خۆی داپۆشیبوو، مووسا ﷺ سەلامی لێ کرد خەزیریش وتی: چۆن لەوڵاتی تۆدا سەلام کردن هەیە؟ وتی: من مووسام، وتی: مووسای بەنی ئیسرائیلی؟ وتی: بەڵێ، هاتووم بۆ لات تا لەو زانستە ڕاستەی (لە پەروەردگارتەوە فێرکراویت منیش فێربکەیت، وتی: بێگومان تۆ ناتوانی لەگەڵ مندا ئارام بگری، ئەی مووسا من لە زانیاری خوا زانیارییەك دەزانم کە خوا فێری کردووم تۆ نایزانیت، وە تۆش لە زانیاری خوا زانیاریەك دەزانیت کە خوا فێری کردویت من نایزانم، ئەنجا مووسا ﷺ فەرمووی: (ئەگەر خوا بیەوێ بەخۆڕاگر دەمبینی و سەرپێچی لە هیچ فەرمانێکت ناکەم)، خەزیریش پێی

وت: (جا ئەگەر شوێنم کەوتی ئەوە پرسیاری هیچ شتێکم لێ مەکە، هەتا خۆم لەبارەیەوە قسەت بۆ دەکەم[1]، ئەنجا هەردووکیان ڕۆشتن بەکەناری دەریایەکدا دەڕۆشتن و کەشتیەك بەلایاندا ڕۆشت ئەوانیش قسەیان لەگەڵدا کرد کە سواریان کەن، جا خەزیریان ناسی و سواریان کرد بەبێ کرێ، جا کاتێ هەردووکیان سواری کەشتیەکە بوون، ئەوەی کە سەیر بوو بەلای مووساوە خەزیر تەختەیەك لە تەختەکانی کەشتیەکەی بە تەوشێیەك هەڵکەن، مووساش ﷺ پێی وت: کەسانێك ئێمەیان بەبێ کرێ سوار کرد، کەچی تۆ پەلاماری کەشتییەکەیانت داو کونت کرد (بۆ ئەوەی سەرنشینەکانی (لە دەریادا) نوقم بکەیت، سوێند بەخوا بەڕاستی کارێکی زۆر خراپ و ناشایستەت کرد، (بەندە چاکەکە) وتی: ئایا من نەم وت تۆ هەرگیز ناتوانی خۆت بگری لە گەڵمدا، (مووسا) وتی: لێم بوورە لەبەر ئەوەی (ئەو مەرجەی دامان نابوو) لەبیرم چوو، ئەم زانیاری فێربوونەم لەسەر قورس مەکە) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( پرسیاری یەکەم لە لایەن مووساوە ﷺ بە لەبیرچوون بوو، دەڵێ: وە چۆلەکەیەك هات و لەسەر قەراغی کەشتیەکە نیشتەوە دەنوکێکی دا لە دەریاکە، خەزیریش بە مووسای فەرموو: زانیاری من و زانیاری تۆ لە بەرانبەر زانیاری خوا تەنها وەك ئەو دەنوکدانەی ئەو چۆلەکە وایە کە چەنێك ئاوی لەو دەریایە کەم کردەوە، لە پاشان لە کەشتیەکە هاتنە دەرەوە، جا لەکاتێکدا دەڕۆشتن بەکەناری دەریادا لە پڕ خەزیر مێرد منداڵێکی بینی لەناو مێرد منداڵدا یاری دەکرد خەزیریش بەدەستی سەری گرت و ملی لێ کردەوە و کوشتی، مووساش پێی فەرموو: (کەسێکی پاکی بێ گوناهت هەروا کوشت بێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ، سوێند بەخوا بەڕاستی کارێکی زۆر خراپ و ناڕەوات

(١) لە نهێنیەیکەی ئاگادارت دەکەم.

کرد، (بەندە چاکەکە ) وتی: (بە مووسا) پێم نەوتیت بێگومان تۆ هەرگیز ناتوانی خۆت بگری لەگەڵ مندا؟)، (سوفیان) وتی: ئەم (پرسیارە)یان لەوەی یەکەمیان سەختربوو، (مووسا) فەرمووی: (ئەگەر دوا ئەم جارە پرسیاری هەرشتێکم لێ کردی ئیتر هاوڕێیەتیم مەکە، چونکە بەڕاستی لە لایەن منەوە بیانووت هەیە ( لەوەی وازم لێ بێنیت)، ئینجا پێکەوە ڕۆشتن هەتا گەشتنە لای خەڵکی شارێ (لەو کاتەدا برسیان بوو)، داوای خۆراکیان کرد لە خەڵکی شارەکە ئەوانیش (خەڵکی شارەکە) میوان داریان لێ نەکردن، ئینجا بنییان دیوارێك لەو (شارەدا) نزیك بوو بکەوێ ) وتی: لار بوو بویەوە، جا خەزیر هەستا و بەدەستی خۆی ڕاستی کردەوە مووساش پێی فەرموو: ئەوانە خەڵکانێك بوون ڕۆشتینە لایان خۆراکیان پێ نەداین و میوانداریان لێ نەکردین، (ئەگەر بتویستایە کرێیەکت لەسەر وەردەگرت (بەندە چاکەکە) وتی: ئالێرەدا کاتی جیابوونەوەی من و تۆیە) تا دەگاتە (ئەوە نهێنی و هۆی ئەو کردەوانە بوو کە تۆ توانای خۆگرتنت نەبوو لەسەر (کردنیان)).

جا پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی ئاواتە خوازبووین کە مووسا ﷺ ئارامی بگرتایە هەتا خوا هەواڵی هەردووکیانی (خەزیر و موسای) بگێرایەتەوە بۆمان )).

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: ئیبنو عەبباس ﷺ ئەم ئایەتەی بەم شێوە دەخوێندەوە (وَكَانَ أَمَامَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ صالحة[1] غَصْبًا) هەروەها ئەم ئایەتەش بەم شێوە دەخوێندەوە: (وَأَمَّا الغُلَامُ فَكَانَ كَافِرًا وَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ)[2].

---

(١) ئەم وشەی (امامهم) و (صالحا) لە خوێندنەوەکانی تردا نیە.

(٢) ئەمەش (فكان كافراً ) بە تەفسیر دانانی ڕاسترە، چونکە پێچەوانەیە لەگەڵ خوێندنەوە موتەواتیرەکاندا. بڕوانە : إرشاد الساري:١٠/٣٨١.

٣ - بابٌ: قَوْلُهُ: ﴿ فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا ﴿٦١﴾ ﴾ الكهف

﴿ سَرَبًا ﴿٦١﴾ ﴾ الكهف. مَذْهَبًا، يَسْرُبُ: يَسْلُكُ، وَمِنْهُ ﴿ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴿١٠﴾ ﴾ الرعد

٤٧٢٦ - حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيم بْنُ موسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَنَّ ابن جُرَيْجٍ أَخْبَرَهُمْ قَالَ: أَخْبَرَنِي يَعْلَى بْنُ مُسْلِمٍ، وَعَمْرو بْنُ دِينَارٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جبَيْرٍ -يَزِيدُ أَحَدُهمَا عَلَى صَاحِبِهِ، وَغَيْرَهمَا قَدْ سَمِعْته يُحَدِّثُهُ عَنْ سَعِيدٍ - قَالَ إِنَّا لَعِنْدَ ابن عَبَّاسٍ فِي بَيْتِهِ، إِذْ قَالَ: سَلُونِي. قلْت: أَيْ أَبَا عَبَّاسٍ -جَعَلَنِي اللَّهُ فِدَاكَ - بِالْكوفَةِ رَجل قَاصٌ يُقَالَ: لَهُ نَوْفٌ، يَزْعُمُ أَنَّهُ لَيْسَ بِمُوسَى بَنِي إِسْرَائِيلَ. أَمَّا عَمْرٌو فَقَالَ لِي: قَالَ: قَدْ كَذَبَ عَدُوُّ اللَّهِ، وَأَمَّا يَعْلَى فَقَالَ لِي: قَالَ ابن عَبَّاسٍ: حَدَّثَنِي أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: "مُوسَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: ذَكَّرَ النَّاسَ يَوْمًا حتَّى إِذَا فَاضَتِ العُيُونُ، وَرَقَّتِ القُلُوبُ وَلَّى، فَأَدْرَكَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: أَيْ رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ فِي الأَرْضِ أَحَدٌ أَعْلَمُ مِنْكَ؟ قَالَ: لَا. فَعَتَبَ عَلَيْهِ إِذْ لَمْ يَرُدَّ العِلْمَ إلى اللَّهِ. قِيلَ: بَلَى. قَالَ: أَيْ رَبِّ، فَأَيْنَ؟ قَالَ: بِمَجْمَعِ البَحْرَيْنِ. قَالَ: أَيْ رَبِّ، اجْعَلْ لِي عَلَمًا أَعْلَمُ ذَلِكَ بِهِ". فَقَالَ لِي عَمْرٌو قَالَ: "حَيْثُ يُفَارِقُكَ الحُوتُ". وَقَالَ لِي يَعْلَى قَالَ: "خُذْ نُونًا مَيِّتًا حَيْثُ يُنْفَخُ فِيهِ الرُّوحُ، فَأَخَذَ حُوتًا فَجَعَلَهُ فِي مِكْتَلٍ، فَقَالَ لِفَتَاهُ: لَا أُكَلِّفُكَ إِلاَّ أَنْ تُخْبِرَنِي بِحَيْثُ يُفَارِقُكَ الحُوتُ. قَالَ مَا كَلَّفْتَ كَثِيرًا، فَذَلِكَ قَوْلُهُ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ ﴿٦٠﴾ ﴾ الكهف: يُوشَعَ بْنِ نُونٍ -لَيْسَتْ عَنْ سَعِيدٍ - قَالَ: فَبَيْنَمَا هُوَ فِي ظِلِّ صَخْرَةٍ فِي مَكَانٍ ثَرْيَانَ، إِذْ تَضَرَّبَ الحُوتُ، وَمُوسَى نَائِمٌ، فَقَالَ فَتَاهُ: لَا أُوقِظُهُ. حَتَى إِذَا اسْتَيْقَظَ نَسِيَ أَنْ يُخْبِرَهُ، وَتَضَرَّبَ الحُوتُ، حتَّى دَخَلَ البَحْرَ فَأَمْسَكَ اللَّهُ عَنْهُ جِرْيَةَ البَحْرِ حتَّى كَأَنَّ أَثَرَهُ فِي حَجَرٍ -قَالَ لِي عَمْرٌو هَكَذَا كَأَنَّ أَثَرَهُ فِي حَجَرٍ، وَحَلَّقَ بَيْنَ إِبْهَامَيْهِ وَاللَّتَيْنِ تَلِيانِهِمَا -

﴿ قَالَ لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا ﴿٦٢﴾ ﴾ الكهف قَالَ: قَدْ قَطَعَ اللَّهُ عَنْكَ النَّصَبَ - لَيْسَتْ هذه عَنْ سَعِيدٍ - أَخْبَرَهُ، فَرَجَعَا فَوَجَدَا خَضِرًا. قَالَ لِي عُثْمَانُ بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ: على طِنْفِسَةٍ خَضْرَاءَ عَلَى كَبِدِ البَحْرِ. قَالَ سَعِيد بْنُ جُبَيْرٍ: مُسَجًّى بِثَوْبِهِ قَدْ جَعَلَ طَرَفَهُ تَحْتَ رِجْلَيْهِ، وَطَرَفَهُ تَحْتَ رَأْسِهِ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ مُوسَى، فَكَشَفَ عَنْ وَجْهِهِ، وَقَالَ: هَلْ بِأَرْضِي مِنْ سَلَامٍ؟ مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: أَنَا مُوسَى. قَالَ: مُوسَى بَنِي إِسْرَائِيلَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَمَا شَأْنُكَ؟ قَالَ: جِئْتُ لِتُعَلِّمَنِي مِمَّا عُلِّمْتَ رَشَدًا. قَالَ: أَمَا يَكْفِيكَ أَنَّ التَّوْرَاةَ بِيَدَيْكَ، وَأَنَّ الوَحْيَ يَأْتِيكَ؟ يَا مُوسَى، إِنَّ لِي عِلْمًا لَا يَنْبَغِي لَكَ أَنْ تَعْلَمَهُ، وَإِنَّ لَكَ عِلْمًا لَا يَنْبَغِي لِي أَنْ أَعْلَمَهُ. فَأَخَذَ طَائِرٌ بِمِنْقَارِهِ مِنَ البَحْرِ، وَقَالَ: والله مَا عِلْمِي وَمَا عِلْمُكَ فِي جَنْبِ عِلْمِ اللهِ إِلَّا كَمَا أَخَذَ هذا الطَّائِرُ بِمِنْقَارِهِ مِنَ البَحْرِ. حَتىٰ إِذَا رَكِبَا فِي السَّفِينَةِ وَجَدَا مَعَابِرَ صِغَارًا تَحْمِلُ أَهْلَ هذا السَّاحِلِ إلى أَهْلِ هذا السَّاحِلِ الآخَرِ عَرَفُوهُ، فَقَالُوا: عَبْدُ اللهِ الصَّالِحُ -قَالَ: قُلْنَا لِسَعِيدٍ: خَضِرٌ؟ قَالَ: نَعَمْ - لَا نَحْمِلُهُ بِأَجْرٍ. فَخَرَقَهَا وَوَتَدَ فِيهَا وَتِدًا. قَالَ مُوسَى

﴿ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا ﴿٧١﴾ ﴾ الكهف -قَالَ مُجَاهِدٌ: مُنْكَرًا - قَالَ:

﴿ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٧٢﴾ ﴾ الكهف كَانَتِ الأُولَى نِسْيَاناً، وَالْوُسْطَى شَرْطًا، وَالثَّالِثَةُ عَمْدًا - قَالَ: ﴿ قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴿٧٣﴾ ﴾ الكهف ، ﴿ لَقِيَا غُلَامًا فَقَتَلَهُ ﴿٧٤﴾ ﴾ الكهف قَالَ يَعْلَى: قَالَ سَعِيدٌ: وَجَدَ غِلْمَانًا يَلْعَبُونَ، فَأَخَذَ غُلَامًا كَافِرًا ظَرِيفًا فَأَضْجَعَهُ، ثُمَّ ذَبَحَهُ بِالسِّكِّينِ. قَالَ: ﴿ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ ﴿٧٤﴾ ﴾ الكهف: لَمْ تَعْمَلْ بِالْحِنْثِ -وَكَانَ ابن عَبَّاسٍ قَرَأَهَا: زَكِيَّةً زَاكِيَةً مُسْلِمَةً. كَقَوْلِكَ: غُلَامًا زَكِيًّا -فَانْطَلَقَا، فَوَجَدَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنْقَضَّ فَأَقَامَهُ - قَالَ سَعِيدٌ بِيَدِهِ: هَكَذَا، وَرَفَعَ يَدَهُ فَاسْتَقَامَ. قَالَ يَعْلَى: حَسِبْتُ أَنَّ سَعِيدًا قَالَ: فَمَسَحَهُ بِيَدِهِ فَاسْتَقَامَ، ﴿ لَوْ شِئْتَ لَتَخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴿٧٧﴾ ﴾ الكهف - قَالَ سَعِيدٌ: أَجْرًا نَأْكُلُهُ. ﴿ وَكَانَ وَرَاءَهُم ﴿٧٩﴾ ﴾ الكهف، وَكَانَ أَمَامَهُمْ -قَرَأَهَا ابن عَبَّاسٍ: أَمَامَهُمْ مَلِكٌ - يَزْعُمُونَ عَنْ

غَيْرِ سَعِيدٍ أَنَّهُ هُدَدُ بْنُ بُدَدٍ، وَالْغُلَامُ الْمَقْتُولُ اسْمُهُ -يَزْعُمُونَ-: جَيْسُورٌ. ﴿ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾ ﴾ الكهف، فَأَرَدْتُ إِذَا هِيَ مَرَّتْ بِهِ أَنْ يَدَعَهَا لِعَيْبِهَا، فَإِذَا جَاوَزُوا أَصْلَحُوهَا فَانْتَفَعُوا بِهَا، وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ: سَدُّوهَا بِقَارُورَةٍ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ: بِالْقَارِ، كَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ، وَكَانَ كَافِرًا ﴿ فَخَشِينَآ أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ﴿٨٠﴾ ﴾ الكهف أَنْ يَحْمِلَهُمَا حُبُّهُ على أَنْ يُتَابِعَاهُ على دِينِهِ فَأَرَدْنَا أَنْ يُبَدِّلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِنْهُ زَكَاةً لِقَوْلِهِ:﴿ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً ﴿٧٤﴾ ﴾ الكهف ﴿ وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴿٨١﴾ ﴾ الكهف هُمَا بِهِ أَرْحَمُ مِنْهُمَا بِالأَوَّلِ الذِي قَتَلَ خَضِرٌ، وَزَعَمَ غَيْرُ سَعِيدٍ أَنَّهُمَا أُبْدِلَا جَارِيَةً، وَأَمَّا دَاوُدُ بْن أَبِي عَاصِمٍ فَقَالَ عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ: إِنَّهَا جَارِيَةٌ.

## ٣ - باسێک:ئەم فەرمایشتەی خوا: (جا کاتێ گەشتنە ئەو شوێنەی دوو دەریاکە بەیەک دەگەن ماسییەکەیان لەبیر چوو، جا (ماسییەکە خۆی فڕێدا و ) ڕێگەی خۆی گرتەبەر لەناو دەریاکەدا، (ئاوەکە) لەت دەبوو وەک خۆی لێ نەدەهاتەوە)

﴿ سَرَبًا ﴾ شوێنی ڕۆشتن، يَسْرُبُ: ڕێگە دەگرێتەبەر، لەڕیشەی (سَرَبًا): ﴿ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴾ واتە: بەڕۆژ دا ڕێگەیەك بگرێتەبەر.

٤٧٣٦ -ئیبراهیمی کوڕی مووسا بۆی گێڕاینەوە وتی: هیشامی کوڕی یوسف بۆی گێڕاینەوە کە ئیبنو جورەیج بۆی گێڕاونەتەوە وتی: یەعلای کوڕی موسلیم و عەمری کوڕی دینار بۆیان گێڕامەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە - هەریەکەیان (یەعلا و عەمر) لە گێڕانەوەی هاوڕێکەی زیادەی هەبوو، وە جگە

له هەردووکیان له کەسانی تریشم بیستووه که له سەعیدەوه گێڕاویانەتەوه - (سەعید) وتی: ئێمه له خزمەت ئیبنو عەبباسدا ﷻ بووین له ماڵی خۆیاندا که وتی پرسیارم لی بکەن، منیش وتم: ئەی باوکی عەبباس خوا بمکات بەقوربانت، لەکوفەدا پیاوێکی چیرۆك خوان هەیه، پێی دەڵێن نەوف، بەلایەوه وایه که (مووسای هاوڕێی خەزیر) مووسای بەنی ئیسرائل نییه، عەمریش پێی وتم: بەڕاستی ئەو دوژمنی خوایه درۆی کردووه، بەڵام یەعلا پێی وتم: ئیبنو عەبباس وتی: ئوبەیی کوڕی کەعب بۆی گێڕامەوه وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مووسا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ڕۆژێك ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد تا چاوەکان فرمێسکیان پێدا هاتە خوارەوه دڵەکان نەرم بوون، مووسا ڕۆشت، ئەنجا پیاوێك پێی گەیشت و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لەسەر زەویدا کەس هەیه لەتۆ زاناترو شارەزاتر بێت؟ مووسا وتی: نەخێر، خواش سەرزەنشتی کرد لەسەر ئەوەی که زانینی ئەو پرسیاره نەگەڕاندەوه بۆلای خوای گەوره، پێی وترا: بەڵێ (له تۆ شارەزاتر هەیه) (مووسا) وتی: ئەی پەروەردگارم (ئەو کەسە) له کوێییه؟ (خوا) فەرمووی: لەو شوێنەی دوو دەریاکه بەیەکتری دەگەن، وتی ئەی پەروەردگارم زانیارییەکم پێ بده ئەوەی پێ بزانم))، (ئیبنو جورەیج وتی) جا عەمر پێی وتم: (( (خوا) فەرمووی: ئەو جێگایەی ماسی یەکەت لێ جیادەبێتەوه بەجێت دێڵێ ))، (ئیبنو جورەیج دەڵێ): یەعلا پێی وتم(( (خوا) فەرمووی ماسی یەکی مردوو لەگەڵ خۆت هەڵگره له هەرجێگایەکدا گیانی کرایەوه بەبەردا (لەوێدایه)، ئەویش ماسی یەکی هەڵگرت و خستیه زەمیلەیەکه و وتی به لاوەکەی بەردەستی: داوای هیچت لێ ناکەم تەنها ئەوه نەبێت که له شوێنێکدا ماسی یەکەت لێ جیابویەوه هەواڵم پێ بدەیت (و ئاگادارم بکەیت)، لاوەکەش وتی: داواکەت زۆرو گەوره نییه، ئەمه ئەو فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵنده که دەفەرموێ: (وه باسی

ئەوكاتە بكە كە مووسا ﷺ بەلاوە بەردەستەكەی خۆی وت) كەیوشەعی كوڕی نوونە)) (ناوهێنا ئەو لاوە) لە سەعیدە و نییە [1]- فەرمووی: ((جا لەكاتێكدا ئەو (مووسا) لەسێبەری گابەردێكدا بوو لەشوێنێكی ئاورنگدا [2] بوو لە پڕ ماسی یەكە كەوتە جوڵەجوڵ مووساش خەوتبوو، لاوە بەردەستەكەی وتی: خەبەری ناكەمەوە (خەبەری نەكردەوە) هەتا كاتێ كە خەبەری بویەوە لەبیرچوو هەواڵی باتێ، ماسی یەكەش كەوتە فڕەفڕ تا ڕۆشتە ناو دەریاكەوە، جا خواش ڕۆشتنی ئاوەكەی وەستاند لەئاست ماسییەكەدا، (بەجۆرێ) هەتا شوێنی ڕۆشتنی ماسییەكە وەك بەناوبەردا بڕوات وابوو[3])) -عەمر پێی وتم: ئاوەها بوو شوێنی ڕۆشتنەكەی (لەدەریاكەدا دەمایەوە) وەك كون وابوو لەناو بەردا، جا پەنجە گەورە و پەنجەی شایەتومان و پەنجەی ناوەڕاست و دواتری كرد بە هەڵقەیەك - (سوێند بەخوا بەڕاستی لەم سەفەرەماندا تووشی ماندوویەتی زۆر بووین )، (لاوە بەردەستەكەی) ((وتی: بەڕاستی خوا تۆ ماندوو ناكات)) - ئەمە سەعید نەیگێڕاوەتەوە - (لاوەكە) ((هەواڵی (ماسیەكەی) بە مووسا دا، جا هەردووكیان گەڕانەوە (بۆجێگای ڕۆشتنی ماسیەكە) خەزریان بینی))، (ئیبنو جورەیج دەڵێ) عوسمانی كوڕی ئەبی سولەیمان بۆی گێڕامەوە: (( (خەزیر) لەسەر ڕاخەرێكی بچوكی سەوز بوو لە ناوەڕاستی دەریاكەدا بەسەر ئاوەكەوە بوو)) سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێ: ((بە پۆشاكەكەی خۆی داپۆشی بوو لایەكی پۆشاكەكەی خستبووە ژێر هەردوو پێی و لاكەی تر خستبووە ژێر سەریەوە، ئەنجا مووسا ﷺ سەلامی لێ كرد خەزیریش پۆشاكەكەی لەسەر ڕووخساری لادا

(١) بەڵكو ئیبنو جورەیج ناوی هێناوە دەڵێ ناوی یوشەعی كوڕی نوونە.

(٢) شوێنێكە خۆڵەكەی تەڕبوو بێ یان شێی تەڕی هەبێت.

(٣) لە گێڕانەوەیەكی تردا دەفەرموێ: وەك تاق وابوو، یان لە گێڕانەوەی موسلیم دا دەفەرموێ: كەماسیەكە دەڕۆشت ئاوەكە بەكی نەدەگرتەوە وەكو تاقی لێ هاتبوو.

و وتی: ئایا لەم ولاٌتە ی مندا (وشەی) سەلام هەیە؟ تۆ کێیت؟ وتی من مووسام، وتی: موسای بەنی ئیسرائل؟ وتی بەڵێ، وتی: چ کارێکت هەیە (بۆچی هاتوویت)؟ وتی: هاتووم (بۆلات) تا لەو زانستە ڕاستە (لە پەروەردگارتەوە) فێرکراوی فێری منی بکەیت، خەزیر وتی: ئایا ئەوەت بەس نیە کە تەوراتت بەدەستەوەیە و بێگومان نیگات بۆ دێت؟ ئەی مووسا بێگومان من زانستێکم هەیە شیاو نییە بۆ تۆ فێری ببیت، وە تۆش زانستێکت هەیە شیاو نیە بۆ من فێری ببم، ئەنجا باڵندەیە بەدەنوکی تۆزێ ئاوی لە دەریاکە هەڵگرت و بردی، جا (خەزیر) وتی: سوێند بەخوا زانیاری من و زانیاری تۆ لە بەرانبەر زانیاری خوادا تەنها وەکو ئەو ئاوەیە کە ئەو باڵندە بە دەنوکی لە (ئاوی) دەریاکە بردی.

(ڕۆشتن) تا هەردووکیان چەند کەشتیەکی بچووکیان بینی، سواری (دانەیەکیان) بوون کە خەڵکی کەناری ئەم بەریان سواردەکرد (و دەگواستەوە) بۆلای خەڵکی کەنارەکەی تر، (کەشتی وانەکان) خەزیریان ناسی وتیان: ئەمە بەندە چاکەکەیە)) - (یەعلا) دەڵێ وتمان بەسەعید: (ئەو بەندە چاکە) خەزیر بوو؟ وتی: بەڵێ: (وتیان) بەکرێ سواری ناکەین [1] ئەنجا خەزیرکونی کردە کەشتیەکە [2] مێخێکی دا لەجێگای کونەکە، مووسا ﷺ فەرمووی: (کەشتیەکەت کون تێکرد بۆئەوەی سەرنشینەکانی (لەدەریادا) نوقم بکەیت، سوێند بەخوا بەڕاستی کارێکی زۆر خراپ و ناشایستەت کرد).

-موجاهید دەڵێ: ﴿ إِمْرًا ﴿٧١﴾ ﴾ الکهف، خراپ و سەرسوڕهێنەر - وتی (ئایا من نەم وت تۆ هەرگیز ناتوانی خۆت بگری لە گەڵ مندا)، (پێغەمبەر ﷺ )

---

(١) واتە: کرێی لێ وەرناگرین.

(٢) تەختەیەکی کەشتیەکەی هەڵکەند.

فەرمووی: پرسیاری یەکەمیان لەبیر چوون بوو، دووهەمیان مەرج بوو، سێ یەمیان بەدەستی ئەنقەست بوو، (مووسا) فەرمووی: (لێم بووره له بەر ئەوەی (ئەو مەرجەی دامان نابوو) لەبیرم چوو ئەم زانیاری فێربوونەم لەسەر قورس مەکە). (هەردووکیان بەتازە لاوێك گەشتن یەکسەر ئەو (تازە لاوەی) کوشت) - یەعلا وتی: سەعید وتی: ((چەند غولامێکی بینی یاریان دەکرد، ئەنجا غولامێکی کافری قۆزی گرت وپاڵی خست پاشان بە چەقۆ سەری بڕی، (موسا) وتی: (کەسێکی پاکی بێ گوناهت هەروا کوشت بێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ) هیچ گوناهو تاوانێکی نەکردبوو))، ئیبنو عەبباس ﴿ زَكِيَّةً ﴾ بە (زَاكِيَةً) دەخوێندەوە بەواتای: مسوڵمان وەك ئەوە وایە کەدەڵێت: (غُلَامًا زَكِيًّا) - ((ئەنجا هەردووکیان (موسا و خەزیر) ڕۆشتن (ئینجا بینیان دیوارێك لەو (شارە)دا نزیك بوو بکەوێت (بەندە چاکەکە) دیوارەکەی چاك کردەوە (ڕاستی کردەوە)، دەڵێ: سەعید بە دەستی ئاوەهای کردو دەستی بەرز کردەوە ((جاڕاستی کردەوە))، یەعلا دەڵێ: وابزانم سەعید وتی: ((جا دەستی پیاهێنا و ڕاستی کردەوە) ((مووسا وتی) وتی: ئەگەر بتویستایە کرێیەکت لەسەر وەردەگرت) - سەعید دەڵێ: کرێیەك بیخۆین - ﴿ وَكَانَ وَرَآءَهُم ﴾: واتە: وە لە پێشیانەوە - ئیبنو عەبباس ئەم شێوە خوێندوویەتیەوە (أَمَامَهُمْ مَلِكٌ) واتە: پادشایەك لە پێشیانەوە هەبوو جگە لە سەعید دەڵێن کە ئەو (پادشا ناوی) (هودەدی کوڕی بودەد) بووە لاوە تازە پێگەیشتووە کوژراوەکەش دەڵێن ناوی (جەیسور) بووە (پادشایەك هەبوو هەموو کەشتیەکی (چاکی) داگیر دەکرد)، جا منیش ویستم کاتێ کەشتیەکە تێپەڕی بە لای پادشادا وازی لێ بێنێ و نەیبات لەبەر ناتەواویەکەی، ئەنجا کەتێپەڕین لێ چاکی دەکەنەوە سوودی لێ دەبینن))، جا هەیانە دەڵێ: کون (ی کەشتیە)کەیان بە بوتڵێکی شوشە قەپات کرد و هەشیانە

دەڵێ: بە ڤیر کونەکەیان گرت، (دایك و باوکی (لاوەکە) ئیماندار بوون) بەڵام لاوەکە کافر بوو (جا ئێمە ترساین (خۆشەویستی ئەولاوە) پاڵیان پێوە بنێت بۆ سەرکەشی و بێ باوەڕی )، واتە: خۆشەویستی ئەو لاوە پاڵیان پێوە بنێت کە هەردووکیان شوێنی ئاینەکەی بکەون.

(جا (بەوکارە) ویستمان پەروەردگاریان (لەبری ئەولاوە) بۆیان بگۆڕێت (بەمنداڵێکی) چاکتر لەو پاکتر لە گوناهو بەسۆز و بەزەیی بۆیان) لەبەر ئەم فەرموودەی خوای گەورە (کەسێکی پاکی بێ گوناهت هەروا کوشت -﴿ وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴾ دایك و باوکی بەسۆزو بەزەیی ترن بۆی لەو منداڵەی یەکەم کە خەزیر کوشتی))، جگە لە سەعید دەڵێ: بۆیان گۆڕدرا بەکچێك بەڵام داوودی کوڕی ئەبی عاصیم دەڵێ: زیاد لە کەسێك دەڵێ: ئەو گۆڕاوە کچێك بوو.

## ٤ - بابٌ: ﴿ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَـٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَـٰذَا نَصَبًا ﴿٦٢﴾ ﴾ الكهف، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ قَصَصًا ﴿٦٤﴾ ﴾ الكهف

﴿ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾ ﴾ الكهف: عملا ﴿ حِوَلًا ﴿١٠٨﴾ ﴾ الكهف: تَحَوُّلًا.﴿ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا ﴿٦٤﴾ ﴾ الكهف:﴿ إِمْرًا ﴿٧١﴾ ﴾ الكهف: وَ﴿ نُّكْرًا ﴿٧٤﴾ ﴾ الكهف: دَاهِيَةً ﴿ يَنقَضَّ ﴿٧٧﴾ ﴾ الكهف: يَنْقَاضُ كَمَا تَنْقَاضُ السِّنُّ ﴿ لَتَّخَذْتَ ﴿٧٧﴾ ﴾ الكهف: وَاتَّخَذْتَ وَاحِدٌ ﴿ رُحْمًا ﴿٨١﴾ ﴾ الكهف: مِنَ الرُّحْمِ، وَهو أَشَدُّ مُبَالَغَةً مِنَ الرَّحْمَةِ، ويُظن أنه من الرحيم، وَتُدْعَى مَكَّةُ: أُمَّ رُحْمٍ؛ أَيِ: الرَّحْمَةُ تَنْزِلُ فيها.

## ٤ - باسێک: (جا کاتێ (مووسا و خزر) هەردووکیان تێپەڕین (لەو شوێنە مووسا) فەرمووی بەلاوە بەردەستەکەی خواردنەکەمان بۆ بێنە، سوێند بەخوا بەڕاستی لەم سەرەفەرەماندا دووچاری ماندوویی زەحمەت بووین) تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە: ( بە چاوگێڕان بەشوێنی خۆیاندا گەڕانەوە)

﴿ صُنۡعًا ﴾ کارێك، کردەوەیەك. ﴿ حِوَلًا ﴾:گواستنەوە، ئاڵوگۆڕ کردن. (ئێمەش ئەوەمان دەویست ئینجا بە چاوگێڕان بەشوێنی خۆیاندا گەڕانەوە). ﴿ إِمۡرًا ﴾ و ﴿ نُّكۡرًا ﴾گەورە سەخت وگران، زۆر خراپ. ﴿ يَنقَضَّ ﴾ (دیوارەکە) دەڕوخا و دەکەوت وەك ددان چۆن دەکەوێ و دەردێ. ﴿ لَتَخَذۡتَ ﴾ لەگەڵ (اتَّخَذْتَ) یەك مانایان هەیە، (واتە: وەرت دەگرت) [1]. ﴿ رُحۡمًا ﴾ لەماددەی (الرُّحْم)ـە کە لەماددەی (الرَّحْمَةِ) زیاتر موبالەغە و بەهێزی مانای تێدایە، وە وا دەزانرێت (رُحْمًا) لە (الرحيم) وەرگیراوە (وانیە) وە مەککەش پێی دەوترێت (أُمَّ رُحْمٍ) واتە: ڕەحمەت و بەزەیی تێدا دادەبەزێت.

### ٥ - بابٌ: ﴿ قَالَ أَرَءَيۡتَ إِذۡ أَوَيۡنَآ إِلَى ٱلصَّخۡرَةِ ﴿٦٣﴾ ﴾ الكهف

٤٧٢٧ - حَدَّثَنِي قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: إِنَّ نَوْفًا الْبَكَالِيَّ يَزْعُمُ أَنَّ مُوسَى بَنِي إِسْرَائِيلَ لَيْسَ بِمُوسَى الْخَضِرِ. فَقَالَ كَذَبَ عَدُوُّ اللَّهِ، حَدَّثَنَا أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَامَ مُوسَى خَطِيبًا فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ فَقِيلَ لَهُ: أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ؟ قَالَ: أَنَا، فَعَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِ، إِذْ لَمْ

---

(١) (اتخذ) لەماددەی (تَخِذ)ـەیەو بەمانای (أَخَذَ) یە، لە بابی ئیفتیعالە وەرگیراوە.

يَرُدَّ الْعِلْمَ إِلَيْهِ، وَأَوْحَى إِلَيْهِ: بَلَى، عَبْدٌ مِنْ عِبَادِي بِمَجْمَعِ الْبَحْرَيْنِ، هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ قَالَ: أَيْ رَبِّ كَيْفَ السَّبِيلُ إِلَيْهِ قَالَ: تَأْخُذُ حُوتًا فِي مِكْتَلٍ فَحَيْثُمَا فَقَدْتَ الْحُوتَ فَاتَّبِعْهُ. قَالَ: فَخَرَجَ مُوسَى، وَمَعَهُ فَتَاهُ يُوشَعُ بْنُ نُونٍ، وَمَعَهُمَا الْحُوتُ حَتَّى انْتَهَيَا إِلَى الصَّخْرَةِ، فَنَزَلاَ عِنْدَهَا. قَالَ: فَوَضَعَ مُوسَى رَأْسَهُ فَنَامَ. قَالَ سُفْيَانُ: وَفِي حَدِيثِ غَيْرِ عَمْرٍو قَالَ: وَفِي أَصْلِ الصَّخْرَةِ عَيْنٌ يُقَالُ لَهَا: الْحَيَاةُ، لاَ يُصِيبُ مِنْ مَائِهَا شَيْءٌ إِلاَّ حَيِيَ، فَأَصَابَ الْحُوتَ مِنْ مَاءِ تِلْكَ الْعَيْنِ، قَالَ فَتَحَرَّكَ، وَانْسَلَّ مِنَ الْمِكْتَلِ، فَدَخَلَ الْبَحْرَ فَلَمَّا اسْتَيْقَظَ مُوسَى ﴿ قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا ﴿٦٢﴾ ﴾ الكهف. قَالَ: وَلَمْ يَجِدِ النَّصَبَ حَتَّى جَاوَزَ مَا أُمِرَ بِهِ، قَالَ لَهُ فَتَاهُ يُوشَعُ بْنُ نُونٍ: ﴿ قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ ﴿٦٣﴾ ﴾ الكهف. قَالَ: فَرَجَعَا يَقُصَّانِ فِي آثَارِهِمَا، فَوَجَدَا فِي الْبَحْرِ كَالطَّاقِ مَمَرَّ الْحُوتِ، فَكَانَ لِفَتَاهُ عَجَبًا، وَلِلْحُوتِ سَرَبًا، قَالَ: فَلَمَّا انْتَهَيَا إِلَى الصَّخْرَةِ، إِذْ هُمَا بِرَجُلٍ مُسَجًّى بِثَوْبٍ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ مُوسَى قَالَ: وَأَنَّى بِأَرْضِكَ السَّلاَمُ؟ فَقَالَ: أَنَا مُوسَى. قَالَ: مُوسَى بَنِي إِسْرَائِيلَ؟ قَالَ: نَعَمْ، ﴿ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾ ﴾ الكهف قَالَ لَهُ الْخَضِرُ: يَا مُوسَى، إِنَّكَ عَلَى عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللهِ عَلَّمَكَهُ اللهُ لاَ أَعْلَمُهُ، وَأَنَا عَلَى عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللهِ عَلَّمَنِيهِ اللهُ لاَ تَعْلَمُهُ. قَالَ: بَلْ أَتَّبِعُكَ. قَالَ:﴿ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِى فَلَا تَسْـَٔلْنِى عَن شَىْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الكهف، فَانْطَلَقَا يَمْشِيَانِ عَلَى السَّاحِلِ، فَمَرَّتْ بِهِمَا سَفِينَةٌ، فَعُرِفَ الْخَضِرُ فَحَمَلُوهُمْ فِي سَفِينَتِهِمْ بِغَيْرِ نَوْلٍ -يَقُولُ: بِغَيْرِ أَجْرٍ - فَرَكِبَا السَّفِينَةَ. قَالَ: وَوَقَعَ عُصْفُورٌ عَلَى حَرْفِ السَّفِينَةِ، فَغَمَسَ مِنْقَارَهُ الْبَحْرَ، فَقَالَ الْخَضِرُ لِمُوسَى: مَا عِلْمُكَ وَعِلْمِي وَعِلْمُ الْخَلاَئِقِ فِي عِلْمِ اللهِ إِلاَّ مِقْدَارُ مَا غَمَسَ هَذَا الْعُصْفُورُ مِنْقَارَهُ قَالَ: فَلَمْ يَفْجَأْ مُوسَى، إِذْ

عَمَدَ الْخَضِرُ إِلَى قَدُومٍ فَخَرَقَ السَّفِينَةَ، فَقَالَ لَهُ مُوسَى: قَوْمٌ حَمَلُونَا بِغَيْرِ نَوْلٍ، عَمَدْتَ إِلَى سَفِينَتِهِمْ فَخَرَقْتَهَا ﴿لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا ﴿٧١﴾﴾ الكهف

فَانْطَلَقَا إِذَا هُمَا بِغُلَامٍ يَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ، فَأَخَذَ الْخَضِرُ بِرَأْسِهِ فَقَطَعَهُ. قَالَ لَهُ مُوسَى: ﴿أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا ﴿٧٤﴾ ۞ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٧٥﴾﴾ الكهف إِلَى قَوْلِهِ ﴿فَأَبَوْا أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ ﴿٧٧﴾﴾ الكهف:. فَقَالَ بِيَدِهِ: هَكَذَا فَأَقَامَهُ، فَقَالَ لَهُ مُوسَى إِنَّا دَخَلْنَا هَذِهِ الْقَرْيَةَ، فَلَمْ يُضَيِّفُونَا وَلَمْ يُطْعِمُونَا، ﴿لَوْ شِئْتَ لَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴿٧٧﴾﴾ الكهف قَالَ: ﴿قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٧٨﴾﴾ الكهف فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَدِدْنَا أَنَّ مُوسَى صَبَرَ حَتَّى يُقَصَّ عَلَيْنَا مِنْ أَمْرِهِمَا». قَالَ: وَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَقْرَأُ: وَكَانَ أَمَامَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ صَالِحَةٍ غَصْبًا، وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ كَافِرًا[1].

## ٥ - باسێک: (لاوەکە وتی: لەبیرتە کاتێ چووینە پەنا بەردە گەورەکە (بۆ پشوودان)

**٤٧٢٧ - سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: وتم بەئیبنو عەبباس رضي الله عنهما بێگومان نەوفی بەکالی دەڵێ: کەمووسای بەنی ئیسرائیل ئەو مووسایە نییە لەگەڵ خەزیردا بووە (ئیبنو عەبباس) وتی: ئەو دوژمنی خوایە درۆی کرد، ئوبەیی کوڕی کەعب رضي الله عنه بۆی گێڕامەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: ((مووسا عليه السلام لەناو بەنی ئیسرائیلدا هەستا وتاری دا، جا پێی وترا: کێ لە هەموو کەس زاناتر و شارەزاترە؟. وتی: من، خواش لەسەر ئەوە سەرزەنشتی کرد کە زانیاری**

(١) بڕوانە: ٧٤.

ئەو بابەتی نەگەڕاندەوە بۆلای خوای گەورە، وە (خوا) نیگای بۆ کرد: بەڵێ (لە تۆ زاناتر هەیە) بەندەیەکە لە بەندەکانم لەو شوێنەدایە دوو دەریاکە بەیەك دەگەن، ئەو کەسە لە تۆ شارەزاترە، (مووسا) وتی: ئەی پەروەردگارم بە چ ڕێگەیەك بگەمە لای؟ فەرمووی ماسی یەك هەڵبگرە لە زەمیلەیەکدا، جا لە هەرشوێنێکدا ماسییەکەت ون کرد شوێنی کەوە (بەندە چاکەکە دەدۆزیتەوە)، دەڵێ: جا مووسا ڕۆشت و لەگەڵ لاوە بەردەستەکەی خۆی یوشەعی کوڕی نوون وماسی یەکەشیان پێبوو، ڕۆشتن هەتا گەشتنە لای گابەردێك لە لایدا لایان داو، دەڵێ: جا مووسا ﷺ سەریخستە سەر زەوی و خەوت - سوفیان دەڵێ: لە فەرموودەکەی جگە لە عەمردا دەڵێ: لەبنی گابەردەکەدا کانییەکی تیا بوو پێی دەوترا: ژیان، هەر شتێك لەئاوی ئەو کانیاوەی بەرکەوتایە زیندوو دەبوویەوە، جا ماسی یەکەش ئەو ئاوی کانیاوەی بەرکەوت، دەڵێ: ئیتر ماسی یەکە جوڵایەوە و لە زەمیلەکە هاتە دەرەوە و ڕۆشتە ناو دەریاکە، ئەنجا کە مووسا لەخەو هەستا وتی بەلاوە بەردەستەکەی: (خواردنەکەمان بۆ بێنە) تاکۆتای ئایەتەکە - وتی: مووسا ماندوو نەدەبوو هەتا لەو شوێنەی کە فەرمانیان پێ کرابوو تێپەڕی - لاوە بەردەستەکەی یوشەعی کوڕی نوون پێی وت: (لەبیرتە کاتێ چووینە پەنا گابەردەکە (بۆپشوودان) جا بەڕاستی من (لەوێدا) ماسی یەکەم لە بیرچوو) تاکۆتایی ئایەتەکە. وتی: جا هەردووکیان بە چاوگێڕان بە شوێنی خۆیاندا گەڕانەوە، ئەنجا لەدەریاکە شوێنی ڕۆشتنی ماسی یەکەیان بینی وەك تاق وابوو، جا بۆ لاوە بەردەستەکەی جێی سەرسوڕمان بوو، وە بۆ ماسی یەکەش بووبوو بەڕێگا. وتی: جا کاتێ گەشتنە لای گابەردەکە لەو کاتەدا هەردووکیان پیاوێکیان بینی بە پۆشاکێك داپۆشرابوو، مووساش ﷺ سەلامی لێ کرد، پیاوەکەش وتی: چۆن لەم وڵاتەی تۆدا سەلام کردن هەیە؟ وتی: من مووسام، وتی: مووسای بەنی ئیسرائیل؟ وتی بەڵێ، وتی: (ئایا (هاوڕێتبم)

شوێنت بکەوم بۆ ئەوەی لەو زانیارییە ڕاستەی فێری بوویت فێرم بکەیت؟) خەزیریش پێی وت: ئەی مووسا بێگومان تۆ زانیاریەکت لایە لەو زانستەی کە خوا فێری کردویت من نایزانم، منیش زانیارییەکەم لایە لەو زانیارییەی خوا کە فێری منی کردووە تۆ نایزانی، مووسا وتی: ئایا شوێنت بکەوم؟ خەزیر وتی: (ئەگەر شوێنم کەوتی ئەوە پرسیاری هیچ شتێکم لێ مەکە هەتا خۆم دەربارەی قسەت بۆ دەکەم [1]))، جا هەردووکیان دەرچوون و ڕۆشتن بەکەناری دەریادا، ئەنجا کەشتی یەك بەلایاندا ڕۆشت، ئینجا خەزیریان ناسی، بۆیە بەبێ کرێ سواری کەشتیەکەی خۆیانیان کرد - دەڵێ: (بغير نول) واتە: بە بێ کرێ - جا هەردووکیان سواری کەشتیەکە بوون، وتی: چۆلەکەیەك لەسەر قەراغی کەشتیەکە نیشتەوە و دەنوکی کرد بەناو دەریاکەدا، جاخەزیر بە مووسای فەرموو: زانیاری تۆو زانیاری من و هەموو دروستکراوەکان لە بەرانبەر زانیاری خوادا تەنها بە ئەندازەی ئەو دەنووك کردنەی ئەو چۆلەکەیەیە (چەند ئاوی هەڵگرتووە لە هەموو دەریاکە).

وتی: جا ئەوەی کە سەیر بوو بەلای مووساوە ﷺ خەزیر تەشوێیەکی هێنا و کەشتیەکەی کون کرد، مووساش پێی وت: کەسانێك ئێمەیان بە بێ کرێ سوار (ی کەشتی)یان کردین تۆ چوویت کەشتیەکەیانت کون کرد (بۆئەوەی سەرنشینەکانی (لەدەریادا) نوقم بکەیت، سوێند بەخوا بەڕاستی کارێکی زۆر خراپت کرد)، ئەنجا هەردوو ڕۆشتن، ئینجا هەردووکیان مێرد منداڵێکیان بینی لەگەڵ چەند مێرد منداڵێکدا یاری دەکرد، جا خەزیر سەری گرت و قرتاندی (سەری بڕی)، جا مووسا پێی وت: (کەسێکی پاك و بێ گوناهت هەروا کوشت بێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ، سوێند بەخوا بەڕاستی کارێکی زۆر خراپ و ناڕەوات

---

(١) لە نهێنی یەکەی ئاگادارت دەکەم.

**کرد، (بەندە چاکەکە) وتی (بە مووسا): پێم نەوتیت بێگومان تۆ هەرگیز ناتوانی خۆت بگری لەگەڵ مندا) تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە (جا ئەوان (خەڵکی شارەکە) میوان داریان لێ نەکردن، ئینجا بینیان دیوارێك لەو (شارە)دا نزیك بوو بکەوێت)، جا (خەزیر) بەدەستی ئاوەها کرد و ڕاستی کردەوە، مووساش ﷺ پێی وت: ئێمە چووینە ناو ئەو شارەوە میوان داریان لێ نەکردین وخواردنیان پێ نەداین (ئەگەر بتویستایە کرێیەکت لەسەری وەردەگرت، (خەزیر) وتی: ئالێرەدا کاتی جیابوونەوەی من و تۆیە و لە حیکمەتی ئەو شتانەی کە تۆ نەت توانی خۆت بگری لەسەر (ڕوودان)یان ئاگادارت دەکەم)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (ئاواتە خوازبووین کە مووسا ﷺ دانی بەخۆیدا بگرتایە تا کار و بەسەرهاتی ئەو دووانە بگێردرایەتەوە بۆمان)).**

**دەڵێ: ئیبنو عەبباس ﷺ ئەم ئایەتەی ئاوا دەخوێندەوە:** (وَكَانَ أَمَامَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ صَالِحَةٍ غَصْبًا، وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ كَافِرًا)[1].

## ٦ - بابُ قوله: ﴿ قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا ﴿١٠٣﴾ ﴾ الكهف

﴿ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾ ﴾ الكهف: عملًا.

٤٧٢٨ - حَدَّثَنِي محمَّد بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْن جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا شعْبَةُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ مُصْعَبٍ قَالَ سَأَلْتُ أَبِي ﴿ قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا ﴿١٠٣﴾ ﴾ الكهف. هُمُ الحرُورِيَّة؟ قَالَ: لَا، هُمُ اليهُودُ وَالنَّصَارى، أمَّا اليَهُودُ فَكَذَّبُوا محَمَّدًا ﷺ، وَأَمَّا النَّصَارى كَفَروا بِالْجَنَّةِ وَقَالُوا لَا طَعَامَ فِيهَا وَلَا شَرَابَ، وَالَحْرُورِيَّهُ الذِينَ يَنْقُضُونَ عَهْدَ اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ، وَكَانَ سَعْدٌ يسَمِّيهِمُ: الفَاسِقِينَ.

---

(١) لە کۆتایی فەرموودەی (٤٧٢٥) ئەم خوێندنەوەی ئیبنو عەبباسمان ڕوون کردەوە.

## ٦ - باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (بڵێ ئایا هەواڵتان بدەینێ بە خەسارەتمەندترین (کەس) لە کار و کردەوەکانیدا؟)

﴿صُنْعًا﴾ واته: ئیش وكارێك.

٤٧٢٨ - موصعەب دەڵێ: پرسیارم لە باوکم کرد لە (مەبەستی ئەم ئایەتە)، (بڵێ: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە خەسارەتمەندترین (کەس) لە کار و کردەوەکانیاندا؟) ئەوانە حەرورییەکانن[1]؟ وتی: نەخێر ئەوانە جوولەکە و گاوورەکان، جا جوولەکەکان باوەڕیان بەموحەممەد ﷺ نەهێنا، گاورەکانیش باوەڕیان بە بەهەشت نەبوو وتیان: بەهەشت خواردن وخواردنەوەی تیا نییە، حەرورییەکانش ئەوانەن پەیمانی خودا هەڵدەوشێننەوە لە پاش بەستنی، وە سەعد (حەروریەکانی) بە لە سنوور دەرچووان[2] ناوی دەبرد.

## ٧ - بابٌ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَلِقَآئِهِۦ فَحَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾﴾ الكهف

٤٧٢٩ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، أَخْبَرَنَا الْمُغِيرَةُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ الْعَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لاَ يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ وَقَالَ:اقْرَءُوا ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾﴾ الكهف: وَعَنْ يَحْيَى بْنِ بُكَيْرٍ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَن، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ مِثْلَهُ.

---

(١) واته: خەواریجەکان بۆیە ئەو ناوەیان لێ نرابوو چونکە سەرەتا لە گوندێکی نزیکی کوفە پەیدابوون کە ناوی (حەرەورا) بوو. (إرشاد الساری: ١٠/٣٩٥)

(٢) ڕاستر وایە بوترێت: خەسارەتمەندان.

## ٧ - باسێک: (ئەوانە کەسانێکن بێ باوڕ بوون بە نیشانەکانی پەروەردگاریان وەگەیشتن بە خزمەتی (لە دواڕۆژدا) لەبەر ئەوە کردەوەکانیان پوچەڵ و بێ نرخ بووەوە، کەواتە لە ڕۆژی دوایی دا هیچ نرخ ڕێزێکیان بۆ دانانێین)

**٤٧٢٩ - ئەبو هوڕەیرە ﵁ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان لە ڕۆژی قیامەت دا پیاوێکی گەورەی قەڵەو دێت لای خوا قورسایی (کێشی) باڵە مێشولەیەکی نییە))، وە فەرمووی: ئەم ئایەتە بخوێنەوە (کەواتە لە ڕۆژی دوایی دا هیچ نرخ و ڕێزێکیان بۆ دانانێین).**

**- وێنەی ئەم فەرموودەیە گێڕدراوەتەوە لە یەحیای کوڕی بوکەیرەوە لە موغیرەی کوڕی عەبدورەحمانەوە لە ئەبی زینادەوە.**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ١٩ - سورة ﴿كٓهيعٓصٓ﴾ (مريم)

قَالَ ابن عَبَّاسٍ: أَسْمِعْ بِهِمْ وَ أَبْصِرْ اللَّهُ يَقُولُهُ، وَهُمُ اليَوْمَ لَا يَسْمَعُونَ وَلَا يُبْصِرُونَ ﴿فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾﴾ مريم: هو يَعْنِي قوله: ﴿أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ ﴿٣٨﴾﴾ مريم: الكُفَّارُ يَوْمَئِذٍ أَسْمَعُ شَيْءٍ وَأَبْصَرُهُ، ﴿لَأَرْجُمَنَّكَ ﴿٤٦﴾﴾ مريم: لَأَشْتِمَنَّكَ ﴿وَرِءْيًا ﴿٧٤﴾﴾ مريم: مَنْظَرًا. وَقَالَ أَبو وَائِلٍ: عَلِمَتْ مَرْيَمُ أَنَّ التَّقِيَّ ذُو نُهْيَةٍ حَتَّى قالت: ﴿قَالَتْ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحْمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا ﴿١٨﴾﴾ مريم: وَقَالَ ابن عُيَيْنَةَ: ﴿تَؤُزُّهُمْ أَزًّا ﴿٨٣﴾﴾ مريم: تُزْعِجُهُمْ إِلَى المَعَاصِي إِزْعَاجًا. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿إِدًّا ﴿٨٩﴾﴾ مريم: عِوَجًا. قَالَ ابن

عَبَّاسٍ ﴿ وِرْدًا ﴿٨٦﴾ ﴾ مريم: عِطَاشًا ﴿ أَثَٰثًا ﴿٧٤﴾ ﴾ مريم: مَالًا ﴿ إِدًّا ﴿٨٩﴾ ﴾ مريم: قَوْلًا عَظِيمًا. ﴿ رِكْزًا ﴿٩٨﴾ ﴾ مريم: صَوْتًا. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ فَلْيَمْدُدْ ﴿٧٥﴾ ﴾ مريم: فَلْيَدَعْهُ. ﴿ غَيًّا ﴿٥٩﴾ ﴾ مريم: خُسْرَانًا ﴿ وَبُكِيًّا ﴿٥٨﴾ ﴾ مريم: جَمَاعَةُ بَاكٍ ﴿ صِلِيًّا ﴿٧٠﴾ ﴾ مريم: صَلِيَ يَصْلَى ﴿ نَدِيًّا ﴿٧٣﴾ ﴾ مريم: وَالنَّادِي مَجْلِسًا.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٩ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿ كٓهيعٓصٓ ﴾[1]

**- ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: ﴿ أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ ﴾، ئەمە خوا دەیفەرموێ، وە ئەو (کافرانە) ئەمڕۆ نابیستن ونابینن.﴿ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ (لەگومڕاییەکی ئاشکرادان) مەبەستی ئەم ئایەتەیە: (چەند بیسەر و بینەرن) مەبەستی بەوانە ئەو کافرانەیە لەو ڕۆژەدا لە هەموو شتێك بیسەرتر و بینەرترن. ﴿ لَأَرْجُمَنَّكَ ﴾: بێگومان جنێوت پێ دەدەم. ﴿ وَرِءْيًا ﴾ دیمەنێك. ئەبو وائیل وتی: مەریەم زانیبوی کە پارێزکار خاوەنی عەقڵ و ژیرییە کاتێ کە وتی: (من پەنا دەگرم بە خوای میهرەبان لە تۆ ئەگەر تۆ لە خواترس و پارێزکاری). ئیبنو عویەینە دەڵێ: ﴿ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا ﴾ زۆر بەهێز پاڵیان پێوە دەنێن بۆ گوناهو تاوان کردن. موجاهید دەڵێ: ﴿ إِدًّا ﴾ لار و چەوت. ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: ﴿ وِرْدًا ﴾: (ئاژەڵانی) تینو. ﴿ أَثَٰثًا ﴾ ماڵ و سامان. ﴿ إِدًّا ﴾ وتەیەکی گەورە و نابەجێ. ﴿ رِكْزًا ﴾: دەنگێکی هێواش.**

---

(١) سوڕەتی مریەم.

موجاهيد دەڵێ: ﴿ فَلْيَمْدُدْ ﴾ واتە: باوازی لێ بێنێت. ﴿ غَيًّا ﴾ خەسارەتمەندی. ﴿ وَبُكِيًّا ﴾: کۆمەڵێ (کەس) بەگریانەوە. ﴿ صِلِيًّا ﴾ لە (صَلِيَ يَصلَى)[1] وەهاتووە (واتە: کەوتووە ناو ئاگر یان بەئاگر سووتاوە) ﴿ نَدِيًّا ﴾ و (النَّادِي) ماناکەیان یەکە واتە: کۆڕ و مەجلیس.

## ١ - بابُ قَوْلِه: ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ ﴿٣٩﴾ ﴾ مريم

٤٧٣٠ - حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يُؤْتَى بِالْمَوْتِ كَهَيْئَةِ كَبْشٍ أَمْلَحَ فَيُنَادِي مُنَادٍ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ. فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ هَذَا الْمَوْتُ -وَكُلُّهُمْ قَدْ رَآهُ - ثُمَّ يُنَادِي يَا أَهْلَ النَّارِ، فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ، فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ هَذَا الْمَوْتُ -وَكُلُّهُمْ قَدْ رَآهُ - فَيُذْبَحُ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ، خُلُودٌ فَلاَ مَوْتَ، وَيَا أَهْلَ النَّارِ، خُلُودٌ فَلاَ مَوْتَ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ ﴿٣٩﴾ ﴾ مريم وَهَؤُلاَءِ فِي غَفْلَةٍ أَهْلُ الدُّنْيَا ﴿ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ مريم

## ١ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەی موحەممەد ﷺ ئەو (ستەمکار)انە لە ڕۆژی داخ و خەفەت بترسێنە)

٤٧٣٠ -ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( (لە ڕۆژی قیامەتدا) مردن دەهێنرێت لەسەر شێوەی بەرانێکی ڕەش وسپی[2]، جا

(١) دوو مانای هەیە: سووتاو دەسوتێ یان کەوتە ئاگرەوە دەکەوێتە ئاگرەوە.

(٢) یان بەرانێکی سپی.

جارِدەرێك جارِ دەدات: ئەی بەهەشتیەکان ئەوانیش ملیان بەرز دەکەنەوە و تەماشا دەکەن جا دەڵێ: ئەمە دەناسن؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ ئەوە مردنە، وە بێگومان هەموویان بینیویانە (و دەزانن) لە پاشان جارِدەرەکە بانگ دەکات: ئەی دۆزەخیەکان، ئەوانیش ملیان بەرز دەکەنەوە و تەماشا دەکەن جا دەڵێ: ئایا ئەمە دەناسن؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ ئەوە مردنە، بێگومان هەموویان دیویانە (و دەزانن)، ئەنجا سەر دەبرِدرێت، لە پاشان دەڵێ: ئەی بەهەشتیەکان (ئێوە) هەتا هەتایین هەرگیز نامرن، وە ئەی دۆزەخیەکان (ئێوەش) هەتا هەتاین وهەرگیز نامرن)).لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (ئەی موحەممەد ﷺ) ئەو (ستەمکار)انە لە رِۆژی داخ و خەفەت بترسێنە کاتێ کاروباری (خەڵکی) کۆتایی پێ دەهێنرێت، لەکاتێکدا (ئەوانە غافڵن). ئا ئەوانەی لە غەفڵەتدان خەڵکی دونیان[1] (ئەوانەن باوەرِناهێنن (بەرِۆژی دوایی) ).

## ٢ - بابُ قَوْلِهِ: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا ﴿٦٤﴾ ﴾ مريم

٤٧٣١ - حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ ذَرٍّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِجِبْرِيلَ: «مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَزُورَنَا أَكْثَرَ مِمَّا تَزُورُنَا؟ " فَنَزَلَتْ: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا ﴿٦٤﴾ ﴾ مريم

(١) ئەوانەن هەر سەرقاڵی دونیا و ئارەزووەکانی دونیان.

## ٢ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئێمە (فریشتەکان) لە ئاسمانەوە دانابەزین بە فەرمانی پەروەردگارت نەبێ تەنها بۆ خوایە ( و خوا دەزانێت) هەموو کاروباری داهاتوو ڕابردوو)

**٤٧٣١ -ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر بەجیبریلی فەرموو: ((چ شتێك ڕێگرتە لەوەی کە زیاتر سەردانیمان بکەیت لەو ئەندازەی سەردانیمان دەکەیت؟))، بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (ئێمە (فریشتەکان) لەئاسمانەوە دانابەزین بە فەرمانی پەروەردگارت نەبێ، تەنها بۆ خوایە (و خۆی دەزانێ) هەموو کاروباری داهاتوو ڕابردوو ئێستامان).**

### ٣ - بابُ قَوْله: ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾﴾ مريم

٤٧٣٢ - حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: سَمِعْتُ خَبَّابًا قَالَ: جِئْتُ الْعَاصِيَ بْنَ وَائِلٍ السَّهْمِيَّ أَتَقَاضَاهُ حَقًّا لِي عِنْدَهُ، فَقَالَ: لاَ أُعْطِيكَ حَتَّى تَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ. فَقُلْتُ: لاَ حَتَّى تَمُوتَ ثُمَّ تُبْعَثَ. قَالَ: وَإِنِّي لَمَيِّتٌ ثُمَّ مَبْعُوثٌ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: إِنَّ لِي هُنَاكَ مَالاً وَوَلَدًا فَأَقْضِيكَهُ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾﴾ مريم، رَوَاهُ الثَّوْرِيُّ، وَشُعْبَةُ، وَحَفصٌ، وَأَبُومُعَاوِيَةَ،وَوَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٠٩١.

## ٣ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئایا ئەو کەست دیوە بێ باوەڕ بوو بە نیشانەو ئایەتەکانی ئێمە وتی (لە ڕۆژی دواییشدا) ماڵ و کوڕم پێ دەدرێت)

٤٧٣٢ - مەسروق دەڵێ: لەخەبباب ﷺ بیست وتی: ڕۆشتم بۆلای عاصی کوڕی وائیلی سەهمی هەقێکم[1] لای بوو لێی وەرگرمەوە (عاص) وتی: پێت نادەم هەتا بێ باوەڕ نەبیت بە موحەممەد ﷺ، منیش وتم: نەخێر (بێ باوەر نابم) هەتا تۆ نەمریت لە پاشان زیندوو نەکرێیتەوە، وتی: بەڕاست من دەمرم پاشان زیندوو دەبمەوە؟ وتم: بەڵێ، وتی: بێگومان لەوێش من ماڵ و کوڕم دەبێت و هەقەکەت دەدەمەوە، ئیتر بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (ئایا ئەو کەسەت دیوە بێ باوەڕ بوو بە نیشانە و ئایەتەکانی ئێمە و وتی: (لە ڕۆژی دواییشدا) ماڵ و کوڕم پێ دەدرێت).

- سەوری و شوعەیب و حەفص و ئەبو موعاویە و وەکیع لە ئەعمەشەوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە.

## ٤ - بابُ قوله: ﴿ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ ﴾ مريم، قَالَ: مَوْثِقًا.

٤٧٣٣ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ خَبَّابٍ قَالَ: كُنْتُ قَيْنًا بِمَكَّةَ، فَعَمِلْتُ لِلْعَاصِي بْنِ وَائِلٍ السَّهْمِيِّ سَيْفًا، فَجِئْتُ أَتَقَاضَاهُ فَقَالَ: لاَ أُعْطِيكَ حَتَّى تَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ. قُلْتُ: لاَ أَكْفُرُ بِمُحَمَّدٍ ﷺ حَتَّى يُمِيتَكَ اللَّهُ، ثُمَّ يُحْيِيَكَ. قَالَ إِذَا أَمَاتَنِي اللَّهُ ثُمَّ بَعَثَنِي، وَلِي مَالٌ وَوَلَدٌ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَٰتِنَا

---

(١) قەرزێکی لای بوو کە کرێ شمشێر دروست کردن بوو، چونکە خەبباب ئاسنگەر بوو. بڕوانە : إرشاد الساري:١٠/٤٠٢.

وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ ﴾ مريم قَالَ: مَوْثِقًا. لَمْ يَقُلِ الأَشْجَعِيُّ عَنْ سُفْيَانَ: سَيْفًا وَلاَ مَوْثِقًا[1].

## ٤ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئایا نهێنیەکان ئاگادارە یان بەڵێنی لە خوای میهرەبان وەرگرتووە)

**(موحەممەدی کوڕی کەسیر[2] وتی: (عَهْدًا): بەڵێنێکی پتەو.**

**٤٧٣٣ - مەسروق: لە خەبابەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: من لە مەککەدا ئاسنگەر بووم شمشێرێکم بۆ عاصی کوڕی وائلی سەهمی دروست کرد، جا ڕۆشتم (کرێکەی) لێ وەرگرم، عاصیش وتی: ناتدەمێ تا بێ باوەڕ نەبی بەموحەممەد ﷺ وتم: بێ باوەڕ نابم بەموحەممەد هەتا خوا دەتمرێنێت لە پاشان زیندووت دەکاتەوە، وتی: کاتێ خوا مراندمی لە پاشان زیندووی کردمەوە سامان و کوڕم دەبێ، بەم هۆیەوە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: (ئایا ئەو کەسەت دیوە بێ باوەڕ بوو بە نیشانە وئایەتەکانی ئێمە و وتی: (لە ڕۆژی دواییشدا) ماڵ وکوڕم پێ دەدرێت، ئایا نهێنیەکان ئاگادارە یان بەڵێنی لە خوای میهرەبان وەرگرتووە)، وتی: (عَهْدًا): بەڵێنێکی پتەو.**

**- ئەشجەعی لە گێڕانەوەکەیدا لە سوفیانەوە هیچ کام لە: (سَيْفًا) و (مَوْثِقًا)ی نەهێناوە.**

## ٥ - بابٌ: قوله: ﴿ كَلَّا سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ ﴾ مريم

٤٧٣٤ - حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ، سَمِعْتُ أَبَا الضُّحَى يُحَدِّثُ عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ خَبَّابٍ قَالَ: كُنْتُ قَيْنًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ لِي دَيْنٌ

---

(١) بروانە: ٢٠١٩.

(٢) موحەممەدی کوڕی کەسیر مامۆستای ئیمامی بوخاری یە.

عَلَى الْعَاصِي بْنِ وَائِلٍ قَالَ فَأَتَاهُ يَتَقَاضَاهُ، فَقَالَ: لاَ أُعْطِيكَ حَتَّى تَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ. فَقَالَ: وَاللَّهِ لاَ أَكْفُرُ حَتَّى يُمِيتَكَ اللَّهُ ثُمَّ تُبْعَثَ. قَالَ: فَذَرْنِي حَتَّى أَمُوتَ ثُمَّ أُبْعَثَ، فَسَوْفَ أُوتَى مَالاً وَوَلَدًا، فَأَقْضِيكَ. فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾﴾ مريم[1].

## ٥ - باسێک:ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە (نەخێر (وانیە) لەمەو پاش ئەوەی دەیڵێ دەینوسین (لەسەری) و ماوەی سزای بۆ درێژ دەکەینەوە)

**٤٧٣٤ -مەسروق لە خەببابەوە ﷺ دەیگێڕیتەوە دەڵێ: من لەسەردەمی نەفامیدا ئاسنگەر بووم (لە مەککە) و من قەرزێکم هەبوو لەلای عاصی کوڕی وائلی سەهمی دەڵێ: ڕۆشت بۆ لای قەرزەکەی لێ وەرگرێتەوە، عاصیش وتی: ناتدەمێ هەتا بێ باوەڕ نەبی بەموحەممەد ﷺ، (خەببابیش) وتی: بێ باوەڕ نابم پێی هەتا خوا دەتمرێنێت لە پاشان زیندووت دەکاتەوە، (عاص) وتی: لێم گەڕێ هەتا دەمرم پاشان زیندوو دەکرێمەوە جا ئەوکاتە ماڵ و کوڕم پێ دەدرێت و قەرزەکەت دەدەمەوە، بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (ئایە ئەو کەسەت دیوە بێ باوەڕ بوو بە نیشانە و ئایەتەکانی ئێمە و وتی (لە ڕۆژی دواییشدا) ماڵ و کوڕم پێ دەدرێت).**

---

(١) بڕوانە: ٢٠٩١.

## ٦ - بابٌ: قَوْله ﷻ: ﴿ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾ ﴾ مريم وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ ﴾ مريم هَدْمًا.

٤٧٣٥ - حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ خَبَّابٍ قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً قَيْنًا، وَكَانَ لِي عَلَى الْعَاصِي بْنِ وَائِلٍ دَيْنٌ فَأَتَيْتُهُ أَتَقَاضَاهُ، فَقَالَ لِي: لاَ أَقْضِيكَ حَتَّى تَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ. قَالَ: قُلْت: لَنْ أَكْفُرَ بِهِ حَتَّى تَمُوتَ ثُمَّ تُبْعَثَ. قَالَ: وَإِنِّي لَمَبْعُوثٌ مِنْ بَعْدِ الْمَوْتِ؟ فَسَوْفَ أَقْضِيكَ إِذَا رَجَعْتُ إِلَى مَالٍ وَوَلَدٍ. قَالَ فَنَزَلَتْ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾ ﴾ مريم[1].

## ٦ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (ئەوەی دەیڵێ (لە ماڵ و کوڕ) بە میرات لێی وەردەگرینەوە (لە ڕۆژی دوایدا) بەتەنها دێتە وە لامان)

**ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴾: ڕووخان و لێك هەڵوەشان.**

**٤٧٣٥ -مەسروق لە خەببابەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: من لە ڕابردوودا پیاوێکی ئاسنگەر بووم، وە قەرزێکم لای عاصی کوڕی وائیلی سەهمی بوو، ئەنجا ڕۆشتم بۆلای قەرزەکەی لێ وەرگرمەوە، پێی وتم: قەرزەکەت نادەمەوە هەتا بێ باوەڕ نەبێ بە موحەممەد ﷺ، (خەبباب) دەڵێ: منیش وتم: بێ باوەڕ نابم بە موحەممەد ﷺ هەتا تۆ نەمریت و زیندوو نەکرێیتەوە، وتی: من زیندوو دەبمەوە لە پاش مردن؟ جا ئەوکاتە قەرزەکەت دەدەمەوە کە گەڕامەوە بۆ سەر**

---

(١) بروانە: ٢٠٩١.

**ماڵ و کوڕی خۆم، دەڵێ بەو هۆیەوە ئەم ئایەتانەی دابەزی (ئایە ئەو کەست دیوە بێ باوەڕ بوو بە نیشانە و ئایەتەکانی ئێمە و وتی: (لە ڕۆژی دواییشدا) ماڵ و کوڕم پێ دەدرێت. ئایا نهێنیەکان ئاگاردارە یان بەڵێنی لە خوای میهرەبان وەرگرتووە. نەخێر (وانیە) لەمەو پاش ئەوەی دەیڵێ دەینوسین (لەسەری) و ماوەی بۆ درێژ دەکەینەوە، ئەوەی ئەو دەیڵێ (لە ماڵ و کوڕ) بە میرات لێی وەردەگرینەوە (لە ڕۆژی دواییدا) بەتەنها دێتەوە لامان).**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ٢٠ - سورة طه

قَالَ ابن جُبَيْرٍ والضَّحَّاكُ: بِالنَّبَطِيَّةِ ﴿ طه ۝١ ﴾ طه: يَا رَجُلُ قال مجاهد: ﴿ أَلْقَى ۝٦٥ ﴾ طه: صَنَعَ. يُقَالُ: كُلُّ مَا لَمْ يَنْطِقْ بِحَرْفٍ أَوْ فِيهِ تَمْتَمَةٌ أَوْ فَأْفَأَةٌ، فَهْيَ عُقْدَةٌ. ﴿ أَزْرِى ۝٣١ ﴾ طه: ظَهْرِي. ﴿ فَيُسْحِتَكُمْ ۝٦١ ﴾ طه: يُهْلِكَكُمْ. ﴿ الْمُثْلَى ۝٦٣ ﴾ طه: تَأْنِيثُ الأَمْثَلِ، يَقُولُ: بِدِينِكُمْ يُقَالُ: خُذِ المُثْلَى خُذِ الأَمْثَلَ. ﴿ ثُمَّ ائْتُوا صَفًّا ۝٦٤ ﴾ طه: يُقَالُ: هَلْ أَتَيْتَ الصَّفَّ اليَوْمَ يَعْنِي المُصَلَّى الذِي يُصَلَّى فِيهِ ﴿ فَأَوْجَسَ ۝٦٧ ﴾ طه: أَضْمَرَ خَوْفًا فَذَهَبَتِ الوَاوُ مِنْ ﴿ خِيفَةً ۝٦٧ ﴾ طه: لِكَسْرَةِ الخَاءِ ﴿ فِي جُذُوعِ ۝٧١ ﴾ طه: أَيْ على جُذُوعِ النَّخْلِ. ﴿ خَطْبُكَ ۝٩٥ ﴾ طه: هو بَالُكَ. ﴿ لَا مِسَاسَ ۝٩٧ ﴾ طه: مَصْدَرُ مَاسَّهُ مِسَاساً. ﴿ لَنَنسِفَنَّهُ ۝٩٧ ﴾ طه: لَنَذْرِيَنَّهُ. ﴿ قَاعًا ۝١٠٦ ﴾ طه: يَعْلُوهُ المَاءُ وَالصَّفْصَفُ المُسْتَوِي مِنَ الأَرْضِ. وَقَالَ

مُجَاهِدٌ: ﴿ أَوْزَارًا ﴿٨٧﴾ ﴾ طه: أثقالاً. ﴿ مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ ﴿٨٧﴾ ﴾ طه: الحُلِيُّ الذِي اسْتَعَارُوا مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ. (فَقَذَفْتُهَا) فَأَلْقَيْتُهَا، ﴿ أَلْقَىٰ ﴿٦٥﴾ ﴾ طه: صَنَعَ. ﴿ فَنَسِىَ ﴿٨٨﴾ ﴾ طه: مُوسَى، هُمْ يَقُولُونَهُ أَخْطَأَ الرَّبَّ. ﴿ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا ﴿٨٩﴾ ﴾ طه: العِجْلُ. ﴿ هَمْسًا ﴿١٠٨﴾ ﴾ طه: حِسُّ الأَقْدَامِ. ﴿ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ ﴿١٢٥﴾ ﴾ طه: عَنْ حُجَّتِي. ﴿ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ ﴾ طه: فِي الدّنْيَا. قَالَ ابنِ عَبَّاسٍ: ﴿ بِقَبَسٍ ﴿١٠﴾ ﴾ طه: ضَلُّوا الطَّرِيقَ، وكانوا شَاتِينَ، فقال: إن لم أَجِدْ عليها مَنْ يَهْدِي الطَّرِيقَ آتِكُمْ بِنَارٍ تُوقِدون. وَقَالَ ابن عُيَيْنَةَ: ﴿ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً ﴿١٠٤﴾ ﴾ طه: أَعْدَلُهُمْ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ هَضْمًا ﴿١١٢﴾ ﴾ طه: لَا يُظْلَمُ فَيُهْضَمُ مِنْ حَسَنَاتِهِ. ﴿ عِوَجًا ﴿١٠٧﴾ ﴾ طه: وَادِيًا. ﴿ وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ ﴾ طه: رَابِيَةً. ﴿ سِيرَتَهَا ﴿٢١﴾ ﴾ طه: حَالَتَهَا ﴿ ٱلْأُولَىٰ ﴿٢١﴾ ﴾ طه: ﴿ ٱلنُّهَىٰ ﴿٥٤﴾ ﴾ طه: التُّقَى. ﴿ ضَنكًا ﴿١٢٤﴾ ﴾ طه: الشَّقَاءُ ﴿ هَوَىٰ ﴿٨١﴾ ﴾ طه: شَقِيَ. ﴿ ٱلْمُقَدَّسِ ﴿١٢﴾ ﴾ طه: المُبَارَكِ ﴿ طُوًى ﴿١٢﴾ ﴾ طه: اسْمُ الوَادِي ﴿ بِمَلْكِنَا ﴿٨٧﴾ ﴾ طه: بِأَمْرِنَا ﴿ مَكَانًا سُوًى ﴿٥٨﴾ ﴾ طه: مَنْصَفٌ بَيْنَهُمْ. ﴿ يَبَسًا ﴿٧٧﴾ ﴾ طه: يَابِسًا ﴿ عَلَىٰ قَدَرٍ ﴿٤٠﴾ ﴾ طه: مَوْعِدٍ ﴿ وَلَا تَنِيَا ﴿٤٢﴾ ﴾ طه: تَضْعُفَا.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٢٠ - (تەفسیری) سورەتی تاها

-ئیبنو جوبەیر و زەحاك دەڵێن: ﴿ طه ﴾: بەزمانی نەبەتی[١] واتە: ئەی پیاوەكە موجاهید دەڵێ: ﴿ أَلْقَىٰ ﴾ وەك ئەوانی كرد.هەركەسێك نەتوانێ پیتێك

(١) نەبەتی: میللەتێك بوون كە عەرەب نەبوون لە نێوان عێراق و نەردەندا دەژیان میرنشینەكەیان دامەزراند، پایتەختەكە (بەترا) بوو، بۆیە وا ناونرا چونكە لەزەویدا بەرهەمیان دەردەهێنا و دەستگیر دەبوو. (ئەلمونجد بەكوردی: ٢٠/٥).

بلّێت یان پیتی (ت) یان (ف) بۆ نەوترێت ئەوە پێی دەوترێت: (عُقْدَةٌ)[1]. ﴿ أَزْرِى ﴾ پشتم. ﴿ فَيُسْحِتَكُمْ ﴾ لەناوتان دەبات. ﴿ ٱلْمُثْلَىٰ ﴾: مێی وشەی: (الأَمْثَل)ـە، دەڵێ: (بِدِينِكُمْ) بەئاینەکەتان (کە جادو و سیحرە) دەوترێت: (خُذِ المُثْلَى) واتە: چاکترینیان وەربگرە. ﴿ ثُمَّ ٱئْتُواْ صَفًّا ﴾: دەوترێت (هَلْ أَتَيْتَ الصَّفَّ اليَوْمَ؟) دەوترێت: ئەمڕۆ هاتویت بۆ شوێنی نوێژ کردن، مەبەستی ئەو نوێژگەیە کە نوێژی تیا دەکرێت. ﴿ فَأَوْجَسَ ﴾: ترسانەکەی شاردەوە، وشە ﴿ خِيفَةً ﴾ پیتی (و)ـەکەی ڕۆشتووە بە هۆی ژێری پیتی (خ)وە. ﴿ فِى جُذُوعِ ﴾ لەسەر بنی دار خورما. ﴿ خَطْبُكَ ﴾: چی پەیوەندی بە تۆوە هەیە، چی وای لێکردی. ﴿ لَا مِسَاسَ ﴾ چاوگی: (مَاسَّهُ مِسَاساً)ـە. ﴿ لَنَنسِفَنَّهُۥ ﴾ بێگومان (خۆڵەمێشەکەی) بلاودەکەینەوە و دەیپرژێنین. ﴿ قَاعًا ﴾ (زەوییەکە) ئاوی بەسەر وەبێت[2] (الصَّفْصفُ) زەویەکی ڕێك و ساف. موجاهید دەڵێ: ﴿ أَوْزَارًا ﴾ چەند باری قورس. ﴿ مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ ﴾: ئەو خشڵ و زێڕانە لە ئالی فیرعەون بەخواستن وەریانگرتبوو. (فَقَذَفْتُهَا): ئەنجا ئەو خشڵەم توڕدا (یە نێو ئاگرەکەوە).﴿ أَلْقَى ﴾ طه: (سامیریش وەك ئەوانی) کرد (فَنَسِيَ): ئەوە (مووسا ﷺ) لەبیری چووە (دەگەڕێ بە شوێن خوادا).

بەڵام (سامیری بەشوێنکەوتوانی دەڵێ):مووسا هەڵەی کردووە (لەگەڕان بە شوێن) پەروەردگاردا[3]. ﴿ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا رَأَيْتَهُمْ ﴾ ئەو گوێرەکەیە (وەڵامی

---

(١) بەکوردی پێی دەڵێن: تر، یان گیری زمان، واتە ناتوانێ هەندێ پیت بڵێ بە جوانی، مەبەستی ئەو وشەیە لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِى ﴿٢٧﴾ ﴾ طه

(٢) زەوییەکی دەشتایی کاکی بە کاکی.

(٣) کە ئەم گوێرەکەیە.

هیچ وتەیەکیان نەداتەوە).﴿ هَمۡسٗا ﴾: خشەی پێیەکان (چپە چپ)[(١)]. ﴿ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ ﴾ (بەکوێری حەشرت کردم) لە ئاست بەڵگەکانم دا. ﴿ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ﴾:[(٢)] لە دونیادا. ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: ﴿ بِقَبَسٍ ﴾: چلۆسکێك (مووسا و خێزانی) ڕێگەیان ون کردبوو لە یەکتر دابڕابوون (مووسا) وتی: ئەگەر کەسێك نەبینم لای ئاگرەکە ڕێگەمان نیشان دا ئەوە چلۆسکێك دێنم بۆتان ئاگری پێ بکەنەوە (وە خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە). ئیبنو عویەینە دەڵێ: ﴿ أَمۡثَلُهُمۡ طَرِيقَةً ﴾ ڕاسترین ڕێبازیان. ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: ﴿ هَضۡمٗا ﴾ ستەمی لێ ناکرێ بەهۆییەوە چاکەکانی بڕوات وکەمبێتەوە.﴿ عِوَجٗا ﴾: شیوێك، دۆڵێك. ﴿ وَلَآ أَمۡتٗا ﴾ بەرزایی، تەپۆڵکە. ﴿ سِيرَتَهَا ﴾ حاڵەتی ﴿ ٱلۡأُولَىٰ ﴾: یەکەم ﴿ ٱلنُّهَىٰ ﴾ خاوەن تەقوا و پارێزکاری. ﴿ ضَنكٗا ﴾: تەنگی و سەختی. ﴿ هَوَىٰ ﴾ تیاچوو، هەڵدێراو. ﴿ ٱلۡمُقَدَّسِ ﴾ پیرۆز ﴿ طُوٗى ﴾ ناوی شیوێکە. ﴿ بِمَلۡكِنَا ﴾ بەفەرمانی ئێمە. ﴿ مَكَانٗا سُوٗى ﴾: (جێگایەك) لە نێوانیاندا بێت[(٣)]. ﴿ يَبَسٗا ﴾: (ڕێگایەکی) وشکانی. ﴿ عَلَىٰ قَدَرٖ ﴾ لەکاتی دیاری کراودا. ﴿ وَلَا تَنِيَا ﴾ هەردووکتان سستی مەکەن.

## ١ - بابٌ: قَوْلُه: ﴿ وَٱصۡطَنَعۡتُكَ لِنَفۡسِي ۝٤١ ﴾ طه:

٤٧٣٦ - حَدَّثَنَا الصَّلْتُ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا مَهْدِيُّ بْنُ مَيْمُونٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْتَقَى آدَمُ وَمُوسَى، فَقَالَ مُوسَى لآدَمَ: أَنْتَ الَّذِي

(١) دەنگێکی هێواش لە ژێر لێوەوە.

(٢) لەکاتێکدا من لە دونیادا چاو ساغ بووم.

(٣) لە هەردوو لایانەوە وەك یەك دوور بێت.

أَشْقَيْتَ النَّاسَ وَأَخْرَجْتَهُمْ مِنَ الْجَنَّةِ؟ قَالَ لَهُ آدَمُ: أَنْتَ الَّذِي اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِهِ، وَاصْطَفَاكَ لِنَفْسِهِ وَأَنْزَلَ عَلَيْكَ التَّوْرَاةَ؟ قَالَ نَعَمْ. قَالَ: فَوَجَدْتَهَا كُتِبَ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي؟ قَالَ: نَعَمْ. فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى». ﴿ٱلْيَمِّ ﴿٣٩﴾﴾ طه: الْبَحْرُ[1].

## ١ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە تۆم هەڵبژارد بۆ خۆم) [2]

**٤٧٣٦ -ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((ئادەم و مووسا ﷺ بەیەکتری گەشتن، ئەنجا مووسا بە ئادەمی فەرموو: ئایا تۆ ئەو کەسە بویت هەموو خەڵکیت بەدبەخت کرد و لە بەهەشت دەرت کردن؟ ئادەم ﷺ فەرمووی: ئایا تۆ ئەو کەسەی کە خوا هەڵیبژاردویت (بەپێدانی) پەیامەکەی خۆی و هەڵیبژاردویت بۆ خۆی و تەوراتی دابەزاندووە بۆت؟ وتی: بەڵێ، وتی: جا بینیت (ئەوتاوانە) لەسەرم نوسرابوو پێش ئەوەی دروستم بکات؟ وتی: بەڵێ (وایە) جا ئادەم ﷺ بەڵگەکەی زاڵ بوو بەسەر مووسا دا ﷺ. ﴿ٱلْيَمِّ ﴿٣٩﴾﴾ طە: دەریا.**

## ٢ - بابٌ: قَوْلِه: ﴿وَلَقَدْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِى فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَٰفُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَىٰ ﴿٧٧﴾ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ ﴿٧٨﴾ وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ﴿٧٩﴾﴾ طه

٤٧٣٧ - حَدَّثَنِي يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا رَوْحٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ، وَالْيَهُودُ تَصُومُ

---

(١) بڕوانە: ٣٤٠٩.

(٢) بۆ ئەوەی ببێتە پێغەمبەر و پەیامی من ڕاگەیەنییت.

عَاشُورَاءَ، فَسَأَلَهُمْ، فَقَالُوا: هَذَا الْيَوْمُ الَّذِي ظَهَرَ فِيهِ مُوسَى عَلَى فِرْعَوْنَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «نَحْنُ أَوْلَى بِمُوسَى مِنْهُمْ فَصُومُوهُ»[1].

## ٢ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (بەڕاستی نیگامان نارد بۆ مووسا کە بەندەکانم بەشەو ببە (و لە میصر دەرچن) ڕێگەیەکی وشکیان لە دەریا (ئاوی نیل)ـدا بۆ بکەرەوە، مەترسە (فیرعەون) پێت بگات وە مەترسە (لە خنکان لە دەریا دا)، ئینجا فیرعەون بە سەربازەکانیەوە شوێنیان کەوتن و لەناکاو دەریا ئەوانی (لەناو شەپۆلی خۆیدا) داپۆشی چ داپۆشینێک، وە فیرعەون گەلەکەی خۆی گومڕا کرد و ڕێنموونی نەکردن)

**٤٧٣٧ -ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە، جوولەکەکان (ڕۆژی) دەی موحەڕەم بەڕۆژوو دەبوون، (پێغەمبەریش ﷺ) پرسیاری لێ کردن، جوولەکەکانیش وتیان: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە خوا تێیدا مووسای ﵇ سەرخست بەسەر فیرعەون دا، پێغەمبەریش فەرمووی: ((ئێمە لە پێشترین بە مووسا ﵇ لەوان (جوولەکەکان) کەوابوو ئەو ڕۆژە بەڕۆژووبن)).**

### ٣ - بابٌ: قَوْلِه: ﴿فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ١١٧﴾ طه

٤٧٣٨ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ بْنُ النَّجَّارِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «حَاجَّ مُوسَى آدَمَ، فَقَالَ لَهُ: أَنْتَ الَّذِي أَخْرَجْتَ النَّاسَ مِنَ الْجَنَّةِ بِذَنْبِكَ وَأَشْقَيْتَهُمْ؟. قَالَ: قَالَ آدَمُ يَا مُوسَى أَنْتَ الَّذِي

(١) بروانە: ٢٠٠٤.

اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلاَمِهِ، أَتَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي أَوْ قَدَّرَهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي؟!». قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى»[1].

## ٣ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوا ی گەورە: (کەواتە (ئاگاداربن ئیبلیس) هەردووکتان لەبەهەشت دەرنەکات، چونکە دووچاری ناخۆشی و زەحمەت دەبیت)

**٤٧٣٨ -ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (مووسا ﷺ بەڵگەی هێنایەوە لەسەر ئادەم ﷺ و پێی فەرموو: تۆ ئەو کەسە بوویت بەتاوانەکەت هەموو خەڵکت لە بەهەشت کردە دەرەوەو توشی ناخۆشی و زەحمەتت کردن، دەڵێ: ئادەم ﷺ وتی: ئەی مووسا تۆ ئەو کەسەبوویت خودا هەڵیبژاردی و پەیام و فەرمایشتی خۆی پێدایت، ئایا سەرزەنشتی من دەکەیت لەسەر (کردنی) کارێك کە خوا لەسەری نوسیبوم، پێش ئەوەی دروستم بکات؟ - یان بڕیاری داوە لەسەرم پێش ئەوەی دروستم بکات؟!)) پێغەمبە ڕی خوا فەرمووی ((جا ئادەم بە بەڵگە زاڵ بوو بەسەر مووسادا ﷺ)).**

(١) بڕوانە: ٣٤٠٩.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٢١ - سورة الأنْبِيَاء ﷺ

٤٧٣٩ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: بَنِي إِسْرَائِيلَ، وَالْكَهْفُ، وَمَرْيَم، وَطَهَ، وَالأَنْبِيَاءُ هُنَّ مِنَ الْعِتَاقِ الأُوَلِ، وَهُنَّ مِنْ تِلاَدِي[1].

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٢١ - (تەفسیری) سوڕەتی ئەنبیا ﷺ

**٤٧٣٩ -عەبدوڵلا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ دەڵێ: (سوڕەتەکانی) بەنی ئیسرائیل[2] و کەهف و مەریەم و تاها و ئەنبیا ئەمانە لە سوڕەتە دێرینە نایابەکانی سەرەتان وە لەو (سوڕەت)انەن لەمێژە لەبەرم کردوون).**

وَقَالَ قَتَادَةُ ﴿ جُذَٰذًا ﴿٥٨﴾ ﴾ الأنبياء: قَطَّعَهُنَّ. وَقَالَ الْحَسَنُ ﴿ فِي فَلَكٍ ﴿٣٣﴾ ﴾ الأنبياء: مِثْلِ فَلْكَةِ الْمِغْزَلِ. ﴿ يَسْبَحُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ الأنبياء: يَدُورُونَ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: ﴿ نَفَشَتْ ﴿٧٨﴾ ﴾ الأنبياء: رَعَتْ ﴿ يُصْحَبُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ الأنبياء: يُمْنَعُونَ. ﴿ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴿٩٢﴾ ﴾ الأنبياء: قَالَ: دِينُكُمْ دِينٌ وَاحِدٌ. وَقَالَ عِكْرِمَةُ: ﴿ حَصَبُ ﴿٩٨﴾ ﴾ الأنبياء: حَطَبُ بِالْحَبَشِيَّةِ. وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿ أَحَسُّوا ﴿١٢﴾ ﴾ الأنبياء: تَوَقَّعُوهُ مِنْ أَحْسَسْتُ. ﴿ خَٰمِدِينَ ﴿١٥﴾ ﴾ الأنبياء: هَامِدِينَ. ﴿ وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾ ﴾ هود: مُسْتَأْصَلٌ يَقَعُ عَلَى الْوَاحِدِ وَالاثْنَيْنِ

---

(١) بڕوانە: ٤٧٠٨.

(٢) واتە: سوڕەتی الإسراء.

وَالْجَمِيعِ. ﴿ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ الأنبياء: لاَ يُعْيُونَ، وَمِنْهُ: ﴿ حَسِيرٌ ﴿٤﴾ ﴾ الملك: وَحَسَرْتُ بَعِيرِي. عَمِيقٌ بَعِيدٌ. ﴿ نُكِسُواْ ﴿٦٥﴾ ﴾ الأنبياء: رُدُّوا. ﴿ صَنْعَةَ لَبُوسٍ ﴿٨٠﴾ ﴾ الأنبياء: الدُّرُوعُ. ﴿ وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمْرَهُم ﴿٩٣﴾ ﴾ الأنبياء: اخْتَلَفُوا، الْحَسِيسُ وَالْحِسُّ وَالْجَرْسُ وَالْهَمْسُ وَاحِدٌ، وَهْوَ مِنَ الصَّوْتِ الْخَفِيِّ ﴿ ءَاذَنَّٰكَ ﴿٤٧﴾ ﴾ فصلت: أَعْلَمْنَاكَ. ﴿ ءَاذَنتُكُمْ ﴿١٠٩﴾ ﴾ الأنبياء: إِذَا أَعْلَمْتَهُ فَأَنْتَ وَهْوَ ﴿ عَلَىٰ سَوَآءٍ ﴿١٠٩﴾ ﴾ الأنبياء: لَمْ تَغْدِرْ.وَقَالَ مُجَاهِدٌ:﴿ لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ ﴿١٣﴾ ﴾ الأنبياء: فُهَمُونَ ﴿ ٱرْتَضَىٰ ﴿٢٨﴾ ﴾ الأنبياء: رَضِيَ.﴿ ٱلتَّمَاثِيلُ ﴿٥٢﴾ ﴾ الأنبياء: الأَصْنَامُ.﴿ ٱلسِّجِلِّ ﴿١٠٤﴾ ﴾ الأنبياء: الصَّحِيفَةُ.

**- قەتادە دەڵێ: ﴿ جُذَٰذًا ﴾ (بتەکانی) پارچە پارچە و ورد کرد. حەسەن دەڵێ: ﴿ فِى فَلَكٍ ﴾ وەکو سەری تەشی[1]. ﴿ يَسْبَحُونَ ﴾ دەسوڕێنەوە. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ نَفَشَتْ ﴾ئاژەڵەکە بەشەو لەوەڕابوو (زیانی دابوو) ﴿ يُصْحَبُونَ ﴾:پەنا نادرێن. ﴿ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾ ئایینەکەتان یەك ئایینە. عیکریمە دەڵێ: ﴿ حَصَبُ ﴾سوتەمەنی (هەڵگیرسێنەر، دەستەچیلە) بە زمانی حەبەشەی.**

**- جگە لە عیکریمە دەڵێ: ﴿ أَحَسُّواْ ﴾: هەستیان پێ کرد، لە (أَحْسَسْتُ) وەرگیراوە واتە: هەستم پێ کرد. ﴿ خَٰمِدِينَ ﴾ خامۆشان، دامرکاوان ﴿ وَحَصِيدٌ ﴾ بنبڕکراو (وەك دەغڵی دروێنە کراو) ئەم وشەیە بەکاردێ بۆ یەك دانە و دووان و کۆمەڵێك.﴿ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴾ قەت ماندوو نابن. ﴿ حَسِيرٌ ﴾ ماندوووە، (حَسَرْتُ بَعِيرِي) وشترەکەم ماندوو کرد، ئەم دووانەش لە هەمان ڕیشە و مانان. (عَمِيقٌ) (ڕێگای) دوور. ﴿ نُكِسُواْ ﴾ گەڕێندرانەوە. ﴿ صَنْعَةَ لَبُوسٍ ﴾**

---

(١) مەبەستی خولگەی سووڕانەوەی خۆر و مانگە.

(دروستكردنى) پۆشاكى زرێ. ﴿ وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم ﴾ جیاواز بوون (الْحَسِيسُ) و (الْحِسُّ) و (الْجَرْسُ) و (الْهَمْسُ) يەك مانايان هەيە كەبريتيە لە دەنگێكى شاراوەى نزم و هێواش. ﴿ ءَاذَنَّكَ ﴾ ئاگادارمان كردوويت. ﴿ ءَاذَنتُكُمۡ ﴾:كاتێ ئاگادارى بكەيت جا تۆو ئەو﴿ عَلَىٰ سَوَآءٖ ﴾ يەكسانبن، تۆ غەدرت نەكردووە.

- موجاهيد دەڵێ: ﴿ لَعَلَّكُمۡ تُسۡـَٔلُونَ ﴾ تێگەيەنرێن، شارەزاكرێن. ﴿ ٱرۡتَضَىٰ ﴾ (خوا) ڕازى بێت. ﴿ ٱلتَّمَاثِيلُ ﴾ ئەو پەيكەرانە ﴿ ٱلسِّجِلِّ ﴾پەڕە و كاغەز.

## ١ - بابٌ: قوله: ﴿كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ ﴿١٠٤﴾﴾ الأنبياء

٤٧٤٠ - حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ النُّعْمَانِ شَيْخٍ مِنَ النَّخَعِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: خَطَبَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّكُمْ مَحْشُورُونَ إِلَى اللَّهِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً ﴿كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾﴾ الأنبياء. ثُمَّ إِنَّ أَوَّلَ مَنْ يُكْسَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِبْرَاهِيمُ، أَلاَ إِنَّهُ يُجَاءُ بِرِجَالٍ مِنْ أُمَّتِي، فَيُؤْخَذُ بِهِمْ ذَاتَ الشِّمَالِ، فَأَقُولُ: يَا رَبِّ أَصْحَابِي فَيُقَالُ: لاَ تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ. فَأَقُولُ كَمَا قَالَ الْعَبْدُ الصَّالِحُ: ﴿وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ ﴿١١٧﴾﴾ المائدة: إلى قوله:﴿ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾﴾ المائدة فَيُقَالُ: إِنَّ هَؤُلاَءِ لَمْ يَزَالُوا مُرْتَدِّينَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ مُنْذُ فَارَقْتَهُمْ»[1].

---

(١) بروانه: ٣٣٤٩.

# ١ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوا ی گەورە (یەکەمجار چۆن دروستمان کرد (بەڕووت و قووتی) پاش مردنیش ئەو (دروست کردنە) دووبارە دەکەینەوە، ئەوە بەڵێنێکە (جێبەجێکردنی ) لەسەر ئێمەیە ئێمە (ئەو بەڵێنە بەدی دەهێنین)

٤٧٤٠ - ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دا و فەرمووی: ((بەڕاستی ئێوە (لە ڕۆژی دوایی دا) لای خودا کۆدەکرێنەوە بەپێ خاوسی و ڕووت و خەتەنە نەکراوی (یەکەم جار چۆن دروستمان کرد (بەڕووت و قووتی) ئەو (دروست کردنە) دووبارە دەکەینەوە، ئەوە بەڵێنێکە (جێ بەجێ کردنی) لەسەر ئێمەیە بێگومان ئێمە (ئەو بەڵێنە) بەدی دێنێن)، پاشان بێگومان یەکەم کەسێك لە ڕۆژی دوایی دا پۆشاکی لەبەر دەکرێت ئیبراهیمە ﵇ ئاگاداربن بەڕاستی پیاوانێك لە ئوممەتم دەهێنرێن و دەبرێن بۆ لای چەپەوە، منیش دەڵێم: ئەی پەروەردگارم ئەوانە هاوەڵانی منن ئەوسا پێم دەوترێت: تۆ نازانیت ئەوانە لە پاش تۆ چییان داهێناوە، منیش وەك ئەو وتەیە دەڵێم کە بەندە چاکەکە وتی: (وەمن شایەت و چاودێر بووم بەسەریانەوە تامن) تادەگاتە (ئاگادار و شایەتە)، ئەنجا دەوترێت بێگومان ئائەوانە لەو کاتەوەی تۆ بەجێت هێشتوون بەردەوام پاشگەزبوونەتەوە لە ئایین پاشە و پاش گەڕاونەتەوە)).

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٢٢ - سورة الحَجِّ

وَقَالَ ابن عُيَيْنَةَ: ﴿ ٱلۡمُخۡبِتِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾ الحج، المُطْمَئِنِّينَ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ ﴿٥٢﴾ ﴾ الحج: إِذَا حَدَّثَ أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي حَدِيثِهِ، فَيُبْطِلُ اللهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ وَيُحْكِمُ آيَاتِهِ. وَيُقَالُ: أُمْنِيَّتُهُ: قِرَاءَتُهُ ﴿ إِلَّآ أَمَانِيَّ ﴿٧٨﴾ ﴾ البقرةيَقْرَءُونَ وَلَا يَكْتُبُونَ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: مَشِيدٌ بِالْقَصَّةِ. وَقَالَ غَيْرُهُ. ﴿ يَسۡطُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾ الحج يَفْرُطُونَ مِنَ السَّطْوَةِ، وَيُقَالُ: يَسْطُونَ: يَبْطِشُونَ.﴿ وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ ﴿٢٤﴾ ﴾ الحج أُلْهِمُوا. قَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ بِسَبَبٍ ﴿١٥﴾ ﴾ الحج بِحَبْلٍ إِلى سَقْفِ البَيْتِ.﴿ تَذۡهَلُ ﴿٢﴾ ﴾ الحج: تُشْغَلُ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٢٢ - (تەفسیری) سورەتی حەج

ئیبنو عویەینە دەڵێ:( ٱلۡمُخۡبِتِينَ ) دڵنیایان. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ ﴾: کاتێ قسە بکات شەیتان وتە دەخاتە نێو قسەکانیەوە خواش ئەوەی شەیتان خستویەتیە ناو قسەکانی لایدەبات و ئایەتەکانی خۆی جێگیر و چەسپاو دەکات. دەشوترێت: (أُمْنِيَّتُهُ) قورئان خوێندنی ئەو (پێغەمبەر ﷺ)،

﴿ إِلَّآ أَمَانِيَّ ﴾ دەخوێننەوە ونانووسن (دەتوانن قورئان بخوێنەوە بێ ئەوەی شارەزای نووسین بن).

- موجاهید دەڵێ: (مَشِيدٌ): بەگەچ (دروست کراو). جگە لەموجاهید دەڵێ: ﴿ يَسْطُونَ ﴾ پەلامار دەبەن، هێرش دەکەن لە (السَّطْوَةِ)ـەوە هاتووە و وەرگیراوە بەمانای پەلامار و لێدانە، وە دەوترێت: (يَسْطُونَ):پەلامار دەبەن.
﴿ وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ ﴾ خراوەتە سەر زمانیان، ڕێنموون کراون (بۆ وتەی جوان).
-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ بِسَبَبٍ ﴾ بەگوریسێك بە بەرزییەکەوە [1] (هەڵواسێ) ﴿ تَذْهَلُ ﴾: بێ ئاگا دەبێت سەرقاڵ دەکرێ.

## ١ - بابٌ: قوله: ﴿ وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ ﴿٢﴾ ﴾ الحج:

٤٧٤١ - حَدَّثَنَا عُمَرُ بْن حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأعمَشُ، حَدَّثَنَا أَبوصَالحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "يَقُولُ الله ﷻ يَوْمَ القِيَامَةِ: يَا آدَمُ. يَقولُ: لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ. فَيُنَادى بِصَوْتٍ: إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تُخْرِجَ مِنْ ذرِّيَّتِكَ بَعْثًا إِلَى النَّارِ. قَالَ: يَا رَبِّ، وَمَا بَعْثُ النَّارِ؟ قَالَ: مِنْ كُلِّ ألْفٍ -أُرَاهُ قَالَ - تِسْعَمِائَةٍ وَتسْعَةً وَتِسْعِينَ. فَحِينئِذٍ تَضَعُ الحَامِلُ حَمْلَهَا وَيَشِيبُ الوَلِيدُ ﴿ وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ ﴿٢﴾ ﴾ الحج، فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَى النَّاسِ حَتَّى تَغَيَّرَتْ وُجُوهُهُمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "مِنْ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ تِسْعَمِائَةٍ وَتسْعَةً وَتِسْعِينَ، وَمِنْكُمْ وَاحِدٌ، ثُمَّ أَنْتُمْ فِي النَّاسِ كَالشَّعْرَةِ السَّوْدَاءِ فِي جَنْب الثَّوْرِ الأَبْيَضِ، أَوْ كَالشَّعْرَةِ البَيْضَاءِ فِي جَنْبِ الثَّوْرِ الأَسْوَدِ، وَإِنِّي لأَرْجُو أَنْ تكونُوا رُبُعَ أَهْلِ الجَنَّةِ". فَكَبَّرْنَا ثمَّ قَالَ: "ثُلُثَ أَهْلِ الجَنَّةِ". فَكَبَّرْنَا، ثمَّ قَالَ: "شَطْرَ أَهْلِ الجَنَّةِ". فَكَبَّرْنَا. قَالَ أَبُو أُسَامَةَ عَنِ الأَعْمَشِ: ﴿ وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم

(١) بە پەتێ خۆی هەڵبواسێ وخۆی بخنکێنێ.

بِسُكَٰرَىٰ ﴿٢﴾ ﴾ وَقَالَ: مِنْ كُلِّ ألفٍ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ. وَقَالَ جَرِيرٌ وَعِيسَى بْنُ يُونُسَ وَأَبُو مُعَاوِيَةَ: (سَكْرى وَمَا هُمْ بِسَكْرى)[1].

## ١ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (خەڵکی دەبینی (وەک) سەرخۆشن)

**٤٧٤١ -ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوا ﷻ لە ڕۆژی دوایی دا دەفەرموێ: ئەی ئادەم. ئادەمیش دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم فەرمان بەر دارتم فەرمان بەردارتم[2] خۆشنودی تۆ بەدەست دێنم - ئینجا بەدەنگێك بانگی لێ دەکرێ: بێگومان خوا فەرمانت پێ دەکات لە نەوەکانت دا ئەوانە دەربێنە (لەناو خەڵکەکەدا) دەنێردرێن بۆ دۆزەخ. (ئادەم) دەڵێ: ئەی پەروەردگارم چەندن ئەوانەی دەنێردرێن بۆ دۆزەخ؟ دەفەرموێ: لە هەر هەزارێك - وابزانم فەرمووی -: نۆسەد و نەوەد و نۆیان، جا ئا لەوە کاتەدایە ئافرەتی سکپڕ سکەکەی فڕی دەداو منداڵی ساوا سەری سپی دەبێت (خەڵکی دەبینی (وەك) سەرخۆشن، سەرخۆشیش نین بەڵکو سزای سەخت و بەتینی خوایە (وای لێ کردوون) )، جا ئەو (فەرموودەیە) ئەوەندە قورس و گران بوو لەسەر خەڵکەکە هەتا ڕەنگی ڕووخساریان گۆڕا، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((نۆسەد و نەوەد و نۆیان لە یەئجوج و مەئجوجە یەك کەسیان لە ئێوەیە، لە پاشان ئێوە لە ناو خەڵکیدا (لەمەحشەردا) وەك تاڵە موویەکی ڕەش وان بە تەنیشتی گایەکی سپیەوە، یان وەك تەڵە موویەکی سپی وان بە تەنیشتی گایەکی ڕەشەوە، وە من ئومێد دەکەم کە ئێوە چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن))، جا ئەڵڵاهو ئەکبەرمان کرد لە پاشان فەرمووی: (ئومێدەوارم ئێوە) سێ یەکی خەڵکی بەهەشت**

---

(١) بڕوانە: ٣٣٤٨.

(٢) گوێڕایەڵتم و لە خزمەتدام هەر فەرمانێکت هەیە جێ بەجێ دەکەم.

بن))، ئەنجا ئەڵڵاهو ئەكبەرمان كرد لە پاشان فەرمووی: (ئومێدەوارم ئێوە) نیوەی خەڵكی بەهەشتبن)).

- ئەبو ئوسامە لە ئەعمەشەوە دەگێڕێتەوە كە (خەڵكی دەبینی (وەك سەرخۆشن بەڵام سەرخۆشیش نین) (لە كاتێكدایە كە) دەفەرموێ: (لەهەر هەزارێك نۆسەد و نەوەد و نۆیان) (بنێرە بۆ دۆزەخ)

- جەریر و عیسای كوڕی یونس و ئەبوموعاویە بە (سَكْرى وَمَا هُمْ بِسَكْرى) (گێڕاویانەتەوە)[1].

٢ - **بابٌ:** ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ﴿١١﴾ ﴾ **إلى قوله** ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ ﴿١٢﴾ ﴾ **الحج** ﴿ وَأَتۡرَفۡنَٰهُمۡ ﴿٣٣﴾ ﴾ **المؤمنون، وَسَّعْنَاهُمْ.**

## ٢ - باسێک: (وە لەناوخەڵک دا کەسێ وا هەیە لە قەراغەوە خوا دەپەرەستێ، جا ئەگەر تووشی خێرو خۆشی بوو دڵخۆش دەبێ پێی (بەردەوام دەبێ لەخوا پەرەستیدا) وە ئەگەر توشی تاقیکردنەوە و بەڵا بوو بەرەو دوا هەڵدەگەرێتەوە، پاش گەز دەبێتەوە لە ئایین زەرەمەندی دنیا و دوا ڕۆژ بووە) تادەگاتە ئەم فەرمایشتەی خوا (تەنها ئەوەیە لە ڕێ لادانی (گومڕایی) زۆر دوور لە ڕاستی)

﴿ وَأَتۡرَفۡنَٰهُمۡ ﴾نازو نیعمەتی زۆرمان پێدابوون.

---

(١) ئەو خوێندنەوەش خوێندنەوەی حەمزە و كیسانی یە.

٤٧٤٢ - حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْحَارِثِ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ ﴿١١﴾ ﴾ الحج: قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ يَقْدَمُ الْمَدِينَةَ، فَإِنْ وَلَدَتِ امْرَأَتُهُ غُلَامًا، وَنُتِجَتْ خَيْلُهُ؛ قَالَ هَذَا دِينٌ صَالِحٌ. وَإِنْ لَمْ تَلِدِ امْرَأَتُهُ وَلَمْ تُنْتَجْ خَيْلُهُ؛ قَالَ هَذَا دِينُ سُوءٍ.

**٤٧٤٢ -سەعیدی کوڕی جوبەری لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەربارەی ئەم ئایەتە: (لە ناو خەڵکێکدا کەسی وا هەیە لەقەراغەوە خوا دەپەرستێ) وتی: جاران پیاوی وا هەبوو دەهاتە مەدینە، جا ئەگەر ژنەکەی کوڕی ببوایە و ماینەکەی نۆمای ببوایە دەیوت: ئەمە ئاینێکی چاك و باشە، بەڵام ئەگەر ژنەکەی کوڕی نەبوایە و ماینەکەی بەچکەی نەبوایە دەیوت: ئەمە ئاینێکی خراپە.**

## ٣ - بابٌ: قوله: ﴿ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ﴿١٩﴾ ﴾ الحج:

٤٧٤٣ - حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو هَاشِمٍ، عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يُقْسِمُ فِيهَا إِنَّ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ﴿١٩﴾ ﴾. الحج: نَزَلَتْ فِي حَمْزَةَ وَصَاحِبَيْهِ، وَعُتْبَةَ وَصَاحِبَيْهِ يَوْمَ بَرَزُوا فِي يَوْمِ بَدْرٍ. رَوَاهُ سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي هَاشِمٍ. وَقَالَ عُثْمَانُ: عَنْ جَرِيرٍ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي هَاشِمٍ، عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ قَوْلَهُ[1].

(١) بڕوانە: ٣٩٦٦.

# ٣ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوا ی گەورە: (ئەمانە دوو کۆمەڵی دژ بەیەکن دەمەقاڵێ و کێشەیانە دەربارەی پەروەردگاریان)

**٤٧٤٣ - قەیسی کوڕی عوباد لە ئەبی زەڕەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو (ئەبو زەڕ) بە سوێند خواردن سوێندی دەخوارد و دەیوت: بەڕاستی ئەم ئایەتە: (ئەمانە دوو کۆمەڵی دژ بەیەکن دەمەقاڵێ و کێشەیانە دەربارەی پەروەردگاریان)، دەربارەی حەمزە و دوو هاوەڵەکەی و عوتبە و دوو هاوەڵەکەی دابەزی لە ڕۆژی (غەزای) بەدردا ڕووبەڕووی یەکتر وەستان.**

**- سوفیان لە ئەبی هاشمیەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە.**

**-وەعوسمان گێڕاویەتیەوە لەجەریرە ئەویش لە مەنصورەوە لە ئەبی هاشیمەوە لە ئەبی میجلەزەوە بەوتی ئەبی زەڕ گێڕاویەتیەوە.**

**٤٧٤٤** - حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مِجْلَزٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: أَنَا أَوَّلُ مَنْ يَجْثُو بَيْنَ يَدَيِ الرَّحْمَنِ لِلْخُصُومَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. قَالَ قَيْسٌ: وَفِيهِمْ نَزَلَتْ ﴿ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُواْ فِى رَبِّهِمْ ﴿١٩﴾ ﴾ الحج: قَالَ: هُمُ الَّذِينَ بَارَزُوا يَوْمَ بَدْرٍ عَلِيٌّ، وَحَمْزَةُ وَعُبَيْدَةُ، وَشَيْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ، وَعُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ، وَالْوَلِيدُ بْنُ عُتْبَةَ[1].

**٤٧٤٤ - ئەبو میجلەز وتی: قەیسی کوڕی عوباد دەگێڕێتەوە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە ﷺ دەڵێ: من یەکەم کەسم لە ڕۆژی دوایی دا لەبەردەم خوای بەبەزەیی دا لەسەر چۆك دادەنیشم، قەیس وتی: ئەم ئایەتە لەواندا دابەزی**

(١) بڕوانە: ٣٩٦٥.

**(ئەمانە دوو کۆمەڵی دژ بە یەکن دەمەقاڵێ و کێشەیانە دەربارەی پەروەردگاریان) وتی ئەوانە بوون کە لە ڕۆژی (غەزای) بەدردا ڕووبەڕووی یەکتربوونەوە: عەلی و حەمزە و عوبەیدە لەگەڵ شەیبەی کوڕی ڕەبیعە و عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و وەلیدی کوڕی عوتبە.**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٢٣ - سورة المُؤْمنينَ

قَالَ ابن عُيَيْنَةَ: ﴿ سَبْعَ طَرَآئِقَ ﴿١٧﴾ ﴾ المؤمنون: سَبْعَ سمَوَاتٍ.﴿ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ المؤمنون: سَبَقَتْ لَهُمُ السَّعَادَةُ.﴿ وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ ﴿٦٠﴾ ﴾ المؤمنون: خَائِفِينَ. قَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ ﴿٣٦﴾ ﴾ المؤمنون: بَعِيدٌ بَعِيدٌ. ﴿ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ ﴾ المؤمنون: المَلاَئِكَةَ. ﴿ لَنَٰكِبُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾ المؤمنون: عَادِلُونَ.﴿ كَٰلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ المؤمنون: عَابِسُونَ.وقال غيره: ﴿ مِن سُلَٰلَةٍ ﴿١٢﴾ ﴾ المؤمنون: الوَلَدُ، وَالنُّطْفَةُ السُّلاَلَةُ. وَالْجِنَّةُ وَالْجُنُونُ وَاحِدٌ. وَالْغُثَاءُ: الزَّبَدُ وَمَا ارْتَفَعَ عَنِ المَاءِ، وَمَا لَا يُنْتَفَعُ بِهِ. ﴿ يَجْـَٔرُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾ المؤمنون:يَرْفَعُونَ أَصْوَاتَهُمْ كَمَا تَجْأَرُ الْبَقَرةُ ﴿ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ﴿٦٦﴾ ﴾ المؤمنون: رَجَعَ عَلَى عَقِبَيْهِ ﴿ سَٰمِرًا ﴿٦٧﴾ ﴾ المؤمنون مِنْ السَّمَرِ وَالْجَمِيعُ السُّمَّارُ وَالسَّامِرُ هَا هُنَا فِي مَوْضِعِ الْجَمْعِ ﴿ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾ المؤمنون: تَعْمَوْنَ مِنْ السِّحْرِ.

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٢٣ - (تەفسیری) سوڕەتی موئمینوون

- ئیبنو عویەینە دەڵێ: ﴿ سَبْعَ طَرَآئِقَ ﴾: حەوت ئاسمانەكان. ﴿ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴾: (خێراتەكانیان) بەختەوەری لە پێش خۆیانەوە بۆ دەستەبەر كردوون. ﴿ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ ﴾ئەوان دەترسن.

- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ ﴾: زۆر دووره زۆر دووره (نابێ و ڕوونادات) ﴿ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴾[1]: فریشتەكان. ﴿ لَنَٰكِبُونَ ﴾ (لە ڕێگای ڕاست) لادەرن. ﴿ كَٰلِحُونَ ﴾ ناشرینان و مرِ و مۆچان[2].

- جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: ﴿ مِن سُلَٰلَةٍ ﴾: منداڵ. (وَالنُّطْفَةُ) لەپوختەیەك (لە قوڕ) (وَالْجِنَّةُ) لەگەڵ (الْجُنُونُ) یەك شتن و یەك مانا دەگەیەنن كە شێتی یە (الْغُثَاءُ) پۆش و كەف (سەرلافاو) ئەوەی سەر ئاوی دەكەوێ لە پوش و پەڵاش، هەر شتێ سوودی لێ وەرناگیرێ.﴿ يَجْـَٔرُونَ ﴾ دەنگیان بەرز دەكەنەوە وەك مانگا چۆن دەبۆڕێنێت.﴿ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ﴾ پاشە و پاش گەڕایەوە.﴿ سَٰمِرًا ﴾ لە (السَّمَر)ـەوە[3] كە چاوگەكەیەتی وەرگیراوە، كۆی وشەكەش: (السُّمَّارُ)ـە، وە (السَّامِرُ) ئا لەم شوێنەدا كە لە شوێنی كۆی وشەكە بەكارهاتووە با خۆی بۆ تاك بەكار دێت.﴿ تُسْحَرُونَ ﴾: (لە بینینی ڕاستی) كوێر بوون، (تُسْحَرُونَ ) لەسیحر و جادووەوە هاتووە (ماناكەی واتە: چۆن جادووتان لێ كراوە، كە ئیسلام بە ناهەق دەزانن).

(١) واتە: پرسیار لە (فریشتە) ژمێریارەكان بكە.

(٢) لێویان هەڵقرچاوە دانەكانیان دەركەوتووە.

(٣) السَّمَر: واتە شەو بەسەر بردن بەقسە و شتی وا، بەڵام لە ئایەتەكەدا مەبەست پێی شەو بەسەر بردنە بە گاڵتەكردن بە ئایەتەكانی قورئان.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٢٤ – و من سُورَةِ النُّورِ

﴿ مِنۡ خِلَٰلِهِۦ ﴿٤٣﴾ ﴾ النور مِنْ بَيْنِ أَضْعَافِ السَّحَابِ. ﴿ سَنَا بَرۡقِهِۦ ﴿٤٣﴾ ﴾ النور الضِّيَاءُ. ﴿ مُذۡعِنِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾ النور يُقَالُ لِلْمُسْتَخْذِي مُذْعِنٌ، ﴿ أَشۡتَاتٗاۚ ﴿٦١﴾ ﴾ النور أَشتَاتًا وَشتَّى وَشتَاتٌ وَشَتٌّ وَاحِدٌ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ سُورَةٌ أَنزَلۡنَٰهَا ﴿١﴾ ﴾ النور: بَيَّنَّاهَا. وَقَالَ غَيْرُهُ سُمِّيَ القُرْآنُ لِجَمَاعَةِ السُّوَرِ، وَسُمِّيَتِ السُّورَةُ لأَنَّهَا مَقْطُوعَةٌ مِنَ الأُخْرى فَلَمَّا قُرِنَ بَعْضُهَا إلى بَعْضٍ سُمِّيَ قُرْآنًا. وَقَالَ سعْدُ بْنُ عِيَاضٍ الثُّمَالِيُّ المِشْكَاةُ الكُوَّةُ بلِسَانِ الحَبَشَةِ، وَقوله تعالى: ﴿ إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ ﴾ القيامة تَأْلِيفَ بَعْضِهِ إلى بَعْضٍ، ﴿ فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ القيامة فَإِذَا جَمَعْنَاهُ وَأَلَّفْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ، أي مَا جُمِعَ فِيهِ، فَاعْمَلْ بِمَا أَمَرَكَ، وَانْتَهِ عَمَّا نَهَاكَ اللهُ، وَيُقَالُ لَيْسَ لِشِعْرِهِ قُرْآنٌ أي تَأْلِيفٌ، وَسُمِّيَ الفُرْقَانَ لأَنَّهُ يُفَرِّقُ بَيْنَ الحَقِّ وَالْبَاطِلِ، وُيقَالُ لِلْمَرْأَةِ مَا قَرَأَتْ بِسَلًا قَطُّ أي لَمْ تَجْمَعْ فِي بَطْنِهَا وَلَدًا. وَقَالَ: ﴿ وَفَرَضۡنَٰهَا ﴿١﴾ ﴾ النور أَنْزَلْنَا فِيهَا فَرَائِضَ مُخْتَلِفَةً وَمَنْ قَرَأَ ﴿ وَفَرَّضۡنَٰهَا ﴿١﴾ ﴾ النور يَقُولُ فَرَضْنَا عَلَيْكُمْ وَعَلَى مَنْ بَعْدَكُمْ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ أَوِ ٱلطِّفۡلِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يَظۡهَرُواْ ﴿٣١﴾ ﴾ النور لَمْ يَدْرُوا لِمَا بِهِمْ مِنَ الصِّغَرِ.

# به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٢٤ - (تەفسیری) سوڕەتی نوور

﴿ مِنْ خِلَٰلِهِۦ ﴾: له نێوان چینی هەورەکەوە. ﴿ سَنَا بَرْقِهِۦ ﴾: ڕووناکی وشەوقی چەخماخە (ی هەورەکە). ﴿ مُذْعِنِينَ ﴾ بەملکەچ و گوێڕایەڵ دەوترێ (مُذعن) ﴿ أَشْتَاتًا ﴾لەگەڵ (شتَّى) و (شتَاتٌ) و (شَتٌّ) یەك شتن بە یەك مانا دێن. واتە: جیاجیا، یەك یەك بەتەنیا.

- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ سُورَةٌ أَنزَلْنَٰهَا ﴾: ئەو سوڕەتەمان ڕوون کردووەتەوە. جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: قورئان ناوە بۆ کۆمەڵێ سوڕەت: سوڕەتیش بە سوڕەت ناونراوە چونکە لەسوڕەتێکی تر جیاکراوەتەوە، جا کاتێ هەندێ سوڕەتی قورئان خراوەتە پاڵ هەندێ سوڕەتی ترەوە، بۆیە پێی وتراوە قورئان.

- سەعیدی کوڕی عیازی سومالیی دەڵێ: (المِشْكَاةُ) بەتاق دەوترێت بەزمانی حەبەشی. وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند ﴿ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴾ کۆکردنەوە و دانەپاڵی هەندێکی لەگەڵ هەندێکی تریدا. ﴿ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴾ ئەگەر کۆمان کردەوە ڕێکمان خست. (فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ) شوێنی ئەوە بکەوە تیاکۆکراوەتەوە و کاربکە بەوەی فەرمانت پێ دەکات، وازبێنە لەوەی خوا قەدەغەی دەکات لێت. وە دەوترێت (لَيْسَ لِشِعْرِهِ قُرْآنٌ) واتە: کۆکەرەوەیەك (نیە بۆ هۆنراوەکانی) وە قورئان ناونراوە بە (الفُرْقَانَ)، چونکە حەق وناهەق لەیەکتری جیا دەکاتەوە وە بە ئافرەت دەوترێت: (مَا قَرَأَتْ بِسَلًا قَطُّ) واتە: هەرگیز لە سکیدا منداڵ کۆنەبۆتەوە (و دروست نەبووە)، وە دەڵێ: ﴿ وَفَرَضْنَٰهَا ۝١ ﴾ النور لەم سوڕەتەدا یاسای جۆراوجۆرمان دابەزاندووە، هەرکەسیش بە ﴿

﴿ وَفَرَضۡنَٰهَا ﴾ خوێندبێتیەوە دەڵێ: فەرز و پێویستمان کردووە لەسەر ئێوە، وە لەسەر ئەوانەی پاش ئێوەش.

- موجاهید دەڵێ: ﴿ أَوِ ٱلطِّفۡلِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يَظۡهَرُواْ ﴾: نەیان زانیوە لەبەر ئەو تەمەنە منداڵی یەی کە هەیانە.

## ١ - بابُ قَوْلِه ﷻ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ۝٦ ﴾ النور

٤٧٤٥ - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنِي الزُّهْرِيُّ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، أَنَّ عُوَيْمِرًا أَتَى عَاصِمَ بْنَ عَدِيٍّ وَكَانَ سَيِّدَ بَنِي عَجْلاَنَ فَقَالَ: كَيْفَ تَقُولُونَ فِي رَجُلٍ وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ؟ أَمْ كَيْفَ يَصْنَعُ؟ سَلْ لِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ فَأَتَى عَاصِمٌ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَكَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ المَسَائِلَ، فَسَأَلَهُ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَرِهَ الْمَسَائِلَ وَعَابَهَا، قَالَ عُوَيْمِرٌ: وَاللَّهِ لاَ أَنْتَهِي حَتَّى أَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ فَجَاءَ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَجُلٌ وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ؟ أَمْ كَيْفَ يَصْنَعِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «قَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ الْقُرْآنَ فِيكَ وَفِي صَاحِبَتِكَ». فَأَمَرَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْمُلاَعَنَةِ بِمَا سَمَّى اللَّهُ فِي كِتَابِهِ، فَلاَعَنَهَا ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنْ حَبَسْتُهَا فَقَدْ ظَلَمْتُهَا، فَطَلَّقَهَا، فَكَانَتْ سُنَّةً لِمَنْ كَانَ بَعْدَهُمَا فِي الْمُتَلاَعِنَيْنِ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «انْظُرُوا فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَسْحَمَ أَدْعَجَ الْعَيْنَيْنِ عَظِيمَ الأَلْيَتَيْنِ خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ فَلاَ أَحْسِبُ عُوَيْمِرًا إِلاَّ قَدْ صَدَقَ عَلَيْهَا، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أُحَيْمِرَ كَأَنَّهُ وَحَرَةٌ فَلاَ أَحْسِبُ عُوَيْمِرًا، إِلاَّ قَدْ كَذَبَ عَلَيْهَا». فَجَاءَتْ بِهِ عَلَى النَّعْتِ الَّذِي نَعَتَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ تَصْدِيقِ عُوَيْمِرٍ، فَكَانَ بَعْدُ يُنْسَبُ إِلَى أُمِّهِ[1].

(١) بروانه: ٤٢٣.

## ١-باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (ئەو (پیاو) انەی بوختان بۆ خێزانەکانیان دەکەن و بێجگە لە خۆیان هیچ شایەتێکیان نییە، ئەوە شایەتی دانی هەریەک لەوانە (بەم جۆرەیە) کە چوار سوێند بەخوا بخوات کە بێگومان ئەو لە ڕاستگۆیانە)

٤٧٤٥ - سەهیلی کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە کە عومیمر هات بۆلای عاصیمی کوڕی عەدیی کە گەورەی بەنی عەجلان بوو، وتی: چی دەڵێن دەربارەی پیاوێك لە گەڵ ژنەکەیدا پیاوێك ببینێت، ئایا بیکوژێت ئەوسا ئێوە دەیکوژنەوە (لەخوێنی ئەودا) یان چی بکات؟ لەو بارەیەوە پرسیارم بۆ بکە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەنجا عاصیم هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا[1] پێغەمبەری خواش ﷺ ئەو جۆرە باسانەی پێ ناخۆش بوو، ئەنجا عومیمر پرسیاری (لە عاصیم) کرد، ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا پرسیاری لەو جۆرەی پێ ناخۆش بوو بەخراپیش باسیکرد.

عوومیمر وتی: بەخوا واز ناهێنم هەتا لەو بارەیەوە پرسیار لە پێغەمبەری خوا نەکەم، ئەنجا عوومیمر هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پیاوێك لەگەڵ ژنەکەیدا پیاوێکی دیوە، ئایا بکوژێت ئێوەش دەیکوژنەوە (لە خوێنی ئەودا) یان چی بکات؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خوا دەربارەی تۆ و هاوسەرەکەت قورئانی دابەزاندووە))، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرد بە نەفرەتکاری بەو شێوەی خوا لە قورئاندا باسی کردووە، جا ئەو (عومیمر) نەفرینی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کرد، لە پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر گیری بدەمەوە ئەوە بێگومان ستەمی لێ دەکەم، بۆیە تەڵاقی دا، ئیتر ئەوە

---

(١) دەربارەی کەسێك لەگەڵ خێزانەکەیدا پیاوێك ببینێت.

بوویە سوونەت و باو بۆ نەفرەتكارانی دوای ئەوانیش، لە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سەرنج بدەن جا ئەگەر ژنەكە منداڵێكی ڕەشكەڵەی زۆر چاوەڕەشی سمت گەورەیی لنگ و پوز گەورە بوو، ئەوە وا دەزانم عوەیمیر ڕاست دەكات لەوەی بە هاوسەرەكەی وتووە، بەڵام ئەگەر منداڵێكی سووركەڵەی بوو وەكو شەوگەرد سووركەڵە بوو، ئەوە وادەزانم بێگومان عوەیمیر بۆختانی بۆ كردووە))، جا كە ژنەكە منداڵەكەی بوو بەو شێوەیە بوو كە پێغەمبەری خوا شێوەكەی باسكرد (دەركەوت كە) عوەیمیر ڕاستی كردووە، ئیتر دواتر منداڵەكەی بەناوی دایكییەوە ناو دەبرا.

٢ - بَابٌ: ﴿وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ۝٧﴾ النور

٤٧٤٦ - حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ أَبُو الرَّبِيعِ، حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً رَأَى مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ؟ أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِمَا مَا ذُكِرَ فِي الْقُرْآنِ مِنَ التَّلاَعُنِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَدْ قُضِيَ فِيكَ وَفِي امْرَأَتِكَ». قَالَ فَتَلاَعَنَا، وَأَنَا شَاهِدٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَفَارَقَهَا فَكَانَتْ سُنَّةً أَنْ يُفَرَّقَ بَيْنَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ وَكَانَتْ حَامِلاً، فَأَنْكَرَ حَمْلَهَا وَكَانَ ابْنُهَا يُدْعَى إِلَيْهَا، ثُمَّ جَرَتِ السُّنَّةُ فِي الْمِيرَاثِ أَنْ يَرِثَهَا، وَتَرِثَ مِنْهُ مَا فَرَضَ اللَّهُ لَهَا[1].

## ٢ - باسێك: (وە لە پێنجەم جاردا بڵێ نەفرینی خوای لەسەر ئەو بێ ئەگەر درۆزن بێ)

٤٧٤٦ - سەهلی كوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە كە پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پێم بڵێ ئەگەر پیاوێك لەگەڵ ژنەكەیدا پیاوێكی بینی، ئایا بیكوژێت ئێوە دەیكوژنەوە یان چۆن بكات؟ ئیتر خوا دەربارەی هەردووكیان ئەوەی لە قورئاندا دەربارەی نەفرینكاری باسكراوە دابەزاند، ئەنجا

---
(١) بروانە: ٤٢٣.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێی: ((بێگومان بڕیار دەربارەی خۆت و ژنەکەت دراوە))، دەڵێ: جا هەردووکیان نەفرینکاریان کرد لەوکاتەدا من لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ئامادەبووم، ئەنجا پیاوە کە لە ژنەکەی جیابوویەوە ئیتر ئەوە بوویە سوونەت و باو کە دوو نەفرینکارەکە لە یەکتری جیابکرێنەوە، ژنەکە سکی پڕ بوو دانی نەنا بەوەدا کە سکی هەیە، وە کوڕەکەی (کە بووی) بەناوی ئەوەوە (ژنەکە) بانگ دەکرا، لە پاشان سوننەت و باو لەمیراتدا وابوو کوڕەکە میراتی لە دایکی ببات و ژنەکەش میرات ئەوەی خوا بۆی دیاری کردووە لە کوڕەکەی ببات.

## ٣ - بابٌ: ﴿ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَـٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٨﴾ ﴾ النور

٤٧٤٧ - حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، حَدَّثَنَا عِكْرِمَةُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ هِلاَلَ بْنَ أُمَيَّةَ قَذَفَ امْرَأَتَهُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ بِشَرِيكِ بْنِ سَحْمَاءَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الْبَيِّنَةَ أَوْ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ». فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِذَا رَأَى أَحَدُنَا عَلَى امْرَأَتِهِ رَجُلاً يَنْطَلِقُ يَلْتَمِسُ الْبَيِّنَةَ. فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «الْبَيِّنَةَ وَإِلاَّ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ» فَقَالَ هِلاَلٌ: وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ إِنِّي لَصَادِقٌ، فَلَيُنْزِلَنَّ اللَّهُ مَا يُبَرِّئُ ظَهْرِي مِنَ الْحَدِّ، فَنَزَلَ جِبْرِيلُ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ ﴿٦﴾ ﴾ النور فَقَرَأَ حَتَّى بَلَغَ: ﴿ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٩﴾ ﴾ النور فَانْصَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا، فَجَاءَ هِلاَلٌ، فَشَهِدَ، وَالنَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ». ثُمَّ قَامَتْ فَشَهِدَتْ فَلَمَّا كَانَتْ عِنْدَ الْخَامِسَةِ وَقَّفُوهَا، وَقَالُوا إِنَّهَا مُوجِبَةٌ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَتَلَكَّأَتْ وَنَكَصَتْ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهَا تَرْجِعُ، ثُمَّ قَالَتْ: لاَ أَفْضَحُ قَوْمِي سَائِرَ الْيَوْمِ، فَمَضَتْ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «أَبْصِرُوهَا فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ الْعَيْنَيْنِ سَابِغَ الأَلْيَتَيْنِ خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ، فَهْوَ لِشَرِيكِ بْنِ سَحْمَاءَ». فَجَاءَتْ بِهِ كَذَلِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «لَوْلاَ مَا مَضَى مِنْ كِتَابِ اللَّهِ لَكَانَ لِي وَلَهَا شَأْنٌ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٦٧١.

## ٣ - باسێک: (ئەو ئافرەتەش (کە تاوانبار کراوە لە لایەن مێردەکەیەوە) سزای (زینای) لەسەر لادەبات بەمەی کە چوار جار سوێند بەخوا بخوات، کە بێگومان مێردەکەی لە درۆزنانە (واتە: درۆدەکات) )

٤٧٤٧ -ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە کە هیلالی کوڕی ئومەییە لە خزمەت پێغەمبەردا ژنەکەی خۆی تاوانبار کرد بە زینا کردن لەگەڵ شەریکی کوڕی سەحما، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((شایەت (بێنە)، یان شەلاق (دەدرێت) لەپشتت))، هیلالیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر کەسێکمان پیاوێك بینی بەسەر ژنەکەیەوە بڕوات بگەڕێت بە شوێن شاهیدا؟ پێغەمبەریش ﷺ هەر دەیفەرموو: (شایەت (بێنە) ئەگەر نا شەلاق (دەدرێت) لە پشتت))، هیلالیش وتی: سوێند بەو زاتەی تۆی بە هەق ناردووە دڵنیابە من ڕاست دەکەم، جا دڵنیام خوا نیگای ئەوە دادەبەزێنێت کە پشتم لە شەلاقدان ڕزگاری ببێ، ئەنجا جیبریل ﵇ دابەزی و ئەو ئایەتە بۆ پێغەمبەر ﷺ دابەزی (ئەو (پیاو)انەی بوختان بۆ خێزانەکانیان دەکەن) جا خوێندیەوە تا گەیشتە: (ئەگەر مێردەکەی لە ڕاستگۆیان بێت) ئیتر پێغەمبەر ﷺ وازی (لە هیلال) هێنا ئەنجا ناردی بەشوێن ژنەکە (ی هیلال)دا، جا هیلال هات وشایەتیەکەی [1] دا پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: (بێگومان خوا دەزانێ کەبەراستی یەکێکتان درۆزنن، دەی ئایە یەکێکتان تەوبە دەکەن و پەشیمان ببنەوە؟)) پاشان ژنەکەش هەستاو شایەتی دا جا کاتێ ئافرەتەکە لە شایەتیدانی پێنجەم دابوو وەستاندیان وتیان پێی: ئەم شایەتییەیان سزای خوات لەسەر پێویست دەکات. ئیبنو عەبباس دەڵێ: هەڵوێستەیەکی کرد و هاتە دواوە هەتا گومانمان برد کەپەشیمان دەبێتەوە، لە

---

(١) بەو شێوەی لە قورئاندا هاتووە لە ئایەتی (٦و٧)ی سورەتی نووردا.

پاشان وتی: ئابڕوی هۆز و خزمانم نابەم هەموو ڕۆژەکانی (ساڵ) [1] وە شایەتی پێنجەمیشی دا، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((بڕوانن بۆ ئەم ژنە جا ئەگەر منداڵەکەی چاو ڕەشی گەورەی سمت گەورەی لگ و پوزگەورە بوو، ئەوە لە شەریکی کوڕی سەحمایە))، جا منداڵەکەی بوو هەر بەو جۆرەبوو بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر (لەبەر) حوکم و بڕیارێك نەبوایە لە قورئاندا دەرچوو و ڕابوردووە (ئایەتی نەفرینکاری)، ئەوە من لە بەرانبەری ئەو ژنەدا بڕیارێکی ترم دەبوو).

٤ - **بابُ قَوْلِه**: ﴿ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ۝٩ ﴾ النور

٤٧٤٨ - حَدَّثَنَا مُقَدَّمُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى، حَدَّثَنَا عَمِّي الْقَاسِمُ بْنُ يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ وَقَدْ سَمِعَ مِنْهُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَجُلاً رَمَى امْرَأَتَهُ فَانْتَفَى مِنْ وَلَدِهَا فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَمَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَتَلاَعَنَا كَمَا قَالَ اللَّهُ، ثُمَّ قَضَى بِالْوَلَدِ لِلْمَرْأَةِ وَفَرَّقَ بَيْنَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ[2].

## ٤ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە لە پێنجەم جاردا (بڵێت) خەشمی خوای لەسەربێ ئەگەر مێردەکەی لە ڕاست گۆیان بێت)

٤٧٤٨ -ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە کە پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ژنەکەی تاوانبار کرد بە زینا کردن و خۆی بەری کرد لە منداڵی ئافرەتەکە[3]، پێغەمبەری خواش فەرمانی بە هەردووکیان کرد کە نەفرینکاری

(١) یان ئەو ڕۆژانەی ماوە.

(٢) بڕوانە: ٥٣٠٦، ٥٣١٣، ٥٣١٤، ٥٣١٥، ٦٧٤٨..

(٣) کە دواتر دەیبێت.

دژ بەیەکتری بکەن، بەو شێوەی خوا فەرموویەتی (لە قورئاندا) پاشان (پێغەمبەر ﷺ) بڕیاری دا مندالەکە بۆ ژنەکە بێت هەردوو نەفرینکارەکەی لە یەکتر جیا کردەوە.

٥ – **بابٌ: قَوْلُه**: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١١﴾ **النور**، **أَفَّاكٌ: كَذَّابٌ**.

## ٥ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (بێگومان کەسانێ کە ئەو بوهتانەیان (بۆ عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ) هەڵبەست، دەستەیەک بوون لە خۆتان (با دوو ڕووشیان تیابوو) وا مەزانن ئەو (بوهاتەنە) شەڕو خراپە بۆتان (وا نییە) بەڵکو خێر و چاکەیە بۆتان بۆ هەریەک لەوانە هەیە لە تاوان بەو ئەندازەی هەوڵی داوە (لە بوهتانەدا)، وە ئەو کەسەیان بەشی گەورەی بوهتانەکەی گرتە ئەستۆ (کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بوو) بۆ ئەو سزای هەرە گەورە هەیە (لە ڕۆژی دوایی دا))

(أَفَّاكٌ): زۆر درۆزن.

٤٧٤٩ - حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها ﴿وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ ١١﴾ النور: قَالَتْ: عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ[1].

**٤٧٤٩ - عوروە دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە رضي الله عنها دەڵێ: مەبەست لەم ئایەتە (ئەو کەسەی کە بەشی گەورەی بوهتانەکەی گرتە ئەستۆ) عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو.**

---

(١) بڕوانە: ٢٥٩٣.

٦ - بابٌ: ﴿ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴿١٢﴾ لَّوْلَا جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ ۚ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا۟ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ ﴾ النور

## ٦ - ئەمە باسێکە: (وە بۆچی کاتێ ئەمەتان بیست نەتان وت: بۆ ئێمە شیاو نییە قسە (و بوهاتنی)ـی وا بکەین، پاک و بێگەردی بۆ تۆ خوایە ئەمە بوهتانێکی زۆر گەورەیە، دەی بۆچی ئەو بوهاتان کەرانە چوار شایەتیان لەسەری نەهێنا، ئینجا ئەگەر شایەتەکانیان نەهێنا کەواتە هەر ئەوانە لای خوا درۆزنن)

٤٧٥٠ - حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ وَسَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، وَعَلْقَمَةُ بْنُ وَقَّاصٍ، وَعُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ قَالَ لَهَا أَهْلُ الإِفْكِ مَا قَالُوا، فَبَرَّأَهَا اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكُلٌّ حَدَّثَنِي طَائِفَةً مِنَ الْحَدِيثِ، وَبَعْضُ حَدِيثِهِمْ يُصَدِّقُ بَعْضًا، وَإِنْ كَانَ بَعْضُهُمْ أَوْعَى لَهُ مِنْ بَعْضٍ الَّذِي حَدَّثَنِي عُرْوَةُ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ أَقْرَعَ بَيْنَ أَزْوَاجِهِ، فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَعَهُ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَأَقْرَعَ بَيْنَنَا فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا، فَخَرَجَ سَهْمِي، فَخَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَعْدَمَا نَزَلَ الْحِجَابُ، فَأَنَا أُحْمَلُ فِي هَوْدَجِي وَأُنْزَلُ فِيهِ، فَسِرْنَا حَتَّى إِذَا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ غَزْوَتِهِ تِلْكَ وَقَفَلَ، وَدَنَوْنَا مِنَ الْمَدِينَةِ قَافِلِينَ آذَنَ لَيْلَةً بِالرَّحِيلِ، فَقُمْتُ حِينَ آذَنُوا بِالرَّحِيلِ، فَمَشَيْتُ حَتَّى جَاوَزْتُ الْجَيْشَ، فَلَمَّا قَضَيْتُ شَأْنِي أَقْبَلْتُ إِلَى رَحْلِي، فَإِذَا عِقْدٌ لِي مِنْ جَزْعِ ظَفَارِ قَدِ انْقَطَعَ فَالْتَمَسْتُ عِقْدِي وَحَبَسَنِي ابْتِغَاؤُهُ وَأَقْبَلَ الرَّهْطُ الَّذِينَ كَانُوا يَرْحَلُونَ لِي، فَاحْتَمَلُوا هَوْدَجِي، فَرَحَلُوهُ عَلَى بَعِيرِي الَّذِي كُنْتُ رَكِبْتُ، وَهُمْ يَحْسِبُونَ أَنِّي فِيهِ، وَكَانَ النِّسَاءُ إِذْ ذَاكَ خِفَافًا لَمْ يُثْقِلْهُنَّ

اللَّحْمُ، إِنَّمَا تَأْكُلُ الْعُلْقَةَ مِنَ الطَّعَامِ فَلَمْ يَسْتَنْكِرِ الْقَوْمُ خِفَّةَ الْهَوْدَجِ حِينَ رَفَعُوهُ، وَكُنْتُ جَارِيَةً حَدِيثَةَ السِّنِّ، فَبَعَثُوا الْجَمَلَ وَسَارُوا، فَوَجَدْتُ عِقْدِي بَعْدَ مَا اسْتَمَرَّ الْجَيْشُ، فَجِئْتُ مَنَازِلَهُمْ، وَلَيْسَ بِهَا دَاعٍ وَلاَ مُجِيبٌ، فَأَمَمْتُ مَنْزِلِي الَّذِي كُنْتُ بِهِ وَظَنَنْتُ أَنَّهُمْ سَيَفْقِدُونِي فَيَرْجِعُونَ إِلَيَّ، فَبَيْنَا أَنَا جَالِسَةٌ فِي مَنْزِلِي غَلَبَتْنِي عَيْنِي فَنِمْتُ، وَكَانَ صَفْوَانُ بْنُ الْمُعَطَّلِ السُّلَمِيُّ ثُمَّ الذَّكْوَانِيُّ مِنْ وَرَاءِ الْجَيْشِ، فَأَدْلَجَ، فَأَصْبَحَ عِنْدَ مَنْزِلِي، فَرَأَى سَوَادَ إِنْسَانٍ نَائِمٍ، فَأَتَانِي فَعَرَفَنِي حِينَ رَآنِي، وَكَانَ يَرَانِي قَبْلَ الْحِجَابِ، فَاسْتَيْقَظْتُ بِاسْتِرْجَاعِهِ حِينَ عَرَفَنِي، فَخَمَّرْتُ وَجْهِي بِجِلْبَابِي، وَاللَّهِ مَا كَلَّمَنِي كَلِمَةً وَلاَ سَمِعْتُ مِنْهُ كَلِمَةً غَيْرَ اسْتِرْجَاعِهِ، حَتَّى أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ فَوَطِئَ عَلَى يَدَيْهَا فَرَكِبْتُهَا فَانْطَلَقَ يَقُودُ بِي الرَّاحِلَةَ حَتَّى أَتَيْنَا الْجَيْشَ، بَعْدَ مَا نَزَلُوا مُوغِرِينَ فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ، فَهَلَكَ مَنْ هَلَكَ، وَكَانَ الَّذِي تَوَلَّى الإِفْكَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ ابْنَ سَلُولَ فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، فَاشْتَكَيْتُ حِينَ قَدِمْتُ شَهْرًا، وَالنَّاسُ يُفِيضُونَ فِي قَوْلِ أَصْحَابِ الإِفْكِ، لاَ أَشْعُرُ بِشَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ، وَهْوَ يَرِيبُنِي فِي وَجَعِي أَنِّي لاَ أَعْرِفُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ اللَّطَفَ الَّذِي كُنْتُ أَرَى مِنْهُ حِينَ أَشْتَكِي، إِنَّمَا يَدْخُلُ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَيُسَلِّمُ ثُمَّ يَقُولُ: «كَيْفَ تِيكُمْ؟». ثُمَّ يَنْصَرِفُ، فَذَاكَ الَّذِي يَرِيبُنِي، وَلاَ أَشْعُرُ حَتَّى خَرَجْتُ بَعْدَ مَا نَقَهْتُ، فَخَرَجَتْ مَعِي أُمُّ مِسْطَحٍ قِبَلَ الْمَنَاصِعِ -وَهْوَ مُتَبَرَّزُنَا - وَكُنَّا لاَ نَخْرُجُ إِلاَّ لَيْلاً إِلَى لَيْلٍ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ نَتَّخِذَ الْكُنُفَ قَرِيبًا مِنْ بُيُوتِنَا، وَأَمْرُنَا أَمْرُ الْعَرَبِ الأُوَلِ فِي التَّبَرُّزِ قِبَلَ الْغَائِطِ، فَكُنَّا نَتَأَذَّى بِالْكُنُفِ أَنْ نَتَّخِذَهَا عِنْدَ بُيُوتِنَا فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ، وَهْيَ ابْنَةُ أَبِي رُهْمِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ، وَأُمُّهَا بِنْتُ صَخْرِ بْنِ عَامِرٍ خَالَةُ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، وَابْنُهَا مِسْطَحُ بْنُ أُثَاثَةَ، فَأَقْبَلْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ قِبَلَ بَيْتِي، قَدْ فَرَغْنَا مِنْ شَأْنِنَا، فَعَثَرَتْ أُمُّ مِسْطَحٍ فِي مِرْطِهَا فَقَالَتْ: تَعِسَ مِسْطَحٌ. فَقُلْتُ لَهَا: بِئْسَ مَا قُلْتِ أَتَسُبِّينَ رَجُلاً شَهِدَ بَدْرًا! قَالَتْ: أَيْ هَنْتَاهُ، أَوَلَمْ تَسْمَعِي مَا قَالَ؟ قَالَتْ: قُلْتُ: وَمَا قَالَ؟ فَأَخْبَرَتْنِي بِقَوْلِ أَهْلِ الإِفْكِ فَازْدَدْتُ مَرَضًا عَلَى مَرَضِي، فَلَمَّا رَجَعْتُ إِلَى بَيْتِي وَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تَعْنِي سَلَّمَ ثُمَّ قَالَ: «كَيْفَ تِيكُمْ؟». فَقُلْتُ: أَتَأْذَنُ لِي أَنْ آتِيَ أَبَوَيَّ؟ قَالَتْ: وَأَنَا حِينَئِذٍ أُرِيدُ

أَنْ أَسْتَيْقِنَ الْخَبَرَ مِنْ قِبَلِهِمَا، قَالَتْ: فَأَذِنَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَجِئْتُ أَبَوَيَّ فَقُلْتُ لأُمِّي: يَا أُمَّتَاهْ، مَا يَتَحَدَّثُ النَّاسُ؟ قَالَتْ: يَا بُنَيَّةُ، هَوِّنِي عَلَيْكَ فَوَاللَّهِ، لَقَلَّمَا كَانَتِ امْرَأَةٌ قَطُّ وَضِيئَةً عِنْدَ رَجُلٍ يُحِبُّهَا، وَلَهَا ضَرَائِرُ، إِلاَّ كَثَّرْنَ عَلَيْهَا. قَالَتْ: فَقُلْتُ: سُبْحَانَ اللَّهِ! وَلَقَدْ تَحَدَّثَ النَّاسُ بِهَذَا قَالَتْ: فَبَكَيْتُ تِلْكَ اللَّيْلَةَ حَتَّى أَصْبَحْتُ لاَ يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ، وَلاَ أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ حَتَّى أَصْبَحْتُ أَبْكِي فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، وَأُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ ﵄ حِينَ اسْتَلْبَثَ الْوَحْيُ، يَسْتَأْمِرُهُمَا فِي فِرَاقِ أَهْلِهِ، قَالَتْ: فَأَمَّا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ فَأَشَارَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالَّذِي يَعْلَمُ مِنْ بَرَاءَةِ أَهْلِهِ، وَبِالَّذِي يَعْلَمُ لَهُمْ فِي نَفْسِهِ مِنَ الْوُدِّ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَهْلَكَ، وَمَا نَعْلَمُ إِلاَّ خَيْرًا، وَأَمَّا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَمْ يُضَيِّقِ اللَّهُ عَلَيْكَ وَالنِّسَاءُ سِوَاهَا كَثِيرٌ، وَإِنْ تَسْأَلِ الْجَارِيَةَ تَصْدُقْكَ، قَالَتْ: فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَرِيرَةَ فَقَالَ: «أَيْ بَرِيرَةُ، هَلْ رَأَيْتِ عَلَيْهَا مِنْ شَيْءٍ يَرِيبُكِ». قَالَتْ بَرِيرَةُ: لاَ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، إِنْ رَأَيْتُ عَلَيْهَا أَمْرًا أَغْمِصُهُ عَلَيْهَا أَكْثَرَ مِنْ أَنَّهَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ، تَنَامُ عَنْ عَجِينِ أَهْلِهَا، فَتَأْتِي الدَّاجِنُ فَتَأْكُلُهُ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاسْتَعْذَرَ يَوْمَئِذٍ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ ابْنِ سَلُولَ، قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ: «يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ مَنْ يَعْذِرُنِي مِنْ رَجُلٍ، قَدْ بَلَغَنِي أَذَاهُ فِي أَهْلِ بَيْتِي، فَوَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَى أَهْلِي إِلاَّ خَيْرًا، وَلَقَدْ ذَكَرُوا رَجُلاً، مَا عَلِمْتُ عَلَيْهِ إِلاَّ خَيْرًا، وَمَا كَانَ يَدْخُلُ عَلَى أَهْلِي إِلاَّ مَعِي». فَقَامَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ الأَنْصَارِيُّ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَا أَعْذِرُكَ مِنْهُ، إِنْ كَانَ مِنَ الأَوْسِ، ضَرَبْتُ عُنُقَهُ؛ وَإِنْ كَانَ مِنْ إِخْوَانِنَا -مِنَ الْخَزْرَجِ - أَمَرْتَنَا، فَفَعَلْنَا أَمْرَكَ، قَالَتْ: فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ -وَهْوَ سَيِّدُ الْخَزْرَجِ - وَكَانَ قَبْلَ ذَلِكَ رَجُلاً صَالِحًا، وَلَكِنِ احْتَمَلَتْهُ الْحَمِيَّةُ فَقَالَ لِسَعْدٍ: كَذَبْتَ، لَعَمْرُ اللَّهِ لاَ تَقْتُلُهُ، وَلاَ تَقْدِرُ عَلَى قَتْلِهِ، فَقَامَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ وَهْوَ ابْنُ عَمِّ سَعْدٍ، فَقَالَ لِسَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ: كَذَبْتَ، لَعَمْرُ اللَّهِ لَنَقْتُلَنَّهُ، فَإِنَّكَ مُنَافِقٌ تُجَادِلُ عَنِ الْمُنَافِقِينَ، فَتَثَاوَرَ الْحَيَّانِ الأَوْسُ وَالْخَزْرَجُ حَتَّى هَمُّوا أَنْ يَقْتَتِلُوا، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُخَفِّضُهُمْ حَتَّى سَكَتُوا وَسَكَتَ، قَالَتْ: فَمَكُثْتُ يَوْمِي ذَلِكَ لاَ يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلاَ

أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ، قَالَتْ فَأَصْبَحَ أَبَوَايَ عِنْدِي -وَقَدْ بَكَيْتُ لَيْلَتَيْنِ وَيَوْمًا لاَ أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ وَلاَ يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ - يَظُنَّانِ أَنَّ الْبُكَاءَ فَالِقٌ كَبِدِي، قَالَتْ: فَبَيْنَمَا هُمَا جَالِسَانِ عِنْدِي وَأَنَا أَبْكِي، فَاسْتَأْذَنَتْ عَلَيَّ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَأَذِنْتُ لَهَا، فَجَلَسَتْ تَبْكِي مَعِي، قَالَتْ: فَبَيْنَا نَحْنُ عَلَى ذَلِكَ دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَسَلَّمَ ثُمَّ جَلَسَ قَالَتْ: وَلَمْ يَجْلِسْ عِنْدِي مُنْذُ قِيلَ مَا قِيلَ قَبْلَهَا، وَقَدْ لَبِثَ شَهْرًا، لاَ يُوحَى إِلَيْهِ فِي شَأْنِي، قَالَتْ فَتَشَهَّدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ جَلَسَ ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ يَا عَائِشَةُ، فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنِي عَنْكِ كَذَا وَكَذَا، فَإِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُكِ اللَّهُ، وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِي اللَّهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ، فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبِهِ ثُمَّ تَابَ إِلَى اللَّهِ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ». قَالَتْ: فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَقَالَتَهُ، قَلَصَ دَمْعِي حَتَّى مَا أُحِسُّ مِنْهُ قَطْرَةً، فَقُلْتُ لأَبِي أَجِبْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِيمَا قَالَ. قَالَ: وَاللَّهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: لأُمِّي أَجِيبِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ. قَالَتْ: مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: فَقُلْتُ: وَأَنَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ لاَ أَقْرَأُ كَثِيرًا مِنَ الْقُرْآنِ، إِنِّي وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُ لَقَدْ سَمِعْتُمْ هَذَا الْحَدِيثَ حَتَّى اسْتَقَرَّ فِي أَنْفُسِكُمْ، وَصَدَّقْتُمْ بِهِ، فَلَئِنْ قُلْتُ لَكُمْ إِنِّي بَرِيئَةٌ - وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّي بَرِيئَةٌ - لاَ تُصَدِّقُونِي بِذَلِكَ، وَلَئِنِ اعْتَرَفْتُ لَكُمْ بِأَمْرٍ - وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّي مِنْهُ بَرِيئَةٌ لَتُصَدِّقُنِّي، وَاللَّهِ مَا أَجِدُ لَكُمْ مَثَلاً إِلاَّ قَوْلَ أَبِي يُوسُفَ قَالَ: ﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ يوسف قَالَتْ: ثُمَّ تَحَوَّلْتُ فَاضْطَجَعْتُ عَلَى فِرَاشِي، قَالَتْ: وَأَنَا حِينَئِذٍ أَعْلَمُ أَنِّي بَرِيئَةٌ، وَأَنَّ اللَّهَ مُبَرِّئِي بِبَرَاءَتِي، وَلَكِنْ وَاللَّهِ مَا كُنْتُ أَظُنُّ أَنَّ اللَّهَ مُنْزِلٌ فِي شَأْنِي وَحْيًا يُتْلَى، وَلَشَأْنِي فِي نَفْسِي كَانَ أَحْقَرَ مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ اللَّهُ فِيَّ بِأَمْرٍ يُتْلَى، وَلَكِنْ كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَرَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي النَّوْمِ رُؤْيَا يُبَرِّئُنِي اللَّهُ بِهَا، قَالَتْ: فَوَاللَّهِ مَا رَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلاَ خَرَجَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْبَيْتِ حَتَّى أُنْزِلَ عَلَيْهِ، فَأَخَذَهُ مَا كَانَ يَأْخُذُهُ مِنَ الْبُرَحَاءِ حَتَّى إِنَّهُ لَيَتَحَدَّرُ مِنْهُ مِثْلُ الْجُمَانِ مِنَ الْعَرَقِ، وَهْوَ فِي يَوْمٍ شَاتٍ مِنْ ثِقَلِ الْقَوْلِ الَّذِي يُنْزَلُ عَلَيْهِ، قَالَتْ: فَلَمَّا سُرِّيَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سُرِّيَ عَنْهُ وَهْوَ يَضْحَكُ، فَكَانَتْ أَوَّلُ كَلِمَةٍ

تَكَلَّمَ بِهَا: «يَا عَائِشَةُ، أَمَّا اللهُ ﷻ فَقَدْ بَرَّأَكِ». فَقَالَتْ أُمِّي: قُومِي إِلَيْهِ. قَالَتْ: فَقُلْتُ وَاللهِ، لاَ أَقُومُ إِلَيْهِ، وَلاَ أَحْمَدُ إِلاَّ اللهَ ﷻ. وَأَنْزَلَ اللهُ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْۚ لَا تَحْسَبُوهُ ﴿١١﴾﴾ النور الْعَشْرَ الآيَاتِ كُلَّهَا، فَلَمَّا أَنْزَلَ اللهُ هَذَا فِي بَرَاءَتِي قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ ﷺ وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحِ بْنِ أُثَاثَةَ لِقَرَابَتِهِ مِنْهُ، وَفَقْرِهِ -: وَاللهِ لاَ أُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحٍ شَيْئًا أَبَدًا بَعْدَ الَّذِي قَالَ لِعَائِشَةَ مَا قَالَ. فَأَنْزَلَ اللهُ ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾﴾ النور. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: بَلَى، وَاللهِ إِنِّي أُحِبُّ أَنْ يَغْفِرَ اللهُ لِي، فَرَجَعَ إِلَى مِسْطَحٍ النَّفَقَةَ الَّتِي كَانَ يُنْفِقُ عَلَيْهِ، وَقَالَ: وَاللهِ لاَ أَنْزِعُهَا مِنْهُ أَبَدًا. قَالَتْ عَائِشَةُ: وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَسْأَلُ زَيْنَبَ ابْنَةَ جَحْشٍ عَنْ أَمْرِي، فَقَالَ: «يَا زَيْنَبُ مَاذَا عَلِمْتِ أَوْ رَأَيْتِ؟». فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَحْمِي سَمْعِي وَبَصَرِي، مَا عَلِمْتُ إِلاَّ خَيْرًا. قَالَتْ: وَهْيَ الَّتِي كَانَتْ تُسَامِينِي مِنْ أَزْوَاجِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَعَصَمَهَا اللهُ بِالْوَرَعِ، وَطَفِقَتْ أُخْتُهَا حَمْنَةُ تُحَارِبُ لَهَا فَهَلَكَتْ فِيمَنْ هَلَكَ مِنْ أَصْحَابِ الإِفْكِ[1].

**٤٧٥٠ - ئیبنو شیهاب دەڵێ: عورووەی کوڕی زوبەیر و سەعیدی کوڕی موسەییەب و عەلقەمەی کوڕی وەققاص و عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعوود بۆیان گێڕامەوە سەبارەت بە دەنگ و باسەکەی عائیشەی ﵂ هاوسەری پێغەمبەر ﷺ کاتێ بوختانچیەکان ئەو بوختانە ناڕەوایەیان وت دەربارەی، پاشان خوای گەورە پاك و بێگەردی عائیشەی خستەڕوو لەوەی بوختانچیەکان وتیان، (زوهری دەڵێ:) هەریەك لەو کەسانەی (ناوم هێنان**

(١) بڕوانە: ٢٥٩٣.

أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ، قَالَتْ فَأَصْبَحَ أَبَوَايَ عِنْدِي -وَقَدْ بَكَيْتُ لَيْلَتَيْنِ وَيَوْمًا لاَ أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ وَلاَ يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ - يَظُنَّانِ أَنَّ الْبُكَاءَ فَالِقٌ كَبِدِي، قَالَتْ: فَبَيْنَمَا هُمَا جَالِسَانِ عِنْدِي وَأَنَا أَبْكِي، فَاسْتَأْذَنَتْ عَلَيَّ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَأَذِنْتُ لَهَا، فَجَلَسَتْ تَبْكِي مَعِي، قَالَتْ: فَبَيْنَا نَحْنُ عَلَى ذَلِكَ دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَسَلَّمَ ثُمَّ جَلَسَ قَالَتْ: وَلَمْ يَجْلِسْ عِنْدِي مُنْذُ قِيلَ مَا قِيلَ قَبْلَهَا، وَقَدْ لَبِثَ شَهْرًا، لاَ يُوحَى إِلَيْهِ فِي شَأْنِي، قَالَتْ فَتَشَهَّدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ جَلَسَ ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ يَا عَائِشَةُ، فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنِي عَنْكِ كَذَا وَكَذَا، فَإِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُكِ اللَّهُ، وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِي اللَّهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ، فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبِهِ ثُمَّ تَابَ إِلَى اللَّهِ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ». قَالَتْ: فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَقَالَتَهُ، قَلَصَ دَمْعِي حَتَّى مَا أُحِسُّ مِنْهُ قَطْرَةً، فَقُلْتُ لأَبِي أَجِبْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِيمَا قَالَ. قَالَ: وَاللَّهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: لأُمِّي أَجِيبِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ. قَالَتْ: مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: فَقُلْتُ: وَأَنَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ لاَ أَقْرَأُ كَثِيرًا مِنَ الْقُرْآنِ، إِنِّي وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُ لَقَدْ سَمِعْتُمْ هَذَا الْحَدِيثَ حَتَّى اسْتَقَرَّ فِي أَنْفُسِكُمْ، وَصَدَّقْتُمْ بِهِ، فَلَئِنْ قُلْتُ لَكُمْ إِنِّي بَرِيئَةٌ - وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّي بَرِيئَةٌ - لاَ تُصَدِّقُونِي بِذَلِكَ، وَلَئِنِ اعْتَرَفْتُ لَكُمْ بِأَمْرٍ - وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّي مِنْهُ بَرِيئَةٌ لَتُصَدِّقُنِّي، وَاللَّهِ مَا أَجِدُ لَكُمْ مَثَلاً إِلاَّ قَوْلَ أَبِي يُوسُفَ قَالَ: ﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ يوسف قَالَتْ: ثُمَّ تَحَوَّلْتُ فَاضْطَجَعْتُ عَلَى فِرَاشِي، قَالَتْ: وَأَنَا حِينَئِذٍ أَعْلَمُ أَنِّي بَرِيئَةٌ، وَأَنَّ اللَّهَ مُبَرِّئِي بِبَرَاءَتِي، وَلَكِنْ وَاللَّهِ مَا كُنْتُ أَظُنُّ أَنَّ اللَّهَ مُنْزِلٌ فِي شَأْنِي وَحْيًا يُتْلَى، وَلَشَأْنِي فِي نَفْسِي كَانَ أَحْقَرَ مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ اللَّهُ فِيَّ بِأَمْرٍ يُتْلَى، وَلَكِنْ كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَرَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي النَّوْمِ رُؤْيَا يُبَرِّئُنِي اللَّهُ بِهَا، قَالَتْ: فَوَاللَّهِ مَا رَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلاَ خَرَجَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْبَيْتِ حَتَّى أُنْزِلَ عَلَيْهِ، فَأَخَذَهُ مَا كَانَ يَأْخُذُهُ مِنَ الْبُرَحَاءِ حَتَّى إِنَّهُ لَيَتَحَدَّرُ مِنْهُ مِثْلُ الْجُمَانِ مِنَ الْعَرَقِ، وَهْوَ فِي يَوْمٍ شَاتٍ مِنْ ثِقَلِ الْقَوْلِ الَّذِي يُنْزَلُ عَلَيْهِ، قَالَتْ: فَلَمَّا سُرِّيَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سُرِّيَ عَنْهُ وَهْوَ يَضْحَكُ، فَكَانَتْ أَوَّلُ كَلِمَةٍ

تَكَلَّمَ بِهَا: «يَا عَائِشَةُ، أَمَّا اللَّهُ ﷻ فَقَدْ بَرَّأَكِ». فَقَالَتْ أُمِّي: قُومِي إِلَيْهِ. قَالَتْ: فَقُلْتُ وَاللَّهِ، لاَ أَقُومُ إِلَيْهِ، وَلاَ أَحْمَدُ إِلاَّ اللَّهَ ﷻ. وَأَنْزَلَ اللَّهُ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْۚ لَا تَحْسَبُوهُ ﴿١١﴾﴾ النور الْعَشْرَ الآيَاتِ كُلَّهَا، فَلَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ هَذَا فِي بَرَاءَتِي قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ ﷺ وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحِ بْنِ أُثَاثَةَ لِقَرَابَتِهِ مِنْهُ، وَفَقْرِهِ -: وَاللَّهِ لاَ أُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحٍ شَيْئًا أَبَدًا بَعْدَ الَّذِي قَالَ لِعَائِشَةَ مَا قَالَ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾﴾ النور. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: بَلَى، وَاللَّهِ إِنِّي أُحِبُّ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لِي، فَرَجَعَ إِلَى مِسْطَحٍ النَّفَقَةَ الَّتِي كَانَ يُنْفِقُ عَلَيْهِ، وَقَالَ: وَاللَّهِ لاَ أَنْزِعُهَا مِنْهُ أَبَدًا. قَالَتْ عَائِشَةُ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْأَلُ زَيْنَبَ ابْنَةَ جَحْشٍ عَنْ أَمْرِي، فَقَالَ: «يَا زَيْنَبُ مَاذَا عَلِمْتِ أَوْ رَأَيْتِ؟». فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَحْمِي سَمْعِي وَبَصَرِي، مَا عَلِمْتُ إِلاَّ خَيْرًا. قَالَتْ: وَهْيَ الَّتِي كَانَتْ تُسَامِينِي مِنْ أَزْوَاجِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَعَصَمَهَا اللَّهُ بِالْوَرَعِ، وَطَفِقَتْ أُخْتُهَا حَمْنَةُ تُحَارِبُ لَهَا فَهَلَكَتْ فِيمَنْ هَلَكَ مِنْ أَصْحَابِ الإِفْكِ[1].

**٤٧٥٠ - ئیبنو شیهاب دەڵێ: عوروەی کوڕی زوبەیر و سەعیدی کوڕی موسەییەب و عەلقەمەی کوڕی وەققاص و عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعوود بۆیان گێڕامەوە سەبارەت بە دەنگ و باسەکەی عائیشەی ﵂ هاوسەری پێغەمبەر ﷺ کاتێ بوختانچیەکان ئەو بوختانە ناڕەوایەیان وت دەربارەی، پاشان خوای گەورە پاك و بێگەردی عائیشەی خستەڕوو لەوەی بوختانچیەکان وتیان، (زوهری دەڵێ:) هەریەك لەو کەسانەی (ناوم هێنان**

(١) بڕوانە: ٢٥٩٣.

لەپێشەوە) بەشێك لە بەسەرهاتەکە (ی عائیشە) یان بۆ گێڕاومەتەوە، گێڕانەوەی هەندێکیان پاڵپشتی گێڕانەوەی هەندێکی تریان دەکات و پشت ڕاستی دەکاتەوە، ئەگەر چی لە هەندێکیان چاکتری لەبەرە، ئەوەی عوروە بۆی گێڕاومەتەوە لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: کە عائیشەی ﵂ هاوسەری پێغەمبەر ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکات بیویستایە بڕوات بۆ سەفەرێك تیروپشکی دەکرد لە نێوان خێزانەکانیدا، جا بۆ هەر خێزانێکی دەرچووایە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خۆیدا دەیبرد، عائیشە ﵂ وتی: جا (پێغەمبەری خوا ﷺ ) بۆ غەزایەك دەرۆشت تیروپشکی کرد لە نێوانماندا ناوی من دەرچوو، منیش لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشتم دوای ئەوەی ئایەتی (حیجاب) دابەزیبوو، منیش لە ناو کەژاوەکەی خۆم دا هەڵدەگیرام و دائەبەزێنرام، هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ لەو غەزاکەی بوویەوەو گەڕایەوەو نزیك بووینەوە لە مەدینە، شەوێکیان ئاگاداری دا بەڕۆشتن و (گەڕانەوە بۆ مەدینە)، منیش کاتێ ئاگاداریان دا بەرۆشتن هەستام و ڕۆشتم تا لە لەشکرەکە تێپەڕیم (و دەستم بەئاو گەیاند) جا کەتەواوبووم لە پێویستیەکەم گەڕامەوە بۆلای شوێنەکەی خۆم (کە دەستم دا لە سنگم) دەبینم ملوانکەکەم کەلەمورووی (ظَفَارِ)[1] بوو پچڕاوە، بۆیە گەڕامەوە بۆ دۆزینەوەی ملوانکەکەم وە بەشوێن گەڕانم بۆملوانکەکە دوای خستم، وە ئەوانەی کەژاوەکەی منیان بارکرد بوو هاتوون وکەژاوەکەی منیان خستبووە سەر پشتی وشترەکەم کە من سواری دەبووم، وایان زانیوە من لە کەژاوەکە دام، وەئافرەتان لەو کات و ڕۆژگارەدا سوکەڵە بوون گۆشت قورسی نەکردبوون، بێگومان خواردنی کەممان دەخوارد، بۆیە ئەو کەسانە سوکی کەژاوەکە بەلایانەوە ئاسایی بوو کاتێ کەژاوەکەیان بەرز کردبویەوە، منیش ئافرەتێکی گەنجی کەم تەمەن

(١) یان ( أظَفَارِ) وەك لە هەندێ گێڕانەوەی بوخاریدا هاتووە.

بووم، ئیتر وشترەکەیان هەڵساند بوو ڕۆشتبوون، منیش ملوانکەکەم دۆزییەوە و دوای ئەوەی لەشکرەکە ڕۆشتبوون، منیش هاتمە جێگاکەی ئەوان کەسی لێ نەمابوو، ئیتر ڕۆشتم بەرەو جێگاکەی خۆم کە پێشتر لێی بووم، دەمزانی بێگومان بەشوێنمدا دەگەڕێن کەدیارنیم و دەگەڕێنەوە بۆ لام. جا لەکاتێکدا لە شوێنەکەی خۆم دانیشتبووم خەو زۆری بۆ چاوەکانم هێنابوو خەوتم، وە صەفوانی کوڕی موعەتتەلی سولەمیی پاشان زەکوانی لەدوای لەشکرەکەوە بوو، کە ڕۆژ بوویەوە هاتە لای جێگاکەی من، وە ڕەشایی کەسێکی خەوتووی بینیبوو، بۆیە هات بۆ لام کە منی بینی ناسیمی، ئەو پێش پێویست بوونی (حیجاب) منی دیبوو، کە زانی منم وتی (إنا لله وإنا إليه راجعون) منیش بە وتەکەی خەبەرم بوویەوە، ئینجا بەسەرپۆشەکەم ڕووخسارم داپۆشی، سوێند بەخوا بەیەك وشەش قسەی لەگەڵ نەکردم، وەجگە لە وتنی: (إنا لله وإنا إليه راجعون) وشەیەکم لێ نەبیست، هەتا وشترەکەی خوست داو دەستەکانی پێ خستە زەوی منیش سواری بووم و بەخێرایی ڕەشوەی وشترەکەی ڕادەکێشا کە سواری بووم هەتا گەشتینەوە بە لەشکرەکە، دوای ئەوەی لایان دابوو باریان خستبوو لەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا (لەوێدا قسەو قسەلۆك دەستی پێکرد)، جا ئەوەی تیاچوو تیاچوو وە ئەو کەسەی بوختانەکەی بڵاوکردبۆوە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو.

ئینجا گەشتینەوە مەدینە، جا کە گەشتمەوە و یەك مانگ نەخۆش کەوتم، خەڵك قسەی بوختان چیەکانیان بڵاو دەکردەوە، منیش هەستم بەهیچ لەو قسانە نەدەکرد، وە شتێك لە نەخۆشیەکەمدا گومانی لا دروست کردم ئەوە بوو ئەو سۆز و لوتفەم لە پێغەمبەردا ﷺ بەدی نەدەکرد کە جاران نەخۆش دەکەوتم دەمبینی تێیدا، تەنها ئەوە نەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ دەهاتە ماڵەوە سەلامی دەکرد و پاشان دەیفەرموو (بە دایکم): ((کچەکەتان چۆنە؟)) پاشان

دەرۆشت، ئائەوە گومانی لا دروست دەکردم، هەستم بەهیچ نەکردبوو هەتا دوا ئەوی چاك بوومەوە لە نەخۆشیەکەم لە مالْ رۆشتمە دەرەوە، جا لەگەلْ دایکی میستەح ڕوو بە مەناصیع ڕۆشتینە دەرەوە - کە شوێنی دەست بەئاو گەیاندنمان بوو - ئێمە شەو بۆ شەو نەبووایە نەدەرۆشتینە دەرەوە، ئەوە پێش ئەوەبوو کە ئاودەست دروست کەین لە نزیك مالّەکانمان، باوی ئێمە لەم بارەیەوە وەك باوی عەرەبە پێشووەکان بوو، لەچۆلّەوانی دەستمان بەئاو دەگەیاند، چونکە ئێمە بە دروستکردنی ئاودەست لای مالّەکانماندا نارەحەت دەبووین، جامن و دایکی میستەح - کە کچی ئەبو ڕوهمی کوڕی عەبدی مەناف بوو، دایکیشی کچی صەخری کوڕی عامیر بوو پوری ئەبەکری صدیق بوو میستەحی کوڕی ئوساسەش کوڕی بوو - جامن و دایکی میستەح ڕوو بە مالّی من هاتینەوە لە کارەکەمان تەواو بوو بووین، دایکی میستەح قاچی لە عەباکەی گیرا و پێی هەلّکەوت وتی میستەح داماوبی، منیش وتم: قسەیەکی خراپت کرد، ئایا تۆ جنێو بەپیاوێك دەدەیت بەشداری غەزای بەدری کردووە؟ وتی: ئەی کچەکە ئایا نەتبیستووە چی وتوە؟ عائیشە دەلّێ وتم چی وتوە؟ ئەنجا قسەی بوختانچیەکانی بۆ گێرامەوە، ئیتر نەخۆشیە پێشووەکەم ئەم نەخۆشیەشی بۆ زیادبوو. جا کە گەرامەوە بۆ مالّی خۆم پێغەمبەری خواش ﷺ هات بۆلام -واتە - سەلامی کرد وفەرمووی: ((کچەکەتان چۆنە؟)) منیش وتم: مۆلّەتم ئەدەیت برۆم بۆ لای دایك و باوکم؟ -عائیشە دەلّێ: من لەوکاتەدا دەمویست ڕاستی هەوالّەکە لە لای هەردووکیانەوە (دایك و باوکمەوە) بزانم - دەلّێ پێغەمبەری خواش ﷺ مۆلّەتی دام، منیش ڕۆشتم بۆلای دایك و باوکم و بەدایکمم وت: ئەی دایکە خەلّك چی دەلّێن؟ وتی: کچی شیرینم نارەحەت مەبە و خەفەت مەخۆ، سوێند بەخوا کەم ئافرەت هەیە جوان بێت و مێردەکەی خۆشی بوێت و هەویەی هەبێت قسە و قسەلۆکی لەدژ نەکەن، عائیشە دەلّێ وتم: پاك و

بێگەردی بۆ خوا، سوێند بەخوا خەڵك ئەو قسەو قسەلۆكە دەكەن، عائیشە دەڵێ: ئەو شەوە تا بەیانی گریام و فرمێسك لەچاوم ووشك نەبوویەوە و خەوم لێ نەكەوت تا ڕۆژم لێبویەوە، ئینجا كاتێ نیگا نەهات و دواكەوت پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی كوڕی ئەبو تاڵیب و ئوسامەی كوڕی زەیدی ﷺ بانگ كرد و ڕاوێژی پێكردن دەربارەی جیابوونەوە لەخێزانی[1]، عائیشە دەڵێ: جا ئوسامەی كوڕ زەید ئەوەی عەرزكرد پێغەمبەری خوا كە دەیزانی لەپاكی و بەریبوونی خێزانی، وە ئەو سۆزو خۆشەویستی لەناخیدا هەیبوو و دەیزانی بۆیان، ئوسامە وتی: خێزانی خۆتە و چاكە نەبێت لەبارەیەوە نەمان زانیوە، بەڵام عەلی كوڕی ئەبو تاڵیب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خوا ڕێگەی لێ نەگرتوی (بۆ ژن هێنان) جگە لەو ئافرەتی تر زۆرە، وە ئەگەر پرسیار لە كەنیزەكەكەی بكەیت ڕاستیت پێ دەڵێ، عائشە دەڵێ: پێغەمبەری خواش ﷺ بەریرەی بانگ كرد و فەرمووی: ((ئەی بەریرە ئایا شتێكت لە عائیشە دیوە بتخاتە گومانەوە؟ )) بەریرەش وتی: نەخێر سوێند بەو زاتەی تۆی بەڕاستی ناردووە هیچ شتێكم لێ نەدیووە نەنگی بێت بۆی، تەنها ئەوە نەبێت كچۆڵەیەكی منالكارە بەسەر هەویرەكەیماڵەومیان خەوی لێ دەكەوێت ئاژەڵی لە ماڵەوە بوو دێت و هەویرەكە دەخوات، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ هەر ئەو ڕۆژە هەستا و سكاڵای حاڵی خۆی كرد لە دەستی عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەی كوڕی سەلول، عائیشە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر دوانگە فەرمووی: ((ئەی جەماوەری مسوڵمانان كێ یارمەتیم دەدا بچم بەگژی پیاوێكداكە بەڕاستی ئەزیەت و ئازاری بەخاوخێزانم گەیاندووە؟ دەی سوێند بەخوا جگە لەچاكە هیچم لەخێزانم نەدیووە، وە سوێند بەخوا باسی پیاوێكیان كردووە جگە لەچاكە هیچم لێ نەدیوە، وە لەگەڵ خۆمدا نەبێت

(١) واتە: عائیشە ﵂ .

نەهاتۆتە ژوورەوە بۆ ناومالْ وخێزانم))، جا سەعدی کوڕی موعازی ئەنصاری هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من یارمەتیت دەدەم لە دژی، ئەگەر ئەو کەسە لە هۆزی ئەوسە دەدەم لە گەردنی، وە ئەگەر لە برایانمانە - لە هۆزی خەزرەج - فەرمانمان پێ بکە ئێمەش فەرمانەکەت جێبەجێ دەکەین،

عائیشە دەڵێ: ئەنجا سەعدی کوڕی عوبادە هەستا و - کە سەرۆکی هۆزی خەزرەج بوو، کە پێشتر پیاوێکی چاك بوو بەڵام دەماری خزمایەتی جولاو - وتی: بە سەعد (ی کوڕی موعاز) سوێند بەخوا درۆ دەکەیت نایکوژی و ناشتوانی بیکوژی، ئەنجا ئوسەیدی کوڕی حوزەیر هەستا کە ئامۆزای سەعد بوو وتی: بە سەعدی کوڕی عوبادە تۆ درۆ دەکەیت سوێند بەخوا دەیکوژین بەڕاستی تۆ دوو ڕوویت و دەمەقاڵێ دەکەیت لەسەر دوو ڕووەکان، جا هەردوو لایان ئەوس وخەزرەج هەستان ویستیان جەنگ لەدژی یەکتر بەرپاکەن، پێغەمبەری خواش ﷺ لەسەر دوانگەکە وەستا بوو بەردەوام هێوری دەکردنەوە هەتا بێ دەنگ بوون، پێغەمبەریش بێدەنگ بوو.

عائیشە دەڵێ: من ئەو ڕۆژە هەمووی گریام فرمێسك لەچاوم ووشك نەدەبوویەوە و خەو نەچووە چاوم جا بۆ بەیانیەکەی دایك و باوکم لابوو، کە بێگومان دوو شەو و ڕۆژێك بەردەوام گریام و خەو نەچوویە چاوم و فرمێسك لەچاوم ووشك نەدەبوویەوە و هەتا (دایك و باوکم) گومانیان وابوو گریان و خەفەت دەمکوژێت، عائیشە دەڵێ: جالەکاتێکدا دایك و باوکم لام دانیشتبوون و منیش دەگریام، لەپڕ ئافرەتێکی ئەنصاری مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی خواست، منیش مۆڵەتم دا و هاتە ژوورەوە و دانیشت لەگەڵ من دەگریا، جا لەکاتێکدا ئێمە لەم حاڵەتەدا بووین پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە و سەلامی کرد و پاشان دانیشت، عائیشە دەڵێ: کەپێشتر لام دانەدەنیشت لەو کاتەوەی ئەو قسەو قسەڵۆکە کرابوو، بێگومان مانگێك مامەوە دەربارەی من هیچ نیگای بۆ

نەدەهات. عائیشە دەڵێ: پێغەمبەری ﷺ کاتێ دانیشت وتی: (أشهد أن لاإله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله) پاشان فەرمووی: ((ئینجا دوا ئەمە ئەی عائیشە بێگومان دەربارەی تۆ ئەوە و ئەوە بەمن گەشتووە، جائەگەر تۆ بێتاوان بیت ئەوە دڵنیابە خوا بێ تاوانیت ڕوون دەکاتەوە، وە ئەگەر تاوانێکیشت کردووە ئەوە داوای لێخۆشبوون لەخوا بکە وە پەشیمان بەرەوە و بگەڕێرەوە بۆ لای خوا، چونکە بەڕاستی ئەگەر مرۆڤ دان بەتاوانەکەیدا بنێت و پاشان بگەڕێتەوە بۆلای خوا، خواش تەوبەی لێ گیرا دەکات))، عائیشە دەڵێ: جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ وتەکەی تەواوکرد فرمێسکم ووشك بوویەوە بەجۆرێ هەستم نەدەکرد یەك فرمێسك لەچاوم بێت، وە وتم بە باوکم: وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەرەوە سەبارەت بەوەی وتی، باوکم وتی: وەڵڵاهی نازانم چی بڵێم بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئینجا وتم بەدایکم: وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەرەوە، دایکم وتی: وەڵڵاهی نازانم چی بڵێم بە پێغەمبەری خوا ﷺ، عائیشە دەڵێ: منیش کچۆڵەیەکی منالکار بووم قورئانی زۆرم نەخوێندبوو، منیش وتم: وەڵڵای دڵنیابن من دەزانم ئێوە ئەو قسە و قسەلۆکەی خەڵك دەربارەی من دەیلێن بیستوتانە، لەدڵ و دەروونتاندا جێگیر بووە و باوەڕتان پێ کردووە، خۆ ئەگەر من پێتان بڵێم: من بێ تاوانم - خواش دەزانێ کە من بێ تاوانم - ئێوە باوەڕم پێ ناکەن بەوەی دەیلێم، بەڵام ئەگەر دان بەو تاوانەدا بنێم لەبەردەم ئێوەدا - خوا دەزانێ بێ تاوانم - ئەوە باوەڕم پێ دەکەن، وەڵڵاهی نموونەیەك نادۆزمەوە بە من ئێوە بچێ جگە لە وتەکەی باوکی یوسف کە فەرمووی: (جا (ئارام دەگرم) بەئارامگرتنێکی چاك و پەسەند خواش یارمەتیدەرمە لەسەر ئەوەی باسی دەکەن).

عائیشە وتی: پاشان خۆم وەرچەرخان لەسەر نوێنەکەم ڕاکشام. دەڵێ: وە من ئەو کاتە دەمزانی کەبێ تاوانم، وەدڵنیابووم خوا بەریبوونی من دەردەخات،

بەڵام سوێند بەخوا گومانم نەدەبرد کە خوا دەربارەی ئەم کارەی من نیگا دابەزێنێت و بخوێنرێتەوە، وەمن لە دڵی خۆمدا لام وابوو لەوە کەمتڕم کە قورئان دەربارەی کاری من فەرمایشت بفەرمووێ و بخوێنرێتەوە، بەڵام من چاوەڕوانم دەکرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەودا خەوێك ببینێ خوا بێ تاوانی منی پێ دەربخات.

عائیشە دەڵێ: جا سوێند بەخوا نەپێغەمبەری خوا ﷺ لەشوێنی خۆی جوڵا نەهیچ کەس لەوانەی لە ماڵەکەدابوون، هەتا وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ دابەزێنرا، جا پێغەمبەر ﷺ حاڵەتێ دایگرت کە لە هاتنی وەحی دا دایگرت کە تایەکی قورس بوو تەنانەت دڵۆپی ئارەقی دانە دانە وەك گۆی مرواری بەڕوخساریدا دەهاتە خوارەوە، لەبەر عەرەق کردنی لە ڕۆژی ساردی زستاندا، لەبەر قورسی ئەو فەرمایشتەی بۆی دائەبەزێنرێ، عائیشە دەڵێ: جا کاتێ قورسی نیگا بۆ هاتنەکە لەسەر پێغەمبەر ﷺ نەما ئەو پێدەکەنی، جا یەکەم وشەیەك لە دەمی هاتە دەرەوە فەرمووی: ((ئەی عائیشە خوا ﷻ بێ تاوانی تۆی دەرخست))، بۆیە دایکم پێی وتم: هەستە بچۆ بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ منیش وتم: سوێند بەخوا ناچم بۆ خزمەتی و جگە لە خوا ﷻ سوپاسی کەس ناکەم، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ ﴿١١﴾﴾ النور تا دە ئایەتەکە تەواو دەبێت.

جا کاتێ خوا ئەم ئایەتانەی دابەزاند دەربارەی بێ تاوانی و پاکێتی من و ئەبو بەکری صدیق - کە خەرج و مەسرەفی میستەحی کوڕی ئوساسەی دەکێشا لەبەر نزیکی و خزمایەتی و هەژاری - وتی: سوێند بەخوا ئیتر خەرجی میستەح بەهیچ جۆرێك ناکێشم هەتا ماوە، دوای ئەو بوختانەی بۆ عائیشەی کرد، ئەنجا خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ

وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ النور. **واته: ئەوانەتان خاوەنی چاکە و سەروەت و سامانن سوێند مەخۆن کە یارمەتی بەخزمان و هەژاران و کۆچەران نەدەن لەپێناوی خوادا، وە با لێبوردەبن و چاوپۆشی بکەن ئایا پێتان خۆش نییە خوا لێتان خۆش بێت، وە خوا لێ خۆش بوو میهرەبانە.**

**جا ئەبو بەکر وتی: بەڵێ سوێند بەخوا پێم خۆشە کە خوا لێم خۆش بێت، ئیتر ئەو خەرجی جاران دەیکرد بۆ میستەح بۆی گێڕایەوە، وە وتی: سوێند بەخوا هەرگیز لێی ناگرمەوە، عائیشە دەڵێ: وە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لەزەینەبی کچی جەحش کردبوو دەربارەی من و فەرمووی پێی: ((زەینەب چی دەزانی یان چیت بینیووە؟)) ئەویش ووتبووی ئەی پێغەمبەری خوا گوێم و چاوم دەپارێزم وەڵڵاهی جگە لە چاکە هیچم لێ نەبینیووە، عائیشە دەڵێ: تەنها زەینەب هاوتای من بوو لەناو خێزانەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەهۆی خواناسی و خۆپارێزیەوە خوا پاراستی، بەڵام حیمنەی خوشکی لەپێناوی زەینەبدا شەڕی دەکرد، ئەویش تیاچوو لە ریزی ئەو کەسانەدا تیاچوون لە بوختان چیەکان.**

**٧ - بابُ قوله:** ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِي مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ ﴾ **النور**

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ تَلَقَّوْنَهُۥ ﴿١٥﴾ ﴾ النور. يَرْوِيهِ بَعْضُكُمْ عَنْ بَعْضٍ، ﴿ تُفِيضُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ يونس: تَقُولُونَ.

## ٧-باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە ئەگەر بەهرە و ڕەحمەتی خوا نەبوایە بەسەرتانەوە لە دنیا و دواڕۆژدا لەبەر ڕۆچوونتان لە بوهتانەدا (بۆ عائیشە) سزایەکی گەورەتان دووچار دەبوو)

-موجاهید دەڵێ: ﴿ تَلَقَّوْنَهُۥ ﴾ هەندێکتان لە هەندێکتانەوە دەیگێڕنەوە. ﴿ تُفِيضُونَ ﴾ دەیڵێن ڕۆدەچن.

٤٧٥١ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُلَيْمَانُ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ أُمِّ رُومَانَ -أُمِّ عَائِشَةَ - أَنَّهَا قَالَت: لَمَّا رُمِيَتْ عَائِشَةُ خَرَّتْ مَغْشِيًّا عَلَيْهَا[1].

**٤٧٥١ -مەسروق لە ئومو ڕۆمانەوە -دایکی عائیشە - دەگێڕێتەوە کە ئەو (ئوممو ڕۆمان) وتی: عائیشە کاتێ ئەو بوهتانەی درایە پاڵ کەوت و لە هۆش خۆی چوو.**

**٨ - بابٌ:** ﴿ إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ ﴾ النور

٤٧٥٢ - حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا هِشَامٌ أَنَّ ابْنَ جُرَيْجٍ أَخْبَرَهُمْ قَالَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ سَمِعْتُ عَائِشَةَ تَقْرَأُ ﴿ إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ[2] بِأَلْسِنَتِكُمْ ﴿١٥﴾ ﴾ النور[3].

---

(١) بڕوانە: ٣٣٨٨.

(٢) (تَلِقُونَهُ) خوێندنەوەیەکی شازە جەماوەری قورئان خوێنان بە :(تَلَقَّوْنَهُۥ) خوێندویانەتەوە.

(٣) بڕوانە: ٤١٤٤.

## ٨ - باسێک: (کاتێ ئەم بوهتانەتان بەدەما و دەم لە یەکتریەوە وەردەگرت وە بە زمانتان شتێکتان دەوت کە زانیاریتان دەربارەی نەبوو، واتاندەزانی شتێکی سووک و ئاسانە لە کاتێکدا لای خوا زۆر گەورەیە)

**٤٧٥٢ -ئیبنو ئەبی مولەیکە دەڵێ: لە عائیشەم ﷺ بیست ئەم ئایەتەی بەم شێوە دەخوێندەوە: ﴿إِذۡ تَلِقُونَهُۥ بِأَلۡسِنَتِكُمۡ ﴿١٥﴾﴾ واتە: بە زمان درۆتان دەکرد**

**بابٌ:** ﴿وَلَوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ قُلۡتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٌ ﴿١٦﴾﴾ النور

٤٧٥٣ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُمَرَ بْنِ سَعِيدِ بْنِ أَبِي حُسَيْنٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: اسْتَأْذَنَ ابْنُ عَبَّاسٍ قَبْلَ مَوْتِهَا عَلَى عَائِشَةَ، وَهْيَ مَغْلُوبَةٌ قَالَتْ: أَخْشَى أَنْ يُثْنِيَ عَلَيَّ. فَقِيلَ: ابْنُ عَمِّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَمِنْ وُجُوهِ الْمُسْلِمِينَ. قَالَتِ: ائْذَنُوا لَهُ. فَقَالَ: كَيْفَ تَجِدِينَكِ؟ قَالَتْ: بِخَيْرٍ إِنِ اتَّقَيْتُ. قَالَ: فَأَنْتِ بِخَيْرٍ -إِنْ شَاءَ اللَّهُ- زَوْجَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَلَمْ يَنْكِحْ بِكْرًا غَيْرَكِ، وَنَزَلَ عُذْرُكِ مِنَ السَّمَاءِ. وَدَخَلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ خِلاَفَهُ فَقَالَتْ: دَخَلَ ابْنُ عَبَّاسٍ فَأَثْنَى عَلَيَّ وَوَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ نِسْيًا مَنْسِيًّا[١].

## باسێک: (بۆچی کاتێ ئەمەتان بیست نەتان وت بۆ ئێمە شیاو نییە قسە (و بوهتان)ـی وا بکەین، پاک و بێگەردی بۆ تۆ خوایە ئەمە بوهتانێکی زۆر گەورەیە)

**٤٧٥٣ -ئیبنو ئەبی مولەیکە دەڵێ: ئیبنو عەبباس ﷺ مۆڵەتی خواست بۆ ڕۆشتنە خزمەتی عائیشە ﷺ - پێش مردنی عائیشە - لەنارەحەتی (سەرەمەرگ) دابوو وتی: دەترسم وەسف و سەنام بکات، پێی وترا: کوڕی مامی پێغەمبەری خوایە ﷺ و**

(١) بروانە: ٣٧٧١.

**له پیاوه ناودارەکانی ناومسوڵمانانه، عائیشه ﷺ وتی: ڕێگەی بدەن (بابێته ژوورەوە)، به عائیشەی وت: حاڵت چۆنه؟ عائیشه وتی: باشم ئەگەر پارێزگارم و له خوا بترسم، ئیبنو عەبباس وتی: حاڵت باشه بەویستی خوا تۆ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوویت جگه له تۆ کچی ماره نەکردووه پاکی وعوزرت [1] له ئاسمانەوه دابەزی، ئیبنو زوبەیر ڕۆشته ژوورەوه و ئیبنو عەبباس هاته دەرەوه پێچەوانەی یەکتری بوون [2]، جا عائیشه وتی: ئیبنو عەباس هاته ژوورەوه و وەسف و سەنای کردم، من ئاواته خوازبووم من شتێکی له بیرچووی لەبیرکراو بوومایه.**

٤٧٥٤ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ بْنُ عَبْدِ الْمَجِيدِ، حَدَّثَنَا ابْنُ عَوْنٍ، عَنِ الْقَاسِمِ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ اسْتَأْذَنَ عَلَى عَائِشَةَ نَحْوَهُ. وَلَمْ يَذْكُرْ نِسْيًا مَنْسِيًّا.

**٤٧٥٤ ـ قاسیم دەگێڕێتەوه که ئیبنو عەبباس ﷺ مۆڵەتی چوونه ژوورەوەی بۆ لای عائیشه ﷺ خواست، ئیتر وەك فەرموودەکەی پێشوو دەگێڕێتەوه بەڵام ئەم بڕگەی باس نەکردوو نەگێڕایەوه (نِسْيًا مَنْسِيًّا).**

## ٩ - بابٌ: ﴿ يَعِظُكُمُ اللَّهُ أَن تَعُودُوا لِمِثْلِهِ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ النور

٤٧٥٥ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: جَاءَ حَسَّانُ بْنُ ثَابِتٍ يَسْتَأْذِنُ عَلَيْهَا. قُلْتُ: أَتَأْذَنِينَ لِهَذَا؟ قَالَتْ: أَوَلَيْسَ قَدْ أَصَابَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ. قَالَ سُفْيَانُ: تَعْنِي ذَهَابَ بَصَرِهِ. فَقَالَ:
حَصَانٌ رَزَانٌ مَا تُزَنُّ بِرِيبَةٍ... وَتُصْبِحُ غَرْثَى مِنْ لُحُومِ الْغَوَافِلِ قَالَتْ لَكِنْ أَنْتَ [3].

(١) مەبەستی پاکێتی عائیشەیه لەو بوهتانەی بۆ دروست کراوه قورئان دابەزی پاکی و ڕاستی ئەوی دەرخست.

(٢) له ڕۆشتنه ژوورەوه و هاتنه دەرەوه دا.

(٣) بڕوانه: ٤١٤٦.

## ٩ - باسێک: (خوا ئامۆژگاریتان دەکات کە هەرگیز نەگەڕێنەوە بۆ وێنەی ئەوەی رووی دا ئەگەر ئێوە باوەڕدارن )

**٤٧٥٥ -مەسروق لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: حەسسانی کوڕی سابیت ﵁ هات و داوای مۆڵەتی کرد بۆ هاتنە ژوورەوە بۆلای عائیشە ﵂ (مەسروق دەڵێ) وتم: (بە عائیشە) ئایا مۆڵەتی ئەمە (حەسسان) دەدەیت؟ عائیشە وتی: ئایاسزایەکی گەورەی تووش نەبووە؟ -سوفیان وتی: مەبەستی نەمانی بینایی وکوێر بوونێتی - ئەنجاحەسسان وتی: (عائیشە) داوێن پاکە، زۆر ژیرە، تۆمەتبار ناکرێ بە (هیچ شتێکی) گوماناوی بەبرسێتی ڕۆژ دەکاتەوە گۆشتی ئافرەتانی (بەڕەوشت و) بێ ئاگا ناخوات [١]، عائیشە ﵂ وتی: بەڵام تۆ (ئاوەهانیت) [٢].**

## ١٠ - بابٌ: ﴿ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾ ﴾ النور

٤٧٥٦ - حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ أَنْبَأَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ دَخَلَ حَسَّانُ بْنُ ثَابِتٍ عَلَى عَائِشَةَ فَشَبَّبَ وَقَالَ:

حَصَانٌ رَزَانٌ مَا تُزَنُّ بِرِيبَةٍ... وَتُصْبِحُ غَرْثَى مِنْ لُحُومِ الْغَوَافِلِ

قَالَتْ لَسْتَ كَذَاكَ. قُلْتُ: تَدَعِينَ مِثْلَ هَذَا يَدْخُلُ عَلَيْكِ وَقَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ ﴿ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ ﴿١١﴾ ﴾ النور فَقَالَتْ: وَأَيُّ عَذَابٍ أَشَدُّ مِنَ الْعَمَى وَقَالَتْ: وَقَدْ كَانَ يَرُدُّ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[٣].

---

(١) واتە: باس و بوهتان بۆ ئافرەتی داوێن پاکی بێ ئاگا ناکات.

(٢) ئاماژە بەوە دەکات کە ئەویش لەگەڵ بوهتان چییەکاندا باسی عائیشەی بەخراپ کردبوو.

(٣) بڕوانە: ٤١٤٦.

## ١٠ - باسێک: (وە خوا ئایەتەکانی خۆی بۆ ئێوە ڕوون دەکاتەوە وە خوا زانای کار دروستە)

٤٧٥٦ -مەسروق دەڵێ: حەسسان کوڕی سابیت چوو بۆ خزمەتی عائیشە ﵂ جا هۆنراوەیەکی وت، لە پێدا هەڵدان و گەورەی عائیشەدا وتی:(عائیشە) داوێن پاکە و زۆر ژیرە و عاقڵە بەهیچ خراپەیەك و گومانێك تۆمەتبار ناکرێ بە برسێتی ڕۆژ دەکاتەوە گۆشتی ئافرەتی (بەڕەوشت و) بێ ئاگا ناخوات.

عائیشە ﵂ وتی: تۆ بەو شێوە نیت (ڕاست ناکەیت)، (مەسروق دەڵێ) وتم: بۆ ڕێگە دەدەیت وێنەی ئەم جۆرە کەسانە بێتەماڵت لە کاتێکدا خوا ئەم ئایەتەی (لەبارەیەوە) دابەزاندووە:(ئەو کەسەیان بەشی گەورەی بوهتانەکەی گرتە ئەستۆ) عائیشەش وتی: دەی چ سزایەك لە کوێری سەختترە؟ هەروەها وتی: بەڕاستی جاران بەرپەرچی تانە و تەشەری کافرانی دەدایەوە کە دەیان کردە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ.

**١١ - بابٌ: قَوْلِه:** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَـٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٠﴾ ﴾ **النور: تَشِيعُ: تظهر، وقَوْلِه:** ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُو۟لُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ **النور**

## ١١ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (بەڕاستی ئەوانەی پێیان خۆشە زینا (کرداری ناشرین) لە ناو خەڵکی باوەڕداردا بڵاو بێتەوە سزای سەختیان بۆ هەیە لە دنیاو دوارۆژدا، وە خوا دەزانێ و ئێوە نازانن، ئەگەر بەهرە و بەزەیی خوا نەبوایە بەسەرتانەوە (دووچاری سزا دەبوون بەهۆی ئەو بوهتانەی کرا بۆ عائیشە) وە بێگومان خوا بەسۆزی میهرەبانە) (تَشِيعُ) واتە: دەرکەوێت و بڵاوبێتەوە. (ئەوانەتان کەخاوەنی چاکەو سەروەت وسامانن باسوێند نەخۆن کە یارمەتی بەخزمان وهەژاران وکۆچەران لە پێناوی خودا نەدەن، دەبا لێپوردەبن و چاوپۆشی بکەن ئایا پێیتان خۆش نییە خوا لێتان خۆش ببێت وە خوا لێخۆش بوو و میهرەبانە).

٤٧٥٧ - وَقَالَ أَبُو أُسَامَةَ: عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: لَمَّا ذُكِرَ مِنْ شَأْنِي الَّذِي ذُكِرَ وَمَا عَلِمْتُ بِهِ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِيَّ خَطِيبًا، فَتَشَهَّدَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ، أَشِيرُوا عَلَيَّ فِي أُنَاسٍ أَبَنُوا أَهْلِي، وَايْمُ اللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَى أَهْلِي مِنْ سُوءٍ، وَأَبَنُوهُمْ بِمَنْ وَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَيْهِ مِنْ سُوءٍ قَطُّ، وَلاَ يَدْخُلُ بَيْتِي قَطُّ إِلاَّ وَأَنَا حَاضِرٌ، وَلاَ غِبْتُ فِي سَفَرٍ إِلاَّ غَابَ مَعِي». فَقَامَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ، فَقَالَ: ائْذَنْ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْ نَضْرِبَ أَعْنَاقَهُمْ، وَقَامَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي الْخَزْرَجِ -وَكَانَتْ أُمُّ حَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ مِنْ رَهْطِ ذَلِكَ الرَّجُلِ -فَقَالَ: كَذَبْتَ، أَمَا وَاللَّهِ، أَنْ لَوْ كَانُوا مِنَ الأَوْسِ مَا أَحْبَبْتَ أَنْ تُضْرَبَ أَعْنَاقُهُمْ. حَتَّى كَادَ أَنْ يَكُونَ بَيْنَ الأَوْسِ وَالْخَزْرَجِ شَرٌّ فِي الْمَسْجِدِ، وَمَا عَلِمْتُ فَلَمَّا كَانَ مَسَاءُ ذَلِكَ الْيَوْمِ خَرَجْتُ لِبَعْضِ حَاجَتِي وَمَعِي أُمُّ مِسْطَحٍ. فَعَثَرَتْ وَقَالَتْ: تَعِسَ

مِسْطَحٌ. فَقُلْتُ: أَيْ أُمِّ تَسُبِّينَ ابْنَكِ وَسَكَتَتْ ثُمَّ عَثَرَتِ الثَّانِيَةَ فَقَالَتْ: تَعِسَ مِسْطَحٌ، فَقُلْتُ لَهَا: تَسُبِّينَ ابْنَكِ ثُمَّ عَثَرَتِ الثَّالِثَةَ فَقَالَتْ: تَعِسَ مِسْطَحٌ. فَانْتَهَرْتُهَا، فَقَالَتْ: وَاللَّهِ مَا أَسُبُّهُ إِلاَّ فِيكِ. فَقُلْتُ: فِي أَيِّ شَأْنِي؟ قَالَتْ: فَبَقَرَتْ لِي الْحَدِيثَ فَقُلْتُ: وَقَدْ كَانَ هَذَا؟ قَالَتْ: نَعَمْ وَاللَّهِ، فَرَجَعْتُ إِلَى بَيْتِي كَأَنَّ الَّذِي خَرَجْتُ لَهُ لاَ أَجِدُ مِنْهُ قَلِيلاً وَلاَ كَثِيراً، وَوُعِكْتُ فَقُلْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَرْسِلْنِي إِلَى بَيْتِ أَبِي. فَأَرْسَلَ مَعِي الْغُلاَمَ، فَدَخَلْتُ الدَّارَ فَوَجَدْتُ أُمَّ رُومَانَ فِي السُّفْلِ وَأَبَا بَكْرٍ فَوْقَ الْبَيْتِ يَقْرَأُ. فَقَالَتْ أُمِّي: مَا جَاءَ بِكِ يَا بُنَيَّةُ فَأَخْبَرْتُهَا وَذَكَرْتُ لَهَا الْحَدِيثَ، وَإِذَا هُوَ لَمْ يَبْلُغْ مِنْهَا مِثْلَ مَا بَلَغَ مِنِّي، فَقَالَتْ: يَا بُنَيَّةُ خَفِّضِي عَلَيْكِ الشَّأْنَ، فَإِنَّهُ وَاللَّهِ، لَقَلَّمَا كَانَتِ امْرَأَةٌ حَسْنَاءُ عِنْدَ رَجُلٍ يُحِبُّهَا، لَهَا ضَرَائِرُ، إِلاَّ حَسَدْنَهَا وَقِيلَ فِيهَا. وَإِذَا هُوَ لَمْ يَبْلُغْ مِنْهَا مَا بَلَغَ مِنِّي، قُلْتُ: وَقَدْ عَلِمَ بِهِ أَبِي؟ قَالَتْ: نَعَمْ. قُلْتُ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَتْ: نَعَمْ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَاسْتَعْبَرْتُ وَبَكَيْتُ، فَسَمِعَ أَبُو بَكْرٍ صَوْتِي وَهْوَ فَوْقَ الْبَيْتِ يَقْرَأُ، فَنَزَلَ فَقَالَ لأُمِّي: مَا شَأْنُهَا؟ قَالَتْ: بَلَغَهَا الَّذِي ذُكِرَ مِنْ شَأْنِهَا. فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، قَالَ: أَقْسَمْتُ عَلَيْكِ أَيْ بُنَيَّةُ إِلاَّ رَجَعْتِ إِلَى بَيْتِكِ. فَرَجَعْتُ وَلَقَدْ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْتِي، فَسَأَلَ عَنِّي خَادِمَتِي فَقَالَتْ: لاَ وَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَيْهَا عَيْبًا إِلاَّ أَنَّهَا كَانَتْ تَرْقُدُ حَتَّى تَدْخُلَ الشَّاةُ فَتَأْكُلَ خَمِيرَهَا أَوْ عَجِينَهَا. وَانْتَهَرَهَا بَعْضُ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: اصْدُقِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَتَّى أَسْقَطُوا لَهَا بِهِ، فَقَالَتْ: سُبْحَانَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَيْهَا إِلاَّ مَا يَعْلَمُ الصَّائِغُ عَلَى تِبْرِ الذَّهَبِ الأَحْمَرِ. وَبَلَغَ الأَمْرُ إِلَى ذَلِكَ الرَّجُلِ الَّذِي قِيلَ لَهُ، فَقَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ! وَاللَّهِ مَا كَشَفْتُ كَنَفَ أُنْثَى قَطُّ. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُتِلَ شَهِيدًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ. قَالَتْ: وَأَصْبَحَ أَبَوَايَ عِنْدِي، فَلَمْ يَزَالاَ حَتَّى دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَدْ صَلَّى الْعَصْرَ، ثُمَّ دَخَلَ وَقَدِ اكْتَنَفَنِي أَبَوَايَ عَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ يَا عَائِشَةُ، إِنْ كُنْتِ قَارَفْتِ سُوءًا أَوْ ظَلَمْتِ، فَتُوبِي إِلَى اللَّهِ، فَإِنَّ اللَّهَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ مِنْ عِبَادِهِ». قَالَتْ: وَقَدْ جَاءَتِ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَهْيَ جَالِسَةٌ بِالْبَابِ فَقُلْتُ: أَلاَ تَسْتَحِي مِنْ هَذِهِ الْمَرْأَةِ أَنْ تَذْكُرَ شَيْئًا. فَوَعَظَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَالْتَفَتُّ إِلَى أَبِي فَقُلْتُ: أَجِبْهُ. قَالَ: فَمَاذَا

أَقُولُ؟ فَالْتَفَتُّ إِلَى أُمِّي فَقُلْتُ: أَجِيبِيهِ. فَقَالَتْ: أَقُولُ مَاذَا؟ فَلَمَّا لَمْ يُجِيبَاهُ تَشَهَّدْتُ فَحَمِدْتُ اللَّهَ وَأَثْنَيْتُ عَلَيْهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قُلْتُ: أَمَّا بَعْدُ فَوَاللَّهِ لَئِنْ قُلْتُ لَكُمْ إِنِّي لَمْ أَفْعَلْ. وَاللَّهُ ﷻ يَشْهَدُ إِنِّي لَصَادِقَةٌ، مَا ذَاكَ بِنَافِعِي عِنْدَكُمْ، لَقَدْ تَكَلَّمْتُمْ بِهِ وَأُشْرِبَتْهُ قُلُوبُكُمْ، وَإِنْ قُلْتُ إِنِّي فَعَلْتُ. وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّي لَمْ أَفْعَلْ، لَتَقُولُنَّ قَدْ بَاءَتْ بِهِ عَلَى نَفْسِهَا، وَإِنِّي وَاللَّهِ مَا أَجِدُ لِي وَلَكُمْ مَثَلاً -وَالْتَمَسْتُ اسْمَ يَعْقُوبَ فَلَمْ أَقْدِرْ عَلَيْهِ - إِلاَّ أَبَا يُوسُفَ حِينَ قَالَ: ﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ يوسف

.وَأُنْزِلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ سَاعَتِهِ فَسَكَتْنَا، فَرُفِعَ عَنْهُ، وَإِنِّي لأَتَبَيَّنُ السُّرُورَ فِي وَجْهِهِ، وَهْوَ يَمْسَحُ جَبِينَهُ وَيَقُولُ: «أَبْشِرِي يَا عَائِشَةُ، فَقَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ بَرَاءَتَكِ». قَالَتْ: وَكُنْتُ أَشَدَّ مَا كُنْتُ غَضَبًا فَقَالَ لِي أَبَوَايَ: قُومِي إِلَيْهِ. فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لاَ أَقُومُ إِلَيْهِ، وَلاَ أَحْمَدُهُ وَلاَ أَحْمَدُكُمَا، وَلَكِنْ أَحْمَدُ اللَّهَ الَّذِي أَنْزَلَ بَرَاءَتِي، لَقَدْ سَمِعْتُمُوهُ، فَمَا أَنْكَرْتُمُوهُ وَلاَ غَيَّرْتُمُوهُ، وَكَانَتْ عَائِشَةُ تَقُولُ: أَمَّا زَيْنَبُ ابْنَةُ جَحْشٍ فَعَصَمَهَا اللَّهُ بِدِينِهَا، فَلَمْ تَقُلْ إِلاَّ خَيْرًا، وَأَمَّا أُخْتُهَا حَمْنَةُ فَهَلَكَتْ فِيمَنْ هَلَكَ، وَكَانَ الَّذِي يَتَكَلَّمُ فِيهِ مِسْطَحٌ وَحَسَّانُ بْنُ ثَابِتٍ وَالْمُنَافِقُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ، وَهْوَ الَّذِي كَانَ يَسْتَوْشِيهِ وَيَجْمَعُهُ، وَهْوَ الَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ هُوَ وَحَمْنَةُ. قَالَتْ: فَحَلَفَ أَبُو بَكْرٍ أَنْ لاَ يَنْفَعَ مِسْطَحًا بِنَافِعَةٍ أَبَدًا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾ النور إِلَى آخِرِ الآيَةِ يَعْنِي أَبَا بَكْرٍ ﴿ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾ النور -يَعْنِي مِسْطَحًا - إِلَى قَوْلِهِ ﴿ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ النور حَتَّى قَالَ أَبُو بَكْرٍ: بَلَى، وَاللَّهِ يَا رَبَّنَا إِنَّا لَنُحِبُّ أَنْ تَغْفِرَ لَنَا، وَعَادَ لَهُ بِمَا كَانَ يَصْنَعُ[1].

(١) بڕوانە: ٢٥٩٣.

٤٧٥٧ - هیشامی کوڕی عوروه دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوە لە عائیشەوە ﵂ وتی: کاتێ باسی ئەو کارەی من کرا کەباسی کرا منیش پێم نەزانیبوو (ئاگادار نەبووم لێی)، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا دەربارەی من وتاری دا، جا شایەتومانی هێنا و سوپاس و ستایشی خوای کرد بەو جۆرە کە شیاوی بوو، پاشان فەرمووی: ((لەپاش ئەوە ڕای خۆتانم پێ بڵێن دەربارەی کەسانێك کارێکی خراپیان داوەتە پاڵ خێزانم، سوێند بەخوا هیچ خراپەیەکم لە خێزانم نەدیوە، وە تاوانباریان کردووە (بەزیناکردن) لەگەڵ کەسێکدا هەرگیز خراپەم لێ نەدیوە، وە هەرگیز نەهاتۆتە ماڵی من بە ئامادەبوونی خۆم نەبێ، وە لە هەر سەفەرێکیشدا من لە ماڵ نەبووم ئەویش لەگەڵمدا بووە لە ماڵ نەبووە))، ئەنجا سەعدی کوڕی موعاز هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگەم بدە کە بدەین لە گەردنی ئەو کەسانە [1] پیاوێکیش لە هۆزی خەزرەج هەستا و - کە دایکی حەسسانی کوڕی سابیت لە خزمانی ئەو پیاوە بوو - وتی: درۆ دەکەیت، سا سوێند بەخوا ئەگەر ئەو کەسانە لە هۆزی ئەوس بوونایە پێت خۆش نەبوو کە لە گەردنیان بدرێت (بوو بەشەڕە قسەیان) هەتا نزیك بوو لەمزگەوت دا شەڕو ئاژاوە لە نێوان ئەوس و خەزرەجدا دروست ببێ، (عائیشە دەڵێ) منیش نازانم وئاگام لێی نییە، جا کاتێ کە ئێوارەی ئەو ڕۆژە بوو، بۆ هەندێ پێویستی خۆم[2] لەماڵا ڕۆشتمە دەرەوە ئوممو میستەحیشم لەگەڵدا بوو قاچی هەڵکەوت وتی: کولۆڵ بیت میستەح منیش وتم: دایك چۆن قسە بە کوڕەکەی دەڵێ؟ ئەو بێدەنگ بوو، پاشان بۆ جاری دووەم قاچی هەڵکەوت (سەرسمی دا) وتی: کولۆڵ بیت میستەح منیش وتم: دایك چۆن قسە بە کوڕەکەی دەڵێ؟ جاری سێیەم قاچی هەڵکەوت و وتی: میستەح کولۆڵ بیت، منیش پیایدا هەڵشاخام، ئەویش وتی: وەڵڵا تەنها

---

(١) کە ئەمو بوهتانەیان کردووە بۆ خێزانت و ئەم پیاوە.

(٢) بۆ دەست بە ئاو گەیاندن.

لەسەر تۆ قسەی پێ دەڵێم: منیش وتم: دەربارەی چ شتێکی من؟ (عائیشە) وتی: ئیتر باسەکەی بۆ هەڵڕشتم، منیش وتم: بەڕاست شتی وا بووە؟ وتی: بەڵێ سوێند بەخوا، ئیتر گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆم ئەوەی بۆی ڕۆشتمە دەرەوە کەم و زۆر هەستم پێ نەکرد وەك نەبووبێ[1] وابوو، جا تام لێ هات وا دایگرتم، بە پێغەمبەری خوام ﷺ وت: بمنێرە بۆ ماڵ باوکم پێغەمبەریش ﷺ مێرد منداڵێکی لەگەڵدا ناردم ڕۆشتمە ژوورەوە بۆ ماڵ (ی باوکم)، جا ئوممو ڕۆمانم دی لە خوارەوە بوو ئەبو بەکریش ﷺ لەسەربان قورئانی دەخوێند، دایکم وتی: کچۆڵەکەم بۆچی هاتوویت؟ منیش هەواڵەکەم پێدا و باسەکەم بۆ گێڕایەوە، جا (هەستم کرد) کاریگەری هەواڵەکە لەسەری بەو ئەندازەی نییە کە لەسەر منە، ئینجا وتی: کچی خۆم ئەم کارە بەسووك بگرە (و قورسی مەکە لەسەر خۆت)، چونکە هەر وابووە سوێند بەخوا کەم وابووە ئافرەتێکی جوان بووبێ خێزانی پیاوێك بووبێ خۆشی ویستبێت و چەند هەوێ ی هەبووبێ، ئیللا حەسادەتیان پێ بردووە وە قسە لە بارەیەوە کراوە، جا (هەستم کرد) کاریگەری هەواڵەکە لەسەری بەو ئەندازە نییە کە لەسەر منە، وتم: بێگومان باوکم بەو هەواڵەی زانیوە؟ وتی: بەڵێ، وتم: پێغەمبەری خواش ﷺ (زانیویەتی)؟ وتی: بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ (زانیویەتی) فرمێسك بە چاومدا هاتە خوار و گریام، ئەبو بەکر کە لەسەربانی خانووەکە بوو قورئانی دەخوێند گوێی لەدەنگی گریانەکەم بوو هاتە خوارەوە بە دایکمی وت ئەوە چییەتی؟ (دایکم) وتی: ئەو هەواڵەی پێگەیشتووە لە بارەیەوە وتراوە بۆیە چاوەکانی بەخوڕ فرمێسکیان ڕشت، (ئەبو بەکر) وتی: ئەی کچی خۆم سوێندم خواردوە بەخوا کە دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ ماڵی خۆت، منیش گەڕامەوە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ هات بوو بۆ ماڵی من و

---

(١) مەبەستی لە غەمباریدا ئاگای لای دەست بە ناوگەیاندنەکە نەما و هەستی نەکرد پێویستی پێی هەبێ.

دەربارەی من پرسیاری لە خزمەتکارەکەم کردبوو، خزمەتکارەکەش وتبووی: نە سوێند بەخوا هیچ ناتەواوییەکم لێی نەدیوە جگە لەوەی کە (بەدیاری هەویرەکەیەوە) دەخەوت تا مەڕدەهات هەویرەکەی دەخوارد، یەکێ لە هاوەڵانی پیایا هەڵشاخا ووتی ڕاستی بە پێغەمبەری خوا ﷺ بڵێ تا بەڕوونی باسەکەیان پێ وتبوو [١]، خزمەتکارەکەش وتبووی پاکو بێگەردی بۆ خوا، سوێند بەخوا لە بارەیەوە هیچ نازانم مەگەر ئەوەی زەڕنگەر دەربارەی ئاڵتونی سوری ساغ دەیزانێت، هەواڵی ئەو کارە گەشتبوویەوە بەو پیاوە کە پێی وترابوو (ئەو کارەی کردووە) ئەویش وتبووی: پاك وبێ گەردی بۆ خوا وەڵلاهی هەرگیز پۆشاکی هچی ئافرەتێکم لانەبردووە[٢] عائیشە وتی: ئەو کەسە[٣] لە ڕێی خوا بەشەهیدی کوژرا.

(عائیشە) دەڵێ: جا دایك و باوکم بەیانییەك لای من بوون مانەوە تا پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام دوا ئەوەی نوێژی عەسری کردبوو، لە پاشان هاتە ژوورەوە لەوکاتەدا دایك و باوکم لای ڕاست و چەپمەوە بوون، جا سوپاس وستایشی خوای کرد و پاشان فەرمووی: جا دوا ئەوە ئەی عائیشە ئەگەر خراپەیەکت کردووە یان ستەمێکت کردووە ئەوە پەشیمان بەرەوە و بگەڕێرەوە بۆ لای خوا، چونکە بەڕاستی خوا تەوبە لەبەندەکانی گیرا دەکات)) (عائیشە) وتی: لەو کاتەدا ئافرەتێکی ئەنصاری هاتبوو لەبەر دەرگاکەدا دانیشتبوو منیش پێم وت: ئایا شەرم ناکەیت ئا لەو ئافرەتە کەشتێك باس دەکەیت[٤]، جا پێغەمبەری خوا دەستی کردە ئامۆژگاری کردن، منیش ئاوڕم دایەوە بەلای

---

(١) ئەو بوهتانەی کرابوو بۆ عائیشە رضي الله عنها.

(٢) واتە: لەگەڵیدا سەرجێیم نەکردووە بەحەرامی.

(٣) کە بوهتانی زینایان بۆ کرد لەگەڵ عائیشەدا رضي الله عنها.

(٤) تایبەت بەخێزانت.

باوكمدا پێم وت: وەڵامی بەرەوە، وتی: بڵێم چی؟ ئەنجا ئاورم دایەوە بەلای دایكمدا وتم: وەڵامی بەرەوە ئەویش وتی: بڵێم چی؟ جا كاتێ هیچ كامیان وەڵامیان نەدایەوە شایەتومانم هێنا و جاسوپاس وستایشی خوام كرد بەو شێوەی لەشایستەی ئەو بێت، لە پاشان وتم: لەپاش ئەوە: جا سوێند بەخوا ئەگەر پێتان بڵێم بەڕاستی من ئەو كارەم نەكردووە -وە خوا ﷻ شایەتی دەدات (دەزانێت) كە من ڕاست دەكەم - ئەوە لای ئێوە سوودی نییە بۆ من، سوێند بەخوا بە دڵنیاییەوە ئێوە ئەو باسەتان باس كردووە وە لە دڵتاندا چەسپیوە، ئەگەر من ئەو كارەم كردووە - وە خوا دەزانێت كەمن ئەو كارەم نەكردووە - بێگومان بە دڵنیاییەوە ئێوە دەڵێن، بەڕاستی دانی پێدانا كە ئەو كارەی كردووە، وە من سوێند بەخوا نموونەیەك نابینم بۆ خۆم و ئێوە - بە شوێن ناوی یەعقوبدا گەڕام دەست نەكەوت - جگە لەباوكی یوسف ﷺ كاتێ وتی: ( (كەوتی جا ئارام) دەگرم بەئارام گرتنێكی چاك و پەسەند، خواش یارمەتیدەرمە لەسەر ئەوەی باسی دەكەن.

هەر لەو ساتەدا نیگا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی ئەنجا بێدەنگ بووین، جا نیگا بۆ هاتنەكە تەواو بوو لەو كاتە پێ خۆش بوونم لە ڕووخساری پێغەمبەردا ﷺ دەبینی، كە (عەرەقی) لە ناوچەوانی دەسڕی و دەیفەرموو: ((موژدەت لێ بێ ئەی عائیشە، چونكە بێگومان خوا پاكێتی تۆی دابەزاند))، (عائیشە) وتی: من لەو كاتە و لە هەمووكات زیاتر تورە بووم، ئەنجا دایك و باوكم بەمنیان وت: هەستە برۆ بۆلای پێغەمبەر ﷺ منیش وتم: وەللاهی هەڵناسم و ناڕۆم بۆلای نە سوپاسی ئەو نە سوپاسی هەردووكتان (دایكی و باوكی) ناكەم، بەڵكو سوپاسی ئەو خوایە دەكەم كە پاكی و بەریبوونی منی دابەزاند (لەو تاوانەی درایە پاڵم)، سوێند بەخوا بێگومان ئێوە ئەو بوهتانەتان بیستبوو بەلام نكوڵیتان لێ نەكرد

و نەتان گۆڕی (نەچوون بەگژیدا)، وە عائیشە هەمیشە دەیوت: بەڵام زەینەبی کچی جەحش ئەو خوایە بەهۆی دیندارییەکەیەوە پاراستی، بۆیە جگە لە قسەی باش هیچی تری نەوت، بەڵام حەمنەی خوشکی (زەینەب) لەگەڵ ئەوانەدا بوو کە تیاچوون ئەویش تیاچوو، وە ئەوەی کە قسەی لەو بابەتەدا دەکرد میستەح و حەسسانی کوڕی سابیت و عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلولی دوو ڕوو بوو، کە ئەو دەگەڕا و بڵاوی دەکردەوە و کۆیدەکردەوە و هەر ئەوبوو لەناویاندا بەشی گەورەی ئەو بوهتانەی گرتە ئەستۆ عەبدوڵڵا و حەمنە بوون، (عائیشە) دەڵێ: ئەنجا ئەبو بەکر ﷺ سوێندی خوارد هەتا ماوە هیچ جۆرە سوود و قازانجێك بە میستەح نەگەیەنێت، ئەنجا خوا ﷻ بەو هۆیەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (با ئەوانەتان کە خاوەن چاکە و ماڵ و سامانن سوێند نەخۆن) تاکۆتایی ئایەتەکە، مەبەستی ئەبو بەکرە ﷺ (خاوەن ماڵ و سامانن کە یارمەتی بە خزمان و هەژاران نەدەن) مەبەستی میستەحە تا کۆتایی یەکەی (ئایا پێتان خۆش نییە خوا لێتان خۆش بێ، وە خوا لێخۆش بوو میهرەبانە) هەتا ئەبو بەکر ﷺ وتی: بەڵێ سوێند بەخوا پەروەردگارمان بێگومان پێمان خۆشە کە لێمان خۆش ببێ، ئیتر ئەبو بەکر گەڕایەوە بۆ هاوکاری کردنی میستەح بەو شێوەی کە پێشتر دەیکرد.

## ١٢ - بابٌ: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ ﴿٣١﴾﴾ النور

٤٧٥٨ - وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ شَبِيبٍ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ يُونُسَ قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: يَرْحَمُ اللَّهُ نِسَاءَ الْمُهَاجِرَاتِ الأُوَلَ، لَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ ﴿٣١﴾﴾ النور. شَقَّقْنَ مُرُوطَهُنَّ فَاخْتَمَرْنَ بِهِ[1].

---

(١) بڕوانە: ٤٧٥٩.

## ١٢ - باسێک: (وە با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسینگ و بەرۆکیاندا)

**٤٧٥٨ -عوروە لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: خوا ڕەحم بەئافەرەتە کۆچەرە یەکەمینەکان بکات، کاتێ خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند (وە با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسینگ و بەرۆکیاندا)، پشتەماڵەکانیان کرد بەدوو لەتەوە (کردیان بە سەرپۆش) سەرپۆشەکانیان دا بە سەر (سینگ وبەرۆك) یاندا.**

٤٧٥٩ - حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ نَافِعٍ، عَنِ الْحَسَنِ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ كَانَتْ تَقُولُ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ ﴿ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ﴿٣١﴾ ﴾ النور. أَخَذْنَ أُزْرَهُنَّ فَشَقَّقْنَهَا مِنْ قِبَلِ الْحَوَاشِي فَاخْتَمَرْنَ بِهَا[1].

**٤٧٥٩ -صەفییەی کچی شەیبە دەگێڕێتەوە کە عائیشە ﷺ هەمیشە دەیوت: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: (وەبا سەرپۆشەکانیان بدەن بەسینگ وبەرۆکیاندا) پشتەماڵەکانیان (پۆشاکەکانیان) هێنا و لە قەراغەکانیانەوە لێیان بڕی و لەتیان کرد و کردیانە سەرپۆش دایان بەسەر (و سینگ و بەرۆك) یاندا.**

---

(١) بڕوانە: ٤٧٥٨.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٢٥ - سورة الفُرْقَانِ

قَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾﴾ الفرقان: مَا تَسْفِي بِهِ الرِّيحُ. ﴿مَدَّ ٱلظِّلَّ ﴿٤٥﴾﴾ الفرقان: مَا بَيْنَ طُلُوعِ الفَجْرِ إلى طُلُوعِ الشَّمْسِ.﴿سَاكِنًا ﴿٤٥﴾﴾ الفرقان: دَائِمًا. ﴿عَلَيْهِ دَلِيلًا ﴿٤٥﴾﴾ الفرقان: طُلُوعُ الشَّمْسِ.﴿خِلْفَةً ﴿٦٢﴾﴾ الفرقان: مَنْ فَاتَهُ مِنَ اللَّيْلِ عَمَلٌ أَدْرَكَهُ بِالنَّهَارِ، أَوْ فَاتَهُ بِالنَّهَارِ أَدْرَكَهُ بِاللَّيْلِ. وَقَالَ الحَسَنُ:﴿هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ ﴿٧٤﴾﴾ الفرقان: فِي طَاعَةِ اللَّهِ، وَمَا شَيْءٌ أَقَرَّ لِعَيْنِ المُؤْمِنِ أَنْ يَرى حَبِيبَهُ فِي طَاعَةِ اللَّهِ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ثُبُورًا ﴿١٣﴾﴾ الفرقان: وَيْلًا. وَقَالَ غَيْرُهُ السَّعِيرُ مُذَكَّرٌ، وَالتَّسَعُّرُ وَالاِضْطِرَامُ: التَّوَقُّدُ الشَّدِيدُ. ﴿تُمْلَىٰ عَلَيْهِ ﴿٥﴾﴾ الفرقان: تُقْرَأُ عَلَيْهِ، مِنْ أَمْلَيْتُ وَأَمْلَلْتُ، (الرَّسُّ): المَعْدِنُ، جَمْعُهُ: رِسَاسٌ. ﴿مَا يَعْبَؤُا ﴿٧٧﴾﴾ الفرقان: يُقَالُ: مَا عَبَأْتُ بِهِ شَيْئًا: لَا يُعْتَدُّ بِهِ.﴿غَرَامًا ﴿٦٥﴾﴾ الفرقان: هَلاَكًا. وَقَالَ مُجَاهِدٌ:﴿وَعَتَوْ ﴿٢١﴾﴾ الفرقان: طَغَوْا. وَقَالَ ابن عُيَيْنَةَ:﴿عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾﴾ الحاقة: عَتَتْ عَنِ الخُزَّانِ.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٢٥ - (تەفسیری) سورەتی فورقان

-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿هَبَآءً مَّنثُورًا﴾ ئەوەی با پەرش و بڵاوی دەکات. ﴿مَدَّ ٱلظِّلَّ﴾ لە نێوان هەڵهاتنی سپێدەی بەیان تا هەڵهاتنی خۆر. ﴿سَاكِنًا﴾ بەوەستاوی، بە بەردەوامی. ﴿عَلَيْهِ دَلِيلًا﴾ هەڵهاتنی خۆر (مان کردە بەڵگەی

لەسەر بوونی سێبەر). ﴿ خِلۡفَةٗ ﴾ هەر کەس کردەوەیەکی لەشەودا لە کیس بچێت بەڕۆژدا دەیکاتەوە یان بەڕۆژدا لەکیسی بچێت بەشەودا دەیکاتەوە. حەسەن دەڵێ: ﴿ هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ ﴾ لەگوێڕایەڵی خوادا، هیچ شتێك نییە مایەی دڵخۆشی باوەڕدار بێت، زیاتر لەوەی کە خۆشەویستەکەی ببینێت و گوێڕایەڵی خوا دەکات.

ئیبنو عەبباس ﷺ وتی: ﴿ ثُبُورٗا ﴾هاوار تیاچوون. جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: السَّعِيرُ: وشەکە نێرە (التَّسَعُّرُ) و (الاِضْطِرَامُ) ئاگری هەڵگیرساوی بەهێزە. ﴿ تُمۡلَىٰ عَلَيۡهِ ﴾: بەسەریدا دەخوێنرێتەوە لە (أَمْلَيْتُ) و (أَمْلَلْتُ) وە وەرگیراوە. (الرَّسُّ): کانی کانزا کۆکەی: (رِسَاسٌ) کانەکان.

﴿ مَا يَعۡبَؤُاْ ﴾ دەوترێت: هیچ گوێی پێ نادەم (بەهیچی نازانم) بەهیچ نازانرێ و نرخی بۆدانانرێت. ﴿ غَرَامًا ﴾:لەناوچوون.

- موجاهید دەڵێ:﴿ وَعَتَوۡ ﴾سەرکێش بوون، وە ئیبنو عویەینە دەڵێ: ﴿ عَاتِيَةٖ ﴾ بایەکە (ئەوەندە بەهێز بوو) لە ژێر دەسەڵاتی فریشتەکانی تایبەت بە با دەرچوو بوو.

## ١ - بابُ قَوْلِه: ﴿ ٱلَّذِينَ يُحۡشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضَلُّ سَبِيلٗا ٣٤ ﴾ الفرقان

٤٧٦٠ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ الْبَغْدَادِيُّ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ قَتَادَةَ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ. أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، يُحْشَرُ الْكَافِرُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: «أَلَيْسَ الَّذِي أَمْشَاهُ عَلَى الرِّجْلَيْنِ فِي الدُّنْيَا قَادِرًا عَلَى أَنْ يُمْشِيَهُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟!». قَالَ قَتَادَةُ: بَلَى وَعِزَّةِ رَبِّنَا[1].

---

(١) بڕوانە: ٦٥٢٣.

## ١-باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەو کەسانەی کە بەسەر و ڕووخساریاندا دەبرێن (ڕادەکێشرێن) بۆ دۆزەخ، ئەوانە خراپترین جێگایان بۆ هەیە وە ڕێگاشیان ون کردووە (گومڕاترن)

**٤٧٦٠ -قەتادە دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ بۆی گێڕاینەوە کە پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کافر بەسەرو ڕووخساریدا دەبرێ (ڕادەکێشرێ) لە ڕۆژی قیامەتدا؟ فەرمووی: ((ئایا ئەو زاتەی لە دونیادا بەسەردوو پێدا بردوویەتی بەڕێگادا توانای نییە کە بەسەر ڕووخساریدا بیبات لە ڕۆژی قیامەتدا؟)) قەتادە وتی: بەڵێ دەتوانێ سوێند بە گەورەی پەروەردگارمان.**

## ٢ - بابُ قوْله: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾﴾ الفرقان

﴿أَثَامًا ﴿٦٨﴾﴾ الفرقان، العقوبة.

٤٧٦١ - حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْصُورٌ وَسُلَيْمَانُ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مَيْسَرَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ. قَالَ وَحَدَّثَنِي وَاصِلٌ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ - أَوْ سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَيُّ الذَّنْبِ عِنْدَ اللَّهِ أَكْبَرُ؟ قَالَ: «أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهْوَ خَلَقَكَ». قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ خَشْيَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ. قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «أَنْ تُزَانِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ». قَالَ: وَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ تَصْدِيقًا لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَ ﴿٦٨﴾﴾ الفرقان

## ٢ - باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ((وە بەندە تایبەتەکانی خوای میهرەبان) کەسانێکن کە هیچ پەرەستراوێکی تر لەگەڵ خوادا ناپەرەستن وە هیچ کەسێ کە خوا کوشتنی ئەوی یاساغ (حەرام) کردووە بە هەق و ڕەوا نەبێ ناکوژن وە زینا و داوێن پیسی ناکەن، وە هەرکەس ئەو تاوانانە بکات (کە باسکران) تووشی تۆڵە دێت)

﴿ أَثَامًا ﴾ تۆڵە و سزا.

٤٧٦١ -عەبدوڵڵا[1] ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد، یان پرسیار کرا - لە پێغەمبەری خوا ﷺ: کام تاوانە لای خوا گەورەترە؟ فەرمووی: ((ئەوەیە کە هاوشێوە بۆ خوا دانێیت کە ئەو (خوا) تۆی دروست کردووە))، وتم: لە پاشان چی تر (گەورەترە)؟ فەرمووی: ((پاشان ئەوەیە کە منداڵەکەت بکوژیت لە ترسی ئەوەی کە لەگەڵتدا خواردن بخوات))، وتم: لە پاشان چی تر (گەورەترە)؟ فەرمووی: ((ئەوەیە کە زینا بکەیت لەگەڵ هاوسەر و حەڵاڵی دراوسێکەت دا)).

(عەبدوڵڵا) وتی: ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی وەك پشت ڕاست کردنەوە بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ (وە (بەندە تایبەتەکانی خوای میهرەبان) کەسانێکن هیچ پەرەستراوێك لەگەڵ خوادا ناپەرەستن وە هیچ کەسێ کە خوا کوشتنی ئەوی یاساغ (حەرام) کردووە بە هەق و ڕەوا نەبێ ناکوژن، وە زینا و داوێن پیسی ناکەن).

٤٧٦٢ - حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَنَّ ابْنَ جُرَيْجٍ أَخْبَرَهُمْ قَالَ: أَخْبَرَنِي الْقَاسِمُ بْنُ أَبِي بَزَّةَ أَنَّهُ سَأَلَ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ هَلْ لِمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا مِنْ تَوْبَةٍ فَقَرَأْتُ

(١) ئەم فەرموودە دوو ڕێگەی هەیە کە پێی گێردراوەتەوە.

عَلَيْهِ: ﴿وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴿٦٨﴾﴾ الفرقان فَقَالَ سَعِيدٌ: قَرَأْتُهَا عَلَى ابْنِ عَبَّاسٍ كَمَا قَرَأْتَهَا عَلَيَّ. فَقَالَ: هَذِهِ مَكِّيَّةٌ نَسَخَتْهَا آيَةٌ مَدَنِيَّةٌ، الَّتِي فِي سُورَةِ النِّسَاءِ[1].

**٤٧٦٢ -هیشامی کوڕی یوسف گێڕایەوە کە ئیبنو جورەیج بۆی گێڕاینەوە وتی: قاسیمی کوڕی ئەبی بەززە بۆی گێڕانەوە کە پرسیاری لە سەعیدی کوڕی جوبەیر کرد: ئایا کەسێك بە دەستی ئەنقەست باوەڕدارێکی کوشتبێ تەوبەی بۆ هەیە؟ (قاسیم دەڵێ:) جا ئەم ئایەتەم بۆ خوێندەوە (وە هیچ کەسێ کە خوا کوشتنی ئەوی یاساغ (حەرام) کردووە بەهەق و ڕەوا نەبێ ناکوژن)، ئەنجا سەعید وتی: منیش ئەو ئایەتەم خوێندەوە بۆ ئیبنو عەبباس ﷺ وەك ئەوەی تۆخوێندتەوە بۆمن، (ئیبنو عەبباس) وتی: ئەم ئایەتە لە مەککە دابەزیوە ئەو ئایەتەی سوڕەتی (النِّسَاءِ) کە لە مەدینە دابەزیوە ئەوی نەسخ [2] کردۆتەوە.**

٤٧٦٣ - حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ النُّعْمَانِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ اخْتَلَفَ أَهْلُ الْكُوفَةِ فِي قَتْلِ الْمُؤْمِنِ، فَرَحَلْتُ فِيهِ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، فَقَالَ: نَزَلَتْ فِي آخِرِ مَا نَزَلَ وَلَمْ يَنْسَخْهَا شَيْءٌ[3].

**٤٧٦٣ -سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: خەڵکی کوفە ڕایان جیابوو دەربارەی کوشتنی باوەڕدار[4] (سەعید دەڵێ) منیش (بۆ پرسیار) لە بارەیەوە سەفەرم کرد بۆ لای ئیبنو عەبباس ﷺ، ئەنجا وتی: ئەو ئایەتە[5] لە کۆتاهەمین ئایەتەکان بووە کە دابەزیوە و هیچ شتێکیش نەیسڕیوەتەوە.**

---

(١) بڕوانە: ٣٨٥٥.

(٢) واتە: حوکمی ئایەتە مەککی یەکەی سڕیوەتەوە و کار بە ئایەتە مەدەنیەکە دەکرێت.

(٣) بڕوانە: ٣٨٥٥.

(٤) بە ئەنقەست کەسێ بکوژێ ئایا تەوبەی لێ وەردەگیرێ یا نا؟.

(٥) سوڕەتی النِّسَاءِ (وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا..).

٤٧٦٤ - حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا مَنْصُورٌ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴿٩٣﴾ ﴾ النساء.قَالَ: لاَ تَوْبَةَ لَهُ. وَعَنْ قَوْلِهِ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴿٦٨﴾ ﴾ الفرقان قَالَ كَانَتْ هَذِهِ فِي الجَاهِلِيَّةِ[1].

**٤٧٦٤ -سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: پرسیارم لە ئیبنو عەبباس ﷺ کرد دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە)، وتی: تەوبەی بۆ نییە (لێی قەبوڵ ناکری). وە پرسیارم لێ کرد دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند (وە کەسانێکن لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن)، وتی: ئەم ئایەتە دەربارەی لە سەردەمی نەفامی (کافرانی قوڕەیش)ـدا بوو.**

## ٣ - بابٌ قوْله: ﴿ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ ﴾ الفرقان

٤٧٦٥ -حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ حَفْصٍ،حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ قَالَ ابْنُ أَبْزَى سُئِلَ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴿٩٣﴾ ﴾ النساء. وَقَوْلِهِ: ﴿ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴿٦٨﴾ ﴾ الفرقان حَتَّى بَلَغَ ﴿ إِلَّا مَن تَابَ ﴿٧٠﴾ ﴾ الفرقان.فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ قَالَ أَهْلُ مَكَّةَ: فَقَدْ عَدَلْنَا بِاللَّهِ وَقَتَلْنَا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَأَتَيْنَا الْفَوَاحِشَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الفرقان: إِلَى قَوْلِهِ ﴿ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الفرقان.

---

(١) بڕوانە: ٣٨٥٥.

# ٣ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (لە ڕۆژی قیامەت دا سزای بۆ چەند بارە دەکرێتەوە و بێ بڕانەوە بە بێ ڕێز و ریسوایی لە دۆزەخ دا دەمێنێتەوە)

٤٧٦٥ -سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: ئیبنو ئەبزا وتی: ئیبنو عەبباس ﷺ پرسیاری لێ کرا[1] دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە هەر کەسێك باوەڕدارێك بەدەس ئەنقەس بکوژێت، ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە)، هەروەها ئەم فەرمایشتەش (وە هیچ کەسێ کە خوا کوشتنی ئەوی یاساغ (حەرام) کردووە بەهەق و ڕەوا نەبێ ناکوژن)، هەتا گەشتە (بێجگە لە کەسێ تەوبەی کردبێ)، (سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ:) منیش پرسیارم (لە ئیبنو عەبباس) کرد ئەویش وتی: کاتێ ئەم ئایەتە[2] دابەزی خەڵکی مەککە وتیان: بێگومان ئێمە هاوبەشمان بۆ خوا داناوە وە کەسانێکمان کوشتووە کەخوا کوشتنیانی حەرام کردووە مەگەر بەهەق و ڕەوا وە بەدرەوشتیمان کردووە، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (بێجگە لە کەسێ تەوبەی کردبێ و باوەڕی هێنابێ وکار و کردەوەی چاکیشی کردبێت)، تا گەشتە ( (خوا) لێبوردەی بەبەزەییە).

## ٤ - بابٌ: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الفرقان

٤٧٦٦ - حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا أَبِي، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: أَمَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبْزَى أَنْ أَسْأَلَ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ هَاتَيْنِ الآيَتَيْنِ ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا

---

(١) ئەم پرسیار کردنە بە شێوەی تریش هاتووە وەك: کە پرسیاری کرد، یان پرسیار بکە.

(٢) سورەتی فورقان، (وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ..)

مُتَعَمِّدًا ﴿٩٣﴾ ﴾ النساء. فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: لَمْ يَنْسَخْهَا شَيْءٌ. وَعَنْ: ﴿ وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴿٦٨﴾ ﴾ الفرقان،[1] قَالَ: نَزَلَتْ فِي أَهْلِ الشِّرْكِ.

## ٤ - باسێک: (بێجگە لە کەسێ تەوبەی کردبێ و باوەڕی هێنابێ و کار و کردەوەی چاکیشی کردبێت، ئا ئەوانە خوا خراپە و تاوانەکانیان دەگۆڕێت بە چاکە، وە خوا لێبوردەی بەزەییە)

**٤٧٦٦ - سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزا فەرمانی پێکردم کە پرسیار لە ئیبنو عەبباس ﷺ بکەم دەربارەی ئەم دوو ئایەتە (وە هەر کەسێك باوەڕدارێك بەدەس ئەنقەس بکوژێت) جاپرسیارم لێ کرد، ئەویش وتی: هیچ شتێك نەیسڕیوەتەوە (نەسخی نەکردۆتەوە)، وە دەربارەی ئەم ئایەتەش (پرسیارم لێ کرد): (وە کەسانێك کە لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن)، وتی: ئەو دەربارەی خەڵکی بتپەرست دابەزی.**

### ٥ - **بابٌ:** ﴿ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا ﴿٧٧﴾ ﴾ الفرقان

﴿ لِزَامًا ﴿٧٧﴾ ﴾ الفرقان هَلَكَةً.

٤٧٦٧ - حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: خَمْسٌ قَدْ مَضَيْنَ الدُّخَانُ وَالْقَمَرُ وَالرُّومُ وَالْبَطْشَةُ وَاللِّزَامُ ﴿ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا ﴿٧٧﴾ ﴾ الفرقان[1].

---

(١) بڕوانە: ٣٨٥٥.

## ٥ - باسێک: (ئەوە بەزووی تۆڵەکەی یەختان دەگرێ و لێتان جیا نابێتەوە)

﴿ لِزَامًا ﴾ تیاچون.

٤٧٦٧ -مەسروق دەڵێ: عەبدوڵلا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ وتی: پێنج (لە نیشانەکانی هاتنی قیامەت) ڕوویان داوە تێپەڕیوون: دوکەڵەکە [٢] و، (لەت بوونی) مانگ [٣] و (سەرکەوتنی) ڕۆمەکان [٤] و پەلامارەکە [٥] و (تۆڵەی) تووش هاتوو (تیاچوونی کافران لەبەدردا یان لە قیامەتدا) [٦]، ﴿ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا ﴿٧٧﴾ ﴾ واتە: (ئەوە بەزوویی تۆڵەکەی یەختان دەگرێ و لێتان جیا نابێتەوە).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ٢٦ - ومن سورة الشُّعَرَاء

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ الشعراء: تَبْنُونَ ﴿ هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ ﴾ الشعراء: يَتَفَتَّتُ إِذَا مُسَّ مُسَحَّرِينَ المَسْحُورِينَ. لَيْكَة و ﴿ لَئَيْكَةِ ﴿١٧٦﴾ ﴾ الشعراء: جَمْعُ أَيْكَةٍ، وَهْي جَمْعُ

---

(١) بروانە: ١٠٠٧.

(2) مەبەستی ئەم ئایەتەیە: ﴿ فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴾ الدخان:١٠.

(3) ئەم ئایەتەیە: ﴿ اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ﴾ القمر:١.

(4) .مەبەستی ئەم دوو ئایەتەیە: ﴿ الم غُلِبَتِ الرُّومُ ﴾ الروم: ١ - ٢

(٥) مەبەستی ئەم ئایەتەیە: ﴿ يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَىٰ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴾ الدخان: ١٦.

(٦) مەبەستی ئەم ئایەتەیە: ﴿ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا ﴾ الفرقان: ٧٧.

شَجَرٍ. ﴿ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ﴿١٨٩﴾ ﴾ الشعراء: إِظْلَالُ العَذَابِ إِيَّاهُمْ. ﴿ مَّوْزُونٍ ﴿١٩﴾ ﴾ الحجر: مَعْلُومٍ.﴿ كَٱلطَّوْدِ ﴿٦٣﴾ ﴾ الشعراء: الجَبَلِ. الشِّرْذِمَةُ طَائِفَةٌ قَلِيلَةٌ ﴿ فِى ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ ﴾ الشعراء: المُصلِّينَ.قَالَ ابن عَبَّاسٍ ﴿ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ ﴾ الشعراء: كَأَنَّكُمْ. الرِّيعُ الأَيْفَاعُ مِنَ الأَرْضِ وَجَمْعُهُ رِيعَةٌ وَأَرْيَاعٌ، وَاحِدُ الرِّيَعَةِ ﴿ مَصَانِعَ ﴿١٢٩﴾ ﴾ الشعراء: كُلُّ بِنَاءٍ فَهْوَ مَصْنَعَةٌ ﴿ فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ ﴾ الشعراء: مَرِحِينَ، فَارِهِينَ بِمَعْنَاهُ وَيُقَالُ ﴿ فَٰرِهِينَ ﴾: حَاذِقِينَ ﴿ تَعْثَوْا ﴿١٨٣﴾ ﴾ الشعراء: أَشَدُّ الفَسَادِ عَاثَ يَعِيثُ عَيْثًا.﴿ وَٱلْجِبِلَّةَ ﴿١٨٤﴾ ﴾ الشعراء: الخَلْقُ، جُبِلَ خُلِقَ، وَمِنْهُ جُبُلًا وَجِبِلًا وَجُبْلًا، يَعْنِي الخَلْقَ. قاله ابن عَبَّاسٍ.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٢٦ - (تەفسیری) سورەتی شوعەرا

**-موجاهید دەڵێ: ﴿ تَعْبَثُونَ ﴾ دروستی دەکەن (بەبێ هوودە). ﴿ هَضِيمٌ ﴾ کاتێ دەستی لێ بدرێت ورد دەبێت. (مُسَحَّرِينَ) جادولێکراوان (لَيْكَةُ) و ﴿ لْـَٔيْكَةِ ﴾ کۆی (أَيْكَةٍ) یە، وە کۆی درەختە. ﴿ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ﴾ واتە: سێبەر کردنی سزاکە بۆیان.﴿ مَّوْزُونٍ ﴾ (بە ئەندازەیەکی) دیاری کراو. ﴿ كَٱلطَّوْدِ ﴾ شاخ و کێو. (الشِّرْذِمَةُ): دەستەیەکی کەمی بچووك. ﴿ فِى ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾ نوێژخوێنان. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ ﴿ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴾ وە ك ئەوەی ئێوە (هەتا هەتای بن). (الرِّيعُ): شوێنی بەرز لەزەویدا، کۆکەشی: (رِيعَةٌ) بەڵام ( أَرْيَاعٌ) کۆی (الرِّيَعَةِ)ـە.﴿ مَصَانِعَ ﴾ هەموو خانوویەك پێی دەوترێت (مَصْنَعَةٌ). ﴿ فَٰرِهِينَ ﴾ کەیفخۆشەکان، دڵخۆشەکان (فارهين): هەربەمانای (فارهين)ـە واتە: کەیفخۆشەکان، وە دەشوترێت: ﴿ فَٰرِهِينَ ﴾ شارەزا و کارامە و چابووکەکان. ﴿**

تَعۡثَوۡاْ﴾ خراپترینی خراپە و گەندەڵی (عَاثَ يَعِيثُ عَيْثًا)[1]. ﴿وَٱلۡجِبِلَّةَ﴾ خەڵك، دروستكراو، دەستە و كۆمەڵ. ( جُبِلَ): دروستكراوە، هەر لەم ڕیشەوە و مانایە: (جُبُلًا) و (جِبِلًا) و (جُبْلًا) واتە: خەڵك و دروستكراو. ئیبنو عەبباس ﷺ ئەمەی وتووە.

١ - بابٌ: ﴿وَلَا تُخۡزِنِي يَوۡمَ يُبۡعَثُونَ ﴿٨٧﴾﴾ الشعراء

٤٧٦٨ - وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ طَهْمَانَ: عَنِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ إِبْرَاهِيمَ يرى أَبَاهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَيْهِ الْغَبَرَةُ وَالْقَتَرَةُ»[2]. قال: الْغَبَرَةُ هي الْقَتَرَةُ.

## ١ - باسێک: (وە شەرمەزار و ڕیسوام مەکە لە ڕۆژێکدا کە (خەڵکی) زیندوو دەکرێنەوە)

٤٧٦٨ ـئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:((بەڕاستی ئیبراهیم ﷺ لە ڕۆژی قیامەت دا باوکی دەبینێ تەپوتۆز و ڕەشی بە ڕووخساریەوە[3] یە))، (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) وشەی (الْغَبَرَةُ) و (الْقَتَرَةُ) یەکێکن و یەك مانایان هەیە کە: تەپۆتز و ڕەشییە.

٤٧٦٩ - حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنَا أَخِي، عَنِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَلْقَى إِبْرَاهِيمُ أَبَاهُ فَيَقُولُ يَا رَبِّ إِنَّكَ وَعَدْتَنِي أَنْ لاَ تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ فَيَقُولُ اللَّهُ إِنِّي حَرَّمْتُ الْجَنَّةَ عَلَى الْكَافِرِينَ»[4].

---

(١) ئەو سێ وشەیە (عَاثَ) کاری ڕابردووە (يَعِيثُ) کاری ڕانەبردووە (عَيْثًا) چاوگە.

(٢) بڕوانە: ٣٣٥٠.

(٣) لە فەرموودەی ژمارە (٣٣٥٠)ی بوخاری دا هاتووە.

(٤) بڕوانە: ٣٣٥٠.

**٤٧٦٩ -ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمووی: ((ئیبراهیم ﷺ (لە ڕۆژی قیامەتدا)[1] بە باوکی دەگات، ئەنجا (ئیبراهیم) دەڵێ: ئەی پەروەردگارم بێگومان تۆ بەڵێنت پێدام لەو ڕۆژەدا (خەڵکی) زیندوو دەکرێنەوە سەرشۆڕم نەکەیت، ئەنجا خواش دەفەرموێ: بێگومان من (چوونە) بەهەشتم لەسەر کافران حەڕام کردووە)).**

## ٢ - بابُ قَوْلِه: ﴿ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ ﴿٢١٥﴾ ﴾ الشعراء

﴿ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ ﴿٢١٥﴾ ﴾ الشعراء أَلِنْ جَانِبَكَ.

٤٧٧٠ - حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ الشعراءصَعِدَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى الصَّفَا فَجَعَلَ يُنَادِي: «يَا بَنِي فِهْرٍ، يَا بَنِي عَدِيٍّ». لِبُطُونِ قُرَيْشٍ حَتَّى اجْتَمَعُوا، فَجَعَلَ الرَّجُلُ إِذَا لَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يَخْرُجَ أَرْسَلَ رَسُولاً لِيَنْظُرَ مَا هُوَ، فَجَاءَ أَبُو لَهَبٍ وَقُرَيْشٌ فَقَالَ: «أَرَأَيْتَكُمْ لَوْ أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ خَيْلاً بِالْوَادِي تُرِيدُ أَنْ تُغِيرَ عَلَيْكُمْ، أَكُنْتُمْ مُصَدِّقِيَّ؟». قَالُوا: نَعَمْ، مَا جَرَّبْنَا عَلَيْكَ إِلاَّ صِدْقًا. قَالَ: «فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ». فَقَالَ أَبُو لَهَبٍ: تَبًّا لَكَ سَائِرَ الْيَوْمِ، أَلِهَذَا جَمَعْتَنَا؟! فَنَزَلَتْ ﴿ تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ ﴾ المسد[2].

---

(١) ئەم زیادەیە لە گێڕانەوەیەکی تری بوخاری دا هاتووە بە ژمارە (٣٣٥٠)

(٢) بڕوانە: ١٣٩٤.

## ٢ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە خزم و کەسە نزیکەکانت بترسێنە و باڵی بەزەیی و نەرم و نیانیت راخە)

﴿ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ ﴾هێمن و لەسەرخۆبە، نەرم و نیان بە.

٤٧٧٠ -ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی (وە خزم وك مسە نزیکەکانت بترسێنە) پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە سەر کێوی صەفا بانگی دەکرد و (دەیووت): ((ئەی بەنی فیهر ئەی بەنی عەدیی)) - بانگی تیرەکانی قورەیشی دەکرد - هەتا هەموو کۆبوونەوە، بەجۆرێك پیاوێ نەیتوانیایە خۆی بێت کەسێکی دەنارد بزانێ ئەو باسە چییە، ئەنجا ئەبو لەهەب و قورەیشیەکان هاتن پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((پێم بڵێن ئەگەر هەواڵتان پێ بدەم بێگومان کۆمەڵێ سوار لەو شێوەدا دەیانەوێ لەناکاو بدەن بەسەرتاندا، ئایا ئێوە باوەڕم پێ دەکەن؟ )) وتیان: بەڵێ، چونکە ئێمە جگە لە ڕاستی هیچمان لە تۆ نەدیوە، فەرمووی: (( دەی بەڕاستی من ئاگادارکەرەوەی ئێوەم پێش (هاتنی) سزای سەخت (ی قیامەت) ))، جا ئەبو لەهەب وتی: تیاچوون بۆ تۆ هەتا هەتایە (هەموو ڕۆژەکە) ئابۆ ئەمە ئێمەت کۆکردەوە؟ ئیتر بەو هۆیەوە ئەم سوڕەتە دائەبەزێ: ﴿ تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ٢ ﴾ المسد واتە: لەناوچێ هەردوو دەستی ئەبو لەهەب وە لە ناویش چوو، سوودی پێ نەگەیاند دارایی یەکەی و ئەوەی کەکردی (لەدوژمنایەتی پێغەمبەردا ﷺ) ).

٤٧٧١ - حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، وَأَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ أَنْزَلَ اللَّهُ:﴿ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ٢١٤ ﴾ الشعراء: قَالَ: «يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ -أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا - اشْتَرُوا

أَنْفُسَكُمْ، لاَ أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، لاَ أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، يَا عَبَّاسُ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، لاَ أُغْنِي عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، وَيَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللَّهِ، لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَيَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَلِينِي مَا شِئْتِ مِنْ مَالِي، لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا». تَابَعَهُ أَصْبَغُ عَنِ ابْنِ وَهْبٍ عَنْ يُونُسَ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ[1].

**٤٧٧١ ـ ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێ خوای گەورە ئەم ئایەتەی:﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ الشعراء دابەزاند، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و فەرمووی: ((ئەی کۆمەڵی قورەیش - یا وشەیەکی لەوشێوە - خۆتان بکڕنەوە [2] من لە بەرانبەر خوادا هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنم، ئەی بنەماڵەی عەبدی مەناف من لە بەرانبەر خوادا ناتوانم هیچ سوودێکتان پێ بگەیەنم، ئەی عەبباسی کوڕی عەبدولموتتەلیب من لە بەرانبەر خوادا هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنم، وەئەی صەفیەی پوری پێغەمبەری خوا من لە بەرانبەر خوادا هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنم، وە ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد ئەوەی دەتەوێ لەسامان داوای کە لێم، بەڵام لە بەرانبەر خوادا هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنم)).**

**ئەصبەغ ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە ئیبنو وەهبەوە لە یونوسەوە لە ئیبنو شیهابەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئەبو لیەمان دەکات.**

---

(١) بڕوانە: ٢٧٥٣.

(٢)) خۆتان ڕزگارکەن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٢٧ - سورة النَّمْلِ

وَالْخَبْءُ مَا خَبَأْتَ. ﴿ لَا قِبَلَ ﴿٣٧﴾ ﴾ النمل: لَا طَاقَةَ. (الصَّرْحُ) كُلُّ مِلَاطٍ اتُّخِذَ مِنَ الْقَوَارِيرِ، وَالصَّرْحُ الْقَصْرُ، وَجَمَاعَتُهُ صُرُوحٌ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ:﴿ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ ﴾ النمل: سَرِيرٌ كَرِيمٌ حُسْنُ الصَّنْعَةِ، وَغَلَاءُ الثَّمَنِ. ﴿ مُسْلِمِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾ النمل: طَائِعِينَ. ﴿ رَدِفَ ﴿٧٢﴾ ﴾ النمل اقْتَرَبَ.﴿ جَامِدَةً ﴿٨٨﴾ ﴾ النمل: قَائِمَةً ﴿ أَوْزِعْنِيٓ ﴿١٩﴾ ﴾ النمل: اجْعَلْنِي. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ نَكِّرُواْ ﴿٤١﴾ ﴾ النمل: غَيِّرُوا. والقبسُ:ما اقتبستَ منهُ النارُ ﴿ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ ﴿٤٢﴾ ﴾ النمل: يَقُولُهُ سُلَيْمَانُ.﴿ ٱلصَّرْحَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النمل: بِرْكَةُ مَاءٍ ضَرَبَ عَلَيْهَا سُلَيْمَانُ قَوَارِيرَ، أَلْبَسَهَا إِيَّاهُ.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٢٧ - (تەفسیری) سورەتی نەمل

**(الْخَبْءُ):ئەوەی شاردۆتەوە. ﴿ لَا قِبَلَ ﴾ لە توانادا نییە، دەرەقەتی نایە. (الصَّرْحُ):هەر جێگایەکە بەشوشەی ڕوون داپۆشرابێ، و (الصَّرْحُ):کۆشك كە کۆکەی (صُرُوحٌ) واتە: کۆشکەکان.**

**- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴾: وە تەختێکی (پادشای) گەورەی هەیە جوان دروست کراوی گران بەهایە. ﴿ مُسْلِمِينَ ﴾ گوێڕایەڵ، فەرمان بەرداران. ﴿ رَدِفَ ﴾ نزیك بۆتەوە. ﴿ جَامِدَةً ﴾ وەستاوە و ناجوڵێت. ﴿**

﴿ أَوْزِعْنِيٓ ﴾: وام لێ بکه، بمکەرە. موجاهید دەڵێ: ﴿ نَكِّرُوا۟ ﴾ بیگۆڕن. (القبسُ): ئەو ئاگر و گڕەی تۆ جلۆسکێکی لێ دەهێنیت. ﴿ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ ﴾ سولەیمان وا دەڵێ: زانستمان پێدراوە ﴿ ٱلصَّرْحَ ﴾ حەوزێکی گەورەی ئاوە بە شووشە سەری گیراوە و خراوەتە سەر ئاوەکە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٢٨ - سورة القصص

﴿ كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ﴿٨٨﴾ ﴾ القصص: إِلَّا مُلْكَهُ، وَيُقَالُ: إِلَّا مَا أُرِيدَ بِهِ وَجْهُ اللَّهِ.

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ ٱلْأَنۢبَآءُ ﴿٦٦﴾ ﴾ القصص: الحُجَجُ.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٢٨ - (تەفسیری) سوڕەتی قەصەص

﴿ كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ﴾: جگە لە دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتی (خوای گەورە)، وە دەوترێت تەنها دەمێنێت مەبەستی پێی: (وَجْهُ اللَّهِ). موجاهید دەڵێ: ﴿ ٱلْأَنۢبَآءُ ﴾ بەڵگەکان.

١ - **بابُ قَوْله:** ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾ القصص

٤٧٧٢ - حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الْوَفَاةُ جَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَوَجَدَ عِنْدَهِ أَبَا جَهْلٍ وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أُمَيَّةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، فَقَالَ: «أَيْ عَمِّ قُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، كَلِمَةً أُحَاجُّ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ». فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ: أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ؟! فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعْرِضُهَا عَلَيْهِ، وَيُعِيدَانِهِ بِتِلْكَ الْمَقَالَةِ حَتَّى قَالَ أَبُو طَالِبٍ آخِرَ مَا كَلَّمَهُمْ: عَلَى مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَأَبَى أَنْ يَقُولَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «وَاللَّهِ لأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ مَا لَمْ أُنْهَ عَنْكَ». فَأَنْزَلَ اللَّهُ:

﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن يَسْتَغْفِرُوا۟ لِلْمُشْرِكِينَ ﴿١١٣﴾ ﴾ التوبة: وَأَنْزَلَ اللَّهُ فِي أَبِي طَالِبٍ، فَقَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴿٥٦﴾ ﴾ القصص[1].

## ١ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (بەڕاستی (ئەی موحەممەد ﷺ) تۆ ناتوانی ئەو کەسەی خۆشت بوێ ڕێنموونی بکەیت بەڵام خوا هەر کەسی بوێ ڕێنموونی دەکات)

**٤٧٧٢ - سەعیدی کوڕی موسەییەب لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: کاتێ ئەبو تاڵیب لەسەرەمەرگدا بوو پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆلای و بینی ئەبو جەهل و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئومەییەی کوڕی موغیرەی لەلایە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی مامە بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) بەم وشەیە شایەتیت بۆ دەدەم لای خوا (لە ڕۆژی دوایی دا) ))، ئینجا ئەبو جەهل وعەبدوڵڵای کوڕی ئەبو**

(١) بروانە: ١٣٦٠.

**ئومەییە وتیان: ئەی ئەبو تاڵیب ئایا وازدێنی لە ئایینی عەبدولموتەلیب ؟! ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام وتنی ئەو وشەیەی بۆ پێشنیار دەکرد، ئەبو جەهل و عەبدوڵلاش قسەکەی پێشوویان بۆ دووبارە دەکردەوە، هەتا ئەبو تاڵیب لەکۆتا قسەی کردی لەگەڵیاندا وتی: ئەو لەسەر ئایینی عەبدولموتەلیبە. وە ڕازی نەبوو بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەخوا هەر داوای لێبوردنت بۆ دەکەم لەخوا تا ڕێگری نەکرێ لێم))، ئەنجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (ڕەوا و شایستە نییە بۆ پێغەمبەر و باوەڕداران کە داوای لێبووردن بۆ هاوبەش پەیداکەران بکەن)، وە دەربارەی ئەبو تاڵیب ئایەتی دابەزاند بە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرمووی (بەڕاستی (ئەی موحەممەد) تۆ ناتوانی ئەو کەسە خۆشت بوێ ڕێنموونی بکەیت، بەڵام خوا هەرکەسی بوێ ڕێنموونی دەکات).**

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﴿أُوْلِي ٱلْقُوَّةِ ﴿٧٦﴾﴾ القصص: لا يَرْفَعُهَا الْعُصْبَةُ مِنَ الرِّجَالِ. ﴿لَتَنُوٓأُ ﴿٧٦﴾﴾ القصص: لَتُثْقِلُ. ﴿فَـٰرِغًا ﴿١٠﴾﴾ القصص: إِلاَّ مِنْ ذِكْرِ مُوسَى. ﴿ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾﴾ القصص: الْمَرِحِينَ. ﴿قُصِّيهِ ﴿١١﴾﴾ القصص: اتَّبِعِي أَثَرَهُ، وَقَدْ يَكُونُ أَنْ يَقُصَّ الْكَلاَمَ. ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ ﴿٣﴾﴾ يوسف: ﴿عَن جُنُبٍ ﴿١١﴾﴾ القصص عَنْ بُعْدٍ عَنْ جَنَابَةٍ وَاحِدٌ، وَعَنِ اجْتِنَابٍ أَيْضًا، ﴿يَبْطِشَ ﴿١٩﴾﴾ القصص: وَيَبطُشُ. ﴿يَأْتَمِرُونَ ﴿٢٠﴾﴾ القصص: يَتَشَاوَرُونَ. الْعُدْوَانُ وَالْعَدَاءُ وَالتَّعَدِّى وَاحِدٌ. ﴿ءَانَسَ ﴿٢٩﴾﴾ القصص: الْجِذْوَةُ: قِطْعَةٌ غَلِيظَةٌ مِنَ الْخَشَبِ لَيْسَ فِيهَا لَهَبٌ، وَالشِّهَابُ: فِيهِ لَهَبٌ. وَالْحَيَّاتُ أَجْنَاسٌ الْجَانُّ وَالأَفَاعِي وَالأَسَاوِدُ. ﴿رِدْءًا ﴿٣٤﴾﴾ القصص: مُعِينًا. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: ﴿يُصَدِّقُنِيٓ ﴿٣٤﴾﴾ القصص: وَقَالَ غَيْرُهُ ﴿سَنَشُدُّ ﴿٣٥﴾﴾ القصص: سَنُعِينُكَ كُلَّمَا عَزَّزْتَ شَيْئًا فَقَدْ جَعَلْتَ لَهُ عَضُدًا. مَقْبُوحِينَ: مُهْلَكِينَ. ﴿وَصَّلْنَا ﴿٥١﴾﴾ القصص بَيَّنَّاهُ وَأَتْمَمْنَاهُ. ﴿يُجْبَىٰٓ ﴿٥٧﴾﴾

القصص يُجْلَبُ. ﴿ بَطِرَتْ ﴿٥٨﴾ ﴾ القصص أَشِرَتْ. ﴿ فِيٓ أُمِّهَا رَسُولًا ﴿٥٩﴾ ﴾ القصص، أُمُّ القُرى مَكَّةُ وَمَا حَوْلَهَا. ﴿ تُكِنُّ ﴿٦٩﴾ ﴾ القصص: تُخْفِي. أَكْنَنْتُ الشَّيْءَ: أَخْفَيْتُهُ، وَكَنَنْتُهُ: أَخْفَيْتُهُ وَأَظْهَرتُهُ. ﴿ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ ﴿٨٢﴾ ﴾ القصص، مِثْلُ: أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَقْدِرُ يُوَسِّعُ عَلَيْهِ وَيُضَيِّقُ عَلَيْهِ.

**-ئيبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ أُوْلِي ٱلْقُوَّةِ ﴾: (كليلى گەنجينەكانى قارون) كۆمەڵێ پياو (ى بەهێز) بۆيان بەرز نەدەكرايەوە و هەڵندەگيرا. ﴿ لَتَنُوٓأُ ﴾ قورس دەبێت، شەكەت و ماندوو دەكات. ﴿ فَرِغًا ﴾ (خاڵى بو لە هەموو شتێك) جگە باس و خواسى مووسا ﷺ. ﴿ ٱلْفَرِحِينَ ﴾: دڵخۆشان و لەخۆبايى بووان ﴿ قُصِّيهِ ﴾ بەشوێنيدا برۆ، هەندێ جار بۆ شوێنكەوتنى قسە و گێڕانەوەيەتى. ﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ ﴾ واتە: ئێمە بۆت دەگێڕينەوە. ﴿ عَن جُنُبٍ ﴾: لە دوورەوە (عَنْ جَنَابَةٍ): هەمان ماناى هەيە. (عَنِ اجْتِنَابٍ) هەر وايە. ﴿ يَبْطِشَ ﴾[1] لەگەڵ (يَبْطُشُ) واتە: پەلاماردان و لێدان. ﴿ يَأْتَمِرُونَ ﴾: ڕاوێژ دەكەن لە نێوان خۆياندا. (الْعُدْوَانُ) لەگەڵ (الْعَدَاءُ) و (التَّعَدِّى) يەكن و هەمان مانايان هەيە كە بريتين لە زوڵم و ستەم. ﴿ ءَانَسَ ﴾: بينى، (هەستى پێ كرد). (الْجِذْوَةُ): پارچە دارێكى ئەستوور كەئاگر و گڕى پێوە نەبێت، (الشِّهَابُ) ئاگر و گڕى پێوەبێت. (الْحَيَّاتُ):چەن جۆرێكن: (الْجَانُّ) (مارێكى باريكى سوكەڵەيە لەناو ماڵ و خانوودايە) (الأَفَاعِي) (كۆى (أفعى) يە مارێكى ژەهردارى پيسە ملى باريكە و سەرى پانە لە كەلاوە وێرانەدا دەژى). (الأَسَاوِدُ) (كۆى (أسودَ) (مارێكى گەورەيە**

---

(١) يەكەم جگە لە ئەبو جەعفەر هەموو قورئان خوێنان بەم جۆرە خوێندويانەتەوە (يَبْطِش) بەلام ئەبو جەعفەر بە: (يبْطُش) خوێندويەتيەوە.

ڕەنگی ڕەشی تیایە).﴿ رِدْءًا ﴾: پشتیوان، یارمەتیدەر. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ يُصَدِّقُنِيٓ ﴾: وتەكانم بسەلمێنی[١].

- جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: ﴿ سَنَشُدُّ ﴾ بێگومان بەهێزت دەكەین (بەبراكەت)، هەر شتێك بەهێز بكەیت ئەو بێگومان باسكت پێداوە[٢]. (مَقْبُوحِينَ):لەناوچووان (دوور خراوان).

﴿ سَنَشُدُّ ﴾ ڕوونمان كردەوە و تەواومان كرد (یەك بەدوای یەكدا ناردمانە خوارەوە). ﴿ يُجْبَىٓ ﴾: بۆی دەهێنرێت.

﴿ بَطِرَتْ ﴾: لەبەر خۆشگوزەرانی یاخی بوو. ﴿ فِىٓ أُمِّهَا رَسُولًا ﴾: (أُمُّ القُرى) بە مەككە و دەوروبەری دەوترێت. ﴿ تُكِنُّ ﴾: دەیشارێتەوە، (أَكْنَنْتُ الشَّيْءَ) واتە: شتەكەم شاردەوە. (كَنَنْتُهُ) هەردوو بەمانای شاردمەوە و ئاشكرام كرد دێت. (وَيْكَأَنَّ اللَّهَ) وەك: (أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ) ئایا نابینی كەخوا (يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَقْدِرُ) (خوا) ڕۆزی بۆ فراوان دەكات، ڕزق و ڕۆزی بۆ كەم دەكات (بۆ هەر كەس كە بیەوێ لەبەندەكانی).

## ٢ - بابٌ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ ﴿٨٥﴾ ﴾ القصص

٤٧٧٣ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا يَعْلَى، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ الْعُصْفُرِيُّ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ﴿ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ﴿٨٥﴾ ﴾ القصص قَالَ: إِلَى مَكَّةَ.

---

(١) ئەو دوو وشە پەیوەندیان بەیەكەوە هەیە بەم جۆرە (هاڕوونم لەگەڵدا بنێرە پشتیوانم بێت وتەكانم بسەلمێنێ).

(٢) ئەوە ئیستعاریە چونكە باسك نیشانەی هێزە باسكت پێداوە واتە: بەهێزت كردووە.

## ٢ - باسێک: (بێگومان ئەو (خوایەی) کە قورئانی بۆ تۆ ناردووە)[1] تاکۆتایی ئایەتەکە

٤٧٧٣ - عیکریمە لە ئیبنو عەبباسەوە ﵄ دەگێڕێتەوە دەڵێ: مەبەست بەم ئایەتە: ﴿لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾ گەڕانەوەی پێغەمبەرە ﷺ بۆ مەککە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٢٩ - سورة العَنْكَبُوت

قَالَ مُجَاهِدٌ:﴿ مُسْتَبْصِرِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾ العنكبوت ضَلَلَةً. وقال غيرُهُ:الحيوان والحيُّ واحد ﴿ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ﴿١١﴾ ﴾ العنكبوت عَلِمَ اللَّهُ ذَلِكَ، إِنَّمَا هِيَ بِمَنْزِلَةِ فَلِيَمِيزَ اللَّهُ كَقوله: ﴿ لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلْخَبِيثَ ﴿٣٧﴾ ﴾ الأنفال:. ﴿ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ ﴿١٣﴾ ﴾ العنكبوت: أَوْزَارِهِمْ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٢٩ - (تەفسیری) سوڕەتی عەنکەبووت

- موجاهید دەڵێ: ﴿ مُسْتَبْصِرِينَ ﴾: گومڕابوون، ڕێگەی ڕاستیان ون کردبوو (وایان دەزانی لەسەر ڕێی ڕاستن).

- جگە لە موجاهید دەڵێ: (الحَيَوان) لەگەڵ (الحي)یەك مانایان هەیە، (واتە: ژیانی دوا ڕۆژ کە ژیانی ڕاستەقینەی هەمیشەیی یە). ﴿ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ﴾: خوا

---

(١) ئەحکام و خوێندنەوە و گەیاندنی قورئانی لەسەر تۆ پێویست کردووە.

ئەوەی هەر زانیوە وەك (فَلِيَمِيزَ اللَّهُ) بۆ ئەم ئایەتە كە دەفەرموێ ﴿ لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلْخَبِيثَ ﴾ واتە خوا پیسی لە پاك جیاكردۆتەوە[1].

﴿ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ ﴾ باری گرانی (كوفر و تاوانی خەڵكانی)تریش لەگەڵ باری گرانی خۆیاندا (هەڵدەگرن) ).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٣٠ - سورة الم غُلِبَتِ الرُّوم

﴿ فَلَا يَرْبُوا (٣٩) ﴾ الروم: مَنْ أَعْطَى يَبْتَغِي أَفْضَلَ فَلَا أَجْرَ لَهُ فِيهَا. قَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ يُحْبَرُونَ (١٥) ﴾ الروم: يُنَعَّمُونَ. ﴿ يَمْهَدُونَ (٤٤) ﴾ الروم: يُسَوُّونَ المَضَاجِعَ، ﴿ ٱلْوَدْقَ (٤٨) ﴾ الروم: المَطَرُ. قَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم (٢٨) ﴾ الروم: فِي الآلِهَةِ، وَفِيهِ: ﴿ تَخَافُونَهُمْ (٢٨) ﴾ الروم: أَنْ يَرِثُوكُمْ كَمَا يَرِثُ بَعْضُكُمْ بَعْضًا. ﴿ يَصَّدَّعُونَ (٤٣) ﴾ الروم: يَتَفَرَّقُونَ، ﴿ فَٱصْدَعْ (٩٤) ﴾ الحجر وَقَالَ غَيْرُهُ: ضُعْفٌ وَضَعْفٌ لُغَتَانِ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ ﴿ ٱلسُّوٓأَىٰٓ (١٠) ﴾ الروم: الإِسَاءَةُ، جَزَاءُ المُسِيئِينَ.

---

(١) لە هەردوو نموونەكەدا: (فليعلمن) و (فليميز) كاری ڕانەبردووون بەڵام بەمانای كاری ڕابردوو دێن.

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٣٠ - (تەفسیری) سوڕەتی (ألم، غُلبَتِ الرُّومُ)

﴿ فَلَا يَرْبُوا۟ ﴾كەسێك بە خشینێك ببەخشێ داوای باشتر لە بەخشینەکەی بکات، ئەوە هیچ پاداشتێکی نییە لەو بەخشینەیدا.

- موجاهید دەڵێ: ﴿ يُحْبَرُونَ ﴾ دڵخۆش دەکرێن، (هەموو جۆرە ناز و نیعمەتێکیان پێ دەدرێ). ﴿ يَمْهَدُونَ ﴾ شوێنی حەسانەوە و نوستن بۆ خۆیان ئامادە دەکەن (لە بەهەشت دا).﴿ ٱلْوَدْقَ ﴾: باران. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ:﴿ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم ﴾(نموونەیەکە) دەربارەی بت و پەرستراوەکان (دابەزیوە)[1]، لە (نموونەی خوادا) تێیدا دەفەرموێ:﴿ تَخَافُونَهُمْ ﴾:ئێوە لەوان دەترسن کەمیراتان لێ ببەن وەك چۆن هەندێکتان میرات لە هەندێکتان دەبەن. ﴿ يَصَّدَّعُونَ ﴾: (خەڵکی) لەیەکتری جیا ئەبنەوە. ﴿ فَٱصْدَعْ ﴾ جیاوازی بکە لە نێوان هەق و ناهاقدا.

- جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: (ضُعْفٌ) لەگەڵ (ضَعْفٌ) دوو شێوە دەربڕینی عەرەبیە یەك مانایان هەیە[2].

- موجاهید دەڵێ: ﴿ ٱلسُّوٓأَىٰٓ ﴾: خراپەکردن[3]، تۆڵەی خراپەکاران.

٤٧٧٤ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا مَنْصُورٌ وَالأَعْمَشُ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ بَيْنَمَا رَجُلٌ يُحَدِّثُ فِي كِنْدَةَ فَقَالَ يَجِيءُ دُخَانٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَأْخُذُ

---

(١) واتە، ئایەتەکە دەربارەی ماف خوا و ماف پەرستراوەکانی جگە لە خوا دابەزیوە.

(٢) لە ئایەتی (الله الذي خلقكم من ضعف) وشەی (ضعف) بەسەر و بە بۆر خوێنراوەتەوە.

(٣) ڕاستر وایە بڵێین: خراپترین مێی (أسوَء) نیسمی تەفزیلە.

بِأَسْمَاعِ الْمُنَافِقِينَ وَأَبْصَارِهِمْ، يَأْخُذُ الْمُؤْمِنَ كَهَيْئَةِ الزُّكَامِ. فَفَزِعْنَا، فَأَتَيْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ، وَكَانَ مُتَّكِئًا، فَغَضِبَ فَجَلَسَ فَقَالَ مَنْ عَلِمَ فَلْيَقُلْ، وَمَنْ لَمْ يَعْلَمْ فَلْيَقُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ. فَإِنَّ مِنَ الْعِلْمِ أَنْ يَقُولَ لِمَا لاَ يَعْلَمُ لاَ أَعْلَمُ. فَإِنَّ اللَّهَ قَالَ لِنَبِيِّهِ ﷺ ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾ص: وَإِنَّ قُرَيْشًا أَبْطَئُوا عَنِ الإِسْلاَمِ فَدَعَا عَلَيْهِمِ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَيْهِمْ بِسَبْعٍ كَسَبْعِ يُوسُفَ، فَأَخَذَتْهُمْ سَنَةٌ حَتَّى هَلَكُوا فِيهَا، وَأَكَلُوا الْمَيْتَةَ وَالْعِظَامَ وَيَرَى الرَّجُلُ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ كَهَيْئَةِ الدُّخَانِ»، فَجَاءَهُ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ يَا مُحَمَّدُ جِئْتَ تَأْمُرُنَا بِصِلَةِ الرَّحِمِ، وَإِنَّ قَوْمَكَ قَدْ هَلَكُوا فَادْعُ اللَّهَ، فَقَرَأَ:

﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ ﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ ﴾ الدخان: أَفَيُكْشَفُ عَنْهُمْ عَذَابُ الآخِرَةِ إِذَا جَاءَ ثُمَّ عَادُوا إِلَى كُفْرِهِمْ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى ﴿ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٦﴾ ﴾ الدخان. يَوْمَ بَدْرٍ وَلِزَامًا يَوْمَ بَدْرٍ. ﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ ﴾ الروم، إِلَى قَوْلِهِ ﴿ سَيَغْلِبُونَ ﴿٣﴾ ﴾ الروم: وَالرُّومُ قَدْ مَضَى[1].

**٤٧٧٤ -مەسروق دەڵێ: پیاوێك لەكیندە[2] فەرمووودەی دەگێڕایەوە و وتی: لە ڕۆژی قیامەتدا دوكەڵێك پەیدا دەبێت دەدات بەسەر گوێ و چاوی ناپاكاندا، باوەڕداریش بەشێوەی هەڵامەت دەیگرێت، بۆیە ئێمەش تۆقین، ئەنجا ڕۆشتم بۆ لای ئیبنو مەسعوود ﷺ پاڵی دابوویەوە (كە باسەكەم بۆ گێڕایەوە) توڕە بوو، جادانیشت و وتی: هەركەس شتێكی زانی بیڵێ، هەر كەسیش شتێك نازانێ بابڵێ: خوادا دەیزانێ، چونكە بێگومان لە**

(١) بروانە: ١٠٠٧.

(٢) كیندە: شوێنێكە لە كوفە.

زانینەوەیە دەربارەی شتێك كەنایزانێ بڵێ: نایزانم، چونكە بەڕاستی خوای گەورە بە پێغەمبەرەكەی ﷺ دەفەرموێ: ( (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ من هیچ كرێ و پاداشتێك لەسەر گەیاندنی ئەم ئایینە لەئێوە داوا ناكەم، وە من لەداواكارانی درۆزن نیم)، وە بێگومان قورەیشییەكان سستیان كرد دەربارەی ئیسلام باوەڕیان نەهێنا، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ دوعای لێ كردن و فەرمووی: ((خودایە یارمەتیم بدە لە دژیان بەحەوت ساڵ قات و قڕی وەك حەوت ساڵەكەی (سەردەمی) یوسف ﷺ ئیتر قات و قڕییان بەسەردا هات هەتا تێیدا تیاچوون، مردارۆبوو و ئێسكیان دەخوارد، وە كەسی وا هەبوو كەسەیری ئاسمانی دەكرد (لەبرساندا) وای دەزانی دوكەڵ بەئاسمانەوەیە، ئەنجا ئەبو سوفیان هات بۆ خزمەتی و وتی: ئەی موحەممەد ﷺ تۆ هاتوویت فەرمانمان پێ دەكەیت بە بەجێ هێنانی پەیوەندی خزمایەتی وە بەڕاستی هۆزەكەت لەناوچوون، دەی لەخودا بپاڕێرەوە (بۆیان) پێغەمبەریش ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (جا چاوەڕوان بە ڕۆژی ئاسمان دوكەڵێكی ئاشكرای لێ پەیدا دەبێ) تادەگاتە (دەگەڕێنەوە)، ئایا ئەگەر ئەوە هات سزای ڕۆژی دوایی یان لەسەر لادەچێت، لە پاشان گەڕانەوە بۆ بێ باوەڕییەكەیان. ئەو (سزایە) ئەوە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵندە: (ڕۆژی دێت پەلاماری بەهێز و هەرە گەورەیان بۆ دەبەین) ئەوە (كوشتاری) ڕۆژی (غەزای) بەدرە. (لِزَامًا):پێش بەدیل گرتنیان لە ڕۆژی بەدردا، وە ﴿ الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣ ﴾:[1] سەركەوتن و زاڵبونی ڕۆم بەسەر فارسدا ڕوویدا و ڕابوورد.

---

(١) مانای ئایەتەكان بەم جۆرەیە: ڕۆم شكێنراو ژێركەوتن (فارس زاڵ بوو) بەسەریاندا لە نزیكترین خاكیان (لە مەككەوە یا لە وڵاتی فارسەوە )، وە ڕۆمەكان دوا تێشكانیان لە داهاتوودا سەردەكەون (بەسەر فارسەكاندا).

## ١ - بابٌ: ﴿لَا تَبۡدِيلَ لِخَلۡقِ ٱللَّهِۚ ٣٠﴾ الروم

لِدِينِ اللَّهِ. ﴿خُلُقُ ٱلۡأَوَّلِينَ ١٣٧﴾ الشعراء: دِينُ الأَوَّلِينَ. وَالْفِطْرَةُ: الإِسْلَامُ.

٤٧٧٥ - حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ؟» ثُمَّ يَقُولُ: ﴿فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَاۚ لَا تَبۡدِيلَ لِخَلۡقِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ ٣٠﴾ الروم[1].

## ١ - باسێک: ((ئاینی) داهێنراوی خوا هیچ جۆره گۆڕانێکی بۆ نییه)

**(لِخَلْقِ اللَّهِ): بۆ ئایینی خودا. ﴿خُلُقُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾: ئایینی پێشینان. (وَالْفِطْرَةُ): ئیسلامه.**

**٤٧٧٥ - ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هیچ منداڵێك نییه ئیللا لەسەر دینداری لەدایك دەبێ، جا دایك و باوکی دەیکەن بە جوولەکە یا گاوور یان ئاگر پەرست، هەرچۆنێك بەچکەیەك بە بەچکەیی بەتەواوی و بێ نوقسانی لەدایك دەبێ، ئایا هەست دەکەن لوتی یاگوێی بڕابێ؟)) پاشان ئەبو هورەیرە ﷺ دەیووت (ئەو سروشتی دیندارییەی خوا خەڵکی لەسەر دروست کردووە، ئایین و دروستکراوەکانی خوا هیچ جۆر گۆڕانی بۆ نییە هەر ئەوە ئاینی ڕێك و ڕاستە).**

(١) بڕوانە: ١٣٥٨.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٣١ - سُورة لُقْمَانَ

## ١ - **بابٌ:** ﴿لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾ لقمان

٤٧٧٦ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيم، عَنْ عَلْقَمَة، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ ﴿٨٢﴾﴾ الأنعام شَقَّ ذَلِكَ عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَقَالُوا: أَيُّنَا لَمْ يَلْبِسْ إِيمَانَهُ بِظُلْمٍ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّهُ لَيْسَ بِذَاكَ، أَلاَ تَسْمَعُ إِلَى قَوْلِ لُقْمَانَ لابْنِهِ ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾ لقمان[1].

# بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

# ٣١ - (تەفسیری) سورەتی لوقمان

## ١ - باسێک: (هاوبەش بۆ خوا دامەنێ چونکە بەڕاستی هاوبەش دانان بۆ خوا ستەمێکی زۆر گەورەیە)

**٤٧٧٦ - عەبدوڵڵا ﷺ وتی: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی:** ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ ﴿٨٢﴾﴾ الأنعام **بەلای هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە ﷺ قورس ناخۆش بوو، وە وتیان: کێ لە ئێمە هەیە ستەمی لە خۆی نەکردبێت؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((مەبەست بە ستەم ئەوە نییە، ئەی ئەم ووتەی لوقمانتان**

(١) بروانە: ٣٢.

**نەبیستووە بە کوڕەکەی دەڵێ: ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾ لقمان، واتە: بێگومان هاوبەش دانان بۆ خوا ستەمێکی گەورەیە)).**

## ٢ - بابُ قَوْلِه: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴿٣٤﴾﴾ لقمان

٤٧٧٧ - حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، عَنْ جَرِيرٍ، عَنْ أَبِي حَيَّانَ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَوْمًا بَارِزًا لِلنَّاسِ إِذْ أَتَاهُ رَجُلٌ يَمْشِي فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الإِيمَانُ؟ قَالَ: «الإِيمَانُ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَلِقَائِهِ وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ الآخِرِ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الإِسْلاَمُ؟ قَالَ: «الإِسْلاَمُ أَنْ تَعْبُدَ اللهَ وَلاَ تُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الإِحْسَانُ؟ قَالَ: «الإِحْسَانُ أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: «مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ، وَلَكِنْ سَأُحَدِّثُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا إِذَا وَلَدَتِ الْمَرْأَةُ رَبَّتَهَا، فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، وَإِذَا كَانَ الْحُفَاةُ الْعُرَاةُ رُءُوسَ النَّاسِ فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا فِي خَمْسٍ لاَ يَعْلَمُهُنَّ إِلاَّ اللهُ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ﴿٣٤﴾﴾ لقمان: ثُمَّ انْصَرَفَ الرَّجُلُ فَقَالَ: «رُدُّوا عَلَيَّ». فَأَخَذُوا لِيَرُدُّوا فَلَمْ يَرَوْا شَيْئًا. فَقَالَ: «هَذَا جِبْرِيلُ جَاءَ لِيُعَلِّمَ النَّاسَ دِينَهُمْ»[1].

# ٢ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (بەڕاستی زانیاری (کاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی تەنها لای خوایە).

**٤٧٧٧ -ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو هاوەڵاندا بوو، لەو کاتەدا پیاوێك[2] هات بۆ خزمەتی بەدەم هاتنەوە پرسیاری**

(١) بڕوانە: ٥٠.

(٢) کە جبریل بوو ﷺ لە شێوەی پیاوێکدا هاتبوو.

كرد و وتى:ئەی پێغەمبەری ئیمان چییە؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: (ئیمان ئەوەیە كە باوەڕ بێنیت بە خوا و بە فریشتەكانی و بەگەشتن بە خزمەتی خوا (لە ڕۆژی دوایی دا)، وە باوەڕ بێنیت بە زیندوبوونەی ڕۆژی دوایی))وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئیسلام چییە؟ فەرمووی: ((ئیسلام ئەوەیە خوا بپەرستی هیچ شتێك نەكەیتە هاوبەشی خوا، وە بە چاكی نوێژەكانت بكەیت، وە زەكاتی فەرز كراو بدەیت (لەماڵ و سامانتدا)، وە ڕۆژووی (مانگی) ڕەمەزان بگریت))، وتی: ئیحسان چییە؟ (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئیحسان ئەوەیە كە خوا بپەرستی وەك ئەوەی خوا ببینی، جا ئەگەر تۆ خوا نەبینی ئەوە بێگومان خوا تۆ دەبینێت)) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: كەی قیامەت بەرپا دەبێت؟ فەرمووی: ((پرسیاری لێ كراو شارەزاتر نییە لەپرسیاركەر، بەڵام باسی نیشانەكانی قیامەتت بۆ دەكەم: كاتێ ژن گەورەكەی خۆی لێ بوو [1]، ئەوە (یەكێكە) لە نیشانەكانی، وە كاتێ كەسانی پێخاوس و ڕوت و قووت بوونە گەورە و سەركردەی خەڵك، ئەوە لەنیشانەكانی یەتی (زانینی هاتنی قیامەت یەكێكە) لەو پێنج شتەی جگە لە خوا كەس نایان زانێت)) (جا پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە)[2] (بەڕاستی زانیاری (كاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی تەنها لای خوایە، وە هەر خوا باران دەبارێنێ، وە تەنها خوا دەزانێ بەوەی لەمنداڵدانی (دایكان) دایە)، لە پاشان پیاوەكە ڕۆشت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((بیهێننەوە بۆ لام))، ئەوانیش چوون بیهێننەوە بەڵام هیچیان نەدی، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەوە جیبریل ﷺ بوو بۆ ئەوە هات بوو تاخەڵكی فێری ئاینەكەیان بكات)).

---

(١) ئەم ئاماژەیە بۆ ئەوەی كەنیزەك زۆر دەبێ و سەرجێیان لەگەڵدا دەكرێت، دواتر ئەو كوڕەی دەیبێت دەبێتە خاوەنی ژنەكە كە دایكێتی، چونكە لە یەكێك لەگێڕاوەكاندا دەفەرموێ (ئەگەر كەنیزە گەورەكەی بوو) .

(٢) لە فەرموودەی ژمارە (٥٠) صەحیحی بوخاریدا ئەم زیادەیە هەیە.

٤٧٧٨ - حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي عُمَرُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَر، أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَه، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَفَاتِيحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ» ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴿٣٤﴾ ﴾ لقمان[1].

**٤٧٧٨ - عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کلیلی نەزانراوەکان پێنجن)) لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (بەڕاستی زانیاری (کاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی تەنها لای خوایە...)).**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٣٢ - سورة (تَنْزِيلُ) السجدة

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ﴾ السجدة ضَعِيفٍ، نُطفَةُ الرَّجُلِ. ﴿ ضَلَلْنَا ﴿١٠﴾ ﴾ السجدة هَلَكْنَا.

وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: الجُرُزُ التِي لَا تُمْطَرُ إِلَّا مَطَرًا لَا يُغْنِي عَنْهَا شَيْئًا. ﴿ يَهْدِ ﴿٢٦﴾ ﴾ السجدة، يُبَيِّنْ.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٣٢ - (تەفسیری) سوڕەتی سەجدە

**- موجاهید دەڵێ: ﴿ مَّهِينٍ ﴾ لاواز و بێ هێز، مەنی و تۆماوی پیاو. ﴿ ضَلَلْنَا ﴾ مردین و لەناوچوین (لەزویدا بووینە خۆڵ و ون بووین). وئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: (الجُرُزُ): زەوییەکە بارانی لێ ناباری مەگەر بارانێکی کەم کە هیچ سوود پێ ناگەینێت. ﴿ يَهْدِ ﴾: ڕوونی دەکاتەوە.**

(١) بروانە: ١٠٣٩.

**١ - بابُ قوله:** ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة

٤٧٧٩ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ ﷻ: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة، وَحَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ اللَّهُ مِثْلَهُ. قِيلَ لِسُفْيَانَ رِوَايَةً. قَالَ: فَأَيُّ شَيْءٍ؟ قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ: قَرَأَ أَبُو هُرَيْرَةَ قُرَّاتِ أَعْيُنٍ[١].

## ١ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئینجا هیچ کەس نازانێ چی شاراوەتەوە بۆیان (لە بەهەشت دا))

**٤٧٧٩ -ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خوا ﷻ دەفەرموێ: ( (لەبەهەشت دا) ئامادەم کردووە بۆ بەندە چاکەکانم ئەوەی چاو نەیبینیوە، وە گوێ نەیبیستووە، وە بەدڵی هیچ مرۆڤێکدا نەهاتووە)) ئەبو هورەیرە دەڵێ: جا ئەگەر دەتانەوێ[٢] ئەم ئایەتە بخوێننەوە: (ئینجا هیچ کەس نازانێ چی شاراوەتەوە بۆیان (لەبەهەشت دا کەهۆی گەشبوونی چاوانن).**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) سوفیان بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەبو زیناد لە ئەعرەجەوە بۆی گێڕاینەوە لە ئەبو هورەیرەوە وتی: خوا فەرمووی... وێنەی فەرموودەکەی پێشووی گێڕایەوە.**

---

(١) بروانە: ٣٢٤٤.

(٢) لەو مەبەستە بگەن کە فەرموودەکە باسی کردووە.

**بە سوفیان وترا: بەگێڕانەوە دەیگێڕیتەوە (یان بۆچوونی خۆتە)؟ وتی: جا چ شتێکە (ئەگەر گێڕانەوە نەبێت لە پێغەمبەرەوە ﷺ)؟**

**- ئەبوموعاویە دەڵێ: لە ئەعمەشەوە لە ئەبی صالیحەوە دەڵێ: ئەبو هورەیرە بەم جۆرەی خوێندەوە:** (قُرَّاتِ[1] أَعْيُنٍ).

٤٧٨٠ - حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، ذُخْرًا، بَلْهَ مَا أُطْلِعْتُمْ عَلَيْهِ». ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة[2].

**٤٧٨٠ - ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمووی: ((خوای بەرز و بڵند دەفەرموێ: (لە بەهەشت دا) ئامادەم کردووە بۆ بەندە چاکەکانم ئەوەی کەچاو نەیدیوە وگوێ نەیبیستووە و بەدڵی هیچ مرۆڤێکدا نەهاتووە، (ئەوانەم) بۆ هەڵگرتوون، ئەوەی ئاگادارن و دەیزانن هەر باسی مەکەن (لە چاو ئەوەی نایزانن هیچ نییە) ))، لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (ئینجا کەهیچ کەس نازانێ چی شاراوەتەوە بۆیان (لە بەهەشت دا)، کەهۆی گەشبوونی چاوانن، ئەم پاداشتە (دەدرێنەوە) بەهۆی ئەو کردەوانەوەی کە کردویانە).**

---

(١) قُرَّاتِ: کۆی: (قُرَّة) کە خوێندنەوەیەکی شازە کە ئەبو دردا و و ئەبو هورەیرە بەو جۆرە خوێندویانەتەوە. بڕوانە ؛ إرشاد الساری: ٥٠٢/١٠.

(٢) بڕوانە: ٣٢٤٤.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٣٣ - سُورَةُ الْأَحْزَابِ

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ظُهُورُهُمْ ﴿٦﴾﴾ الأحزاب: قُصورِهِمْ.

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٣٣ - (تەفسیری) سورەتی ئەحزاب

موجاهید دەڵێ: ﴿ظُهُورُهُمْ﴾: کۆشکەکانیان.

## ١ - بابٌ: ﴿ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴿٦﴾﴾ الأحزاب

٤٧٨١ - حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُلَيْحٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ هِلاَلِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ مُؤْمِنٍ إِلاَّ وَأَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ ﴿ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴿٦﴾﴾ الأحزاب، فَأَيُّمَا مُؤْمِنٍ تَرَكَ مَالاً فَلْيَرِثْهُ عَصَبَتُهُ مَنْ كَانُوا، فَإِنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضِيَاعًا فَلْيَأْتِنِي وَأَنَا مَوْلاَهُ»[1].

## ١ - باسێک: (پێغەمبەر ﷺ لە خودی بڕواداران بۆ خۆیان لە پێشترە)

**٤٧٨١ - ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((هیچ باوەڕدارێك نیە مەگەر من لە دونیا و دواڕۆژدا لە هەموو کەس لەپێشترم بۆی ئەگەر حەزتان کرد ئەم ئایەتە بخوێننەوە، ((پێغەمبەر ﷺ لە خودی باوەڕداران**

(١) بروانە: ٢٣٩٨.

بۆ خۆیان لەپێشترە)، جا هەر باوەڕدارێك مرد و سامانی بەجێ هێشت با میراتگرەکانی هەرکەسێکن میراتی لێ ببەن، هەرکەسێکیش قەرز یا خاوخێزانی لێ بەجێما با (نزیکەکانی) بێن بۆ لام، بێگومان من کەسوکاری ئەوم)).

**٢ - بابٌ: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ ﴿٥﴾ ﴾ الأحزاب.**

٤٧٨٢ - حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ الْمُخْتَارِ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي سَالِمٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَا كُنَّا نَدْعُوهُ إِلاَّ: زَيْدَ ابْنَ مُحَمَّدٍ، حَتَّى نَزَلَ الْقُرْآنُ ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ ﴿٥﴾ ﴾ الأحزاب.

## ٢ - باسێک: (ئەو بەکوڕ کراوانە بەناوی باوکیانەوە بانگیان بکەن، ئەو ڕاسترە بەلای خواوە)

**٤٧٨٢ -عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما گێڕایەوە کەزەیدی کوڕی حارسەی کە ئازادکراوی پێغەمبەری خودا بوو، ئێمە هەر بەزەیدی کوڕی موحەممەد بانگمان دەکرد، هەتا قورئان دابەزی و فەرمووی: (ئەو بەکوڕ کراوانە بەناوی باوکیانەوە بانگیان بکەن، ئەوە ڕاسترە بەلای خواوە).**

**٣ - بابٌ: ﴿ فَمِنۡهُم مَّن قَضَىٰ نَحۡبَهُۥ وَمِنۡهُم مَّن يَنتَظِرُۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا ﴿٢٣﴾ ﴾ الأحزاب**

﴿ نَحۡبَهُۥ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأحزاب: عَهْدَهُ. ﴿ أَقۡطَارِهَا ﴿١٤﴾ ﴾ الأحزاب: جَوَانِبُهَا. ﴿ ٱلۡفِتۡنَةَ لَأٓتَوۡهَا ﴿١٤﴾ ﴾ الأحزاب: لأَعْطَوْهَا.

## ٣ - باسێک: (جا هەندێکیان نەزر و بەڵێنی خۆی بەجێ هێنا (شەهید بوو)، هەندێکیشیان چاوەڕوانن هیچ گۆڕانێکیان (لە بەڵێنی خۆیاندا) نەکردووە)

**﴿ نَحْبَهُۥ ﴾ نەزر و بەڵێنەکەی. ﴿ أَقْطَارِهَا ﴾ لە هەموو لایەکییەوە. ﴿ ٱلْفِتْنَةَ لَآتَوْهَا ﴾ (ئەگەر داوای هەڵگەڕانەوە لەئاین یان لێ بکرایە) بێگومان بەجێیان دەهێنا و داواکەیان پێدەدان.**

٤٧٨٣ - حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ ثُمَامَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: نُرَى هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِي أَنَسِ بْنِ النَّضْرِ ﴿ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأحزاب[1].

**٤٧٨٣ -ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: ئێمە وا دەزانین ئەم ئایەتە دەربارەی ئەنەسی کوڕی نەزر ﷺ دابەزی: (لە ناو باوەڕداراندا پیاوانێك هەن ڕاستیان کرد لەو پەیمانەی کەدابوویان بەخوا).**

٤٧٨٤ - حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي خَارِجَةُ بْنُ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ قَالَ لَمَّا نَسَخْنَا الصُّحُفَ فِي الْمَصَاحِفِ فَقَدْتُ آيَةً مِنْ سُورَةِ الأَحْزَابِ، كُنْتُ أَسْمَعُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقْرَؤُهَا، لَمْ أَجِدْهَا مَعَ أَحَدٍ إِلاَّ مَعَ خُزَيْمَةَ الأَنْصَارِيِّ، الَّذِي جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَهَادَتَهُ شَهَادَةَ رَجُلَيْنِ ﴿ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأحزاب[2].

---

(١) بروانە: ٢٨٠٥.

(٢) بروانە: ٢٨٠٧.

٤٧٨٤ -خارجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابیت دەگێڕێتەوە کە زەیدی کوڕی سابیت وتی: کاتێ (لە نوسینەوەی) پەڕەکانی قورئاندا[١] چەند قورئانێکمان[٢] ڕەنووس کرد. لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتێکم لێ ون بوو، جاران گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیخوێند، لای کەس نەمدۆزییەوە خوزەیمەی ئەنصاری نەبێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ شایەتی دانی ئەوی بە شایەتی دوو پیاو دادەنا، (وە ئەوە مەبەستی ئەم ئایەتەیە) (لە ناو باوەڕداراندا پیاوانێك هەن ڕاستیان کرد لەو پەیمانەی کە دابوویان بەخوا).

٤ - **باب:** ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ ﴾ الأحزاب **وقال معمر: التَّبَرُّجُ أَنْ تُخْرِجَ مَحَاسِنَهَا، و** ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ ﴿٣٨﴾ ﴾ الأحزاب: **استنَّها: جعلها.**

## ٤ - باسێک: (بەخێزانەکانت بڵێ ئەگەر ئێوە ژیانی دنیاو ڕازاوەی ئەوتان دەوێ، دەی هەمووتان وەرن موتعەتان[٣] پێ بدەم و تەڵاقتان بدەم بە تەڵاقدانێکی چاک و بێ زیان)

**مەعمەر دەڵێ: (التَّبَرُّجُ) ئەوەیە کەئافرەت جوانی خۆی دەربخات. ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ ﴾: باو وڕێگای (دانراوی) خوایە (استنَّها): کە دایناوە.**

٤٧٨٥ - حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّ عَائِشَةَ رضي الله عنها زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جَاءَهَا حِينَ أَمَرَ اللَّهُ أَنْ

---

(١) پەڕەکانی ئەو قورئانەی لای حەفصە بوو رضي الله عنها.

(٢) ئەو قورئانانەی کە عوسمانی کوڕی عەففان رضي الله عنه. فەرمانی کرد بە نووسینەوەیان.

(٣) موتعة: پارە و شتومەکێکە دەدرێتە ئافرەتی تەڵاق دراو. بڕوانە : إرشاد الساری: ٥٠٨/١٠.

يُخَيِّرَ أَزْوَاجَهُ، فَبَدَأَ بِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «إِنِّي ذَاكِرٌ لَكِ أَمْرًا فَلاَ عَلَيْكِ أَنْ تَسْتَعْجِلِي حَتَّى تَسْتَأْمِرِي أَبَوَيْكِ»، وَقَدْ عَلِمَ أَنَّ أَبَوَيَّ لَمْ يَكُونَا يَأْمُرَانِي بِفِرَاقِهِ، قَالَتْ ثُمَّ قَالَ: « إِنَّ اللَّهَ قَالَ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ ﴿٢٨﴾ ﴾ الأحزاب إِلَى تَمَامِ الآيَتَيْنِ فَقُلْتُ لَهُ: فَفِي أَيِّ هَذَا أَسْتَأْمِرُ أَبَوَيَّ فَإِنِّي أُرِيدُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ[1].

**٤٧٨٥ ـئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە کە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ خوا فەرمانی پێکرد کە هاوسەرەکانی سەرپشك بکات [2]، هات بۆلای (عائیشە ﵂) جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەمنەوە دەستی پێکرد و فەرمووی: ((من کارێکت بۆ باس دەکەم پێویست نییە لەسەرت پەلە بکەیت هەتا ڕاوێژ بە دایك و باوکت دەکەیت))، بەدڵنیاییەوە دایك و باوکم هیچکات فەرمانم پێ ناکەن بەجیابوونەوە لێی، عائیشە ﵂ وتی: لە پاشان (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((بێگومان خوا دەفەرموێ: (ئەی پێغەمبەر ﷺ بە خێزانەکانت بڵێ) تا کۆتایی دوو ئایەتەکە، منیش عەرزم کرد، دەی دەربارەی چ شتێك ڕاوێژ بە دایك و باوکم بکەم؟ من بێگومان بە دڵنیاییەوە خوا و پێغەمبەرەکەی و ڕۆژی دواییم دەوێ.**

---

(١) بڕوانە: ٤٧٨٦.

(٢) لە نێوان دونیا و قیامەت دا یان لە نێوان مانەوە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و تەڵاقدان دا.

٥ - بابُ قَوْلِهِ: ﴿ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الأحزاب، وَقَالَ قَتَادَةُ: ﴿ وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ ﴿٣٤﴾ ﴾[1] الأحزاب، القُرْآنُ وَالحِكمة: السُّنَّةُ.

## ٥ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە ئەگەر ئێوە خوا و پێغەمبەرەکەی و پاداشتی ڕۆژی دواییتان دەوێ، ئەوە بێگومان بۆ چاکەکاران لە ئێوە پاداشتێکی گەورەی ئامادەکردووە)

قەتادە دەڵێ: مەبەست لە: ﴿ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ ﴾ قورئانە، ﴿ وَٱلْحِكْمَةِ ﴾ش: سوننەتە. (کە لەم ئایەتەدا هاتوون).

٤٧٨٦ - وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ عَائِشَةَ -زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: لَمَّا أُمِرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِتَخْيِيرِ أَزْوَاجِهِ بَدَأَ بِي فَقَالَ: «إِنِّي ذَاكِرٌ لَكِ أَمْرًا فَلاَ عَلَيْكِ أَنْ لاَ تَعْجَلِي حَتَّى تَسْتَأْمِرِي أَبَوَيْكِ». قَالَتْ: وَقَدْ عَلِمَ أَنَّ أَبَوَيَّ لَمْ يَكُونَا يَأْمُرَانِي بِفِرَاقِهِ، قَالَتْ: ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ اللهَ جَلَّ ثَنَاؤُهُ قَالَ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا ﴿٢٨﴾ ﴾ الأحزاب: إِلَى ﴿ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الأحزاب قَالَتْ: فَقُلْت: فَفِي أَيِّ هَذَا أَسْتَأْمِرُ أَبَوَيَّ؟! فَإِنِّي أُرِيدُ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ، قَالَتْ: ثُمَّ فَعَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَ مَا فَعَلْتُ.

---

(١) وە بیربکەنەوە لەوەی دەخوێنرێت لە ماڵەکانتاندا لە ئایەتەکانی خواو دانایی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ.

تَابَعَهُ مُوسَى بْنُ أَعْيَنَ، عَنْ مَعْمَر، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ. وَقَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ وَأَبُو سُفْيَانَ الْمَعْمَرِيُّ: عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ[1].

**٤٧٨٦ -ئەبو سەلەمی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە کە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرا بە سەرپشك کردنی هاوسەرەکانی لە منەوە دەستی پێکرد و فەرمووی: ((من کارێکت بۆ باس دەکەم، پێویست ناکات پەلە بکەیت هەتا ڕاوێژ بەدایك و باوکت دەکەیت) ))، عائیشە دەڵێ: بێگومان ئەو دەیزانی کە دایك و باوکم هیچ کات فەرمانم پێ ناکەن بە جیابوونەوە لێی، عائیشە دەڵێ: لە پاشان فەرمووی: (خوای ستایشی بەرز و بڵندبێ دەفەرموێ: (ئەی پێغەمبەر ﷺ بەخێزانەکانت بڵێ ئەگەر ئێوە ژیانی دونیا و ڕازاوەی ئەوتان دەوێ) تا دەگاتە (پاداشتێکی گەورە)، (عائیشە ﷺ) دەڵێ منیش وتم: جا دەربارەی کامەیان ڕاوێژ بە دایك و باوکم بکەم؟ چونکە بێگومان من خوا و پێغەمبەرەکەی ومالی و دوارۆژم دەوێت، دەڵێ: پاشان هەموو هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ وەك منیان کرد.**

**-مووسای کوڕی ئەعیەن لە مەعمەرەوە گێڕاویەتیەوە ئەویش لە زوهرییەوە وتی: ئەبو سەلەمە بۆی گێڕامەوە (بەم گێڕانەوە) پاڵپشتی (گێرانەوەکەی لەیسی) کردووە.**

**- عەبدوڕەزاق و ئەبو سوفیانی مەعمەری لە مەعمەرەوە لە زوهری یەوە لە عورووەوە لە عائیشەوە ﷺ ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە.**

(١) بڕوانە: ٤٧٨٥.

٦ - **بابٌ:** ﴿ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ﴿٣٧﴾ ﴾ الأحزاب

٤٧٨٧ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ مَنْصُورٍ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ، حَدَّثَنَا ثَابِتٌ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ ﴿ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ ﴿٣٧﴾ ﴾ الأحزاب نَزَلَتْ فِي شَأْنِ زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ وَزَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ[1].

## ٦ - باسێک: (وە لە دڵی خۆتدا شتێک دەشاریتەوە کە خوا ئاشکرای دەکات، وە لە (قسەی) خەڵک دەترسی لە کاتێکدا خوا شیاوترە کە لێی بترسیت)

**٤٧٨٧ -ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەم ئایەتە: (وە لەدڵی خۆتدا شتێك دەشاریتەوە کە خوا ئاشکرای دەکات)، دەربارەی حاڵی زەینەبی کچی جەحش و زەیدی کوڕی حاریسە دابەزی.**

٧ - **بابُ: قَوْلِه:** ﴿ تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ۚ ﴿٥١﴾ ﴾ الأحزاب

قَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ تُرْجِي ﴿٥١﴾ ﴾ الأحزاب:تُؤَخِّرُ. ﴿ أَرْجِهْ ﴿١١١﴾ ﴾ الأعراف: أَخِّرْهُ.

٤٧٨٨ - حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ قَالَ هِشَامٌ، حَدَّثَنَا، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَت: كُنْتُ أَغَارُ عَلَى اللاَّتِي وَهَبْنَ أَنْفُسَهُنَّ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَقُولُ أَتَهَبُ الْمَرْأَةُ نَفْسَهَا؟! فَلَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى ﴿ تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ﴿٥١﴾ ﴾ الأحزاب: قُلْتُ: مَا أُرَى رَبَّكَ إِلاَّ يُسَارِعُ فِي هَوَاكَ[2].

---

(١) بروانە: ٧٤٣٠.

(٢) بروانە: ٥١١٣.

# ٧ -باسى ئەم فەرمايشتەى خواى گەورە: ( (ئەى موحەممەد ﷺ) سەرەى هەر يەكێ لە خێزانەكانت ويست دواى بخە و هەريەكێ لەوانت ويست (پێشى بخەو) بيهێنە بۆ لاى خۆت، وە هەركامت بوێ (بێتە لات) لەوانەى وازت لێ هێناون هيچ گوناحێكت لە سەر نييە)

-ئيبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ تُرۡجِی ﴾ دواى بخە. ﴿ أَرۡجِهۡ ﴾ دواى بخە.

٤٧٨٨ - عائيشە ﷺ دەڵێ: من ڕق و قيزم لەو ژنانە دەهاتەوە كە خۆيان دەبەخشيیە پێغەمبەرى خوا ﷺ وە دەموت، ئايا ئافرەت خۆى دەبەخشێت (بە پياو)؟ جا كاتێ خواى بەرز و بڵند ئەم ئايەتەى دابەزاند: ((ئەى موحەممەد ﷺ) سەرەى هەريەكێ لە خێزانەكانت ويست دواى بخە و هەريەكێ لەوانت ويست (پێشى بخەو) بيهێنە بۆلاى خۆت، وە هەركامت بوێ (بێتە لات) لەوانەى وازت لێ هێناون هيچ گوناهت لەسەر نييە).

(عائيشە دەڵێ) وتم: وا گومان دەبەم ئەوەى حەزت لێيە پەروەدگارت زوو بۆى بەدى دەهێنێ.

٤٧٨٩ - حَدَّثَنَا حِبَّانُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا عَاصِمٌ الأَحْوَلُ، عَنْ مُعَاذَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَسْتَأْذِنُ فِي يَوْمِ الْمَرْأَةِ مِنَّا بَعْدَ أَنْ أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ تُرۡجِی مَن تَشَآءُ مِنۡهُنَّ وَتُـٔۡوِیۤ إِلَیۡكَ مَن تَشَآءُۖ وَمَنِ ٱبۡتَغَیۡتَ مِمَّنۡ عَزَلۡتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَیۡكَۚ ﴿٥١﴾ ﴾ الأحزاب فَقُلْتُ لَهَا: مَا كُنْتِ تَقُولِي؟ قَالَتْ: كُنْتُ أَقُولُ لَهُ إِنْ كَانَ ذَاكَ إِلَيَّ فَإِنِّي لاَ أُرِيدُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْ أُوثِرَ عَلَيْكَ أَحَدًا. تَابَعَهُ عَبَّادُ بْنُ عَبَّادٍ سَمِعَ عَاصِمًا.

٤٧٨٩ -موعازه دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمووکات لە رۆژی سەرەی هەر ئافرەتێك لەئێمەدا مۆڵەتی دەخواست (ئەگەر بیویستایە بڕوات بۆ لای ئافرەتێکی ترمان)، پاش ئەوەی ئەم ئایەتەی بۆ دابەزێنرا (ئەی موحەممەد ﷺ) سەرەی هەر یەکێ لە خێزانەکانت ویست دوای بخە و هەریەکێ لەوانت ویست (پێشی بخەو) بیهێنە بۆ لای خۆت، وە هەرکامت بوێ (بێتە لات) لەوانەی وازت لێ هێناون هیچ گوناهت لەسەر نییە)، (موعازە دەڵێ) منیش بە عائیشەم وت: تۆ چیت دەوت [1]؟ وتی: من عەرزم دەکرد: ئەگەر ئەو کارە بەدەستی خۆم بێت ئەو بێگومان ئەی پێغەمبەری خوا من کەس لە لام لەتۆ لە پێشتر نییە (تۆ ناگۆڕمەوە بەکەسی تر).

- عەببادی کوڕی عەبباد ئەم فەرموودەی گێڕایەوە و پاڵپشتی (گێڕانەوەکەی عەبدوڵلای کوڕی موبارەك) دەکات کە لە عاصمی بیستووە.

**٨ - بابٌ: قَوْلِه:** ﴿لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ ۖ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾﴾ **الأحزاب** **يُقَالُ:** ﴿إِنَاهُ ﴿٥٣﴾﴾ الأحزاب **إِدْرَاكُهُ، أَنَى يَأْنِي أَنَاةً.** ﴿لَعَلَّ السَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿٦٣﴾﴾ الأحزاب: **إِذَا وَصَفْتَ صِفَةَ الْمُؤَنَّثِ قُلْتَ قَرِيبَةً وَإِذَا جَعَلْتَهُ ظَرْفًا وَبَدَلًا، وَلَمْ تُرِدِ الصِّفَةَ نَزَعْتَ الْهَاءَ مِنَ الْمُؤَنَّثِ، وَكَذَلِكَ لَفْظُهَا فِي الْوَاحِدِ وَالاثْنَيْنِ وَالْجَمِيعِ لِلذَّكَرِ وَالْأُنْثَى.**

---

(١) ئەگەر داوای لێ بکردیتایە بڕوات بۆ لای خێزانێکی تری.

**٨ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (مەچنە ژوورەوە بۆ ماڵەکانی پێغەمبەرﷺ مەگەر ڕێگەتان پێ بدرێ بۆ نان خواردنێک بێ ئەوەی چاوەڕوانی پێگەیشتنی بکەن، بەڵام ئەگەر بانگ کران (بۆ نان خواردن) ئەوسا بڕۆنە ژوورەوە، ئینجا ئەگەر خواردنەکەتان خوارد بڵاوەی لێ بکەن وە مەمێننەوە بۆ قسە کردن چونکە بەڕاستی ئەو (مانەوەتان) ئازاری پێغەمبەر ﷺ دەدات، ئەویش شەرم دەکات لێتان (کە بێ دەنگە) بەڵام خوا لە (وتنی) هەق شەرم ناکات، وە هەرکاتێ داوای شتێکی ناوماڵتان کرد لە (هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ) ئەوە لە پشت پەردەوە لێیان داوا بکەن ئەو (شێوە داوا کردنە) تان خاوێن ترە بۆ دڵی ئێوە و ئەوانیش، بەهیچ شێوەیەک بۆ ئێوە دروست نییە ئازاری (دڵی) پێغەمبەری خوا ﷺ بدەن، وە هەرگیز نابێ خێزانەکانی پاش خۆی مارە بکەن، بەڕاستی ئەو (ئازار دانی دڵ و مارەکردنە) تان بەلای خواوە (گوناهێکی) زۆر گەورەیە)**

دەوترێت ﴿إِنَىٰهُ﴾:کاتی پێگەیشتنی (خواردنەکە)، (أَنَى يَأْنِي أَنَاةً)[1] ﴿لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا﴾ ئەگەر (قَرِيبًا) بکەیت بە سیفەت بۆ مێینە دەڵێ: (قَرِيبَةً) بەلام ئەگەر بیکەیتە بەناو بۆکاتی سیفەتەکە یان بیکەیتە ناو بۆ شوێنی سیفەتەکە و سیفەت نەبێت، ئەوکاتە پیتی (ة)ی مێینەکەی لێ دەکرێتەوە.

---

(١) (أني) کاری ڕابردووە، (يأني) کاری ڕانەبردووە (أَنَاةً) چاوگە.

وە هەروەها ئەو وشەیە (قَرِيبًا) ئەگەر بە سیفەت نەیەت ئەوە هەمان وشە بۆ دانەیەك و دووان و كۆمەڵێك و نێر و مێ بەكار دێت و بۆ هەموویان دەبێت.

٤٧٩٠ - حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، يَدْخُلُ عَلَيْكَ الْبَرُّ وَالْفَاجِرُ، فَلَوْ أَمَرْتَ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ بِالْحِجَابِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ الْحِجَابِ[1].

**٤٧٩٠ -ئەنەس ﷺ دەڵێ: عومەر ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا خەڵكی چاك و خراپ دێتە ماڵت خۆزگە فەرمانت بكردایە بە دایكانی باوەڕداران بەحیجاب و دەرنەكەوتن بەو هۆیەوە خوا ئایەتی حیجابی دابەزاند.**

٤٧٩١ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الرَّقَاشِيُّ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَان، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: حَدَّثَنَا أَبُو مِجْلَزٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا تَزَوَّجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَيْنَبَ ابْنَةَ جَحْشٍ دَعَا الْقَوْمَ، فَطَعِمُوا ثُمَّ جَلَسُوا يَتَحَدَّثُونَ وَإِذَا هُوَ كَأَنَّهُ يَتَهَيَّأُ لِلْقِيَامِ فَلَمْ يَقُومُوا، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ قَامَ، فَلَمَّا قَامَ قَامَ مَنْ قَامَ، وَقَعَدَ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ لِيَدْخُلَ، فَإِذَا الْقَوْمُ جُلُوسٌ ثُمَّ إِنَّهُمْ قَامُوا، فَانْطَلَقْتُ فَجِئْتُ فَأَخْبَرْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَنَّهُمْ قَدِ انْطَلَقُوا، فَجَاءَ حَتَّى دَخَلَ، فَذَهَبْتُ أَدْخُلُ فَأَلْقَى الْحِجَابَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ ﴿٥٣﴾ ﴾ الآية.الأحزاب[2].

**٤٧٩١ -ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ زەینەبی كچی جەحشی (مارەكرد و) گوێزایەوە خەڵكی بانگ كرد (بۆشایی یەكەی) و نانیان**

---

(١) بڕوانە: ٤٠٢.

(٢) بڕوانە: ٤٧٩٢، ٤٧٩٣، ٤٧٩٤، ٥١٥٤، ٥١٦٣، ٦٨٦٦، ٥١٦٨، ٥١٧٠، ٥١٧١، ٥٤٦٦، ٦٢٣٨، ٦٢٣٩، ٦٢٧١، ٧٤٢١.

**خوارد، پاشان دانیشتن و قسەیان دەکرد، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ دەتووت خۆی ئامادە دەکات بۆ هەستان بەڵام خەڵکەکە هەڵنەستان، جا کە ئەوەی دی هەستا ئەنجا کە پێغەمبەر ﷺ هەستا ئەوەی هەستا (لەگەڵی) هەستا، بەڵام سێ کەس دانیشتن، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ هات بێتە ژوورەوە دەبینێ ئەو کەسانە دانیشتوون لە پاشان هەستان، (ئەنەس دەڵێ:) منیش ڕۆشتم هەواڵم دا بە پێغەمبەر ﷺ کەئەو پیاوانە ڕۆشتن ئەنجا (پێغەمبەر ﷺ هات هەتا چوویە ژوورەوە، منیش ڕۆشتم بچمە ژوورەوە، بەڵام پەردەکەی لە نێوان من وخویدا دادایەوە بەو هۆیەوە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، مەچنە ژوورەوە بۆ ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ ) تا کۆتایی ئایەتەکە.**

٤٧٩٢ - حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، قَالَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: أَنَا أَعْلَمُ النَّاسِ بِهَذِهِ الآيَةِ -آيَةِ الْحِجَابِ- لَمَّا أُهْدِيَتْ زَيْنَبُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَانَتْ مَعَهُ فِي الْبَيْتِ، صَنَعَ طَعَامًا، وَدَعَا الْقَوْمَ، فَقَعَدُوا يَتَحَدَّثُونَ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْرُجُ، ثُمَّ يَرْجِعُ، وَهُمْ قُعُودٌ يَتَحَدَّثُونَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الأحزاب إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ﴿٥٣﴾ ﴾ الأحزاب. فَضُرِبَ الْحِجَابُ، وَقَامَ الْقَوْمُ[1].

**٤٧٩٢ -ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: من لە هەموو کەس شارەزاترم بەم ئایەتە (مەبەستم) ئایەتی حیجابە: کاتێ زەینەب (بە بوکێنی برا و) گوێزرایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، زەینەب لە ماڵەوە لەگەڵیدا بوو، (پێغەمبەر ﷺ) خواردنی ساز کردبوو خەڵکی بانگ کردبوو، (جا نانیان خوارد) ئینجا**

(١) بروانە: ٤٧٩١.

دانیشتبوون قسەیان دەکرد، پێغەمبەریش هەر دەرۆشتە دەرەوە و پاشان دەگەڕایەوە، خەڵکە هەر دانیشتبوون قسەیان دەکرد، بەو هۆیەوە خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتەی دابەزاند: ((ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە مەچنە ژوورەوە بۆ ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ مەگەر ڕێگەتان پێ بدرێ بۆ نان خواردنێك بێ ئەوەی چاوەڕوانی پێگەیشتنی بکەن)، تا دەگاتە ئەم فەرموودەی خوا (لە پشتی پەردەوە) ئیتر حیجاب دانرا و خەڵکەکەش هەستان.

٤٧٩٣ - حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: بُنِيَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِزَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ بِخُبْزٍ وَلَحْمٍ، فَأُرْسِلْتُ عَلَى الطَّعَامِ دَاعِيًا فَيَجِيءُ قَوْمٌ فَيَأْكُلُونَ وَيَخْرُجُونَ، ثُمَّ يَجِيءُ قَوْمٌ فَيَأْكُلُونَ وَيَخْرُجُونَ، فَدَعَوْتُ حَتَّى مَا أَجِدُ أَحَدًا أَدْعُو فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ مَا أَجِدُ أَحَدًا أَدْعُوهُ. قَالَ: "ارْفَعُوا طَعَامَكُمْ". وَبَقِيَ ثَلاَثَةُ رَهْطٍ يَتَحَدَّثُونَ فِي الْبَيْتِ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ فَانْطَلَقَ إِلَى حُجْرَةِ عَائِشَةَ فَقَالَ: «السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ وَرَحْمَةُ اللَّهِ». فَقَالَتْ: وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، كَيْفَ وَجَدْتَ أَهْلَكَ بَارَكَ اللَّهُ لَكَ؟ فَتَقَرَّى حُجَرَ نِسَائِهِ كُلِّهِنَّ، يَقُولُ لَهُنَّ كَمَا يَقُولُ لِعَائِشَةَ، وَيَقُلْنَ لَهُ كَمَا قَالَتْ عَائِشَةُ، ثُمَّ رَجَعَ النَّبِيُّ ﷺ فَإِذَا ثَلاَثَةُ رَهْطٍ فِي الْبَيْتِ يَتَحَدَّثُونَ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ شَدِيدَ الْحَيَاءِ، فَخَرَجَ مُنْطَلِقًا نَحْوَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ فَمَا أَدْرِي أَخْبَرْتُهُ أَوْ أُخْبِرَ أَنَّ الْقَوْمَ خَرَجُوا، فَرَجَعَ حَتَّى إِذَا وَضَعَ رِجْلَهُ فِي أُسْكُفَّةِ الْبَابِ دَاخِلَةً وَأُخْرَى خَارِجَةً أَرْخَى السِّتْرَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ، وَأُنْزِلَتْ آيَةُ الْحِجَابِ[1].

٤٧٩٣ ـ ئەنەس ﷺ دەڵێ: زەینەبی کچی جەحش گوێزرایەوە بە نان وگۆشت (نانی زەماوەندەکە کرا)، جا من نێردرام بە بانگ کەری خەڵکی بۆ نان خواردن، ئەنجا کەسانێك دەهاتن و نانیان دەخوارد و دەڕۆشتنە دەرەوە، پاشان کەسانێکی تر دەهاتن و نانیان دەخوارد و دەڕۆشتنە دەرەوە، جامن هەر خەڵکم بانگ

(١) بڕوانە: ٤٧٩١.

دەکرد هەتا کەسم دەست نەکەوت بانگی بکەم، ئیتر وتم: ئەی پێغەمبەری خوا کەس نییە بانگی کەم فەرمووی: ((خواردنەکاتان لابەن و هەڵگرن)) سێ پیاو مانەوە لەماڵەوەدا قسەیان دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ ڕۆشتە دەرەوە و ڕۆشت بەرەو ژوورەکەی عائیشە ﵂ فەرمووی: ((سەلام و ڕەحمەتی خواتان لێ بێ خەڵکی ئەم ماڵە)) عائیشە وتی: سەلام و ڕەحمەتی خوا لەسەر تۆش بێ، خێزانەکەت چۆن بوو خوا فەرووبەرەکت داری بکات بۆت، جا پێغەمبەر ﷺ ژووری هەموو هاوسەرەکانی بەسەرکردەوە، ئەوەی بە عائیشەی فەرموو بە هەموو هاوسەرەکانی دەفەرموو، ئەوانیش بە وێنەی وتەکەی عائیشە وەڵامیان دەدایەوە، لە پاشان پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە[1]، جا بینی سێ کەس لە ماڵەوەن قسە دەکەن - پێغەمبەر ﷺ زۆر بەشەرم بوو - ئەنجا پێغەمبەر ﷺ دەرچوو ڕوو بە ژوورەکەی عائیشە ڕۆشت. جا نازانم من پێم وت - یان پێی وترا - کە ئەو کەسانە (ی دانیشتبوون) ڕۆشتنە دەرەوە، ئیتر گەڕایەوە و هات قاچێکی خستە ئەو دیوی دەرگاکە و قاچەکەی تری لە دەرەوەی دەرگاکە بوو پەردەکەی لە نێوان من و خۆیدا دادایەوە و ئایەتی حیجاب دابەزی.

٤٧٩٤ - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بَكْرٍ السَّهْمِيُّ، حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ - ﵁ قَالَ: أَوْلَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ بَنَى بِزَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ، فَأَشْبَعَ النَّاسَ خُبْزًا وَلَحْمًا ثُمَّ خَرَجَ إِلَى حُجَرِ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ كَمَا كَانَ يَصْنَعُ صَبِيحَةَ بِنَائِهِ فَيُسَلِّمُ عَلَيْهِنَّ وَيَدْعُو لَهُنَّ وَيُسَلِّمْنَ عَلَيْهِ وَيَدْعُونَ لَهُ فَلَمَّا رَجَعَ إِلَى بَيْتِهِ رَأَى رَجُلَيْنِ جَرَى بِهِمَا الْحَدِيثُ، فَلَمَّا رَآهُمَا رَجَعَ عَنْ بَيْتِهِ، فَلَمَّا رَأَى الرَّجُلَانِ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ رَجَعَ عَنْ بَيْتِهِ وَثَبَا مُسْرِعَيْنِ، فَمَا أَدْرِي أَنَا أَخْبَرْتُهُ بِخُرُوجِهِمَا أَمْ أُخْبِرَ فَرَجَعَ حَتَّى دَخَلَ الْبَيْتَ، وَأَرْخَى السِّتْرَ

(١) بۆ ئەو ماڵەی زەینەبی لێ بوو ﵂.

بَيْنِي وَبَيْنَهُ وَأُنْزِلَتْ آيَةُ الْحِجَابِ. وَقَالَ ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنِي حُمَيْدٌ، سَمِعَ أَنَسًا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٤٧٩٤ -ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ زەینەبی كچی جەحشی گواستەوە نانی شایی دروست كرد و خەڵكی تێر كرد لە نان و گۆشت، لە پاشان ڕۆشتە دەرەوە بۆ بەسەركردنەوەی ماڵی دایكانی باوەڕداران (خێزانەكانی)، وەك چۆن پێشتر وای دەكرد، بەیانی (ئەو شەوەی) خێزانی دەگواستەوە جا سەلامی لێ دەكردن و دوعای بۆ دەكردن هاوسەرانیشی سەلامیان لەو دەكرد و دوعایان بۆ دەكرد، جا كاتێ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە دوو پیاوی بینی قسە و باس هەبوو لە نێوانیاندا، ئەنجا كە ئەو دووانەی بینی گەڕایەوە نەڕۆشتە ماڵەوە، جا كە دوو پیاوەكە پێغەمبەری خوایان ﷺ بینی گەڕایەوە و نەهاتە ماڵەوە بە پەلە ڕۆشتن (ئەنەس دەڵێ:) جا نازانم من هەواڵم پێدا بە دەرچوونیان لە ماڵ یان هەواڵی پێدرا، ئیتر گەڕایەوە هات هەتا ڕۆشتە ژوورەوە، پەردەكەی لە نێوان من و خۆیدا دادایەوە و ئایەتی حیجاب دابەزی.**

**- (هەمان فەرموودەیە پێشوو) ئیبنو ئەبی مەریەم وتی: یەحیا بۆی گێڕاینەوە وتی: حومەید بۆی گێڕاینەوە كە لە ئەنەسی بیستووە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

٤٧٩٥ - حَدَّثَنِي زَكَرِيَّاءُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: خَرَجَتْ سَوْدَةُ بَعْدَ مَا ضُرِبَ الْحِجَابُ لِحَاجَتِهَا، وَكَانَتِ امْرَأَةً جَسِيمَةً لاَ تَخْفَى عَلَى مَنْ يَعْرِفُهَا، فَرَآهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فَقَالَ يَا سَوْدَةُ: أَمَا وَاللَّهِ مَا تَخْفَيْنَ عَلَيْنَا، فَانْظُرِي كَيْفَ تَخْرُجِينَ، قَالَتْ: فَانْكَفَأَتْ رَاجِعَةً، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَيْتِي، وَإِنَّهُ لَيَتَعَشَّى.

---

(١) بڕوانە: ٤٧٩١.

وَفِي يَدِهِ عَرْقٌ فَدَخَلَتْ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي خَرَجْتُ لِبَعْضِ حَاجَتِي فَقَالَ لِي عُمَرُ كَذَا وَكَذَا. قَالَتْ: فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ ثُمَّ رُفِعَ عَنْهُ وَإِنَّ الْعَرْقَ فِي يَدِهِ مَا وَضَعَهُ فَقَالَ: «إِنَّهُ قَدْ أُذِنَ لَكُنَّ أَنْ تَخْرُجْنَ لِحَاجَتِكُنَّ»[1].

**٤٧٩٥ - عائیشه ﵂ دەڵێ: - دوای ئەوەی حیجاب فەرزکرابوو - سەودە ڕۆشتە دەرەوە بۆ دەست بە ئاو گەیاندن کە ئافرەتێکی بەخۆوە بوو کەسێك بیناسیایە شاراوە نەبوو لێی، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ بینی و وتی: ئەی سودە وڵلاهی دەتناسمەوە بۆیە بزانە چۆن دەڕۆیتە دەرەوە (سەودەش) وتی: منیش بەرەو دواوە گەڕامەوە لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی من بوو نانی ئێوارەی دەخوارد، گرتکێکی[2] بەدەستەوە بوو جا ڕۆشتە ژوورەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ڕۆشتمە دەرەوە بۆ پێویستیەکی خۆم، عومەر ئاوا و ئاوای پێ وتم، دەڵێت: ئیتر خوا نیگای بۆ دابەزاند، لە پاشان کە حاڵەتی نیگا بۆ هاتنی لەسەر لاچوو هێشتا گرتکەکەی بەدەستەوە بوو دایـنەنا بوو فەرمووی: ((بێگومان و بە دڵنیایی یەوە ڕێگەتان پێدراوە کە لە ماڵ بڕۆنە دەرەوە بۆ پێویستی خۆتان)).**

**٩ - بابٌ:** ﴿ إِن تُبْدُوا۟ شَيْـًٔا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٥٤﴾ لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِىٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُنَّ ۗ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدًا ﴿٥٥﴾ ﴾ الأحزاب

(١) بروانە: ١٤٦.

(٢) گرتك: پارچە ئێسقانێكە كە گۆشتی پێوە بێ. فەرهەنگی خاڵ: ل ٤٨٩

## ٩ - باسێک: (ئەگەر هەر شتێک ئاشکرا بکەن (بیڵێن) یا بیشارنەوە (لە دڵتاندا) ئەوە بەڕاستی خوا زانایە بە هەموو شتێک، هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ هیچ گوناهێکیان لەسەر نییە (ئەگەر بێ حیجاب بن) لای باوکیان و کوڕانیان و برایانیان وبرازاکانیان و خوشکە زاکانیان و لای ئافرەتانی هاودینیان و لای غولام و کەنیزانی خۆیان، وە لە خوا بترسن بەڕاستی خوا چاودێر و ئاگادارە بەسەر هەمو و شتێکدا)

٤٧٩٦ - حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ حَدَّثَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ قَالَت: اسْتَأْذَنَ عَلَيَّ أَفْلَحُ أَخُو أَبِي الْقُعَيْسِ بَعْدَ مَا أُنْزِلَ الْحِجَابُ، فَقُلْتُ: لاَ آذَنُ لَهُ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ فِيهِ النَّبِيَّ ﷺ فَإِنَّ أَخَاهُ أَبَا الْقُعَيْسِ لَيْسَ هُوَ أَرْضَعَنِي، وَلَكِنْ أَرْضَعَتْنِي امْرَأَةُ أَبِي الْقُعَيْسِ، فَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَفْلَحَ أَخَا أَبِي الْقُعَيْسِ اسْتَأْذَنَ، فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ حَتَّى أَسْتَأْذِنَكَ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَمَا مَنَعَكِ أَنْ تَأْذَنِينَ عَمُّكِ». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الرَّجُلَ لَيْسَ هُوَ أَرْضَعَنِي، وَلَكِنْ أَرْضَعَتْنِي امْرَأَةُ أَبِي الْقُعَيْسِ. فَقَالَ: «ائْذَنِي لَهُ فَإِنَّهُ عَمُّكِ، تَرِبَتْ يَمِينُكِ». قَالَ عُرْوَةُ: فَلِذَلِكَ كَانَتْ عَائِشَةُ تَقُولُ حَرِّمُوا مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا تُحَرِّمُونَ مِنَ النَّسَبِ[١].

**٤٧٩٦ ـ عوروەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە عائیشە ﵂ وتی: پاش ئەوەی (حوکمی) حیجاب دابەزێنرا بوو ئەفلەحی برای ئەبی قوعەیس مۆڵەتی خواست بێتە ژوورەوە بۆ لای من، منیش وتم: مۆڵەتی نادەم لەو بارەیەوە تا مۆڵەت لە پێغەمبەر ﷺ نەخوازم، بێگومان براکەی ئەبی قوعەیس ئەو کەسە نییە**

(١) بڕوانە: ٢٦٤٤.

(ژنەکەی) شیری پێدابم، بەڵکو ژنی ئەبی قوعەیس شیری بە من داوە، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لام و منیش عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئەفلەحی برای ئەبی قوعەیس داوا دەکات بێتە ژوورەوە بۆ لای من، ڕازی نەبووم کە مۆڵەتی بدەم تا مۆڵەت لە تۆ نەخوازم پێغەمبەری ﷺ فەرمووی: ((چ شتێك ڕێگرتە لەوەی مۆڵەتی بدەیت؟ ئەو مامەتە)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان ئەو پیاوە ئەو کەسە نییە کە شیری بە من داوە، بەڵکو ژنی ئەبی قوعەیس شیری بەمن داوە، فەرمووی: ((مۆڵەتی بدە چونکە بێگومان ئەو مامی تۆیە هەژارۆکەی نەزان)).

عوروە دەڵێ: جا لەبەر ئەوە عائیشە ﵂ هەمیشە دەیوت: بە مەحرەمی دانێن بەهۆی شیر خواردنەوە، وەك ئەوەی بە مەحرەمی دادەنێن بەهۆی ڕەچەڵەك و نەسەبەوە.

١٠ - **بابُ قَوْلِه:** ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَـٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ ۚ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾ الأحزاب: **قالَ أبُو العَالِيَة: صَلاَةُ اللهِ ﷻ ثَنَاؤُهُ عَلَيْه عِنْدَ المَلاَئِكَةِ، وَصَلاَةُ المَلاَئِكَةِ: الدُّعَاءُ. قالَ ابن عَبَّاسٍ:** ﴿ يُصَلُّونَ ﴿٥٦﴾ ﴾ الأحزاب يُبَرِّكُونَ. ﴿ لَنُغْرِيَنَّكَ ﴿٦٠﴾ ﴾ الأحزاب **لَنُسَلِّطَنَّكَ**.

# ١٠ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە (بەڕاستی خوا و فریشتەکانی سەڵاوات دەدەن لەسەر پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ئێوەش سەڵاوات و سەلامی زۆری لەسەر بدەن)

- ئەبولعالییە دەڵێ: (صَلاَةُ اللهِ) ستایشی خوایە ﷻ لەسەر پێغەمبەر ﷺ لای فریشتەکان، وە (صَلاَةُ المَلاَئِكَةِ) دوعایە (بۆ پێغەمبەر ﷺ).

- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ يُصَلُّونَ ﴾ (خوا و فریشتەکان) دوعای فەڕ و بەرەکەتی بۆ دەکەن. ﴿ لَنُغْرِيَنَّكَ ﴾ بێگومان زاڵت دەکەین (بەسەریاندا).

٤٧٩٧ - حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ، عَنِ الْحَكَمِ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَمَّا السَّلاَمُ عَلَيْكَ فَقَدْ عَرَفْنَاهُ فَكَيْفَ الصَّلاَةُ قَالَ: «قُولُوا اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ»[١].

**٤٧٩٧ - کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ دەڵێ: وترا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە (شێوەی) سەلام کردن لێت، ئەوە پێشتر زانیومانە، بەڵام چۆن سڵاوات بدەین لەسەرت؟ فەرموووی: ((بڵێن:** اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ**))**

**واتە: ئەی خوایە میهرەبانی و بەزەیی خۆت بڕژە بەسەر موحەممەد و بەسەر کەسوکاری موحەممەددا هەر وەکو ڕشتووتە بەسەر ئیبراهیم و بەسەر کەسوکاری ئیبراهیم دا، بێگومان تۆشایستەی سوپاس و شکۆمەندیت وە (خوایە) فەڕ و بەرەکتی خۆت بڕژە بەسەر موحەممەد و کەسوکاری موحەممەددا، هەر وەکو فەڕ و بەرەکەتی خۆت ڕشتووە بەسەر ئیبراهیم و کەس و کاری ئیبراهیم دا، بەڕاستی تۆ شایستەی سوپاس و بڵندی شکۆمەندیت).**

---

(١) بڕوانە: ٣٣٧٠.

٤٧٩٨ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ الْهَادِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خَبَّابٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا التَّسْلِيمُ فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ قَالَ: «قُولُوا اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ». قَالَ أَبُو صَالِحٍ عَنِ اللَّيْثِ «عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ».

حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حَمْزَةَ، حَدَّثَنَا ابن أَبِي حَازِمٍ وَالدَّرَاوَرْدِيُّ، عَنْ يَزِيدَ وَقَالَ: "كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَآلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَآلِ إِبْرَاهِيمَ"[1].

**٤٧٩٨ -ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە (شێوەی) سەلام کردن بوو (لێت)، ئەی چۆن سڵاوات بدەین لەسەرت؟ فەرمووی:**

((**بڵێن:** اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ)).

**واتە: ((ئەی خوایە گیان میهرەبانی و بەزەیی خۆت بڕژە بەسەر موحەممەددا کە بەندە و پێغەمبەری تۆیە هەر وەك ڕشتووتە بەسە کەسوکاری ئیبراهیم دا، وە (خوایەگیان) فەڕ و بەرەکەتی خۆت بڕژە بەسەر موحەممەد و بەسەر کەس و کاری موحەممەددا، هەر وەك ڕشتووتە بەسەر ئیبراهیمدا))**

**- ئەبو صالح: دەگێڕێتەوە لە لەیسەوە (و بەم شێوەیە گێڕاویەتیەوە) دەڵێ: ( ((فەڕ و بەرەکەتی خۆت بڕژە) بەسەر موحەممەد و بەسەر کەس و کاری موحەممەددا، هەروەك فەڕ و بەرەکەتت ڕشتووە بەرە کەس وکاری ئیبراهیم دا))**

**- هەمان فەرموودە ئیبنو ئەبی حازیم و دەراوەردیی گێڕاویانەتەوە لەیەزیدەوە (بەم جۆرە) فەرمووی: ((هەر وەکو میهرەبانی و بەزەیی خۆت ڕشتووە بەسەر**

---

(١) بږوانە: ٦٣٥٨.

ئیبراهیم دا، وه (خوایه) فەڕ و بەرەکەتی خۆت بڕژه بەسەر موحەممەد و کەس و کاری موحەممەددا، هەر وەکو فەڕ و بەرەکەتی خۆت ڕشتووه بەسەر ئیبراهیم و کەس و کاری ئیبراهیم دا)).

١١ - بَابٌ: قَوْلِهِ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْا۟ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُوا۟ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا ﴿٦٩﴾ ﴾ الأحزاب

٤٧٩٩ - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، حَدَّثَنَا عَوْفٌ، عَنِ الْحَسَنِ وَمُحَمَّدٍ وَخِلَاسٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مُوسَى كَانَ رَجُلاً حَيِيًّا، وَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْا۟ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُوا۟ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا ﴿٦٩﴾ ﴾ الأحزاب[1].

## ١١ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وەک ئەو کەسانە مەبن کە ئازاری مووسایان دا ⊠ (تۆمەتیان بۆ کرد)، جا خوامووسای پاک کردەوە لەوەی دەیانووت، وە (مووسا) لای خوا ڕێز و پلە و پایەی هەبوو)

٤٧٩٩ -ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان مووسا ﷺ پیاوێکی زۆر بەشەرم و حەیابوو، ئەوەش مەبەستی ئەم ئایەتەیە[2] (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە وەك ئەو کەسانە مەبن کە ئازاری مووسایان دا. (تۆمەتیان بۆ دروست کرد) ئەنجا مووسای پاك کردەوە لەوەی دەیان وت، (مووسا) لای خوا خاوەن ڕێز و پلە بوو).

---

(١) بروانه: ٢٧٨.

(٢) کە خەڵکی مەدینە دەترسێنێ لەوەی ئازاری پێغەمبەر ﷺ بدەن هەرچۆنێك بەنو ئیسرائیل ئازاری مووسایان دا تۆمەتبارییان کرد بە قۆرە یان نەخۆشی بەڵەکی هەیە. بروانە : إرشاد الساری، ٥٣١/١٠.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٣٤ - سورة سَبَأ

يُقَالُ: ﴿ مُعَٰجِزِينَ ﴿٥﴾ ﴾ سبأ: مُسَابِقِينَ بِفَائِتِينَ ﴿ بِمُعۡجِزِينَ ﴿١٣٤﴾ ﴾ الأنعام: مُغَالِبِينَ. ﴿ سَبَقُوٓاْ ﴿٥٩﴾ ﴾ الأنفال: فَاتُوا. ﴿ لَا يُعۡجِزُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ الأنفال: لَا يَفُوتُونَ. ﴿ يَسۡبِقُونَا ﴿٤﴾ ﴾ العنكبوت: يُعْجِزُونَا قوله: ﴿ بِمُعۡجِزِينَ ﴿١٣٤﴾ ﴾ الأنعام: بِفَائِتِينَ، وَمَعْنَى ﴿ مُعَٰجِزِينَ ﴿٥﴾ ﴾ سبأ: مُغَالِبِينَ يُرِيدُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا أَنْ يُظْهِرَ عَجْزَ صَاحِبِهِ. مِعْشَارٌ. عُشْرٌ. الأُكُلُ الثَّمَرُ. ﴿ بَٰعِدۡ ﴿١٩﴾ ﴾ سبأ: وَبَعِّدْ وَاحِدٌ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ لَا يَعۡزُبُ ﴿٣﴾ ﴾ سبأ: لَا يَغِيبُ. العَرِمُ السُّدُّ مَاءٌ أَحْمَرُ أَرْسَلَهُ اللَّهُ فِي السُّدِّ فَشَقَّهُ وَهَدَمَهُ وَحَفَرَ الوَادِيَ، فَارْتَفَعَتَا عَنِ الجَنْبَيْنِ، وَغَابَ عَنْهُمَا المَاءُ فَيَبِسَتَا، وَلَمْ يَكُنِ المَاءُ الأَحْمَرُ مِنَ السُّدِّ، ولكن كَانَ عَذَابًا أَرْسَلَهُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنْ حَيْثُ شَاءَ. وَقَالَ عَمْرُو بْنُ شُرَحْبِيلَ: العَرِمُ المُسَنَّاةُ بِلَحْنِ أَهْلِ اليَمَنِ. وَقَالَ غَيْرُه العَرِمُ الوَادِي. السَّابِغَاتُ الدُّرُوعُ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ( يُجَازى): يُعَاقَبُ.

﴿ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ﴿٤٦﴾ ﴾ سبأ: بِطَاعَةِ اللَّهِ. ﴿ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ﴿٤٦﴾ ﴾ سبأ: وَاحِدٌ وَاثْنَيْنِ. ﴿ ٱلتَّنَاوُشُ ﴿٥٢﴾ ﴾ سبأ: الرَّدُّ مِنَ الآخِرَةِ إِلَى الدُّنْيَا. ﴿ وَبَيۡنَ مَا يَشۡتَهُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾ سبأ: مِنْ مَالٍ أَوْ وَلَدٍ أَوْ زَهْرَةٍ.

﴿ بِأَشۡيَاعِهِم ﴿٥٤﴾ ﴾ سبأ: بِأَمْثَالِهِمْ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ كَٱلۡجَوَابِ ﴿١٣﴾ ﴾ سبأ: الْجَوْبَةِ مِنَ الأَرْضِ. الخَمْطُ الأَرَاكُ. وَالأَثَلُ الطَّرْفَاءُ. العَرِمُ الشَّدِيدُ.

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٣٤ - (تەفسیری ) سوورەتی سەبەء

دەوترێت: ﴿ مُعَٰجِزِينَ ﴾: (وادەزانن) لەدەست دەرچوون.﴿ بِمُعۡجِزِينَ ﴾ لەدەست دەرچوان.

. ﴿ مُعَٰجِزِينَ ﴾ پەکخەران، ماندوکەران. ﴿ سَبَقُوٓاْ ﴾ تێپەڕین. ﴿ لَا يُعۡجِزُونَ ﴾ دەستەوسانمان ناکەن.﴿ يَسۡبِقُونَا ﴾: (وادەزانن) دەستەوسانمان دەکەن. ئەم فەرمایشتە: ﴿ بِمُعۡجِزِينَ ﴾ لە دەست دەرچوان، وەمانای: (مُعَاجِزِينَ) زاڵبوان و پەکخەران، هەرمیەك لەو دوو کەسە دەیەوێ دەستە پاچەیی بەرانبەرەکەی دەرخات.

(مِعْشَارٌ): دەیەك: (الأُكُلُ): بەروبومی درەخت. ﴿ بَٰعِدۡ ﴾ و (بَعِّدْ) [1]: یەك مانایان هەیە واتە: (ڕێگای سەفەرمان) دوور بخەرەوە. موجاهید دەڵێ: ﴿ لَا يَعۡزُبُ ﴾: ون نابێ. (العَرِمُ): بەنداو، ئاوێکی سوور بوو خوا ناردی بۆ ناو بەنداوە کەو درز و کەلێنی کردە بەنداوەکە و ڕوخاندی و شیوەکەی هەڵکەند، جا هەردوو باخەکە بە باخی نەمان و ئاویان نەما و وشك بوون، ئاوە سورەکەش ئاوی بەنداوەکە نەبوو، بەڵکو سزایەك بوو خوا ناردبووی بۆیان لە شوێنێکەوە کە خۆی ویستی.

-عەمری کوڕی شورەحبیل دەڵێ: (العَرِمُ): بەربەست و دیوارێکە (لەبەردەم شیوێکدا دروست دەکرێ تا ئاوەکە بەرز بێتەوە و بڕوات بەسەر زەوی و دەوروبەریدا) بەزمانی خەڵکی یەمەن.

---

(١) (بَعِّدْ) خوێندنەوەی ئیبنو کەسیر و ئەبی عەمر و هیشامە لە ئیبنو عامیرەوە، حەوت قورئان خوێنەکەی کەیان بە ﴿ بَٰعِدۡ ﴾ خوێندویانەتەوە.

-جگە لە عەمر دەڵێ: (العَرِمُ): شیو و دۆڵە. (السَّابِغَاتُ):زرێیانێك (كە هەموو لەش داپۆشێت).

-موجاهید دەڵێ: (يُجَازى) [1] سزادەدرێت، تۆڵەی لێ دەسەنرێت. ﴿ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ﴾: (بە یەك شت ئامۆژگاریتان دەكەم) ئەویش گوێڕایەڵی و فەرمان بەرداری خوایە. ﴿ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ﴾ دوو دوو، یەك یەك. ﴿ ٱلتَّنَاوُشُ ﴾ [2]: گەڕانەوە لە دوا ڕۆژەوە بۆ دونیا. ﴿ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ ﴾ (ئەوەی حەزی لێ دەكەن) لەسامان و كوڕ و جوانی و خۆشی (دونیا).﴿ بِأَشْيَاعِهِم ﴾ بە هاوشێوەكانیان.

-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ كَٱلْجَوَابِ ﴾: وە حەوزی گەورە لە زەویدا (گۆماوێكی خڕی گەورە لە زەویدا). ( الخَمْطُ ): داری ئەراك (داری سیواك). (الأَثْلُ): داری گەز (العَرِمُ): سەخت و بەهێز.

١ - **بابٌ:** ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُواْ ٱلْحَقَّ وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ﴾ سبأ

## ١ - باسێك: (هەتا كاتێ ترس و بیم لە دڵی (تكاكاران) لا دەبرێ [3]، بەیەكتری دەڵێن: پەروەردگارتان چی بڕیارێكی فەرمووە؟ دەڵێن: وتە ڕاستەكەی فەرمووە (كە ڕێگەدانە بە تكاكردن) وە تەنها (خوا) بەرز و بڵند و گەورەیە)

٤٨٠٠ - حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا عَمْرٌو، قَالَ: سَمِعْتُ عِكْرِمَةَ يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَضَى اللَّهُ الأَمْرَ فِي السَّمَاءِ ضَرَبَتِ

---

(١) (يُجَازى) خوێندنەوەی ئیبنو كەسیر و نافیع ونەبی عەمرو عاصیمە لە ڕیوایەتی نەبی بەكرو نەبی جەعفەرەوە، بەڵام حەمزەو كیسائی حەفص لەعاصیمەوە، وە یەعقوب خەلەف بە (نُجَٰزِيٓ ) خوێندویانەتەوە.

(٢) التناوش، بەدەست هێنان، دەست پێ گەیشتن.

(٣) بەهۆی ڕێگە پێدانی شەفاعەت.

الْمَلَائِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خُضْعَانًا لِقَوْلِهِ، كَأَنَّهُ سِلْسِلَةٌ عَلَى صَفْوَانٍ، فَإِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا: مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قَالُوا لِلَّذِي قَالَ: الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ. فَيَسْمَعُهَا مُسْتَرِقُ السَّمْعِ، وَمُسْتَرِقُ السَّمْعِ هَكَذَا بَعْضُهُ فَوْقَ بَعْضٍ -وَوَصَفَ سُفْيَانُ بِكَفِّهِ فَحَرَفَهَا وَبَدَّدَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ - فَيَسْمَعُ الكَلِمَةَ، فَيُلْقِيهَا إِلَى مَنْ تَحْتَهُ ثُمَّ يُلْقِيهَا الآخَرُ إِلَى مَنْ تَحْتَهُ، حَتَّى يُلْقِيَهَا عَلَى لِسَانِ السَّاحِرِ أَوِ الْكَاهِنِ، فَرُبَّمَا أَدْرَكَ الشِّهَابُ قَبْلَ أَنْ يُلْقِيَهَا، وَرُبَّمَا أَلْقَاهَا قَبْلَ أَنْ يُدْرِكَهُ، فَيَكْذِبُ مَعَهَا مِائَةَ كَذْبَةٍ، فَيُقَالُ أَلَيْسَ قَدْ قَالَ لَنَا يَوْمَ كَذَا وَكَذَا كَذَا وَكَذَا؟! فَيُصَدَّقُ بِتِلْكَ الْكَلِمَةِ الَّتِي سَمِعَ مِنَ السَّمَاءِ»[١].

**٤٨٠٠ - ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ((کاتێ خوا لە ئاسمان بڕیاری کارێکی دا فریشتەکان باڵەکانیان دەدەن بەیەکدا بەمل کەچی بۆ فەرمایشتەکەی خوا، (دەنگی ئەو فەرمایشتەی خودا) وەك دەنگ و زڕەی زنجیرێك وایە بدرێت بەسەر تاوێرە بەردێکی سافدا [٢]، کاتێ ترسەکەی دڵیان ناهێڵرێ دەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرمووی؟ دەڵێن بەوەی پرسیارەکەی کردووە: خوا وتەی هەقی فەرمووە ئەو (خودایە) بەرز و بڵند و گەورەیە، جا ئەو (شەیتانانەی) بەدزیەوە گوێ دەگرن ئەو وتەیە دەبیستن، ئەوانیش (شەیتانانەی) بەدزیوە گوێ دەگرن ئابەو جۆرە هەندێکیان لە سەر و هەندێکیانەوەن - سوفیان بەدەست ئەوەی باس کرد جا پەنجەکانی لارکردەوە پەنجەکانی لە یەکتری جیاکردەوە - جا وتەیەك دەبیستێ دەینێرێ بۆ ئەوە لە خواریەوەیە، پاشان ئەوەی تریش دەینێرێ بۆ ئەوەی خوار خۆی (بەو جۆرە دەڕوا) هەتا کۆتاهەمینیان دەیخاتە سەر زمانی جادووگەر یا کۆڵەنانی، جا لەوانەیە ئاگرەکە بەر شەیتانە گوێهەڵخەرەکە بکەوێ پێش ئەوەی وتەکە بگەیەنێ (بە هاورێکەی و بیسوتێنێ)، وە لەوانەشە بیگەیەنێ (بەوەی لە**

(١) بڕوانە: ٤٧٠١.

(٢) دەترسن وا دەزانن فەرمانی کاری قیامەتە.

**خواریەوەیە) پێش ئەوەی گڕی ئاگرەکە بیگاتێ و لێی بدات (و بیسوتێنێ)، جا ئەویش (جادوگەر یا کۆڵەنانی) لەگەڵ ئەو وتەیەدا سەد درۆی لەگەڵدا دەکات، جا دەوترێت: ئایا بەڕاستی پێی نەوتین ئەو ڕۆژە ئەو ڕۆژە ئەوە و ئەوە دەبێ؟ جا بەهۆی ئەو وتەیەوە کە لە ئاسمانەوە بیستی باوەڕ (بەهەمو درۆکانی تری) دەکرێ.**

٢ - **بابٌ:** ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا نَذِيرٞ لَّكُم بَيۡنَ يَدَيۡ عَذَابٖ شَدِيدٖ ۝٤٦﴾ سبأ

٤٨٠١ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ خَازِمٍ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: صَعِدَ النَّبِيُّ ﷺ الصَّفَا ذَاتَ يَوْمٍ فَقَالَ: «يَا صَبَاحَاهْ[1]» فَاجْتَمَعَتْ إِلَيْهِ قُرَيْشٌ قَالُوا: مَا لَكَ؟ قَالَ: «أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ الْعَدُوَّ يُصَبِّحُكُمْ أَوْ يُمَسِّيكُمْ أَمَا كُنْتُمْ تُصَدِّقُونِي؟». قَالُوا: بَلَى. قَالَ: «فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ». فَقَالَ أَبُو لَهَبٍ: تَبًّا لَكَ أَلِهَذَا جَمَعْتَنَا؟! فَأَنْزَلَ اللَّهُ:﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ۝١﴾ المسد[2].

## ٢ - باسێک: (ئەو (پێغەمبەر ﷺ) تەنها ترسێنەرە بۆ ئێوە لە پێش هاتنی سزای سەختی قیامەت)

**٤٨٠١ - ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێکیان ڕۆشتە سەر (کێوی) صەفا و فەرمووی: ((هۆ خەڵکینە فریاکەون))، ئەنجا قوڕەیشیەکان لێی کۆبوونەوە وتیان: ئەوە چیتە؟ (چی ڕووی داوە؟) فەرمووی: ((پێم بڵێن ئەگەر هەواڵتان پێ بدەم بە دڵنیاییەوە دوژمن بەیانی زوو یان ئێوارە دەدات**

---

(١) (يَا صَبَاحَاهْ) ئەم وشەیە کەسێك دەیڵێ داوای بەهاناوەچوون بکات.ئەسڵی وشەکە لەوەوە هاتوە کاتێ هاواری پەلاماردان دەکەن دەوترێت چونکە بەزۆری لەکاتی بەیانیاندا هێرش و پەلاماریان بردووە، وە ڕۆژی هێرش وپەلاماریان بە (يوم الصباح) وەك ئەوە وایە کەسێك کە دەڵێ، (يَا صَبَاحَاهْ) هاوار دەکات کە دوژمن هاتۆتە سەرمان. إرشاد الساري:٨/١١.

(٢) بڕوانە: ١٣٩٤.

بەسەرتاندا، ئایا ئێوە باوەڕم پێ دەكەن؟)) وتیان: بەڵێ (باوەڕت پێ دەكەین) فەرمووی: ((دەی بەڕاستی من ئاگادار كەرەوەی ئێوەم پێش (هاتنی) سزای سەختی (قیامەت))، ئەبولەهەب وتی: تیاچوون بۆ تۆ بۆ ئا ئەمە كۆت كردینەوە؟!

ئیتر بەو هۆیەوە خوا ئەم سوڕەتەی دابەزاند: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ﴾ واتە: لەناوچێ هەردوو دەستی ئەبو لەهەب وە لەناویش چوو.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٣٥ - سورة الملائكة

قَالَ مُجَاهِدٌ: القِطْمِيرُ: لِفَافَةُ النَّوَاةِ. ﴿مُثْقَلَةٌ ١٨﴾ فاطر: مُثَقَّلَةٌ. وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿ٱلْحَرُورُ ٢١﴾ فاطر : الحَرُورُ بِالنَّهَارِ مَعَ الشَّمْسِ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ٱلْحَرُورُ﴾ بِاللَّيْلِ، وَالسَّمُومُ بِالنَّهَارِ.

﴿وَغَرَابِيبُ ٢٧﴾ فاطر: أَشَدُّ سَوَادٍ، الغِرْبِيبُ: الشَّدِيدُ السَّوَادِ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٣٥ - (تەفسیری) سوڕەتی مەلائیكە[1] (فاطِر)

-موجاهید دەڵێ: (القِطْمِيرُ):ئەو بەرگە (تەنكەیە بە) ناوكی خورماوەیە.

﴿مُثْقَلَةٌ﴾:بارگرانێ (گوناهباری).

(١) كە مەبەست پێی سوڕەتی (فاطر)ە، چونكە لە سەرەتایەوە باسی فریشتە دەكات بۆیە ئەو ناوەشی هەیە.

-جگە لەموجاهید دەڵێ: ﴿ ٱلْحَرُورُ ﴾: (بای گەرم وسوتێنەری) خۆرمتاوە بەرۆژدا لەگەڵ (گەرما)ی خۆردا.

-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ ٱلْحَرُورُ ﴾: (بای گەرمە) لە شەودا. (السَّمُومُ): بای گەرمە لە ڕۆژدا. ﴿ وَغَرَابِيبُ ﴾: تۆختڕینی ڕەش. (الغِرْبِيبُ) ڕەشی تۆخ.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٣٦ - سورة يس

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ فَعَزَّزْنَا ﴿١٤﴾ ﴾ يس: مَصَائِبَكُم شَدَّدْنَا. ﴿ يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ ﴿٣٠﴾ ﴾ يس: كَانَ حَسْرَةً عَلَيْهِمُ اسْتِهْزَاؤُهُمْ بِالرُّسُلِ. ﴿ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ ﴿٤٠﴾ ﴾ يس: لَا يَسْتُرُ ضَوء أَحَدِهِمَا ضَوْءَ الآخَرِ، وَلَا يَنْبَغِي لَهُمَا ذَلِكَ. ﴿ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ ﴿٤٠﴾ ﴾ يس: يَتَطَالَبَانِ حَثِيثَيْنِ. ﴿ نَسْلَخُ ﴿٣٧﴾ ﴾ يس: نُخْرِجُ أَحَدَهُمَا مِنَ الآخَرِ، وَيَجْرِي كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا ﴿ مِّن مِّثْلِهِۦ ﴿٤٢﴾ ﴾ يس: مِنَ الأَنْعَامِ. (فَكِهُونَ): مُعْجَبُونَ. ﴿ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴿٧٥﴾ ﴾ يس: عِنْدَ الحِسَابِ. وَيُذْكَرُ عَنْ عِكْرِمَةَ ﴿ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾ ﴾ يس: المُوقَرُ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ طَٰٓئِرُكُم ﴿١٩﴾ ﴾ يس مَصَائِبُكُمْ. ﴿ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ يس: يَخْرُجُونَ. ﴿ مَّرْقَدِنَا ﴿٥٢﴾ ﴾ يس: مَخْرَجِنَا. ﴿ أَحْصَيْنَٰهُ ﴿١٢﴾ ﴾ يس: حَفِظْنَاهُ. ﴿ مَكَانَتِهِمْ ﴿٦٧﴾ ﴾ يس: وَمَكَانُهُمْ وَاحِدٌ.

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٣٦ - (تەفسیری) سوڕەتی یاسین

-موجاهید دەڵێ: ﴿ فَعَزَّزْنَا ﴿١٤﴾ ﴾بەهێزمان کرد، پشتیوانمان کرد. ﴿ يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ ﴿٣٠﴾ ﴾ئەو پەشیمانی و داخەیان (بەهۆی) گاڵتە کردنیان بە پێغەمبەران. ﴿ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ ﴾ (خۆر و مانگ) ڕووناکی هیچ کامیان ڕووناکی ئەوەی کەیان داناپۆشێت، وە هیچیان بۆی نییە ئەوە بکات. ﴿ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ ﴾ هەردووکیان (شەو و ڕۆژ) بەشوێن یەکتردا دێن بە بێ دواکەوتن. ﴿ نَسْلَخُ ﴾: (شەو و ڕۆژ) یەکێکیان لەوی تریان دەردێنین، وە هەریەکەیان دەڕوات (بەرەو پێگەی خۆی). ﴿ مِّن مِّثْلِهِۦ ﴾ بەوێنەی (کەشتی) لەوڵاخی سواری. (فَكِهُونَ)[1] سەرسامن، خۆشحاڵن.

﴿ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴾ (سەربازانی ئەمادە کراو) لەکاتی لێپرسینەوە (لە قیامەت) دا.

-وە لە عیکریمەوە گێڕدراوەتەوە وتویەتی: ﴿ ٱلْمَشْحُونِ ﴾ پڕ لە کاڵا و کەل و پەل و شتی وا.

-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ طَٰٓئِرُكُم ﴾: ئەوەی توشتان دەبێ، شوومی و بەد بەختیان. ﴿ يَنسِلُونَ ﴾ (لەگۆڕەکانیان) دێنە دەرەوە.﴿ مَّرْقَدِنَا ﴾ شوێنی هاتنەدەرەوەمان (گۆڕەکانمان). ﴿ أَحْصَيْنَٰهُ ﴾پاراستومانە، هەژمارمان کردووە بە نووسین.

﴿ مَكَانَتِهِمْ ﴾ لەگەڵ (مَكَانُهُمْ) یەك مانان.

---

(١) ئەبو جەعفەر بە (فَكِهُونَ) خوێندویەتیەوە، بەلام ئەوان تر بە: ﴿ فَٰكِهُونَ ﴾ خوێندویانەتەوە. بڕوانە : إرشاد الساري: ١٠/١١.

خوای بەرز و بڵند دەفەرموێ: (هیچ زانیاریەکیان نییە لەبارەیەوە) واتە: بتەکان بێگومان هیچ نازانن. ﴿فِي عَقِبِهِ﴾ لە منداڵ و وەچەکانیدا.﴿ مُقْتَرِنِينَ ﴾ پێکەوە دەڕۆشتن. ﴿ سَلَفًا ﴾ گەلی فیرعەون پێشینانی کافرانی ئوممەتی محەممەدن. ﴿ وَمَثَلًا ﴾ پەند و ئامۆژگاری. ﴿يَصِدُّونَ ﴾ دەیکەنە هاوار و قیڕە (ی خۆشی). ﴿ مُبْرِمُونَ ﴾ لێبڕاوان، بڕیاردەران.﴿ أَوَّلُ الْعَابِدِينَ ﴾ یەکەمی باوەڕداران. ﴿ إِنَّنِي بَرَاءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴾ عەرەب دەڵێ: ئێمە لە تۆ بەرین و پەیوەندیمان پێتەوە نییە، بۆ یەك کەس و دوو کەس کۆمەڵ و نێر و مێ هەر دەوترێت: (بَرَاءٌ) چونکە چاوگە، ئەگەر بڵێ: (بَرِيءٌ) (بۆ یەك کەس) ئەوە بۆ دوو کەس دەوترێ (بَرِيئَانِ) لە کۆیشدا دەوترا (بَرِيئُونَ).

-عەبدوڵڵا بەم جۆرەی خوێندۆتەوە: (إِنَّنِي بَرِيٌّ)[1] بە یای خوێندۆتەوە، (والزُّخْرُفُ): ئاڵتون و زێڕ. (مَلاَئِكَةً يَخْلُفُونَ) (فریشتەکان لەزەویدا) هەندێکیان شوێن هەندێکی تریان دەگرنەوە[2].

## ١ -بابٌ: قَوْلُهُ: ﴿وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّاكِثُونَ ﴿٧٧﴾﴾ الزخرف

٤٨١٩ - حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ عَلَى الْمِنْبَرِ: ﴿وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ﴿٧٧﴾﴾ الزخرف[3].

---

(١) ئەمە خوێندنەوەیەکی شازە، قورئان خوێنەکان بە: ﴿بَرَاءٌ﴾ خوێندویانەتەوە. بڕوانە : إرشاد الساری:١١/٤٨.

(٢) ئەگەر خوا بیویستایە لە جیاتی مرۆڤەکان فریشتەکانی لە زەویدا دانایە.

(٣) بڕوانە: ٣٢٣٠.

# ١ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە (هاوار دەکەن) ئەی مالیک ( کە سەرپەرشتیاری دۆزەخە) با پەروەردگارت بمان مرێنێت (تا رزگاربین)، (مالیکیش) دەڵێ: بێگومان ئێوە دەمێننەوە)

**٤٨١٩ - صەفوانی کوڕی یەعلا لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست لەسەر دوانگە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: (وە (هاوار دەکەن) ئەی مالیك (کە سەرپەرستیاری دۆزەخە) با پەرومردگارت بمان مرێنێت (تا رزگار بین) ).**

وَقَالَ قَتَادَةُ: ﴿ وَمَثَلًا لِّلْآخِرِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾ الزخرف عِظَةً لمن بَعدهُم. وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ ﴾ الزخرف ضَابِطِينَ، يُقَالُ فُلاَنٌ مُقْرِنٌ لِفُلاَنٍ: ضَابِطٌ لَهُ. وَالأَكْوَابُ: الأَبَارِيقُ الَّتِي لاَ خَرَاطِيمَ لَهَا.. وَقَالَ قَتَادَةُ: ﴿ فِىٓ أُمِّ ٱلْكِتَـٰبِ ﴿٤﴾ ﴾جُمْلَةِ الْكِتَابِ أَصْلِ الْكِتَابِ. ﴿ أَوَّلُ ٱلْعَـٰبِدِينَ ﴿٨١﴾ ﴾ الزخرف أَيْ: مَا كَانَ فَأَنَا أَوَّلُ الأَنِفِينَ وَهُمَا لُغَتَانِ رَجُلٌ عَابِدٌ وَعَبِدٌ. وَقَرَأَ عَبْدُ اللَّهِ: ﴿ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَـٰرَبِّ ﴿٣٠﴾ ﴾ الفرقان.وَيُقَالُ: أَوَّلُ الْعَابِدِينَ: الْجَاحِدِينَ مِنْ عَبِدَ يَعْبَدُ

**-قەتادە دەڵێ: ﴿ وَمَثَلًا لِّلْآخِرِينَ ﴾ (کردمانن) بە پەند و ئامۆژگاری بۆ کەسانێ کە دوا ئەوان دێن.**

**-جگە لە قەتادە دەڵێ ﴿ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ ﴾ ڕاگران و ژێر دەست خەران، دەوترێت (فُلاَنٌ مُقْرِنٌ لِفُلاَنٍ) ڕاگرێتی و توانای بەسەریدا هەیە. (الأَكْوَابُ) جام، وە پەرداخ کە دەسکیان نییە، وە قەتادە دەڵێ: ﴿ فِىٓ أُمِّ ٱلْكِتَـٰبِ ﴾ ماکی کتێب [1]، ئەسڵی کتێب. ﴿ أَوَّلُ ٱلْعَـٰبِدِينَ ﴾ واتە: خوای بەبەزەیی کوڕی نەبووە، کەواتە من یەکەمی**

---

(١) واتە: (لوح المحفوظ) بەکوردی پێی دەوترێت: تابلۆی پارێزراو.

ئەو کەسانەم لەوە خۆبە دوور دەگرن [١] (عَابِدٌ وَعَبِدٌ) دوو دەربڕینی عەرەبین. دەوترێت: (رَجُلٌ عَابِدٌ وَعَبِدٌ)[٢].

-وە عەبدوڵلا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ بەم جۆرە ئەم ئایەتەی خوێندوەتەوە ﴿ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ ﴾[٣] وە دەوترێت: ﴿ أَوَّلُ ٱلْعَٰبِدِينَ ﴾ (یەکەمی) دانپیانەران لە (عَبِدَ يَعْبَدُ)ـەوە هاتووە (لەم حاڵەدا بەمانای دانپیانەنانە)[٤].

## ٢ - **بابٌ**: ﴿ أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا أَن كُنتُمْ قَوْمًا مُّسْرِفِينَ ۝٥ ﴾ **الزخرف**

**: مُشْرِكِينَ. واللهِ لَوْ أَنَّ هذا القُرْآنَ رُفِعَ حَيْثُ رَدَّهُ أَوائِلُ هذهِ الأُمَّةِ لَهَلَكُوا.**

﴿ فَأَهْلَكْنَآ أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلْأَوَّلِينَ ۝٨ ﴾ الزخرف: عُقُوبَةُ الأَوَّلِينَ.

﴿ جُزْءًا ۝١٥ ﴾ الزخرف عِدْلًا.

## ٢ - باسێک: (دەی ئایا ئێمە ئەم قورئانەتان لێ بگێڕینەوە (پشت گوێتان خەین) لەبەر ئەوەی ئێوە گەلێکی زیادەڕەوون)

**واتە: هاوبەش دانەران، سوێند بەخوا بەڕاستی ئەگەر ئەم قورئانە لە ناو خەڵکدا نەبایە کاتێ خەڵکانی پێشوی ئەم ئوممەتە (ی ئاخیرزەمان) ڕەدیان کردەوە (و باوەڕیان پێ نەهێنا)، بەدڵنیاییەوە لە ناو دەچوون.**

---

(١) کە خوا کوڕ و منداڵی هەبێ.

(٢) کەواتە: ئەو دوو وشە: (عابِدٌ) و (عَبِدٌ) یەك مانایان هەیە کە بەمانای خۆ بەدوورگرتن و خۆپاراستنە. (إرشاد الساری، ١١/٥٠)

(٣) ئەمە تەفسیرە نەك خوێندنەوە، خوێندنەوەکەی بەم جۆرەیە: ﴿ وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ ﴾ الزخرف: ٨٨).

(٤) ئیبنو تین دەڵێ: بەو جۆرە سەر و ژێریان بۆکردووە و خوێندوویانەتەوە، من لە زمانی عەرەبیدا نەمدیوە(عَبِدَ) بە مانای (جَحَدَ) دانپیا نەنان هاتبێ. فتح الباري ١٠/٧٣١.

﴿ فَأَهْلَكْنَآ أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾واته: سزا و تۆڵەی گەله پێشینەکان. ﴿ جُزْءًا ﴾ هاوشان و هاوتا.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٤٤ - سورة الدُّخَانِ

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ رَهْوًا ﴿٢٤﴾ ﴾ الدخان: طَرِيقًا يَابِسًا.ويقال رَهْوًا:ساكناً. ﴿ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾ الدخان: على مَنْ بَيْنَ ظَهْرَيْهِ. ﴿ فَٱعْتِلُوهُ ﴿٤٧﴾ ﴾ الدخان: أدْفَعُوهُ. ﴿ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ ﴿٥٤﴾ ﴾ الدخان: أَنْكَحْنَاهُمْ حُورًا عِينًا يَحَارُ فِيهَا الطَّرْفُ. ﴿ تَرْجُمُونِ ﴿٢٠﴾ ﴾ الدخان: القَتْلُ. و ﴿ رَهْوًا ﴿٢٤﴾ ﴾ الدخان: ساكنا. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ كَٱلْمُهْلِ ﴿٤٥﴾ ﴾ الدخان: أَسْوَدُ كَمُهْلِ الزَّيْتِ. وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿ تُبَّعٍ ﴿٣٧﴾ ﴾ الدخان: مُلُوكُ اليَمَنِ، كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ يُسَمَّى تُبَّعًا؛ لأَنَّهُ يَتْبَعُ صَاحِبَهُ، وَالظِّلُّ يُسَمَّى تُبَّعًا لأَنَّهُ يَتْبَعُ الشَّمْسَ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٢٤ - (تەفسیری ) سوڕەتی دوخان

-موجاهید دەڵێ: ﴿ رَهْوًا ﴾: (بەرەو) ڕێگای وشکانی. وە دەوترێ (رَهْوًا) بەئارامی و وەستاوی.﴿ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ (هەڵمان بژاردن) بەسەر خەڵکی سەردەمی خۆیاندا. ﴿ فَٱعْتِلُوهُ ﴾: بەتوندی پاڵی پێوە بنێن.﴿ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ ﴾:

کیژانی چاو گەورەمان کردە هاوسەریان، (جوانییان) چاو تێك دەدات. ﴿ تَرْجُمُونِ ﴾ کوشتن (بە بەرد باران کردن). ﴿ رَهْوًا ﴾ (دەریای سوور بە جێ بێڵە) بە ئارامی و ئاوەڵا.ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ كَٱلْمُهْلِ ﴾ : ڕەشە وەك خڵتەی ڕۆن زەیت.جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: ﴿ تُبَّعٍ ﴾: پادشاکانی یەمەن، هەریەکەیان پێی دەوترا (تُبَّع)، لەبەر ئەوەی بە شوێن هاوڵەکەیدا دەڕۆشت [1]، سێبەریش پێی دەوترێت (تُبَّع) چونکە شوێنی خۆر دەکەوێت.

١ - **بابٌ:** ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ۝١٠ ﴾ الدخان

قَالَ قَتَادَةُ: ﴿ فَٱرْتَقِبْ ۝١٠ ﴾ الدخان: فَانْتَظِرْ.

٤٨٢٠ - حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: مَضَى خَمْسٌ: الدُّخَانُ، وَالرُّومُ، وَالْقَمَرُ، وَالْبَطْشَةُ، وَاللِّزَامُ[2].

## ١ - باسێک: (جا چاوەڕوان بە ڕۆژێ ئاسمان دوکەڵێکی ئاشکرای لێ پەیدا دەبێ)

-قەتادە دەڵێ: ﴿ فَٱرْتَقِبْ ﴾ چاوەڕوان بە.

٤٨٢٠ -مەسروق لە عەبدوڵڵاوە ﷺ دەگێڕێتەوە کەوتی: پێنج (لە نیشانەکانی هاتنی قیامەت) ڕوویان داوە و تێپەڕیوون: دوکەڵەکە و (سەرکەوتنی) ڕۆمەکان و (لەت بوونی) مانگ و پەلامارەکە و (تۆڵەی ) تووش هاتوو [1].

---

(١) کە لە پێش ئەودا پادشابووە.

(٢) بڕوانە: ١٠٠٧.

## ٢ -بابٌ: ﴿ يَغْشَى ٱلنَّاسَ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ ﴾ الدخان

٤٨٢١ - حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: إِنَّمَا كَانَ هَذَا؛ لأَنَّ قُرَيْشًا لَمَّا اسْتَعْصَوْا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ دَعَا عَلَيْهِمْ بِسِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ، فَأَصَابَهُمْ قَحْطٌ وَجَهْدٌ، حَتَّى أَكَلُوا الْعِظَامَ، فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَنْظُرُ إِلَى السَّمَاءِ فَيَرَى مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا كَهَيْئَةِ الدُّخَانِ مِنَ الْجَهْدِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى ٱلنَّاسَ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ ﴾ الدخان:.قَالَ: فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اسْتَسْقِ اللَّهَ لِمُضَرَ، فَإِنَّهَا قَدْ هَلَكَتْ. قَالَ: «لِمُضَرَ؟! إِنَّكَ لَجَرِيءٌ». فَاسْتَسْقَى فَسُقُوا. فَنَزَلَتْ ﴿ إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ ﴾ الدخان فَلَمَّا أَصَابَتْهُمُ الرَّفَاهِيَةُ عَادُوا إِلَى حَالِهِمْ حِينَ أَصَابَتْهُمُ الرَّفَاهِيَةُ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ ﴿ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ الدخان: قَالَ: يَعْنِي: يَوْمَ بَدْرٍ[٢].

## ٢ - باسێک: ( (ئەو دوکەڵە) خەڵکی دادەگرێ (و دەڵێن): ئەمە بەڵایەکی سەختە)

**٤٨٢١ -مەسروق دەڵێ: عەبدوڵڵا ؓ وتی: بێگومان کاتێ ئەو (قات و قڕیە) بوو، چونکە قوڕەیشیەکان سەرپێچی پێغەمبەریان کرد ﷺ (وازیان لە بتپەرستی نەهێنا)، ئەویش دوعای لێ کردن (کە خوا تووشی قات و قڕیان**

(١) ئەو تۆڵەی یەخەی کافرانی قوڕەیشی گرت لە غەزای بەدردا، یان ئەو سزایەی یەخەیان دەگرێ لە قیامەت دا. بڕوانە : إرشاد الساري، ٥٢/١١.

(٢) بڕوانە: ١٠٠٧.

بكات) وەك قات و قڕی سەردەمی یوسف ﷺ، ئەنجا تووشی بێبارانی ونارەحەتی بوون، بەجۆرێ هەتا ئێسکیان دەخوارد تا وای لێهات پیاوێکیان سەیری ئاسمانی کردبا وای دەزانی شتێکی وەك دووکەڵ بە ئاسمانەوەیە لە برساندا، جا خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتەی دابەزاند: (جا چاوەڕوان بە ڕۆژێ ئاسمان دووکەڵێکی ئاشکرای لێ پەیدا دەبێ هەموو ئادەمی دادەگرێ (و دەڵێن) ئەمە بەڵایەکی سەختە)، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێك هاتە خزمەتی و پێ وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ: داوای باران بارین بکە لەخوا بۆ هۆزی موزەڕ چونکە بەڕاستی فەوتان و تیاچوون، فەرمووی (( (داوای باران بکەم) بۆ موزەڕ؟ بەڕاستی تۆ ئازا و بوێری)) [1] ئەنجا پێغەمبەر ﷺ داوای باران بارینی بۆ کردن و بارانیان بۆ باری جا ئەم ئایەتە دابەزی: (بێگومان ئێوە دەگەڕێنەوە بۆ بێ باوەڕی) جا کاتێ گوزەران خۆشیان بەسەردا هات (قات و قڕی نەما) گەڕانەوە بۆ حاڵی پێشویان[2] کە خۆش گوزەرانیان بۆ گەڕایەوە، بەو هۆیەوە خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند (ڕۆژێ دێت پەلامارێکی بەهێز و هەرە گەورەیان بۆ دەبەین بەڕاستی ئێمە تۆڵە دەسەنین (لە کافران لە جەنگی بەدردا) (عەبدوڵڵا) وتی: مەبەستی ڕۆژی (غەزای) بەدر بوو.

## ٣ - بابٌ: ﴿ رَبَّنَا ٱكۡشِفۡ عَنَّا ٱلۡعَذَابَ إِنَّا مُؤۡمِنُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ الدخان

٤٨٢٢ - حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ فَقَالَ: إِنَّ مِنَ الْعِلْمِ أَنْ تَقُولَ لِمَا لاَ تَعْلَمُ: اللَّهُ أَعْلَمُ، إِنَّ اللَّهَ قَالَ لِنَبِيِّهِ ﷺ ﴿ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾ ص: إِنَّ قُرَيْشًا لَمَّا غَلَبُوا

---

(١) کە هاوبەش بڕیاردەدەیت بۆ خوا داوای بەزەیی و بارانی لێ دەکەیت.

(٢) کە بتپەرستی و بێ باوەڕی یە.

النَّبِيَّ ﷺ وَاسْتَعْصَوْا عَلَيْهِ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَيْهِمْ بِسَبْعٍ كَسَبْعِ يُوسُفَ». فَأَخَذَتْهُمْ سَنَةٌ أَكَلُوا فِيهَا الْعِظَامَ وَالْمَيْتَةَ مِنَ الْجَهْدِ، حَتَّى جَعَلَ أَحَدُهُمْ يَرَى مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ السَّمَاءِ كَهَيْئَةِ الدُّخَانِ مِنَ الْجُوعِ. قَالُوا ﴿ رَبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ الدخان: فَقِيلَ لَهُ: إِنْ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَادُوا. فَدَعَا رَبَّهُ فَكَشَفَ عَنْهُمْ، فَعَادُوا، فَانْتَقَمَ اللَّهُ مِنْهُمْ يَوْمَ بَدْرٍ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى:﴿ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ ﴾ الدخان: إِلَى قَوْلِهِ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ الدخان[1].

## ٣ - باسێک: (ئەی پەروەردگارمان ئەم سزایەمان لەسەر لابە، بەڕاستی ئێمە باوەڕ دارین)

**٤٨٢٢ -مەسروق دەڵێ: چوومە ژوورەوە بۆ لای عەبدوڵڵا ﷺ وتی: بەڕاستی ئەوە لە شارەزایی یەوەیە کە شتێکت نەزانی بڵێیت خوا دەیزانێ و شارەزاترە، بێگومان خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرموو: ( ( ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ من هیچ کرێ و پاداشتێك لەسەر گەیاندنی ئەم ئایینە لە ئێوە داوا ناکەم، وە من لە داواکارانی درۆزن نیم)، بێگومان کاتێ قورەیشیەکان عاسی بوون لە پێغەمبەر ﷺ و سەرپێچیان کرد لە بەرانبەریدا (باوەڕیان نەهێنا) فەرمووی: ((خودایە یارمەتیم بدە لە دژیان بە حەوت ساڵی قات و قڕی وەك حەوت ساڵەکەی (سەردەمی) یوسف ﷺ، ئیتر قات وقڕییان تووش بوو، کە تێیدا لە برسان دا ئێسك و مردارۆ بوویان خوارد، وە کەسانێکی وایان هەبوو سەیری ئاسمانی دەکرد لە برساندا نێوان خۆی و ئاسمانی وەك دوکەڵ دەبینی، وتیان: (ئەی پەروردگارمان ئەم سزایەمان لەسەر لابە بەڕاستی ئێمە باوەڕدارین).**

---

(١) بڕوانە: ١٠٠٧.

**جا بە (پێغەمبەر ﷺ) وترا: ئەگەر سزاکەیان لەسەر لابەین دەگەڕێنەوە (بۆ بێ باوەڕی)، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ لە پەروەردگاری پاڕایەوە ئەوجا سزاکەیان لەسەر لابرا، ئەنجا گەڕانەوە (بۆ بێ باوەڕی) بۆیە خوای گەورە لە ڕۆژی (غەزای) بەدردا تۆڵەی لێکردنەوە، ئەوەش مەبەستی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵندە: (ڕۆژێ ئاسمان دوکەڵێکی ئاشکرای لێ پەیدا دەبێ)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتەی خوا (بەڕاستی ئێمە تۆڵە دەسەنین (لە کافران لە جەنگی بەدردا) )).**

## ٤ -بابُ قوله ﴿ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الدخان

الذِّكْرُ و﴿ ٱلذِّكْرَىٰ ﴿١٣﴾ ﴾ الدخان: وَاحِدٌ.

**٤٨٢٣** - حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللهِ ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَمَّا دَعَا قُرَيْشًا كَذَّبُوهُ وَاسْتَعْصَوْا عَلَيْهِ فَقَالَ: «اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَيْهِمْ بِسَبْعٍ كَسَبْعِ يُوسُفَ». فَأَصَابَتْهُمْ سَنَةٌ حَصَّتْ -يَعْنِي- كُلَّ شَيْءٍ حَتَّى كَانُوا يَأْكُلُونَ الْمَيْتَةَ فَكَانَ يَقُومُ أَحَدُهُمْ فَكَانَ يَرَى بَيْنَهُ وَبَيْنَ السَّمَاءِ مِثْلَ الدُّخَانِ مِنَ الْجَهْدِ وَالْجُوعِ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى ٱلنَّاسَ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ ﴾ الدخان حَتَّى بَلَغَ: ﴿ إِنَّا كَاشِفُوا۟ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًا إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ ﴾ الدخان قَالَ عَبْدُ اللهِ: أَفَيُكْشَفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: وَالْبَطْشَةُ الْكُبْرَى يَوْمَ بَدْرٍ[1].

---

(١) بڕوانە: ١٠٠٧.

## ٤ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (جا چۆن تەمێ خوار دەبن و ئامۆژگاری وەردەگرن کە بەڕاستی پێغەمبەرێکی ڕوون و ئاشکرایان بۆ هاتووە)

(الذِّكْرُ) و ﴿ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾ الدخان جیاوازنین و یەك مانایان هەیە.

٤٨٢٣ -مەسروق دەڵێ: ڕۆشتم بۆلای عەبدوڵلا ﷺ لە پاشان (عەبدوڵلا) وتی: بێگومان کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ قوڕەیشیەکانی بانگ کرد (باوەڕ بێنن) باوەڕیان نەهێنا و سەرپێچی ئەویان کرد، بۆیە ئەویش فەرمووی: ((خودایە یارمەتیم بدە لە دژیان بە حەوتساڵی قات و قڕی وەك حەوت ساڵەکەی (سەردەمی) یوسف ﷺ))، ئیتر قات و قڕیان تووش بوو لە ناوی بردن - واتە - هەموو شتێکی لەناوبرد، هەتا وایان لێ هات مرداروبوویان دەخوارد، جا کەسێکیان دەوەستا و سەیری ئاسمانی دەکرد لە نێوان خۆی و ئاسماندا وایدەزانی دوکەڵ دەبینێ، لەبەر لاوازی لە برساندا (چاوی کز بوو بوو)، لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (جا چاوەڕوان بە ڕۆژێ ئاسمان دوکەڵێکی ئاشکرای لێ پەیدا دەبێ هەموو خەڵکی دادەگرێ (و دەڵێن): ئەمە بەڵایەکی سەختە)، تا دەگاتە (بێگومان بۆ ماوەیەکی کەم ئەم بەڵایە لا دەبەین بێگومان ئێوە دەگەڕێنەوە بۆ بێ باوەڕی)، عەبدوڵلا وتی: دەی ئایا دەکرێ لە ڕۆژی قیامەت دا ئەم بەڵایان لەسەر لابرێ؟! وتی: مەبەست لە: (الْبَطْشَةُ الْكُبْرَى)ـش ڕۆژی (غەزای) بەدرە.

### ٥ –بابٌ: ﴿ ثُمَّ تَوَلَّوْا عَنْهُ وَقَالُوا مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴿١٤﴾ ﴾ الدخان

٤٨٢٤ - حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ خَالِدٍ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ وَمَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ: إِنَّ اللَّهَ بَعَثَ مُحَمَّدًا ﷺ وَقَالَ: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ

عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ ص. فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا رَأَى قُرَيْشًا اسْتَعْصَوْا عَلَيْهِ فَقَالَ: «اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَيْهِمْ بِسَبْعٍ كَسَبْعِ يُوسُفَ». فَأَخَذَتْهُمُ السَّنَةُ حَتَّى حَصَّتْ كُلَّ شَيْءٍ حَتَّى أَكَلُوا الْعِظَامَ وَالْجُلُودَ -فَقَالَ أَحَدُهُمْ حَتَّى أَكَلُوا الْجُلُودَ وَالْمَيْتَةَ - وَجَعَلَ يَخْرُجُ مِنَ الأَرْضِ كَهَيْئَةِ الدُّخَانِ فَأَتَاهُ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ: أَيْ مُحَمَّدُ، إِنَّ قَوْمَكَ قَدْ هَلَكُوا فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَكْشِفَ عَنْهُمْ فَدَعَا ثُمَّ قَالَ: «تَعُودُوا بَعْدَ هَذَا». فِي حَدِيثِ مَنْصُورٍ ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ ﴾ الدخان: إِلَى: ﴿ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ ﴾ الدخان: أَيُكْشَفُ عَذَابُ الآخِرَةِ؟ فَقَدْ مَضَى الدُّخَانُ وَالْبَطْشَةُ وَاللِّزَامُ وَقَالَ أَحَدُهُمْ: الْقَمَرُ وَقَالَ الآخَرُ: الرُّومُ[1].

## ٥ - باسێک: (له پاشان گوێیان پێ نەداو وه وتیان: فێر کراوێکی شێته)

**٤٨٢٤ -مەسروق دەڵێ: عەبدوڵڵا ﷺ وتی: بێگومان خوا موحەممەدی ﷺ به پێغەمبەر نارد و فەرمووی: ((ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ من هیچ کرێ وپاداشتێك لەسەر گەیاندنی ئەم ئایینه له ئێوه داوا ناکەم، وه من لەو کەسانەش نیم که درۆ هەڵبەستم و زۆر له خۆم بکەم).**

**کاتێك که پێغەمبەری خوا ﷺ قوڕەیشیەکانی بینی گوێڕایەڵی نەبوون ئەوسا فەرمووی: ((خوایه یارمەتیم بده له دژیان به حەوت ساڵی قات وقڕی وەك حەوت ساڵەکەی (سەردەمی) یوسف ﷺ))، ئیتر قات و قڕییان تووش بوو هەتا هەموو شتێکی لەناوبرد تا (وایان لێهات) ئێسك و پێستەیان خوارد (لەبرسانا)،**

---

(١) بڕوانه: ١٠٠٧.

یەکێکیان[١] وتی: هەتا پێستە و مردارۆ بوویان خوارد جا لە زەوی یەوە[٢] شتێکی وەك دوکەڵی لێ دەردەچوو. ئەنجا ئەبو سوفیان هات بۆ خزمەتی (پێغەمبەر ﷺ) وتی: ئەی موحەممەد بێگومان هۆزەکەت دڵنیابە لەناو دەچن، دەی لەخوا بپاڕێرەوە تا ئەو بەڵایەیان لەسەر لابات، ئەویش دوعای کرد و پاڕایەوە، پاشان فەرمووی: ((دوای ئەوە[٣] دەگەڕێنەوە بۆ بێ باوەڕی)).
لەو گێڕانەوەی مەنصور (دەیگێڕێتەوە دەڵێ:) لە پاشان (پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (جا چاوەڕوان بە ڕۆژێ ئاسمان دوکەڵی ئاشکرای لێ پەیدا دەبێ)، تا دەگاتە (دەگەڕێنەوە بۆ بێ باوەڕی) ئایا دەکرێ سزای دوا ڕۆژیان لەسەر لابچێت؟! چونکە بەڕاستی دوکەڵەکە و پەلامارە بەهێز و هەرە گەورەکە و (سزا و تۆڵە) یەخەگرتووەکە هەموویان ڕابوردن و هاتنەدی، کەسێکیان[٤] دەڵێ: (لەت بوونی) مانگ و، کەسێکی تریان دەڵێ: (سەرکەوتنی) ڕۆمەکان (تێپەڕین و هاتنەدی).

### ٦ - بابٌ: ﴿ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴾ الدخان

٤٨٢٥ - حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: خَمْسٌ قَدْ مَضَيْنَ: اللِّزَامُ، وَالرُّومُ، وَالْبَطْشَةُ، وَالْقَمَرُ، وَالدُّخَانُ[٥].

---

(١) لەم دووانە، سولەیمان یان مەنصور کە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیەن.
(٢) لەبەر گەرمی زەوی بەهۆی بێ بارانیەوە.
(٣) کە قات و قڕییەکەتان لەسەر لاچوو.
(٤) لەسولەیمان و مەنصور.
(٥) بڕوانە: ١٠٠٧.

## ٦ - باسێک: (ڕۆژێ دێ پەلامارێکی بەهێز و هەرە گەورەیان بۆ دەبەین، بەڕاستی ئێمە تۆڵە دەسەنین (لە کافران لە جەنگی بەدردا) )

٤٨٢٥ -مەسروق لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕایەوە وتی:بێگومان پێنج (لە نیشانەکانی هاتنی قیامەت) ڕوویان داوە و تێپەڕیوون: (سزا و تۆڵە) یەخەگرتووەکە و (سەرکەوتنی) ڕۆمەکان و پەلامارەکە و (لەت بوونی) مانگ و دوکەڵەکە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٤٥ -سورة الجَاثِيَة

﴿ جَاثِيَةً ﴿٢٨﴾ ﴾ الجاثية مُسْتَوْفِزِينَ عَلَى الرُّكَبِ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ:﴿ نَسْتَنسِخُ ﴿٢٩﴾ ﴾ الجاثية: نَكْتُبُ.

﴿ نَنسَاكُمْ ﴿٣٤﴾ ﴾ الجاثية: نَتْرُكُكُمْ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٤٥ - (تەفسیری) سوڕەتی جاسیە

﴿ جَاثِيَةً ﴾: (لەترساندا) بەسەر ئەژنۆدا کەوتن.

-موجاهید دەڵێ: ﴿ نَسْتَنسِخُ ﴾: دەینوسین. ﴿ نَنسَاكُمْ ﴾ وازتان لێ دێنین، لەبیرتان دەکەین.

## ١ - بابٌ: ﴿ وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ﴿٢٤﴾ ﴾ الآيَةَ. الجاثية:

٤٨٢٦ - حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: "قَالَ اللَّهُ ﷻ: يُؤْذِينِي ابن آدَمَ، يَسُبُّ الدَّهْرَ وَأَنَا الدَّهْرُ، بِيَدِي الأَمْرُ، أُقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ"[١].

## ١ - باسێک: (جگە لە ڕۆژگار هیچ شتێک ئێمە لە ناو نابات) تا کۆتای ئایەتەکە

**٤٨٢٦ -ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوا ﷻ فەرمووی: ئادەمی ئازارم دەدات، جنێو بە ڕۆژگار دەدات، (هەڵسوڕێنەری) ڕۆژگار منم، کاروبار هەموو بەدەستی منە شەو و ڕۆژ ئاڵوگۆڕی پێ دەکەم)).**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٤٦ - سُورَةُ الأَحْقَافِ

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ تُفِيضُونَ ﴿٨﴾ ﴾ الأحقاف: تَقُولُونَ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: أَثَرَةٍ وَأُثْرَةٍ و﴿ أَثَـٰرَةٍ ﴿٤﴾ ﴾ الأحقاف: بَقِيَّةُ عِلْمٍ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ:﴿ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴿٩﴾ ﴾ الأحقاف لَسْتُ بِأَوَّلِ الرُّسُلِ. وَقَالَ غَيْرُهُ:﴿ أَرَءَيْتُمْ ﴿١٠﴾ ﴾ الأحقاف هذِه الأَلِفُ إِنَّمَا هِيَ تَوَعُّدٌ إِنْ صَحَّ مَا تَدَّعُونَ لَا يَسْتَحِقُّ أَنْ يُعْبَدَ، وَلَيْسَ قَوْلُهُ: ﴿ أَرَءَيْتُمْ ﴿١٠﴾ ﴾ الأحقاف : بِرُؤْيَةِ العَيْنِ؛ إِنَّمَا هُوَ أَتَعْلَمُونَ أَبَلَغَكُمْ أَنَّ مَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ خَلَقُوا شَيْئًا؟.

---

(١) بروانه: ٦١٨١، ٦١٨٢، ٧٤٩١.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٤٦ - (تەفسیری) سوڕەتی ئەحقاف

موجاهید دەڵێ: ﴿ تُفِيضُونَ ﴾: دەیڵێن، (ڕۆدەچن). کەسێکیان دەڵێ: (أَثَرَةٍ) و (أُثْرَةٍ) لەگەڵ: ﴿ أَثَـٰرَةٍ ﴾ ئاسەوارێکی زانست و زانیاری. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴾: من یەکەم پێغەمبەر و نێردراو نیم. جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: ﴿ أَرَءَيْتُمْ ﴾ ئەم پیتی (أ) هەمزەیە لێرەدا تەنها بۆ هەڕەشەیە: ئەگەر ڕاستە ئەوەی ئێوە هاواری لێ دەکەن ودەیپەرەستن شیاوی ئەوە نیە بپەرسترێت.مەبەست لەم فەرمایشتە ﴿ أَرَءَيْتُمْ ﴾: بینین نییە بە چاو بەڵکو مەبەست پێی ئایا دەزانن، ئایا پێتان گەشتووە ئەوانەی جگە لە خوا دەیپەرەستن شتێکیان دروست کرد بێ؟!

١ - **بابٌ:** ﴿ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن قَبْلِى وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيْلَكَ ءَامِنْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَـٰذَآ إِلَّآ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ **الأحقاف**

١ - باسێک: (وە ئەو کەسەی بە باوک و دایکی دەڵێت ئۆف لە دەس ئێوە، ئایا هەڕەشەم لێ دەکەن کە (زیندوو دەکرێمەوە و لەگۆڕ) دێمە دەرەوە، لە کاتێکدا چەند چین خەڵک پێش من ڕۆشتوون (و زیندوو نەبوونەتەوە)، وە (دایک و باوکی) هەردووکیان هانا بۆ خوا دەبەن، (دەڵێن): هاوار بۆ تۆ باوەڕ بێنە بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە، کەچی ئەو دەڵێ: ئەمە بەس ئەفسانەی پێشینانە و هیچی تر)

٤٨٢٧ - حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ يُوسُفَ بْنِ مَاهَكَ قَالَ: كَانَ مَرْوَانُ عَلَى الْحِجَازِ اسْتَعْمَلَهُ مُعَاوِيَةُ، فَخَطَبَ فَجَعَلَ يَذْكُرُ يَزِيدَ بْنَ مُعَاوِيَةَ؛ لِكَيْ يُبَايِعَ لَهُ بَعْدَ أَبِيهِ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ شَيْئًا، فَقَالَ: خُذُوهُ. فَدَخَلَ بَيْتَ عَائِشَةَ فَلَمْ يَقْدِرُوا عَلَيْهِ فَقَالَ مَرْوَانُ إِنَّ هَذَا الَّذِي أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِ: ﴿ وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَا أَتَعِدَانِنِي ﴿١٧﴾ ﴾ الأحقاف. فَقَالَتْ عَائِشَةُ مِنْ وَرَاءِ الْحِجَابِ: مَا أَنْزَلَ اللَّهُ فِينَا شَيْئًا مِنَ الْقُرْآنِ إِلاَّ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ عُذْرِي.

**٤٨٢٧ -یوسفی کوڕی ماهەك دەڵێ: مەروان والی و لێپرسراوی وڵاتی حیجاز بوو - معاوییە دایاندبوو - جا (مەروان) وتاری دا و دەستی کرد بە باس کردنی یەزیدی کوڕی موعاوییە بۆ ئەوەی لە پاش باوکی بەیعەتی پێ بدرێت، عەبدوڕەحمان کوڕی ئەبو بەکریش شتێکی[1] پێ وت، مەروانیش وتی: بیگرن، عەبدوڕەحمانیش ڕۆشتە ماڵی عائیشە ﵂ ئیتر نەیان توانی بیگرن، ئەنجا مەروان وتی: ئەمە (عەبدوڕەحمان) ئەو کەسەیە کەخوا ئەم ئایەتەی لەبارەیەوە دابەزاند: (وە ئەوە ئەو کەسەیە کە بەباوك و دایکی بڵێت ئۆف لە دەست ئێوە ئایا هەڕەشەم لێ دەکەن)، عائیشەش ﵂ لەپشت پەردەوە وتی: خوا دەربارەی ئێمە (خێزانی ئەبو بەکر) هیچ قورئانی دانەبەزاندووە جگە لەوەی کە خوا پاکێتی منی دابەزاند.**

(١) وتی: ئەمە حوکمی هیرەقلی یە واتە حوکمی بنەماڵەیی و پشتاو پشت.

## ٢ - بابُ قوله: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ۚ بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ ۖ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٤﴾﴾ الأحقاف

قَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿عَارِضٌ ﴿٢٤﴾﴾ الأحقاف : السَّحَابُ.

٤٨٢٨ - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنَا عَمْرٌو أَنَّ أَبَا النَّضْرِ حَدَّثَه، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ضَاحِكًا حَتَّى أَرَى مِنْهُ لَهَوَاتِهِ، إِنَّمَا كَانَ يَتَبَسَّمُ[1].

## ٢ - باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (جا کاتێ ئەو (سزایە) یان بینی پەڵە هەورێکە بەرەو شێونەکانیان دێ (دڵخۆش بوون)، وتیان: ئەمە هەورێکە بارانی پێیە بۆمان (هود وتی: نەخێر) بەڵکو ئەو (سزایە) یە کە داواتان دەکرد زوو بێت، بایەکی بەهێزە سزای سەختی پێیە)

**-ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ:﴿عَارِضٌ﴾: هەورە.**

**٤٨٢٨ - عائیشە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە (بەجۆرێ) پێبکەنێت تا ناو دەم و مەلاشووی ببینم بەڵکو هەمیشە زەردەخەنەی دەکرد.**

٤٨٢٩ - قَالَتْ: وَكَانَ إِذَا رَأَى غَيْمًا أَوْ رِيحًا عُرِفَ فِي وَجْهِهِ. قَالَتْ: يَا رَسُولَ الله، إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوُا الْغَيْمَ فَرِحُوا، رَجَاءَ أَنْ يَكُونَ فِيهِ الْمَطَرُ، وَأَرَاكَ إِذَا رَأَيْتَهُ عُرِفَ فِي وَجْهِكَ

---

(١) بڕوانە: ٦٠٩٢.

الْكَرَاهِيَةُ. فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ مَا يُؤْمِنِّي أَنْ يَكُونَ فِيهِ عَذَابٌ؟ عُذِّبَ قَوْمٌ بِالرِّيحِ، وَقَدْ رَأَى قَوْمٌ الْعَذَابَ فَقَالُوا: ﴿هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ﴿٢٤﴾﴾ الأحقاف»[1].

**٤٨٢٩ - عائیشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەور یان بای بدیایە (پێ ناخۆش بوون) لە ڕووخساریدا دەبینرا و دەزانرا، عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان خەڵکی کاتێ هەور دەبینن دڵخۆش دەبن، بە ئومێدی ئەوەی کەبارانی پێ بێت، کەچی تۆ دەبینم کاتێ هەور دەبینی لە ڕووخسارتدا پێ ناخۆش بوون دەبینرێت و هەستی پێ دەکرێ؟ ئەویش فەرمووی: ((ئەی عائیشە (چونکە) دڵنیانیم کە ئەو (هەورە) سزای تیا نەبێت؟ گەلێك بە بای توند سزا دراون، وە بێگومان کەسانێك سزایان بینی وتیان: (ئەمە هەورێکە بارانی پێیە بۆمان).**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٤٧ -سورة مُحَمَّدٍ ﷺ

﴿أَوْزَارَهَا ﴿٤﴾﴾ محمد: آثَامَهَا، حَتَّى لَا يَبْقَى إلا مُسْلِمٌ. ﴿عَرَّفَهَا ﴿٦﴾﴾ محمد: بَيَّنَهَا. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿مَوْلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴿١١﴾﴾ محمد: وَلِيُّهُمْ. ﴿عَزَمَ ٱلْأَمْرُ ﴿٢١﴾﴾ محمد: جَدَّ الأَمْرُ. ﴿فَلَا تَهِنُواْ ﴿٣٥﴾﴾ محمد: لَا تَضْعُفُوا. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿أَضْغَٰنَهُمْ ﴿٢٩﴾﴾ محمد: حَسَدَهُمْ. ﴿ءَاسِنٍ ﴿١٥﴾﴾ محمد: مُتَغَيِّرٍ

(١) بروانە: ٣٢٠٦.

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٤٧ - (تەفسیری) سوڕەتی موحەممەد ﷺ

﴿ أَوْزَارَهَا ﴾[1] (تاگەلی جەنگكەر) چەكەكانیان (دادەنێن) جگە لە مسوڵمان نامێنێ. ﴿ عَرَّفَهَا ﴾: ڕوونی كردۆتەوە. موجاهید دەڵێ ﴿ مَوْلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ (خوا) پشتیوانیانە. ﴿ عَزَمَ ٱلْأَمْرُ ﴾: كارەكە جددی و پێویست بوو. ﴿ فَلَا تَهِنُوا۟ ﴾: لاواز مەبن، سست مەبن. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ أَضْغَـٰنَهُمْ ﴾: حەسادەت، ڕق وكینە زۆر.

﴿ ءَاسِنٍ ﴾ (ئاوێ كە تامی) گۆڕاوە.

### ١ - بابٌ: ﴿ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ ﴾ محمد:

٤٨٣٠ - حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخْلَدٍ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي مُزَرِّدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَلَقَ اللَّهُ الْخَلْقَ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْهُ قَامَتِ الرَّحِمُ فَأَخَذَتْ بِحَقْوِ الرَّحْمَنِ فَقَالَ لَهَا: مَهْ. قَالَتْ: هَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنَ الْقَطِيعَةِ. قَالَ: أَلاَ تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ. قَالَتْ: بَلَى يَا رَبِّ. قَالَ: فَذَاكِ لَكِ». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾ محمد[2].

---

(١) تا جەنگ كۆتایی دێت كافر توانای جەنگی نامێنێ.

(٢) بروانە: ٤٨٣١، ٤٨٣٢، ٥٩٨٧، ٧٥٠٢..

## ١ - باسێک: (وە هەرچی پەیوەندی خزمایەتی یە بیپچڕێنن)

٤٨٣٠ - ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خوا دروستکراوەکانی دروست کرد، ئەنجا کاتێ لە دروست کردنیان بوویەوە خزمایەتی (ڕەحم) هەستا کەمەری خوای میهرەبانی گرت[1]، جا خوا فەرمووی: (وازبێنێ) چییە؟ (ڕەحم) وتی: ئەمە شوێنی پەناگرە بە تۆ لە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، (خوا) فەرمووی: ئایا ڕازی نابیت ئەوەی تۆ بگەیەنێت منیش پەیوەندی لەگەڵ ببەستم، وە ئەوەی تۆی پچڕاند منیش پەیوەندی لەگەڵ دەبچڕێنم؟ وتی: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، (خوا) فەرمووی دەی ئەوە وادەبێت (لە نێوان من و تۆدا) )).

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئەگەر ویستان ئایەتی: (جا ئایا ئێوە بەتەمان (ئەی ناپاکان) ئەگەر پشت هەڵکەن (لە ئیسلام و جیهاد)، لە زەویدا ئاژاوە و خراپە بەرپابکەن، وە هەرچی پەیوەندی خزمایەتییە بیبچڕێنن) بخوێننەوە.

٤٨٣١ - حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حَمْزَةَ، حَدَّثَنَا حَاتِمٌ، عَنْ مُعَاوِيَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمِّي أَبُو الْحُبَابِ سَعِيدُ بْنُ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ بِهَذَا، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: "اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ:﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾ محمد"[2].

٤٨٣١ -بەرێگایەکی تر ئەم فەرموودە لە ئەبو ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەڵێ: پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ویستان ئەم ئایەتە: ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ ﴾[3] بخوێننەوە.

---

(١) ئەمە سیفەتی خوایە ئێمە بڕیاری دەدەین بۆ خوا بەڵام چۆنیەتی نازانین وە ئەو مانا ئەوە نییە بۆ مرۆڤەکان بەکاردێت. فتح الباری:٧٤٦/١٠.

(٢) بڕوانە: ٤٨٣٠.

(٣) تا کۆتایی ئایەتەکە لەفەرموودەی پێشتردا بە ژمارە (٤٨٣٠) هەموو ئایەتەکەمان تەفسیر کرد

٤٨٣٢ - حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي الْمُزَرِّدِ بِهَذَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾ محمد»[1].

**٤٨٣٢ -بەشیری کوڕی موحەممەد بۆی گێڕاینەوە وتی: عەبدوڵڵا بۆی گێڕاینەوە وتی: موعاوییەی کوڕی ئەبی لموزەڕەد ئەم فەرموودەی بۆ گێڕاینەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( ئەگەر ویستان ئەم ئایەتە (جا ئایا ئێوە بەتەمان (ئەی ناپاکان) ) بخوێننەوە)).**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ٤٨ - سورة الفَتْحِ

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم ﴿٢٩﴾ ﴾ الفتح: السَّحْنَةُ. وَقَالَ مَنْصُورٌ، عَنْ مُجَاهِدٍ: التَّوَاضُعُ.

﴿ شَطْـَٔهُۥ ﴿٢٩﴾ ﴾ الفتح فِرَاخَهُ. ﴿ فَٱسْتَغْلَظَ ﴿٢٩﴾ ﴾ الفتح غَلُظَ. ﴿ سُوقِهِۦ ﴿٢٩﴾ ﴾ الفتح السَّاقُ حَامِلَةُ الشَّجَرَةِ. وَيُقَالُ: ﴿ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ﴿٦﴾ ﴾ الفتح كَقَوْلِكَ: رَجُلُ السَّوْءِ. وَدَائِرَةُ السَّوْءِ: العَذَابُ.

﴿ وَتُعَزِّرُوهُ ﴿٩﴾ ﴾ الفتح تَنْصُرُوهُ. ﴿ شَطْـَٔهُۥ ﴿٢٩﴾ ﴾ شَطْءُ السُّنْبُلِ، تُنْبِتُ الحَبَّةُ عَشْرًا أَوْ ثَمَانِيًا وَسَبْعًا، فَيَقْوى بَعْضُهُ بِبَعْضٍ فَذَاكَ قوله تعالى: ﴿ فَـَٔازَرَهُۥ ﴿٢٩﴾ ﴾ الفتح

(١) بروانه: ٤٨٣٠.

قَوَّاهُ، وَلَوْ كَانَتْ وَاحِدَةً لَمْ تَقُمْ على سَاقٍ، وَهُوَ مَثَلٌ ضَرَبَهُ اللَّهُ لِلنَّبِيِّ ﷺ إِذْ خَرَجَ وَحْدَهُ، ثُمَّ قَوَّاهُ بِأَصْحَابِهِ، كَمَا قَوى الحَبَّةَ بِمَا يَنْبُتُ مِنْهَا.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٤٨ - (تەفسیری) سورەتی فەتح

-موجاهید وتی: ﴿ سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم ﴾ دیمەن و ڕووخسار، مەنصور لەموجاهیدەوە گێڕاویەتیەوە دەڵێ: خۆ بە كە مزانین. ﴿ شَطْـَٔهُۥ ﴾ چەكەرەی. ﴿ فَٱسْتَغْلَظَ ﴾:بەهێز و قایم بووبێ ﴿ سُوقِهِۦ ﴾: لاسكەكەی كە ڕووەكەكەی ڕاگرتووە، وە دەوترێت: ﴿ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ﴾[1]: وەك ئەوەیە كە دەڵێیت: (رَجُلُ السَّوْءِ) (ودائِرةُالسَّوْءِ) واتە: سزا. ﴿ وَتُعَزِّرُوهُ ﴾یارمەتی بدەن. ﴿ شَطْـَٔهُۥ ﴾: چەكەرەی گوڵەكەی، دەنكە تۆوێك دە یا هەشت یا حەوت گوڵی لێ دەڕوێ وسەوز دەبێ، ئەنجا هەندێكی هەندێكی بەهێز دەكات، ئەوەش مەبەستی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵندە: ﴿ فَـَٔازَرَهُۥ ﴾ بەهێزی دەكات، ئەگەر یەك گوڵ بێت لەسەر یەك لاسك ناوەستێ، ئەوە نموونەیە كە خوا هێناویەتیەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ كاتێ بەتەنها دەڕۆشتە دەرەوەد (بۆ بانگ كردنی كافران بۆ مسوڵمان بوون)، لە پاشان خوا بەهاوەڵان بەهێزی كرد، هەرچۆنێك دەنكە تۆوەكەی بەهێز كرد بەو گوڵانەی لێی دەڕوێن و سەوز دەبن.

(١) واتە: خراپ بەسەرداهاتن.

## ١ - بابٌ: ﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١ ﴾ الفتح

٤٨٣٣ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَسِيرُ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ وَعُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ يَسِيرُ مَعَهُ لَيْلاً، فَسَأَلَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ عَنْ شَيْءٍ، فَلَمْ يُجِبْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ سَأَلَهُ فَلَمْ يُجِبْهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ فَلَمْ يُجِبْهُ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: ثَكِلَتْ أُمُّ عُمَرَ، نَزَرْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، كُلَّ ذَلِكَ لاَ يُجِيبُكَ. قَالَ عُمَرُ: فَحَرَّكْتُ بَعِيرِي، ثُمَّ تَقَدَّمْتُ أَمَامَ النَّاسِ، وَخَشِيتُ أَنْ يُنْزَلَ فِيَّ الْقُرْآنُ، فَمَا نَشِبْتُ أَنْ سَمِعْتُ صَارِخًا يَصْرُخُ بِي فَقُلْتُ: لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ يَكُونَ نَزَلَ فِيَّ قُرْآنٌ. فَجِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَقَالَ: «لَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ اللَّيْلَةَ سُورَةٌ لَهِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ». ثُمَّ قَرَأَ ﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١ ﴾ الفتح[1].

## ١ - باسێک: ( ئەی موحەممەد ﷺ بێگومان ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێ دایت (کە ڕێکەوتنی حودەیبیەیە))

**٤٨٣٣ - زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکێ لە سەفەرەکانیدا شەو بە ڕێگادا دەڕۆشت عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ لەگەڵیدا دەڕۆشت، ئەنجا عومەری کوڕی خەتتاب دەربارەی شتێك پرسیاری لێ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ وەڵامی نەدایەوە، پاشان پرسیاری لێ کردووە بەڵام وەڵامی نەدایەوە، دواتر پرسیاری لێ کردووە و وەڵامی نەدایەوە، بۆیە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ وتی: عومەر دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات، سێ جار بەرۆکی پێغەمبەرت گرت و پرسیارت لێ کرد، لە هەموویاندا وەڵامی نەدایتەوە، عومەر وتی: وشترەکەم**

(١) بڕوانە: ٤١٧٧.

بەخێرای لێخوڕی و پاشان پێش خەڵكەكە كەوتم، وە ترسام قورئان لە بارەمەوە دابەزی بێت. زۆری پێ نەچوو گوێم لێ بوو كەسێك بە دەنگی بەرز بانگم دەكات، عومەر دەڵێ وتم: منیش وتم: سوێند بە خوا ترسام كە قورئان دەربارەم دابەزی بێت، جا هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامم لێ كرد و ئەویش فەرمووی: ((سوێند بەخوا ئەمشەو سورەتێكم بۆ دابەزێنراوە لام خۆشەویسترە لە هەرچی خۆری لێ هەڵهاتووە))، لە پاشان سورەتی: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾ی خوێندەوە.

٤٨٣٤ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ سَمِعْتُ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١﴾ الفتح قَالَ: الْحُدَيْبِيَةُ[1].

٤٨٣٤ ـ قەتادە لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە وتی: ئەم ئایەتە: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾ مەبەستی پێی (ڕێككەوتنی) حودەیبیەیە.

٤٨٣٥ - حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ قُرَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ قَالَ: قَرَأَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ سُورَةَ الْفَتْحِ فَرَجَّعَ فِيهَا. قَالَ مُعَاوِيَةُ: لَوْ شِئْتُ أَنْ أَحْكِيَ لَكُمْ قِرَاءَةَ النَّبِيِّ ﷺ لَفَعَلْتُ[2].

٤٨٣٥ ـ عەبدوڵڵای كوڕی موغەففەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئازادكردنی مەككەدا سورەتی فەتحی خوێند و دەنگی پێی دەلەراندەوە[3]، موعاویە وتی: ئەگەر بمەوێ شێوەی قورئان خوێندنەكەی پێغەمبەرتان ﷺ بۆ بلێمەوە بۆم دەخوێندنەوە (وەك ئەو).

---

(١) بروانە: ٤١٧٢.

(٢) بروانە: ٤٢٨١.

(٣) بە دەنگەوە دەیخوێندەوە.

## ٢ - بابٌ: ﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾﴾ الفتح

٤٨٣٦ - حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الْفَضْلِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، حَدَّثَنَا زِيَادٌ أَنَّهُ سَمِعَ الْمُغِيرَةَ يَقُولُ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى تَوَرَّمَتْ قَدَمَاهُ، فَقِيلَ لَهُ: غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ!! قَالَ: «أَفَلاَ أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا»؟[1].

## ٢ - باسێک: (تا خوا خۆش ببێت لە تاوانەکانی رابردوو و داهاتووت، وە نیعمەتی خۆی بە تەواوی بڕژێت بەسەرت دا، وە ڕێگای ڕاستت نیشان بدات)[2]

**٤٨٣٦ -موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ (ئەوەندە) هەستابوو بۆ شەو نوێژ هەتا پێیەکانی ئاوسان، جا پێ وترا: خوا خۆش بووە لەو گوناهانەت کە ڕابوردووە و لەوانەی داهاتووشت، فەرمووی: ((دەی ئایا منیش بەندەیەکی شوکرانە بژێری خوا نەبم؟)).**

٤٨٣٧ - حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَحْيَى، أَخْبَرَنَا حَيْوَةُ، عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ سَمِعَ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُومُ مِنَ اللَّيْلِ حَتَّى تَتَفَطَّرَ قَدَمَاهُ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: لِمَ تَصْنَعُ هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ؟ قَالَ: «أَفَلاَ أُحِبُّ أَنْ أَكُونَ عَبْدًا شَكُورًا؟». فَلَمَّا كَثُرَ لَحْمُهُ صَلَّى جَالِسًا فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ قَامَ، فَقَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ[3].

---

(١) بروانە: ١١٣٠.

(٢) واتە: بەردەوامت کات.

(٣) بروانە: ١١١٨.

**٤٨٣٧ -عورِوه دهگێڕێتهوه له عائیشهوه ﵂ ئهویش دهگێڕێتهوه که پێغهمبهری خوا ﷺ ههمیشه ههڵدهسا بۆ شهو نوێژ ههتا پێیهکانی دهئاوسان، ئهنجا عائیشه وتی: ئهی پێغهمبهری خوا بۆچی ئاوا دهکهیت (ئهوهنده خۆت ئازار دهدهیت)، له کاتێکدا خوا له گوناههکانی ڕابردوو داهاتووت خۆش بووه؟ فهرمووی: ((دهی ئایا منیش پێم خۆش نهبێ که بهندهیهکی شوکرانه بژێر بم (بۆخوا) ))، جا کاتێ گۆشتن بوو به دانیشتنهوه نوێژی دهکرد. ئهنجا که بیویستایه کڕنوش بهرێ ههڵدهسایهوه و (ههندێکی تر) قورئانی دهخوێند، پاشان کڕنوشی دهبرد.**

## ٣ - بابٌ: ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ۝٨ ﴾ الفتح

٤٨٣٨ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ أَبِي هِلاَلٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﵄ أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ الَّتِي فِي الْقُرْآنِ: ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ۝٨ ﴾ الفتح: قَالَ: فِي التَّوْرَاةِ: يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَحِرْزًا لِلأُمِّيِّينَ، أَنْتَ عَبْدِي وَرَسُولِي سَمَّيْتُكَ الْمُتَوَكِّلَ لَيْسَ بِفَظٍّ وَلاَ غَلِيظٍ وَلاَ سَخَّابٍ بِالأَسْوَاقِ وَلاَ يَدْفَعُ السَّيِّئَةَ بِالسَّيِّئَةِ وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَصْفَحُ وَلَنْ يَقْبِضَهُ اللَّهُ حَتَّى يُقِيمَ بِهِ الْمِلَّةَ الْعَوْجَاءَ بِأَنْ يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. فَيَفْتَحَ بِهَا أَعْيُنًا عُمْيًا وَآذَانًا صُمًّا وَقُلُوبًا غُلْفًا[1].

---

(١) بروانه: ٢١٢٥.

## ٣ - باسێک: (بەڕاستی (ئەی موحەممەد ﷺ) تۆمان ناردوە بە شایەت و موژدە دەر و ترسێنەر)

٤٨٣٨ -عەتائی کوڕی یەسار لە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەم ئایەتەی کە لە قورئاندایە: (ئەی پێغەمبەر بەڕاستی ئێمە تۆمان ناردووە بە شایەت و موژدە دەر و ترسێنەر)، لە تەوراتیشدا دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر ئێمە تۆمان ناردووە بە شایەت و موژدەدەر، وەك قەڵاو پەنای بۆ نەتەوەیەکی نەخوێنەوار، تۆ بەندە و نێردراوی منی، ناوم ناوی پشت بەستوو بە خوا، بەدخو و قسەڕەق و دڵ ڕەق نییە و لە بازاڕدا دەنگ بەرز و قاڵە قاڵ کەر نییە، بەخراپە بەرپەرچی خراپە ناداتەوە، بەڵکو چاوپۆشی دەکات و دەبورێ وە خوا گیانی ناکێشێت هەتا ئەو گەلە لارەی پێ ڕاست نەکاتەوە کەبڵێن: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) بەم وشەی یەکتاپەرەستی یە چاوانی کوێری پێ ڕۆشن کاتەوە و گوێیانی کەڕی پێ بکاتەوە و دڵانی داپۆشراوی پێ بکاتەوە.

## ٤ - بابٌ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤﴾ ﴾ الفتح

٤٨٣٩ - حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ يَقْرَأُ، وَفَرَسٌ لَهُ مَرْبُوطٌ فِي الدَّارِ، فَجَعَلَ يَنْفِرُ، فَخَرَجَ الرَّجُلُ فَنَظَرَ فَلَمْ يَرَ شَيْئًا، وَجَعَلَ يَنْفِرُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ ذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «تِلْكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ بِالْقُرْآنِ»[1].

---

(١) بروانە: ٣٦١٤.

## ٤ - باسێک: (ئەو خوایە زاتێکە ئارامی دابەزاندووە ناو دڵی باوەڕداران )

**٤٨٣٩ -بەڕا ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ قورئانی دەخوێند و لە هەمان کاتدا ماینێکی خۆی لە ماڵدا بەسرابوویەوە هەر سڵی دەکرد و دەسڵەمیەوە، پیاوەکە لەماڵ چوەدەرەوە تەماشای کرد هیچی نەبینی ئەنجا کە ڕۆژ بویەوە ئەو (ڕووداو)ەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: (ئەوەی ئارامی یە بە هۆی قورئان (خوێندنەکەوە) دابەزیوە )).**

٥ - **بابُ قوله:** ﴿إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ ﴿١٨﴾﴾ الفتح.

٤٨٤٠ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كُنَّا يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ أَلْفًا وَأَرْبَعَمِائَةٍ[1].

## ٥ - باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (کە پەیمانیان پێ دایت لە ژێر درەختەکەدا (لە حودەیبیە) )

**٤٨٤٠ -جابیر ﷺ دەڵێ: ئێمە لە ڕۆژی (ڕێکەوتنی) حودەیبیەدا هەزار و چوارسەد کەس بووین.**

٤٨٤١ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا شَبَابَةُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ صُهْبَانَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيِّ: إِنِّي مِمَّنْ شَهِدَ الشَّجَرَةَ، نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْخَذْفِ[2].

---

(١) بڕوانە: ٣٥٧٦.

(٢) بڕوانە: ٥٤٧٩، ٦٢٢٠.

**٤٨٤١ -عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەلی موزەنیی ﷺ دەڵێ: من لەو کەسانە بووم ئامادەی (ڕێکەوتنی حودەیبیەی ژێر) درەختەکە بووم، پێغەمبەر ﷺ پیچەکە گرتنی [١] قەدەغە کرد.**

٤٨٤٢ - وَعَنْ عُقْبَةَ بْنِ صُهْبَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْمُغَفَّلِ الْمُزَنِيَّ فِي الْبَوْلِ فِي الْمُغْتَسَلِ.

**٤٨٤٢ -عوقبەی کوڕی صوهبان وتی: لە عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەلی موزەنیم ﷺ بیست: دەربارەی میزکردن لە شوێنی خۆشوردندا[٢].**

٤٨٤٣ - حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ ﷺوَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ[٣].

**٤٨٤٣ -ئەبو قیلابە لە سابیتی کوڕی زەححاکەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: سابیت لە بەشداربووانی (ڕێکەوتنی حودەیبیەی ژێر) درەختەکە بووە.**

٤٨٤٤ - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ إِسْحَاقَ السُّلَمِيُّ، حَدَّثَنَا يَعْلَى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ سِيَاهٍ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ قَالَ: أَتَيْتُ أَبَا وَائِلٍ أَسْأَلُهُ فَقَالَ: كُنَّا بِصِفِّينَ فَقَالَ رَجُلٌ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُدْعَوْنَ إِلَى كِتَابِ اللَّهِ. فَقَالَ عَلِيٌّ: نَعَمْ. فَقَالَ سَهْلُ بْنُ حُنَيْفٍ: اتَّهِمُوا أَنْفُسَكُمْ فَلَقَدْ رَأَيْتُنَا يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ -يَعْنِي الصُّلْحَ الَّذِي كَانَ بَيْنَ النَّبِيِّ ﷺ وَالْمُشْرِكِينَ - وَلَوْ نَرَى قِتَالاً لَقَاتَلْنَا، فَجَاءَ عُمَرُ فَقَالَ: أَلَسْنَا عَلَى الْحَقِّ وَهُمْ عَلَى الْبَاطِلِ أَلَيْسَ قَتْلاَنَا فِي الْجَنَّةِ وَقَتْلاَهُمْ فِي النَّارِ؟! قَالَ: «بَلَى». قَالَ: فَفِيمَ أُعْطِي الدَّنِيَّةَ فِي دِينِنَا، وَنَرْجِعُ وَلَمَّا يَحْكُمِ اللَّهُ بَيْنَنَا. فَقَالَ: «يَا ابْنَ الْخَطَّابِ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ وَلَنْ يُضَيِّعَنِي اللَّهُ أَبَدًا». فَرَجَعَ مُتَغَيِّظًا، فَلَمْ

---

(١) پیچەکە گرتن: بەردە وردە یان زیخ بە پەنجە هاویشتن و تەقاندنی (ئەلمونجید، ٦١٩/١).

(٢) لە فەتح الباری دا بەم جۆرەیە: (پێغەمبەر ﷺ میزکردنی لە حەمام دا قەدەغە کرد و بێگومان زۆربەی وەسوەسە لەوەوەیە ) (٧٦/١١) وە بوخاری ئەم گێڕانەوەی بۆ ئەوە هێناوە کە عوقبەی کوڕی صوهبا لە عەبدوڵڵا فەرموودەی بیستووە، لە فەرموودەی پێشودا لە سەنەدەکەدا ناوی هاتووە.

(٣) بڕوانە: ١٣٦٣.

يَصْبِرْ حَتَّى جَاءَ أَبَا بَكْرٍ فَقَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ أَلَسْنَا عَلَى الْحَقِّ وَهُمْ عَلَى الْبَاطِلِ؟ قَالَ: يَا ابْنَ الْخَطَّابِ، إِنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلَنْ يضَيِّعَهُ اللَّهُ أَبَدًا. فَنَزَلَتْ سُورَةُ الفَتْحِ[1].

**٤٨٤٤ -حەبیبی کوڕی سابیت دەڵێ: ڕۆشتەمە لای ئەبو وائل پرسیاری لێ بکەم، جا (ئەبو وائیل) وتی: ئێمە لەصیفین بووین، پیاوێك وتی: ئایا سەرنجی ئەوانە نادەن کە بانگ دەکرێن بۆ (کارکردن بە) قورئانەکەی خوا؟ عەلیش ﷺ وتی: بەڵێ (من پێش هەمووان کاری پێ دەکەم) ئەنجا سەهلی کوڕی حونەیف ﷺ وتی: (ئەی خەڵکینە) گومانی خراپ بەخۆتان ببەن، جاسوێند بەخوا بە دڵنیاییەوە لە ڕۆژی حودەیبیەدا -واتە: ئەو ڕێکەوتنەی کە لە نێوان پێغەمبەر و ﷺ هاوبەش دانەراندا بوو - خۆمانم دەبینی ئەگەر بمانویستایە جەنگ بکەین بێگومان جەنگمان دەکرد، ئەنجا عومەر ﷺ هات و وتی: ئایا ئێمە لەسەر هەق نین وئەوان لەسەر ناهەق نین؟ ئایا کوژراوەکانی ئێمە لە بەهەشتانین و کوژراوەکانی ئەوان لە دۆزەخدا نین؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((بەڵێ وایە)) (عومەر) وتی: دەی لەبەر چی لە ئاینەکەماندا سەرشۆڕی بنوێنین، وە بگەڕێینەوە کە هێشتا خوا لە نێوانماندا بڕیاری نەداوە؟ (پێغەمبەر ﷺ ) فەرمووی: ((ئەی کوڕی خەتتاب دڵنیابە من پێغەمبەری خودام، وە هەرگیز من پشتگوێ ناخات))، ئینجا عومەر بەرق خواردنەوەیەکی زۆرەوە گەڕایەوە، جا خۆی پێ نەگیراو هەتا چووە لای ئەبو بەکر ﷺ و وتی: ئەی ئەبو بەکر ئایا ئێمە لەسەر هەق نین و ئەوان لەسەر ناهەق نین؟ (ئەبو بەکر) وتی: ئەی کوڕی خەتتاب، بەڕاستی ئەو پێغەمبەری خوایە ﷺ وە هەرگیز نایفەوتێنێ، جا بە هۆیەوە سوڕەتی فەتح دابەزی.**

---

(١) بڕوانە: ٣١٨١.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٤٩ - سُورَةُ الحُجُرَاتِ

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ لَا تُقَدِّمُوا ﴿١﴾ ﴾ الحجرات: لَا تَفْتَاتُوا على رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ عَلَى لِسَانِهِ. ﴿ ٱمْتَحَنَ ﴿٣﴾ ﴾ الحجرات: أَخْلَصَ. ﴿ وَلَا تَنَابَزُوا ﴿١١﴾ ﴾ الحجرات: يُدْعَى بِالْكُفْرِ بَعْدَ الإِسْلَامِ. ﴿ يَلِتْكُم ﴿١٤﴾ ﴾ الحجرات: يَنْقُصْكُمْ، أَلَتْنَا نَقَصْنَا

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٤٩ - (تەفسیری) سورەتی حوجورات

**موجاهید وتی: ﴿ لَا تُقَدِّمُوا ﴾: پێش پێغەمبەری خوا ﷺ فەتوا و بڕیار مەدەن هەتا خوا لەسەر زمانی ئەو بڕیار دەدات. ﴿ ٱمْتَحَنَ ﴾ : پوختی کرد، پاکی کردەوە. ﴿ وَلَا تَنَابَزُوا ﴾: بەناوی بێ باوەڕی بانگ بکرێ پاش مسوڵمان بوونی[1] ﴿ يَلِتْكُم ﴾: لە ئێوە کەم کاتەوە، کەمتان پێ بدات، (أَلَتْنَا): کەممان کردووە.**

### ١ - بابٌ: ﴿ لَا تَرْفَعُوٓا أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ ﴿٢﴾ ﴾ الحجرات:

﴿ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٢﴾ ﴾ الحجرات:: تَعْلَمُونَ، وَمِنْهُ الشَّاعِرُ.

---

(١) حەسەنی بەصری دەڵێ: جوو یا گاور مسوڵمان دەبوون پاش مسوڵمان بونیان پێیان دەوترا: ئەی جوولەکە ئەی گاور فەدەغەکران لەوەی وا بڵێن (إرشاد الساری:١١/٧٩)

٤٨٤٥ - حَدَّثَنَا يَسَرَةُ بْنُ صَفْوَانَ بْنِ جَمِيلٍ اللَّخْمِيُّ، حَدَّثَنَا نَافِعُ بْنُ عُمَرَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: كَادَ الْخَيِّرَانِ أَنْ يَهْلِكَا -أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ رضي الله عنهما- رَفَعَا أَصْوَاتَهُمَا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ قَدِمَ عَلَيْهِ رَكْبُ بَنِي تَمِيمٍ، فَأَشَارَ أَحَدُهُمَا بِالأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ أَخِي بَنِي مُجَاشِعٍ، وَأَشَارَ الآخَرُ بِرَجُلٍ آخَرَ -قَالَ نَافِعٌ: لاَ أَحْفَظُ اسْمَهُ- فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ لِعُمَرَ: مَا أَرَدْتَ إِلاَّ خِلاَفِي. قَالَ: مَا أَرَدْتُ خِلاَفَكَ. فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا فِي ذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَرْفَعُوٓا۟ أَصْوَٰتَكُمْ ﴿٢﴾ ﴾ الحجرات. قَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ فَمَا كَانَ عُمَرُ يُسْمِعُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ هَذِهِ الآيَةِ حَتَّى يَسْتَفْهِمَهُ. وَلَمْ يَذْكُرْ ذَلِكَ عَنْ أَبِيهِ، يَعْنِي: أَبَا بَكْرٍ.

## ١ - باسێک: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە دەنگتان بەرز مەکەنەوە بەسەر دەنگی پێغەمبەردا ﷺ) تا کۆتایی ئایەتەکە

**﴿ لَا تَشْعُرُونَ ﴾: دەیزانن (هەستی پێ دەکەن)، وشەی (الشَّاعِرُ) لەوەوە هاتووە زانایە و هەستیارە.**

**٤٨٤٥ -ئیبنو ئەبی مولەیکە دەڵێ: دووپیاوە چاکەکە ئەبو بەکر و عومەر رضي الله عنهما خەریك بوو تیاچن، لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەنگیان بەرز کردەوە کاتێ کۆمەڵە سوارێکی بەنی تەمیم هاتنە خزمەتی، یەکێکیان[1] پێشنیاری ئەقرەعی کوڕی حابیسی برای بەنی موجاشیعی کرد (بیکاتە بەرپرسیان)، ئەوەی کەشیان [2] پێشنیاری کەسێکی تری کرد (پێغەمبەر ﷺ بیکاتە ئەمیریان) - نافیع دەڵێ: ناوی ئەو کەسەم لە یاد نییە - جا ئەبو بەکر بە عومەری وت: تۆ هەر پێچەوانەی منت ویست، (عومەریش) وتی: پێچەوانەی تۆم مەبەست نەبووە،**

(١) کە عومەری کوڕی خەتتاب بوو رضي الله عنه.

(٢) کە ئەبو بەکرە رضي الله عنه.

جا هەردووكیان دەنگیان بەرز بوویەوە لەو بارەیەوە، بەو هۆیەوە خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند: (ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە دەنگتان بەرز مەكەنەوە) تا كۆتایی ئایەتەكە. ئیبنو زوبەیر دەڵێ: جا عومەر پاش (دابەزینی) ئەو ئایەتە دەنگی ئەوەندە بەرز نەدەكردەوە كە پێغەمبەر بیبستێ، هەتا پێغەمبەر ﷺ داوای دەكرد (دەنگ بەرز بكاتەوە)[1] تا لێی تێ بگات، وە (عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر) ئەمەی لە باوكیەوە (مەبەستی باوكی دایكێتی) واتە: ئەبو بەكر ﷺ نەگێڕایەوە.

٤٨٤٦ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا أَزْهَرُ بْنُ سَعْدٍ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عَوْنٍ قَالَ: أَنْبَأَنِي مُوسَى بْنُ أَنَس، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ افْتَقَدَ ثَابِتَ بْنَ قَيْسٍ فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَا أَعْلَمُ لَكَ عِلْمَهُ. فَأَتَاهُ فَوَجَدَهُ جَالِسًا فِي بَيْتِهِ مُنَكِّسًا رَأْسَهُ فَقَالَ لَهُ: مَا شَأْنُكَ؟ فَقَالَ: شَرٌّ. كَانَ يَرْفَعُ صَوْتَهُ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ. فَأَتَى الرَّجُلُ النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ قَالَ كَذَا وَكَذَا. فَقَالَ مُوسَى: فَرَجَعَ إِلَيْهِ الْمَرَّةَ الآخِرَةَ بِبِشَارَةٍ عَظِيمَةٍ فَقَالَ: «اذْهَبْ إِلَيْهِ فَقُلْ لَهُ: إِنَّكَ لَسْتَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ؛ وَلَكِنَّكَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ».

٤٨٤٦ - مووسای كوڕی ئەنەس لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ سۆراغی سابیتی كوڕی قەیسی كرد، پیاوێكیش (سەعدی كوڕی موعاز) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من هەواڵت بۆ دەزانم، ئەنجا ڕۆشت بۆ لای و بینی لەماڵەوە دانیشتووە سەری داخستووە پێی وت: ئەوە چیتە؟ وتی: حاڵم خراپە (چونكە) ئەو دەنگی بەرزدەكردەوە بەسەر دەنگی پێغەمبەردا ﷺ كە بێگومان كردەوەكانی پوچەڵ بۆتەوە، وە ئەو [2] لە دۆزەخیانە، ئەنجا

---

(١) چونكە لە زمانی عەرەبیدا بە باپیریش هەر دەڵێن (اب).

(٢) واتە: ئەو نەفسەی لە بەردەمتدایە حاڵی خراپە، ئەمە (إلتفات)ی پێ دەڵێن لە زمانی عەرەبیدا بۆ هەندێ ئامانجی بەلاغی بە كاردەهێنرێت.

پیاوەکە (سەعد) هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و هەواڵی پێدا کە سابیت واو وای ووت. مووسای کوڕی ئەنەسیش وتی: ئەنجا جاری دووەم (سەعد) گەڕایەوە بۆلای سابیت بەموژدەیەکی گەورەوە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((بڕۆ بۆ لای و پێی بڵێ: دڵنیابە تۆ لە دۆزەخیان نیت، بەڵکو تۆ لە بەهەشتیانی)).

## ٢ -بابٌ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ ﴾ الحجرات

٤٨٤٧ - حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ أَخْبَرَهُمْ أَنَّهُ قَدِمَ رَكْبٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَمِّرِ الْقَعْقَاعَ بْنَ مَعْبَدٍ. وَقَالَ عُمَرُ: بَلْ أَمِّرِ الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَا أَرَدْتَ إِلَى -أَوْ: إِلاَّ- خِلاَفِي. فَقَالَ عُمَرُ: مَا أَرَدْتُ خِلاَفَكَ. فَتَمَارَيَا حَتَّى ارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا، فَنَزَلَ فِي ذَلِكَ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴿١﴾ ﴾ الحجرات. حَتَّى انْقَضَتِ الآيَةُ[1].

## ٢ - باسێک: (بێگومان ئەو کەسانەی لە دەرەوەی ژوورەکان بانگت دەکەن (ئەی موحەممەد ﷺ) زۆربەیان نەفامن و تێ ناگەن)

٤٨٤٧ -ئیبنو ئەبی مولەیکە دەڵێ: کە عەبدوڵڵای کوڕی زوبیەر رضي الله عنهما بۆی گێڕانەوە کە چەند سوارێك لە هۆزی تەمیم هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، جا

(١) بروانە: ٤٣٦٧.

ئەبو بەکر ﷺ وتی: قەعقاعی کوڕ مەعبەد بکە بە گەورەیان،عومەریش ﷺ وتی: نەخێر بەڵکو ئەقەرعی کوڕ حابس بکە بە گەورەیان، بۆیە ئەبو بەکر وتی: تۆ هەر ویستت پێچەوانەی من بکەیت، عومەریش وتی: من نەم ویستووە پێچەوانەی تۆ بکەم، جا بوویە مشت و مڕ و دەنگە دەنگیان کرد هەتا دەنگیان بەرز بوویەوە، جا بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە پێش مەکەون لە خوا و پێغەمبەرەکەی )، هەتا ئایەتەکە تەواو بوو و کۆتایی هات.

## ٣ -بابُ قولِهِ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۝٥﴾ الحجرات

## ٣ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (خۆ ئەگەر چاوەڕوانیان بکردایە تا دەرۆشتیتە دەرەوە بۆ لایان ئەوە چاکتر بوو بۆیان)

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٥٠ - سورة ق

﴿ رَجْعُۢ بَعِيدٌ ۝٣ ﴾ ق: رَدٌّ. ﴿ فُرُوجٍ ۝٦ ﴾ ق: فُتُوقٍ، وَاحِدُهَا: فَرْجٌ، وَرِيدٌ فِي حَلْقِهِ، الحَبْلُ: حَبْلُ العَاتِقِ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ:﴿ مَا تَنقُصُ ٱلْأَرْضُ ۝٤ ﴾ ق: مِنْ عِظَامِهِمْ. ﴿ تَبْصِرَةً ۝٨ ﴾ ق: بَصِيرَةً ﴿ وَحَبَّ ٱلْحَصِيدِ ۝٩ ﴾ ق: الحِنْطَةُ.﴿ بَاسِقَٰتٍ ۝١٠ ﴾ ق: الطِّوَالُ﴿ أَفَعَيِينَا ۝١٥ ﴾ ق: أَفَأَعْيَا عَلَيْنَا.﴿ وَقَالَ قَرِينُهُۥ ۝٢٣ ﴾ ق: الشَّيْطَانُ الذِي قُيِّضَ لَهُ.﴿ فَنَقَّبُواْ ۝٣٦ ﴾ ق: ضَرَبُوا.﴿ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ ۝٣٧ ﴾ ق: لَا يُحَدِّثُ نَفْسَهُ بِغَيْرِهِ حِينَ أَنْشَأَكُمْ وَأَنْشَأَ خَلْقَكُمْ. ﴿ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ۝١٨ ﴾ ق: رَصَدٌ.﴿ سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ ۝٢١ ﴾ ق: المَلَكَانِ كَاتِبٌ وَشَهِيدٌ. ﴿ شَهِيدٌ ۝٣٧ ﴾ ق: شَاهِدٌ بِالْقَلْبِ.﴿ لُّغُوبٍ ۝٣٨ ق: النَّصَبُ. وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿ نَّضِيدٌ ۝١٠ ﴾ ق: الكُفُرى مَا دَامَ فِي أَكْمَامِهِ، وَمَعْنَاهُ: مَنْضُودٌ بَعْضُهُ عَلَى بَعْضٍ، فَإِذَا خَرَجَ مِنْ أَكْمَامِهِ فَلَيْسَ بِنَضِيدٍ. فِي ﴿ وَإِدْبَٰرَ ٱلنُّجُومِ ۝٤٩ ﴾ الطور: ﴿ وَأَدْبَٰرَ ٱلسُّجُودِ ۝٤٠ ﴾ ق: كَانَ عَاصِمٌ يَفْتَحُ التِي فِي (ق) وَيَكْسِرُ التِي فِي (الطُّور )، وَيُكْسَرَانِ جَمِيعًا وَيُنْصَبَانِ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ﴿ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ ۝٤٢ ﴾ ق: يَخْرُجُونَ مِنَ القُبُورِ.

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٥٠ - (تەفسیری) سوڕەتی قاف

﴿ رَجْعٌۢ بَعِيدٌ ﴾: گەڕانەوە (یەکی دوورە). ﴿ فُرُوجٍ ﴾ درز و کەلێن، کۆیە و تاکەکەی: (فَرْجٌ)ـە. (وَرِيدٌ): (شادەمارێکە) لەمل و گەردنیدایە. (الحَبْلُ ): ڕەگی بناگوێ (شادەماری دڵ).

-موجاهید دەڵێ: ﴿ مَا تَنقُصُ ٱلۡأَرۡضُ ﴾: (ئەوەی زەوی کەمیدەکات و دەیخوات) لە ئێسکەکانیان. ﴿ تَبۡصِرَةً ﴾: بەرچاو و ڕوونی. ﴿ وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ ﴾: گەنم. ﴿ بَاسِقَٰتٍ ﴾ : زۆر بەرز و درێژ. ﴿ أَفَعَيِينَا ﴾: ئایا ئێمە دەسەوەسان بووین (لەدروست کردنی یەکەم). ﴿ وَقَالَ قَرِينُهُۥ ﴾ ئەو شەیتانەی کە بۆی دانراوە (لەگەڵیدا بێت). ﴿ فَنَقَّبُواْ ﴾: ئەوان ڕۆشتن، گەڕان. ﴿ أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ ﴾: خۆی بە هیچی ترەوە خەریك ناکات (تەنها گوێ لەو دەگرێ)، (کاتی دروستی کردن، سەرەتا دروستی کردن)[1].﴿ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴾ چاودێری کردن (نوسەری گشت کردار و گوفتار). ﴿ سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ ﴾: دوو فریشتەکە: نوسەر و شایەت (بەسەر مرۆڤەوە).﴿ شَهِيدٌ ﴾: بەدڵ گوێ بگرێ و ئاگادار بێ. ﴿ لُّغُوبٍ ﴾ ماندووبوون.

-جگەلەموجاهید دەڵێ: ﴿ نَّضِيدٌ ﴾: هێشووی (خورما) کە لە ناو پورەگەکەیدا بێت، ماناکەشی واتە: چین چین بەسەر یەکەوەیە، جائەگەر لەپێستەکە (پۆرگەکەی) هاتە دەرەوە ئەوە (نَضِید) نییە.

---

(١) ئەم بڕگەیە دەبوو لەگەڵ (أفعیینا) بەدوای ئەودا بوایە چونکە مانای ئەوە.

-لە ﴿ وَإِدْبَٰرَ ٱلنُّجُومِ ﴾، ﴿ وَأَدْبَٰرَ ٱلسُّجُودِ ﴾ وشەی (أَدْبَارِ) عاصیم[١] ئەومیان لە سوڕەتی قافدا بەفەتحە (أَدبار) دەیخوێنێتەوە، بەڵام ئەومیان لە سوڕەتی (الطُّور) دایە بەکەسرە (إِدبار) دەیخوێنێتەوە، وە هەردوو وشەکە بە ژێر (إ) دەخوێنرێنەوە [٢] و هەردووکیان بەسەریش (أ) دەخوێنرێتەوە

-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ وَأَدْبَٰرَ ٱلسُّجُودِ ﴾. واتە: لە گۆڕەکان دێنە دەرەوە.

## ١ - بابُ قوله: ﴿ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ ﴿٣٠﴾ ﴾ ق

٤٨٤٨ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي الأَسْوَدِ، حَدَّثَنَا حَرَمِيٌّ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُلْقَى فِي النَّارِ وَتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ؟ حَتَّى يَضَعَ قَدَمَهُ فَتَقُولُ: قَطِ قَطِ»[٣].

## ١-باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە دۆزەخ دەڵێ: ئایا کەسی تر هەیە (بیهێنن)؟ ))

**٤٨٤٨ -ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((دۆزەخیەکان) فڕێ دەدرێنە ناو دۆزەخەوە، (دۆزەخیش) دەڵێ: ئایا کەسی تر ماوە [٤] (بیهێنن) هەتا (خوای پەروەردگار) پێی [١] دەخاتە سەر (دۆزەخ) ئەویش دەڵێ: بەسمە بەسمە)).**

---

(١) یەکێکە لە حەوت قورئان خوێنە ناودارەکەی ئیسلام.

(٢) وشەی (إدبار) لە سوورەتی قافدا نافیع و ئیبنو کەسیر و حەمزە و (إدبار) لە سوڕەتی توردا جەماوەری قورئان خوێنان بە ژێر دەیخوێننەوە. وە بە (أدبار) لە قافدا عاصیم و ئەبو عەمر و ئیبنو عامیر کەسائی و یەعقوب وە بە (أدبار) لە سوڕەتی توردا مەتوعی لە ئەعمەشەوە کە خوێندنەوەیەکی شازە. (إرشاد الساري: ٨٥/١١)

(٣) بڕوانە: ٦٦٦١، ٧٣٨٤.

(٤) بەجۆرێکی کەش ماناکراوە کە دۆزەخ دەڵێ: شوێنی کەس نەماوە و پڕ بوون (فتح الباري: ٧٦٥/١٠- ٧٦٦)

٤٨٤٩ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُوسَى الْقَطَّانُ، حَدَّثَنَا أَبُو سُفْيَانَ الْحِمْيَرِيُّ سَعِيدُ بْنُ يَحْيَى بْنِ مَهْدِيٍّ، حَدَّثَنَا عَوْفٌ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَفَعَهُ -وَأَكْثَرُ مَا كَانَ يُوقِفُهُ أَبُو سُفْيَانَ- «يُقَالُ لِجَهَنَّمَ: هَلِ امْتَلأْتِ؟ وَتَقُولُ: هَلْ مِنْ مَزِيدٍ؟ فَيَضَعُ الرَّبُّ ﷻ قَدَمَهُ عَلَيْهَا فَتَقُولُ: قَطِ قَطِ»[٢].

**٤٨٤٩ - موحەممەد لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەبو هورەیرەش دەیباتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ، بەڵام ئەبو سوفیان بەزۆری بە وتەی ئەبو هورەیرە دەیگێڕێتەوە ((بە دۆزەخ دەوترێت ئایا پڕ بوویت؟ دۆزەخیش دەڵێ: ئایا کەسی تر ماوە؟ ئینجا پەروەردگار ﷻ پێی دەخاتە سەری، دۆزەخیش دەڵێ: بەسمە بەسمە)).**

٤٨٥٠ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَحَاجَّتِ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ، فَقَالَتِ النَّارُ: أُوثِرْتُ بِالْمُتَكَبِّرِينَ وَالْمُتَجَبِّرِينَ. وَقَالَتِ الْجَنَّةُ: مَا لِي لاَ يَدْخُلُنِي إِلاَّ ضُعَفَاءُ النَّاسِ وَسَقَطُهُمْ؟! قَالَ اللَّهُ ﷻ لِلْجَنَّةِ: أَنْتِ رَحْمَتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي. وَقَالَ لِلنَّارِ: إِنَّمَا أَنْتِ عَذَابٌ أُعَذِّبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي. وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا مِلْؤُهَا، فَأَمَّا النَّارُ فَلاَ تَمْتَلِئُ حَتَّى يَضَعَ رِجْلَهُ فَتَقُولُ: قَطٍ قَطٍ قَطٍ. فَهُنَالِكَ تَمْتَلِئُ وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ، وَلاَ يَظْلِمُ اللَّهُ ﷻ مِنْ خَلْقِهِ أَحَدًا، وَأَمَّا الْجَنَّةُ فَإِنَّ اللَّهَ ﷻ يُنْشِئُ لَهَا خَلْقًا»[٣].

**٤٨٥٠ -ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەهەشت و دۆزەخ دەبێ بە دەمەقاڵەیان، ئەنجا دۆزەخ دەڵێ: تایبەتکراوم بەخۆ بەزلزانان و زۆردار و ستەمکارانەوە، بەهەشتیش دەڵێ: من چیمە هەر لاوازانی خەڵکی و بێ نرخ**

---

(١) باوەرمان پێیەتی بەڵام چۆنیەتیەکەی نازانین.

(٢) بڕوانە: ٤٨٥٠، ٧٤٤٩.

(٣) بڕوانە: ٤٨٤٩.

بێ ڕێزەکانیان دێنە ناومەوە؟ خوا ﷻ بە بەهەشت دەفەرمووێ: تۆ بەزەیی منی بەتۆ هەرکەسم بوێ ڕەحمی پێدەکەم لە بەندەکانم، وە بەدۆزەخیشی دەفەرمووێ: بێگومان تۆش سزایەکیت بەتۆ هەرکەسم بوێ لە بەندەکانم سزای دەدەم، وە بۆ هەریەکەشیان (لەسەر منە) پڕ کردنیان، بەڵام دۆزەخ پڕ نابێت هەتا پەروەردگار پێی پیا نەنێت و دۆزەخیش دەڵێ: بەسمە بەسمە بەسمە.ئەنجا لەوێدا پڕ دەبێت بەشەکانی دەچنە پاڵ یەکتری (دەچن بەناو یەکتریدا) وە خوا ﷻ ستەم لەهیچ کەس لە بەندەکانی ناکات، بەڵام بەهەشت بێگومان خوا ﷻ دروستکراوی تری بۆ بەدی دەهێنێت)).

## ٢ - بابٌ: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾﴾ ق

٤٨٥١ - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ جَرِيرٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا لَيْلَةً مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَنَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةَ أَرْبَعَ عَشْرَةَ فَقَالَ: «إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا، لاَ تُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لاَ تُغْلَبُوا عَلَى صَلاَةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا». ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾﴾ ق[1].

## ٢ - باسێک: (بە ستایشی پەروەردگارت تەسبیحات بکە پێش هەڵاتنی خۆر و پێش ئاوا بوونیشی)

٤٨٥١ -جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ وتی: ئێمە شەوێك لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین، ئەنجا سەیری مانگی کرد کە مانگی چواردە بوو، جا فەرمووی:

(١) بڕوانە: ٥٥٤.

((بێگومان ئێوه (له قیامەتدا) پەروەردگارتان دەبینن هەرچۆنێك ئەو (مانگ)ـە دەبینن، قەرەباڵغی و پاڵ پاڵێن ناکەن بۆ بینین، جا ئەگەر توانیتان نوێژی پێش خۆر هەڵاتن و پێش ئاوابوونی خۆر [1] مەفەوتێنن وبیانکەن))، له پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (بەستایشی پەروەردگارت تەسبیحات بکە پێش هەڵاتنی خۆر پێش ئاوابوونیشی).

٤٨٥٢ - حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا وَرْقَاءُ، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَمَرَهُ أَنْ يُسَبِّحَ فِي أَدْبَارِ الصَّلَوَاتِ كُلِّهَا، يَعْنِي قَوْلَهُ: ﴿وَأَدْبَٰرَ ٱلسُّجُودِ ﴿٤٠﴾﴾ ق.

٤٨٥٢ -موجاهید دەڵێ: -ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پەروەردگار فەرمانی به پێغەمبەر ﷺ کردووه له پاش هەموو نوێژەکان تەسبیحات بکات، مەبەستی ئەم فەرمایشتەی خوایە:﴿وَأَدْبَٰرَ ٱلسُّجُودِ﴾

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٥١ - سورة وَالذَّارِيَاتِ

قَالَ عَلِيٌّ عليه السلام ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ﴿١﴾﴾ الذاريات: الرِّيَاحُ. وَقَالَ غَيْرُهُ:﴿تَذْرُوهُ ﴿٤٥﴾﴾ الكهف: تُفَرِّقُهُ. ﴿وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ﴿٢١﴾﴾ الذاريات: تَأْكُلُ وَتَشْرَبُ فِي مَدْخَلٍ وَاحِدٍ وَيَخْرُجُ مِنْ مَوْضِعَيْنِ. ﴿فَرَاغَ ﴿٢٦﴾﴾ الذاريات: فَرَجَعَ. ﴿فَصَكَّتْ ﴿٢٩﴾﴾

(١) واتە: نوێژی بەیانیان ومەغریبان.

الذاريات: فَجَمَعَتْ أَصَابِعَهَا فَضَرَبَتْ جَبْهَتَهَا. وَالرَّمِيمُ: نَبَاتُ الأَرْضِ إِذَا يَبِسَ وَدِيسَ. ﴿ لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الذاريات: أَيْ: لَذُو سَعَةٍ، وَكَذَلِكَ. ﴿ عَلَى ٱلْمُوسِعِ قَدَرُهُۥ ﴿٢٣٦﴾ ﴾ البقرة: يَعْنِي: القَوِيَّ. ﴿ زَوْجَيْنِ ﴿٤٩﴾ ﴾ الذاريات: الذَّكَرَ وَالأُنْثَى، وَاخْتِلَافُ الأَلْوَانِ حُلْوٌ وَحَامِضٌ فَهُمَا زَوْجَانِ. ﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٥٠﴾ ﴾ الذاريات: مِنَ اللهِ إِلَيْهِ. ﴿ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات: مَا خَلَقْتُ أَهْلَ السَّعَادَةِ مِنْ أَهْلِ الفَرِيقَيْنِ إِلَّا لِيُوَحِّدُونِ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: خَلَقَهُمْ لِيَفْعَلُوا، فَفَعَلَ بَعْضٌ وَتَرَكَ بَعْضٌ، وَلَيْسَ فِيهِ حُجَّةٌ لأَهْلِ القَدَرِ، وَالذَّنُوبُ: الدَّلْوُ العَظِيمُ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ صَرَّةٍ ﴿٢٩﴾ ﴾ الذاريات ﴿ ذَنُوبًا ﴿٥٩﴾ ﴾ الذاريات: سَبِيلًا. العَقِيمُ التِي لَا تَلِدُ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: وَالْحُبُكُ أسْتِوَاؤُهَا وَحُسْنُهَا. ﴿ فِي غَمْرَةٍ ﴿١١﴾ ﴾ الذاريات: فِي ضَلَالَتِهِمْ يَتَمَادَوْنَ. وَقَالَ غَيْرُهُ: تَوَاصَوْا: تَوَاطَئُوا. وَقَالَ: ﴿ مُّسَوَّمَةً ﴿٣٤﴾ ﴾ الذاريات: مُعَلَّمَةً مِنَ السِّيمَا. قُتِلَ الإنسانُ: لُعِنَ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٥١ - (تەفسیری) سوڕەتی زاریات

**-عەلی ﷺ دەڵێ: ﴿ وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ﴾ بایەکان. جگە لە عەلی دەڵێ: ﴿ تَذْرُوهُ ﴾ بڵاوی دەکاتەوە. ﴿ وَفِيٓ أَنفُسِكُمْ ﴾: لەیەك شوێنەوە دەخۆیت و دەخۆیتەوە بەڵام لە دوو شوێنە و دەردەچێت. ﴿ فَرَاغَ ﴾: جا گەڕایەوە. ﴿ فَصَكَّتْ ﴾: پەنجەکانی پێکەوە نوساند و کێشای بە ڕووخساری خۆیدا، زللەیەکی دا لە ڕووخساری.** (الرَّمِيمُ):

ڕووەکی سەر زەوی کاتێ وشك دەبێ لە ژێر پێی دەخرێت ورد دەبێت. ﴿ لَمُوسِعُونَ ﴾: (ئێمە) فراوان کەرین، هەروەها. ﴿ عَلَى ٱلْمُوسِعِ قَدَرُهُۥ ﴾: واتە: بەهێز (دەوڵەمەند). ﴿ زَوْجَيْنِ ﴾ : نێر و مێ. (وَاخْتِلاَفُ الأَلْوَانِ): شیرین و ترش هەر پێیان دەوترێت (زَوْجَانِ). ﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ﴾: لەخواوە بۆ لای خوا [١] ﴿ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾: ئەو کەسانەی بەختەوەرن لە مرۆڤ و جنۆکەکان تەنها بۆ بەندایەتی و یەکتاپەرستیم دروست کردوون. هەندێکیشیان دەڵێن: دروستی کردوون تا بەندایەتی ئەنجام بدەن، جا هەندێك بەجێی دێنن و هەندێکیش نایکەن و بەجێی ناهێنن، وە لەمەدا بەڵگە نییە بۆ قەدەرییەکان [٢]. (الذَّنُوبُ): دوڵچەی گەورەیە.موجاهید دەڵێ: ﴿ صَرَّةٍ ﴾ قیژە و هاوار کردنێك.﴿ ذَنُوبًا ﴾: ڕێگایەك. (العَقِيمُ): ئافرەتێك منداڵی نەبێت، نەزۆك. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: (الْحُبُكُ): ڕێك و پێك وجوانی ئاسمان﴿ فِى غَمْرَةٍ ﴾ لە گومڕاییدا دەخولێنەوە، لەگێژاوی بێ ئاگاییدا.جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: (تَوَاصَوْا ): ژێر بەژێر ڕێکەوتوون، (ئەمان و ئەوان) ڕاسپاردەیان بۆ یەکتری کردووە. وە وتی: ﴿ مُّسَوَّمَةً ﴾ نیشانەکراو لە: (السِّيمَا) وە وەرگیراوە. (قُتِلَ الإنسانُ): نەفرینی کراوە، بەکوشت چێ.

---

(١) واتە: بە پەلە لە سەرپێچی خواوە بگەڕێنەوە بۆ گوێڕایەڵی خوا، یان لە سزای خواوە بگەڕێنەوە بۆ ڕەحمەتی خوا.

(٢) موعتەزیلە: کە دەڵێن: خوا ئیرادەی خێروچاکەی ویستووە لە مرۆڤەکان شەڕ و خراپەی نەویستووە و ئیرادەی خوا پەیوەست نییە پێیەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٥٢ - سورة الطُّور

وَقَالَ قَتَادَةُ: ﴿مَّسْطُورٍ ۝٢﴾ الطو: مَكْتُوبٍ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: الطُّورُ الجَبَلُ بِالسُّرْيَانِيَّةِ. ﴿فِى رَقٍّ ۝٣﴾ الطور: صَحِيفَةٍ. ﴿وَٱلسَّقْفِ ٱلْمَرْفُوعِ ۝٥﴾ الطور: سَمَاءٌ. ﴿ٱلْمَسْجُورِ ۝٦﴾ الطور: المُوقَدِ. وَقَالَ الحَسَنُ: تُسْجَرُ حَتَّى يَذْهَبَ مَاؤُهَا فَلَا يَبْقَى فِيهَا قَطْرَةٌ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿أَلَتْنَٰهُم ۝٢١﴾ الطور: نَقَصْنَا. وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿مَوْرًا ۝٩﴾ الطور: تَدُورُ. ﴿أَحْلَٰمُهُم ۝٣٢﴾ الطور: العُقُولُ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ٱلْبَرُّ ۝٢٨﴾ الطور: اللَّطِيفُ. ﴿كِسْفًا ۝٤٤﴾ الطور: قِطْعًا. ﴿ٱلْمَنُونِ ۝٣٠﴾ الطور: المَوْتُ. وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿يَتَنَٰزَعُونَ ۝٢٣﴾ الطور: يَتَعَاطَوْنَ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٥٢ - (تەفسیری) سوڕەتی توور (الطُّور)

-قەتادە دەڵێ: ﴿مَّسْطُورٍ﴾: نوسراو. موجاهید دەڵێ: (الطُّورُ) واتە: شاخ بە زمانی سوریانی. ﴿فِى رَقٍّ﴾ لاپەڕە، پێستی تەنك. ﴿وَٱلسَّقْفِ ٱلْمَرْفُوعِ﴾ ئاسمانە. ﴿ٱلْمَسْجُورِ﴾ هەڵگیرساو، پڕکراو لەئاگر.

-حەسەن دەڵێ: ﴿ٱلْمَسْجُورِ﴾ دەریایەکە ئاگری تیا هەڵدەگیرسێنرێ هەتا هەموو ئاوەکەی دەڕوات، وە یەك دڵۆپ ئاوی تیا نامێنێت.

-موجاهید دەڵێ:﴿ أَلَتْنَٰهُم ﴾کەممان کردەوە. جگە لە موجاهید دەڵێ: ﴿ مَوْرًا ﴾ دەگەڕێتەوە (دەڕوات، دەخولێتەوە). ﴿ أَحْلَٰمُهُم ﴾ ژیرییان، بیر و هۆشیان.

-ئیبنو عەبباس ﷺ. ﴿ ٱلْبَرُّ ﴾ بە بەزەیی، میهرەبان، چاکەکار. ﴿ كِسْفًا ﴾ پارچەیەك، بەشێك.﴿ ٱلْمَنُونِ ﴾ مردن. جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: ﴿ يَتَنَٰزَعُونَ ﴾لە یەکتری وەردەگرن، دەیدەن بەیەکتری.

## ١ - بابٌ

٤٨٥٣ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ نَوْفَلٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَت: شَكَوْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنِّي أَشْتَكِي فَقَالَ: «طُوفِي مِنْ وَرَاءِ النَّاسِ، وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ». فَطُفْتُ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي إِلَى جَنْبِ الْبَيْتِ يَقْرَأُ بِالطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ[1].

## ١ - باسێک

**٤٨٥٣ - ئوممو سەلەمە ﷺ دەڵێ: لای پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵام کرد کە من نەخۆشم فەرمووی: ((لەدوای خەڵکەکەوە تەواف بکە بەسواری ولآخەکەتەوە))، منیش تەوافم کرد لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەپەنا کەعبەدا نوێژی دەکرد سورەتی (والطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ)ـی دەخوێند.**

٤٨٥٤ - حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ: حَدَّثُونِي، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالطُّورِ فَلَمَّا بَلَغَ هَذِهِ

---

(١) بروانە: ٤٦٤.

الآيَةَ ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ الطور: كَادَ قَلْبِي أَنْ يَطِيرَ. قَالَ سُفْيَانُ: فَأَمَّا أَنَا فَإِنَّمَا سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ يُحَدِّثُ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ: يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالطُّورِ. لَمْ أَسْمَعْهُ زَادَ الَّذِي قَالُوا لِي[١].

**٤٨٥٤ - جوبیری کوڕی موتعیم له باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: گوێم له پێغەمبەر ﷺ بوو له (نوێژی) مەغریبدا (سورەتی) توری دەخوێند، جا کاتێ گەشتە ئەم ئایەتە (ئایا ئەوان (بێ دروستکارێك) له خۆیانەوە دروست بوون، یاخۆیان دروستکاری خۆیانن، ئەی ئایا ئەوان ئاسمانەکان و زەوی یان دروست کردووە (نەخێر وا نییە)، بەڵکو دڵنیا نین و گومانیان هەیە، ئەی ئایا گەنجینەکانی پەروەردگاری تۆ لای ئەوانە؟ یاخود ئەوان دەسەڵاتدار و وزاڵن؟ خەریك بوو دڵم بفڕێ.**

**سوفیان[٢] دەڵێ: بەڵام من له زوهریم بیستووە له موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیمەوە دەگێڕایەوە ئەویش له باوکیەوە وتی: له پێغەمبەرم ﷺ بیست له نوێژی مەغریبدا سورەتی توری دەخوێند (تا ئەوێم له زوهری بیستووە). بەڵام ئەو زیادەی خەڵکی تر بەمنیان وتووە له زوهریم نەبیستووە[٣].**

(١) بڕوانە: ٧٦٥.

(٢) یەکێکە لەوانەی فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە.

(٣) جا کاتێ گەشتە ئەم ئایەتە....تا کۆتایی فەرموودەکە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٥٣ - سورة وَالنَّجْمِ

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ذُو مِرَّةٍ ۝٦﴾ النجم: ذُو قُوَّةٍ. ﴿قَابَ قَوْسَيْنِ ۝٩﴾ النجم: حَيْثُ الوَتَرُ مِنَ القَوْسِ.

﴿ضِيزَىٰٓ ۝٢٢﴾ النجم: عَوْجَاءُ. ﴿وَأَكْدَىٰٓ ۝٣٤﴾ النجم: قَطَعَ عَطَاءَهُ.﴿رَبُّ ٱلشِّعْرَىٰ ۝٤٩﴾ النجم: هُوَ مِرْزَمُ الجَوْزَاءِ. ﴿ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ۝٣٧﴾ النجم: وَفَّى مَا فُرِضَ عَلَيْهِ ﴿أَزِفَتِ ٱلْآزِفَةُ ۝٥٧﴾ النجم: اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ. ﴿سَٰمِدُونَ ۝٦١﴾ النجم: البَرْطَمَةُ. وَقَالَ عِكْرِمَةُ: يَتَغَنَّوْنَ بِالْحِمْيَرِيَّةِ. وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ:﴿أَفَتُمَٰرُونَهُۥ ۝١٢﴾ النجم: أَفَتُجَادِلُونَهُ، وَمَنْ قَرَأَ: (أَفَتَمْرُونَهُ) يَعْنِي أَفَتَجْحَدُونَهُ. ﴿مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ ۝١٧﴾ النجم : بَصَرُ مُحَمَّدٍ ﷺ ﴿وَمَا طَغَىٰ ۝١٧﴾ النجم: وَلَا جَاوَزَ مَا رَأَى. ﴿فَتَمَارَوْا۟ ۝٣٦﴾ القمر: كَذَّبُوا. وَقَالَ الحَسَنُ: ﴿إِذَا هَوَىٰ ۝١﴾ النجم: غَابَ وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ:﴿أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ ۝٤٨﴾ النجم: أَعْطَى فَأَرْضَى.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٥٣ - (تەفسیری) سوڕەتی نەجم

**-موجاهید دەڵێ: ﴿ذُو مِرَّةٍ﴾ خاوەن هێزێك و توانا. ﴿قَابَ قَوْسَيْنِ﴾ [١]: ئەندازەی دووری ژێ لە کەوانەکەوە.﴿ضِيزَىٰٓ﴾ [٢]: ناڕاستە، غەیر عادلانە.**

(١) ئەندازەی دوو کەوان.

(٢) ئەسڵی مانای ئەم وشە: جەور و ستەمە.

﴿ وَأَكْدَىٰٓ ﴾ بەخشینەکەی بڕی، لە خێرکردن دەستی گرتەوە. ﴿ رَبُّ ٱلشِّعْرَىٰ ﴾ (پەروەردگاری) گەلاوێژە. ﴿ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴾: ئەوەی پێویست کرابوو لەسەری بە تەواو بەجێی هێنا. ﴿ أَزِفَتِ ٱلْـَٔازِفَةُ ﴾قیامەت نزیك بۆتەوە. ﴿ سَٰمِدُونَ ﴾غافڵان، (ئارەزوو بازان، خوبەزلزان). عیکریمە دەڵێ: ﴿ سَٰمِدُونَ ﴾گۆرانی دەڵێن بەزمانی حیمیەری. ئیبراهیم دەڵێ: ﴿ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ ﴾ دەی ئایا دەمە قاڵەی لەگەڵ دەکەن، هەرکەس بەم شێوە خوێندویەتیەوە: (أَفَتَمْرُونَهُ)[1] واتە: بڕوای پێ ناکەن، نکۆڵی لێ دەکەن (دەربارەی ئەوەی بینیویەتی). ﴿ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ ﴾: چاوی موحەممەد ﷺ.﴿ وَمَا طَغَىٰ ﴾: لە (بینینی) مەبەست تێ نەپەڕی.﴿ فَتَمَارَوْا۟ ﴾: بەدرۆیان زانی وباوەڕیان نەکرد (بەگومان بوون). حەسەن وتی: ﴿ إِذَا هَوَىٰ ﴾ ئاوا بوو، نیشت. ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: ﴿ أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ ﴾ دەبەخشێت و (مرۆڤ) ڕازی دەکات[2].

## ١ - بابٌ

٤٨٥٥ - حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ قُلْتُ لِعَائِشَةَ رضي الله عنها: يَا أُمَّتَاهْ، هَلْ رَأَى مُحَمَّدٌ ﷺ رَبَّهُ؟ فَقَالَتْ: لَقَدْ قَفَّ شَعَرِي مِمَّا قُلْتَ، أَيْنَ أَنْتَ مِنْ ثَلاَثٍ مَنْ حَدَّثَكَهُنَّ فَقَدْ كَذَبَ؟! مَنْ حَدَّثَكَ أَنَّ مُحَمَّدًا ﷺ رَأَى رَبَّهُ فَقَدْ كَذَبَ. ثُمَّ قَرَأَتْ: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾ الأنعام ﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ ﴿٥١﴾ ﴾ الشورى. وَمَنْ حَدَّثَكَ أَنَّهُ يَعْلَمُ

---

(١) کە حەمزە و کیسائی و یەعقوب و خەلەف بەو جۆرە خوێندویانەتەوە. بڕوانە : إرشاد الساری، ١١/٩٥.

(٢) بەوەی پێ بەخشیوە.

مَا فِي غَدٍ فَقَدْ كَذَبَ ثُمَّ قَرَأَتْ:﴿ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ ﴿٣٤﴾ ﴾ لقمان. وَمَنْ حَدَّثَكَ أَنَّهُ كَتَمَ فَقَدْ كَذَبَ ثُمَّ قَرَأَتْ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ﴿٦٧﴾ ﴾ المائدة وَلَكِنَّهُ رَأَى جِبْرِيلَ عليه السلام فِي صُورَتِهِ مَرَّتَيْنِ[1].

## ١ - باسێک

**٤٨٥٥ - مەسروق دەڵێ: بە عائیشەم ﵂ وت: ئەی دایکە ئایا موحەممەد ﷺ پەروەردگاری خۆی بینیوە؟عائیشە وتی: قژم ڕاست بووەوە لەتاو ئەو قسەی کردت، چۆن تۆ بێ ئاگای لەم سێ شتە، هەرکەس دەربارەیان قسەی بۆکردی ئەوە دڵنیابە درۆی کردووە: هەرکەس پێی وتی کەموحەممەد ﷺ پەروەردگاری بینیوە، ئەوە دڵنیابە درۆی کردووە، لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (چاوەکان پەی پێ نابەن و ناتوانن بیبینن، بەڵام ئەو هێزی بینین و چاوەکان دەبینێ وە ئەو ئاگای ورد بینە). (بۆ هیچ کەس نەبووە کە خوا قسەی لەگەڵدا بکات مەگەر بە سروشت یان لە پشت پەردەوە)، وە هەرکەس پێی وتی ئەوەی سبەی دەبێ دەیزانێ ئەوە بێگومان درۆی کردووە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (وە هیچ کەس نازانێ سبەینێ (لە داهاتوودا) چی دەکات)، وە هەر کەس پێی وتیت: پێغەمبەر ﷺ شتی شاردۆتەوە (لەگەیاندنی پەیامەکەیدا) ئەوە بەڕاستی درۆی کردووە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی لە لایەن پەروەردگارتەوە بۆت دابەزێنراوە ڕایگەیەنە (بەخەڵکی)) تا کۆتایی ئایەتەکە. بەڵام پێغەمبەر ﷺ جیبریلی عليه السلام لەسەر شێوەی خۆی دووجار بینیوە.**

---

(١) بڕوانە: ٣٢٣٤.

## ٢ - بابٌ: ﴿ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝٩ ﴾ النجم

من حَيْثُ الوَتَرُ فِي القَوْسِ.

٤٨٥٦ - حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ، حَدَّثَنَا الشَّيْبَانِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ زِرًّا، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﴿ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝٩ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ۝١٠ ﴾ النجم:. قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ مَسْعُودٍ أَنَّهُ رَأَى جِبْرِيلَ لَهُ سِتُّمِائَةِ جَنَاحٍ[1].

## ٢ - باسێک: (جا بە ئەندازەی دووکەوان یا کەمتر (ی ماوە بوو لەگەڵ موحەممەد ﷺ دا)

**واتە: بە ئەندازەی دووری ژێ لە کەوانەوە.**

**٤٨٥٦ -زیر گێڕایەوە لە عەبدوڵڵاوە دەربارەی ئەم ئایەتە: (جا بە ئەندازەی دوو کەوان یا کەمتر (ی ماوە بوو لە گەڵ موحەممەد ﷺ دا) ئینجا (خوا) سروشتی کرد بۆ بەندەی خۆی ئەوەی کە بۆی کرد) دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ بۆی گێڕاینەوە کە پێغەمبەر ﷺ جیبریلی ﷺ بینی شەش سەد باڵی هەبوو.**

## ٣ - بابُ قَوْلِهِ: ﴿ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ۝١٠ ﴾

٤٨٥٧ - حَدَّثَنَا طَلْقُ بْنُ غَنَّامٍ، حَدَّثَنَا زَائِدَةُ، عَنِ الشَّيْبَانِيِّ قَالَ سَأَلْتُ زِرًّا عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى:﴿ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝٩ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ۝١٠ ﴾ النجم:قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ: أَنَّ مُحَمَّدًا ﷺ رَأَى جِبْرِيلَ لَهُ سِتُّمِائَةِ جَنَاحٍ[2].

---

(١) بڕوانە: ٣٢٣٢.

(٢) بڕوانە: ٣٢٣٢.

## ٣ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئینجا (خوا) سرووشتی کرد بۆ بەندەی خۆی ئەوەی کە بۆی کرد)

٤٨٥٧ -شەیبانی دەڵێ: پرسیارم لە زیڕ کرد دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرزو بڵند: (جا بە ئەندازەی دووکەوان یان کەمتر (ی ماوە بوو لەگەڵ موحەممەد ﷺ دا)، ئینجا (خوا) سروشتی کرد بۆ بەندەی خۆی ئەوەی کە بۆی کرد)، زێڕیش وتی: عەبدوڵڵا بۆی گێڕاینەوە کە موحەممەد ﷺ جیبریلی ﷺ دیوە، شەش سەد باڵی هەبوو.

## ٤ - بابٌ: ﴿لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾﴾ النجم

٤٨٥٨ - حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيم، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ ﴿لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾﴾ النجم. قَالَ: رَأَى رَفْرَفًا أَخْضَرَ قَدْ سَدَّ الأُفُقَ[١].

## ٤ - باسێک: (سوێند بەخوا بێگومان گەورەترین بەڵگە و نیشانەی پەروەردگاری بینی)

٤٨٥٨ -عەلقەمە دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵڵاوە ﷺ دەربارەی ئەم ئایەتە (سوێند بەخوا گەورەترین بەڵگە و نیشانەی پەروەردگاری بینی)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرشێکی بینی[٢] (جیبریلی ﷺ لە سەر بوو) هەموو ئاسۆی گرتبوویەوە.

---

(١) بڕوانە: ٣٢٣٣.

(٢) بەجۆری تریش ماناکراوە، جیبریلی بینی جلێکی لەبەردا بوو هەموو ئاسۆی گربوو، یا باڵەکانی جیبریل هەموو ئاسۆی گرتبوو، بەڵام ئەوە لەسەرەوە نووسیومانە لە هەمووی ڕاسترە و ڕیوایاتی تر پشگیری دەکات. (ارشاد الساری:١١/٩٩)

## ٥ - بابٌ: ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ ﴾ النجم

٤٨٥٩ - حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَشْهَبِ، حَدَّثَنَا أَبُو الْجَوْزَاءِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما فِي قَوْلِهِ: ﴿ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ ﴾ النجم:

. كَانَ الَّلاَتُ رَجُلاً يَلُتُّ سَوِيقَ الْحَاجِّ.

## ٥ - باسێک: (دەی پێم ئایا لات و عوززا (هیچیان پێ دەکرێ))

**٤٨٥٩ - ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەربارەی ﴿ ٱللَّٰتَ ﴾ دەڵێ: لات پیاوێک بوو سەوقاتی حاجیانی تێکەڵ بەرۆن دەکرد [(١)].**

٤٨٦٠ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ وَاللاَّتِ وَالْعُزَّى. فَلْيَقُلْ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ: تَعَالَ أُقَامِرْكَ. فَلْيَتَصَدَّقْ»[(٢)].

**٤٨٦٠ ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس سوێندی خوارد و لەسوێندەکەیدا وتی: سوێند بەلات و عوززا ئەوە بابڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) هەرکەسیش بە هاورێکەی وت: وەرە قومارت لەگەڵ بکەم ئەو باخێرێک بکات)).**

(١) ئاردی تێکەڵ بە ڕۆن دەکرد و سەوقاتی بۆ حاجیان دروست دەکرد.

(٢) بڕوانە: ٦١٠٧، ٦٣٠١، ٦٦٥٠.

## ٦ - بابٌ: ﴿ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ ﴾ النجم

٤٨٦١ - حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ سَمِعْتُ عُرْوَةَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ ﵂ فَقَالَتْ: إِنَّمَا كَانَ مَنْ أَهَلَّ بِمَنَاةَ الطَّاغِيَةِ الَّتِي بِالْمُشَلَّلِ لاَ يَطُوفُونَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾ ﴾ البقرة فَطَافَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَالْمُسْلِمُونَ. قَالَ سُفْيَانُ: مَنَاةُ بِالْمُشَلَّلِ مِنْ قُدَيْدٍ. وَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِدٍ: عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، قَالَ عُرْوَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: نَزَلَتْ فِي الأَنْصَارِ كَانُوا هُمْ وَغَسَّانُ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمُوا يُهِلُّونَ لِمَنَاةَ. مِثْلَهُ. وَقَالَ مَعْمَرٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ: كَانَ رِجَالٌ مِنَ الأَنْصَارِ مِمَّنْ كَانَ يُهِلُّ لِمَنَاةَ -وَمَنَاةُ صَنَمٌ بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ - قَالُوا: يَا نَبِيَّ اللهِ كُنَّا لاَ نَطُوفُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ تَعْظِيمًا لِمَنَاةَ. نَحْوَهُ[1].

## ٦ - باسێک: (وە بتی سێیەم کە مەناتە (ئایا هیچیان پێ دەکرێ))

**٤٨٦١ -زوهری دەڵێ: لەعوروەم بیست وتی: بە عائیشەم ﵂ وت[2]، عائیشەش وتی: بێگومان جاران هەرکەس لە موشەللەلەوە ئیحرامی دابەستایە بەناوی مەناتی سەرکەشەوە تەواف نێوان صەفاو مەڕوایان نەدەکرد، بەو هۆیەوە خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتەی دابەزاند (بەڕاستی (هاتوچۆی نێوان) صەفاو مەڕوە لەدروشمەکانی (دینی) خوان)، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ و مسوڵمانان تەواف (نێوان صەفا و مەروە) یان کرد، سوفیان دەڵێ: مەنات لە موشەللەل بوو لە قودەید.**

---

(١) بروانە: ١٦٤٣.

(٢) ئەوەی عوروە بە عائیشەی وت لە فەرموودەی (٤٤٩٥) دایە لە تەفسیری سوڕەتی بەقەڕە ئایەتی ١٥٨.

- عائیشه ﵂ دەڵێ: (ئەو ئایەتە) دەربارەی ئەنصارییەکان دابەزی - ئەوان و هۆزی غەسسان - پێش مسوڵمان بوونیان - بەناو مەناتەوە ئیحرامیان دادە بەست. هەر وەك فەرموودەکەی سوفیان دەگێڕێتەوە.

- عائیشه ﵂ دەڵێ: جاران کەسانێك لە ئەنصارییەکان لەوانەیان ئیحرامیان بەناوی مەناتەوە دادە بەست - مەنات بتێك بوو لە نێوان مەککە و مەدینەدا - (ئەنصارییەکان) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە جاران هاتوچۆی نێوان صەفا و مەرِ وەمان نەدەکرد لەبەر رێزدانان بۆ مەنات ئیتر وێنەی فەرموودەکە پێشوو دێنێ.

## ٧ - بابٌ: ﴿فَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ وَٱعْبُدُوا۟ ۩ ﴿٦٢﴾﴾ النجم

٤٨٦٢ - حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ سَجَدَ النَّبِيُّ ﷺ بِالنَّجْمِ وَسَجَدَ مَعَهُ الْمُسْلِمُونَ وَالْمُشْرِكُونَ وَالْجِنُّ وَالإِنْسُ. تَابَعَهُ ابْنُ طَهْمَانَ، عَنْ أَيُّوبَ. وَلَمْ يَذْكُرِ ابْنُ عُلَيَّةَ ابْنَ عَبَّاسٍ[1].

## ٧ - باسێك: (دەی سوژدە بەرن بۆ خوا و پەرستشی بکەن)

٤٨٦٢ - عیکریمە لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە ﵄ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەخوێندنی سورەتی (النَّجْم) سوژدەی برد، وە مسوڵمانان و بتپەرست و جنۆکە و مرۆڤەکان لەگەڵیدا سوژدەیان برد.

ئیبنو تەهمان لەئەیووبەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عەبدولواریس دەکات. وە ئیبنو عولەییە (لەڕشتەکەیدا) ناوی ئیبنو عەبباسی نەهێناوە.

---

(١) بڕوانە: ١٠٧١.

٤٨٦٣ - حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ أَخْبَرَنِي أَبُو أَحْمَدَ، حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: أَوَّلُ سُورَةٍ أُنْزِلَتْ فِيهَا سَجْدَةٌ ﴿وَٱلنَّجْمِ ۝١﴾ النجم. قَالَ فَسَجَدَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَسَجَدَ مَنْ خَلْفَهُ، إِلاَّ رَجُلاً رَأَيْتُهُ أَخَذَ كَفًّا مِنْ تُرَابٍ فَسَجَدَ عَلَيْهِ، فَرَأَيْتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ قُتِلَ كَافِرًا، وَهْوَ أُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ[1].

**٤٨٦٣ -عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: یەکەم سوڕەتێك دابەزێنرا سوژدەی تیا بوو سوڕەتی نەجم بوو، (عەبدوڵڵا) دەڵێ: ئەنجا پێغەمبەرری خوا ﷺ (دوای خوێندنەوەی) سوژدەی برد، ئەوانەش لەدوایەوە بوون هەموو سوژدەیان برد، پیاوێك نەبێ مشتێ خۆڵی هەڵگرت سوژەی لەسەری برد، ئەنجا دوای ئەوە دیم بە کافری کوژرا، ئەو کەسەش ئومەییەی کوڕی خەلەف بوو.**

## ٥٤ - سورة ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ ۝١﴾ القمر

قَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿مُّسْتَمِرٌّ ۝٢﴾ القمر: ذَاهِبٌ. ﴿مُزْدَجَرٌ ۝٤﴾ القمر: مُتَنَاهٍ. ﴿وَٱزْدُجِرَ ۝٩﴾ القمر: فَاسْتُطِيرَ جُنُونًا ﴿وَدُسُرٍ ۝١٣﴾ القمر: أَضْلاَعُ السَّفِينَةِ.﴿لِّمَن كَانَ كُفِرَ ۝١٤﴾ القمر: يَقُولُ: كُفِرَ لَهُ جَزَاءً مِنَ اللهِ. ﴿مُّحْتَضَرٌ ۝٢٨﴾ القمر: يَحْضُرُونَ المَاءَ. وَقَالَ ابن جُبَيْرٍ:﴿مُّهْطِعِينَ ۝٨﴾ القمر: النَّسَلاَنُ، الخَبَبُ السِّرَاعُ. وَقَالَ غَيْرُهُ:﴿فَتَعَاطَىٰ ۝٢٩﴾ القمر: فَعَاطَهَا بِيَدِهِ فَعَقَرَهَا. ﴿ٱلْمُحْتَظِرِ ۝٣١﴾ القمر: كَحِظَارٍ مِنَ الشَّجَرِ مُحْتَرِقٍ.﴿وَٱزْدُجِرَ ۝٩﴾ القمر: أُفْتُعِلَ مِنْ زَجَرْتُ. ﴿كُفِرَ ۝١٤﴾ القمر: فَعَلْنَا بِهِ وَبِهِمْ مَا فَعَلْنَا جَزَاءً لِمَا صُنِعَ بِنُوحٍ وَأَصْحَابِهِ. ﴿مُّسْتَقِرٌّ ۝٣٨﴾ القمر: عَذَابٌ حَقٌ، يُقَالُ: الأَشَرُ: المَرَحُ وَالتَّجَبُّرُ.

---

(١) بروانە: ١٠٦٧.

## ٥٤ - (تەفسیری) سورەتی: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ﴾[1]

موجاهید دەڵێ: ﴿مُّسْتَمِرٌّ﴾ دەڕوات، نامێنێ، کۆتایی دێت. ﴿مُزْدَجَرٌ﴾ توندتری ڕێگری کەر، هۆی گەڕانەوە. ﴿وَٱزْدُجِرَ﴾ (جنۆکە دەستی لێ وەشاندووە) شێت کراوە. ﴿وَدُسُرٍ﴾ پارچە تەختەکانی کەشتیەکە. ﴿لِّمَن كَانَ كُفِرَ﴾ ئەمە پاداشتە بۆ ئەو کەسەی باوەڕی پێ نەکرا)، دەڵێ: باوەڕی پێ نەکرا ئیتر بەو جۆرە لە لایەن خواوە تۆڵەیان لێ سەنرا. ﴿مُّحْتَضَرٌ﴾: (گەلی صالح ﷺ) ئامادەی نۆرە ئاوەکەیان دەبوون. ئیبنو جوبەیر دەڵێ: ﴿مُّهْطِعِينَ﴾ بە پەلە دەڕۆن، ڕادەکەن. جگە لە ئیبنو حوبەیر دەڵێ: ﴿فَتَعَاطَىٰ﴾ جا ئەویش دەستی دایە شمشێر و (وشترەکەی) سەربڕی (چوارپەلی بڕی). ﴿ٱلْمُحْتَظِرِ﴾ پەل و پۆی درەختی سووتاو. ﴿وَٱزْدُجِرَ﴾:لەسەر کێشی (أفْتُعِلَ)ەیە، لە (زَجَرْتُ)ەوە وەرگیراوە (پاڵ پێوەنراوە، دەرکراوە). ﴿كُفِرَ﴾: ئەوەی بەسەرمان هێنان چ نووح (بەڕزگار کردن) چ ئەوان (بە خنکاندنیان) لە تۆڵەی ئەوەدا بوون بە نووح ﷺ و هاوەڵانی کرا.﴿مُّسْتَقِرٌّ﴾ سزایەکی هەق و ڕاست[2]، وە دەوترێت: (الأَشَرُ):لەخۆبایی بووی خۆبەزلزان.

### ١ - بابٌ: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً يُعْرِضُوا۟ ۝٢﴾ القمر

٤٨٦٤ - حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ وَسُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: انْشَقَّ الْقَمَرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِرْقَتَيْنِ، فِرْقَةً فَوْقَ الْجَبَلِ وَفِرْقَةً دُونَهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اشْهَدُوا»[3].

---

(١) ناوی سورەتی قەمەرە، بۆیە بوخاری ئەو ناوەی لێ ناوە چونکە بەو ئایەتە دەست پێ دەکات.

(٢) بەو شێوەی خوا وەعدەی پێدابوون هاتەدی.

(٣) بڕوانە: ٣٦٣٦.

## ١ - باسێک: (وە مانگ لەت بوو وە ئەگەر بێ باوەڕان موعجیزەیەک ببینن پشت هەڵدەکەن)

**٤٨٦٤ -ئیبنو مەسعوود ﷺ دەڵێ: مانگ لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو بە دوو لەتەوە، لەتێکیان بەسەر شاخەکەوە بوو، لەتێکیشیان لەم لایەوە، بوو پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((شایەتی بدەن)).**

٤٨٦٥ - حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، أَخْبَرَنَا ابْنُ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ مُجَاهِدٌ، عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ انْشَقَّ الْقَمَرُ وَنَحْنُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَصَارَ فِرْقَتَيْنِ، فَقَالَ لَنَا «اشْهَدُوا، اشْهَدُوا»[١].

**٤٨٦٥ -عەبدوڵلا ﷺ وتی: لەکاتێکدا ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین مانگ لەت بوو بویە دوو لەتەوە، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێمان: ((شایەت بن، شایەت بن)).**

٤٨٦٦ - حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي بَكْرٌ، عَنْ جَعْفَرٍ، عَنْ عِرَاكِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: انْشَقَّ الْقَمَرُ فِي زَمَانِ النَّبِيِّ ﷺ[٢].

**٤٨٦٦ - ئیبنو عەبباس ﷺ وتی: لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ مانگ لەت بوو.**

٤٨٦٧ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ سَأَلَ أَهْلُ مَكَّةَ أَنْ يُرِيَهُمْ آيَةً فَأَرَاهُمُ انْشِقَاقَ الْقَمَرِ[٣].

---

(١) بروانە: ٣٦٣٦.

(٢) بروانە: ٣٦٣٨.

(٣) بروانە: ٣٦٣٧.

٤٨٦٧ ـئەنەس ﷺ دەڵێ: خەڵکی مەککە داوایان کرد (لە پێغەمبەر ﷺ) کە موعجیزەیەکیان نیشان بدات، ئەویش لەت بوونی مانگ (بەدوو لەت)ی نیشان دان.

٤٨٦٨ - حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: انْشَقَّ الْقَمَرُ فِرْقَتَيْنِ.

٤٨٦٨ ـئەنەس ﷺ وتی: مانگ بوو بە دوو لەتەوە (لەسەر دەمی پێغەمبەردا ﷺ).

## ٢ - بابٌ: ﴿ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٥﴾ ﴾ القمر

قَالَ قَتَادَةُ: أَبْقَى اللَّهُ سَفِينَةَ نُوحٍ حَتَّى أَدْرَكَهَا أَوَائِلُ هذِه الأُمَّةِ.

٤٨٦٩ - حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ: ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾ القمر[١].

## ٢ - باسێک: ((کەشتێکە) بە چاودێری ئێمە دەڕۆشت، ئەمە پاداشتە بۆ ئەو کەسەی باوەڕی پێ نەکرا (کە نووحە ﷺ)، بێگومان ئەو ڕووداوەمان هێشتەوە تا ببێتە پەندێک، جا ئایا کەسێک هەیە پەند وەرگرێ؟)

ـقەتادە دەڵێ: خوا کەشتییەکەی نووحی ﷺ هێشتەوە هەتا پێشینانی ئەم ئوممەتە پێی گەیشتوون و بینیویانە.

٤٨٦٩ ـعەبدوڵڵا ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی بەم جۆرە دەخوێندەوە: ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾

(١) بروانە: ٣٣٤١.

## ٣ - بابٌ: ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾ القمر

قَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ يَسَّرْنَا ﴿١٧﴾ ﴾ هَوَّنَّا قِرَاءَتَهُ.

٤٨٧٠ - حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقْرَأُ: ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾

## ٣ - باسێک: (سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە قورئانمان ئاسان کردووە بۆ ئامۆژگاری لێ وەرگرتن، جا ئایا پەند وەرگرێک هەیە؟)

**–موجاهید دەڵێ: ﴿ يَسَّرْنَا ﴾ خوێندنەوەیمان ئاسان کردووە.**

**٤٨٧٠ -عەبدوڵڵا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە ئەو ئەم ئایەتەی بەم جۆرە دەخوێندەوە:** ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾ القمر.

## ٤ - بابٌ: ﴿ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ ﴿٢٠﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٢١﴾ ﴾ القمر

٤٨٧١ - حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ أَنَّهُ سَمِعَ رَجُلاً سَأَلَ الأَسْوَدَ: ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾ القمر.أَوْ (مُذَّكِرٍ) فَقَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ يَقْرَؤُهَا﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾ القمر، قَالَ: وَسَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَؤُهَا:﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾ دَالاً[1].

---

(١) بروانە: ٣٣٤١.

## ٤ - باسێک: (بنەدار خورمای لە بێخ هەڵکەندراو، جا ئایا سزا و هەڕەشەی ئێمە چۆن بوو (لە بن باوەڕان) )

٤٨٧١ -ئەبو ئیسحاق دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پیاوێك بوو پرسیاری لە ئەسوەد کرد وتی: ئایا ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ـە یا (مُذکِر)ـە؟ ئەسوەدیش وتی: لە عەبدوڵلام بیستووە بە ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾دەیخوێندەوە وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست بە: ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾دەیخوێندەوە بە دال [1] (دەیخوێندەوە).

## ٥ - بابٌ: ﴿ فَكَانُوا۟ كَهَشِيمِ ٱلْمُحْتَظِرِ (٣١) وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ (٣٢) ﴾ القمر

٤٨٧٢ - حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا أَبِي، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَرَأَ: ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ (٣٢) ﴾ الآيَةَ[2] القمر.

## ٥ - باسێک: (جا هەموو بوون بە پووشی ژێر پێی ئاژەڵ، سوێند بەخوا بەڕاستی قورئانمان ئاسان کردووە بۆ ئامۆژگاری لێ وەرگرتن، دەسا ئاخۆ پەند وەرگرێک ببێ؟)

٤٨٧٢ -عەبدوڵلا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەم ئایەتەی بەم جۆرە خوێندەوە:﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە.

---

(١) واتە: بە (مُدَّكر) نەك (مُذَّكر) بەیەکەمیان کە بەداڵە نەك دووەمیان کە ژاڵە.

(٢) بڕوانە: ٣٣٤١.

٦ - بابٌ: ﴿ وَلَقَدْ صَبَّحَهُم بُكْرَةً عَذَابٌ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣٨﴾ فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٩﴾ ﴾ القمر

٤٨٧٣ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَرَأَ: ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٤٠﴾ ﴾ القمر[1].

## ٦ - باسێک: (سوێند بەخوا بێگومان لەبەرە بەیاندا سزایەکی بەردەوام هێرشی بردە سەریان دەی بچێژن سزا و هەڕەشەکانم)

٤٨٧٣ - عەبدوڵڵا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەم ئایەتەی بەم جۆرە خوێندەوە: ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾.

٧ - بابٌ: ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا أَشْيَاعَكُمْ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٥١﴾ ﴾ القمر

٤٨٧٤ - حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ: فَهَلْ مِنْ مُذْكِرٍ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٥١﴾ ﴾ القمر[2].

---

(١) بڕوانە: ٣٣٤١.

(٢) بڕوانە: ٣٣٤١.

## ٧ - باسێک: (سوێند بەخوا بێگومان زۆر لە کەسانی بێ باوەڕی وەک ئێوەمان لەناو بردووە جا ئایا تەمێ وەرگرێک هەیە)

٤٨٧٤ -عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: ئەم ئایەتەم بەم جۆرە: (فَهَلْ مِنْ مُذَّكِرٍ) خوێندەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش فەرمووی: ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾

## ٨ - بابٌ: ﴿ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ ﴾ القمر

٤٨٧٥ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حَوْشَبٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ وُهَيْبٍ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ وَهْوَ فِي قُبَّةٍ يَوْمَ بَدْرٍ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَنْشُدُكَ عَهْدَكَ وَوَعْدَكَ، اللَّهُمَّ إِنْ تَشَأْ لاَ تُعْبَدْ بَعْدَ الْيَوْمِ». فَأَخَذَ أَبُو بَكْرٍ بِيَدِهِ فَقَالَ: حَسْبُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلْحَحْتَ عَلَى رَبِّكَ. وَهْوَ يَثِبُ فِي الدِّرْعِ، فَخَرَجَ وَهْوَ يَقُولُ: ﴿ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ ﴾ القمر[1].

## ٨ - باسێک: (بێگومان کۆمەڵەکەیان دەشکێنرێ و هەڵدێن)

٤٨٧٥ - ئیبنو عەبباس ﷺ [2] دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی غەزای بەدردا لەچادرێکی وەك گومەز دابوو فەرمووی: ((ئەی خوایە من داوای بەجێهێنانی پەیمان وبەڵێنەکەتت لێ دەکەم (کە سەرکەوتنمە بەسەر کافران دا)، خوایە ئەگەر بتەوێ

(١) بڕوانە: ٣٩١٥.

(٢) ئەم فەرموودە بە دوو ڕشتە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە.

(باوەڕداران لەناوچن) لە ئەمڕۆ بەدواوە ناپەرستڕێیت)) جا ئەبو بەکر ﷺ دەستی پێغەمبەری ﷺ گرت وتی: ئیتر بەسە ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی تۆ زۆر پاڕایتەوە لە پەروەردگارت، لەو کاتەدا هەستا زرێی پۆشیبوو، جا (لە چادرەکە) هاتە دەرەوە دەیفەرموو: ((بێگومان کۆمەڵەکەیان دەشکێنرێ و هەڵدێن و ڕادەکەن)).

## ٩ - بابٌ: ﴿ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ ﴾ القمر

﴿ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ ﴾ القمر: يَعْنِي: مِنَ المَرَارَةِ.

٤٨٧٦ - حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَنَّ ابْنَ جُرَيْجٍ أَخْبَرَهُمْ قَالَ: أَخْبَرَنِي يُوسُفُ بْنُ مَاهَكَ قَالَ: إِنِّي عِنْدَ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ قَالَتْ: لَقَدْ أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ ﷺ بِمَكَّةَ، وَإِنِّي لَجَارِيَةٌ أَلْعَبُ ﴿ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ ﴾ القمر[1].

## ٩ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (بەڵکو بەڵێنیان ڕۆژی دواییە وە (سزای) ئەو ڕۆژە زۆر سەخت تر و تاڵترە)

﴿ وَأَمَرُّ ﴾ لە (المَرَارَةِ )ـەوە هاتووە واتە: تاڵی[2].

٤٨٧٦ -یوسف کوڕی ماهەك دەڵێ: من لە خزمەتی عائیشەی دایکی باوەڕداراندا ﵂ بووم وتی: سوێند بەخوا بێگومان کە ئەم ئایەتە: ﴿ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ ﴾ دابەزێنرا بۆ موحەممەد ﷺ لە مەککە دا، من کچۆڵەیەك بووم یاریم دەکرد.

---

(١) بڕوانە: ٤٩٩٣.

(٢) نەك لە (مرور)ـەوە واتە، ڕۆشت و تێپەڕین.

٤٨٧٧ - حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ وَهْوَ فِي قُبَّةٍ لَهُ يَوْمَ بَدْرٍ: «أَنْشُدُكَ عَهْدَكَ وَوَعْدَكَ، اللَّهُمَّ إِنْ شِئْتَ لَمْ تُعْبَدْ بَعْدَ الْيَوْمِ أَبَدًا». فَأَخَذَ أَبُو بَكْرٍ بِيَدِهِ وَقَالَ: حَسْبُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَدْ أَلْحَحْتَ عَلَى رَبِّكَ. وَهْوَ فِي الدِّرْعِ فَخَرَجَ وَهْوَ يَقُولُ: ﴿ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ ﴾ القمر[1].

**٤٨٧٧ - ئيبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی غەزای بەدردا لە چادرێکی وەك گومەز دابوو فەرمووی: ((خوایە من داوای بەجێهێنانی پەیمان و بەڵێنەکەتت لێ دەکەم (کەسەرکەوتنمە بەسەر کافران دا)، (خوایە) ئەگەر بتەوێ (باوەڕداران لەناوچن) لەئەمڕۆ بەدواوە هەگیز ناپەرسترێیت))، جا ئەبو بەکر ﷺ دەستی پێغەمبەری ﷺ گرت وتی: ئیتر بەسە ئەی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی تۆ زۆر پاڕایتەوە لە پەروەردگارت، لەوکاتەدا زرێی پۆشیبوو جا (لە جادرەکە) هاتە دەرەوە دەیفەرمووو: ((بێگومان کۆمەڵەکەیان دەشکێنرێ و هەڵدێن، بەڵکو بەڵێنیان ڕۆژی دواییە، وە (سزای ) ئەو ڕۆژە زۆر سەختر وتاڵترە )).**

(١) بڕوانە: ٢٩١٥.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٥٥ - سورة الرَّحْمَن

وقال مجاهد:﴿ بِحُسْبَانٍ ﴿٥﴾ ﴾ الرحمن: وقال غيره: ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلْوَزْنَ ﴿٩﴾ ﴾ الرحمن: يُرِيدُ لِسَانَ المِيزَانِ، ﴿ وَالْعَصْفُ ﴾: بَقْلُ الزَّرْعِ إِذَا قُطِعَ مِنْهُ شيء قَبْلَ أَنْ يُدْرِكَ فَذَلِكَ العَصْفُ. ﴿ وَٱلرَّيْحَانُ ﴿١٢﴾ ﴾ الرحمن: رِزْقُهُ. ﴿ وَٱلْحَبُّ ﴿١٢﴾ ﴾ الرحمن: الذِي يُؤْكَلُ مِنْهُ، وَالرَّيْحَانُ فِي كَلَامِ العَرَبِ: الرِّزْقُ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: وَالْعَصْفُ يُرِيدُ المَأْكُولَ مِنَ الحَبِّ. ﴿ وَٱلرَّيْحَانُ ﴿١٢﴾ ﴾ الرحمن: النَّضِيجُ الذِي لَمْ يُؤْكَلْ. وَقَالَ غَيْرُهُ العَصْفُ وَرَقُ الحِنْطَةِ. وَقَالَ الضَّحَّاكُ: العَصْفُ التِّبْنُ. وَقَالَ أَبُو مَالِكٍ: العَصْفُ أَوَّلُ مَا يَنْبُتُ تُسَمِّيهِ النَّبَطُ هَبُورًا. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: العَصْفُ وَرَقُ الحِنْطَةِ. وَالرَّيْحَانُ الرِّزْقُ، وَالْمَارِجُ: اللَّهَبُ الأَصْفَرُ وَالأَخْضَرُ الذِي يَعْلُو النَّارَ إِذَا أُوقِدَتْ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿ رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ ﴿١٧﴾ ﴾ الرحمن: لِلشَّمْسِ فِي الشِّتَاءِ مَشْرِقٌ، وَمَشْرِقٌ فِي الصَّيْفِ. ﴿ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴿١٧﴾ ﴾ الرحمن: مَغْرِبُهَا فِي الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ ﴿ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ ﴾ الرحمن: لَا يَخْتَلِطَانِ ﴿ ٱلْمُنشَـَٔاتُ ﴿٢٤﴾ ﴾ الرحمن: مَا رُفِعَ قِلْعُهُ مِنَ السُّفُنِ، فَأَمَّا مَا لَمْ يُرْفَعْ قَلْعُهُ فَلَيْسَ بِمُنْشَأَتٍ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ كَٱلْفَخَّارِ ﴿١٤﴾ ﴾ الرحمن: كما يُصنع الفخار. ﴿ شُوَاظٌ ﴿٣٥﴾ ﴾ الرحمن: لهب من نار. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ وَنُحَاسٌ ﴿٣٥﴾ ﴾ الرحمن: الاالصُّفْرُ يُصَبُّ عَلَى رُءُوسِهِمْ، يُعَذَّبُونَ بِهِ. ﴿ خَافَ

مَقَامَ رَبِّهِۦ ﴿٤٦﴾ الرحمن: يَهُمُّ بِالْمَعْصِيَةِ فَيَذْكُرُ اللَّهَ ﷻ فَيَتْرُكُهَا، الشُّوَاظُ لَهَبٌ مِنْ نَارٍ.

﴿ مُدْهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ ﴾ الرحمن: سَوْدَاوَانِ مِنَ الرِّيِّ. ﴿ صَلْصَـٰلٍ ﴿١٤﴾ ﴾ الرحمن: طِينٌ خُلِطَ بِرَمْلٍ، فَصَلْصَلَ كَمَا يُصَلْصِلُ الفَخَّارُ. وَيُقَالُ: مُنْتِنٌ، يُرِيدُونَ بِهِ: صَلَّ، يُقَالُ: صَلْصَالٌ، كَمَا يُقَالُ: صَرَّ البَابُ عِنْدَ الإِغْلَاقِ، وَصَرْصَرَ مِثْلُ كَبْكَبْتُهُ يَعْنِي كَبَبْتُهُ. ﴿ فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ ﴾ الرحمن: وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَيْسَ الرُّمَّانُ وَالنَّخْلُ بِالْفَاكِهَةِ، وَأَمَّا العَرَبُ فَإِنَّهَا تَعُدُّهَا فَاكِهَةً كَقَوْلِهِ ﷻ: ﴿ حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ ﴿٢٣٨﴾ ﴾ البقرة: فَأَمَرَهُمْ بِالْمُحَافَظَةِ على كُلِّ الصَّلَوَاتِ، ثُمَّ أَعَادَ العَصْرَ تَشْدِيدًا لَهَا، كَمَا أُعِيدَ النَّخْلُ وَالرُّمَّانُ، وَمِثْلُهَا: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ ﴿١٨﴾ ﴾ الحج: ثُمَّ قَالَ ﴿ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ﴿١٨﴾ ﴾ الحج: قَدْ ذَكَرَهُمْ فِي أَوَّلِ قَوْلِهِ: ﴿ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ ﴿١٨﴾ ﴾ الحج: وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿ أَفْنَانٍ ﴿٤٨﴾ ﴾ الرحمن أَغْصَانٍ. ﴿ وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ ﴿٥٤﴾ ﴾ الرحمن مَا يُجْتَنَى قَرِيبٌ. وَقَالَ الحَسَنُ: ﴿ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ ﴿١٣﴾ ﴾ الرحمن: نِعَمِهِ. وَقَالَ قَتَادَةُ: ﴿ رَبِّكُمَا ﴿١٣﴾ ﴾ الرحمن: يَعْنِي الجِنَّ وَالإِنْسَ. وَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ:

﴿ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ ﴾ الرحمن: يَغْفِرُ ذَنْبًا، وَيَكْشِفُ كَرْبًا، ويرْفَعُ قَوْمًا، وَيَضَعُ آخَرِينَ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ بَرْزَخٌ ﴿٢٠﴾ ﴾ الرحمن: حَاجِزٌ، الأَنَامُ: الخَلْقُ. ﴿ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ ﴾ الرحمن: فَيَّاضَتَان. ﴿ ذُو ٱلْجَلَـٰلِ ﴿٢٧﴾ ﴾ الرحمن: ذُو العَظَمَةِ، وَقَالَ غَيْرُهُ: مَارِجٌ خَالِصٌ

مِنَ النَّارِ، يُقَالُ: مَرَجَ الأَمِيرُ رَعِيَّتَهُ إِذَا خَلَّاهُمْ يَعْدُو بَعْضُهُمْ على بَعْضٍ. مَرَجَ أَمْرُ النَّاسِ﴿ مَّرِيجٍ ﴿٥﴾ ﴾ ق: مُلْتَبِسٌ. ﴿ مَرَجَ ﴿١٩﴾ ﴾ الرحمن: اخْتَلَطَ البَحْرَانِ، مِنْ مَرَجْتَ دَابَّتَكَ تَرَكْتَهَا.﴿ سَنَفْرُغُ لَكُمْ ﴿٣١﴾ ﴾ الرحمن: سَنُحَاسِبُكُمْ، لَا يَشْغَلُهُ شَيْءٌ عَنْ شَيْءٍ وَهْوَ مَعْرُوفٌ فِي كَلَامِ العَرَبِ يُقَالُ: لأَتَفَرَّغَنَّ لَكَ وَمَا بِهِ شُغْلٌ، يَقُولُ: لآخُذَنَّكَ عَلَى غِرَّتِكَ.

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٥٥ - (تەفسیری) سورەتی رەحمان

**موجاهید وتی: ﴿بِحُسْبَانٍ ﴾ بەحسابێکی زۆر ورد دەسوڕێنە، وەك سوڕانەوەی بەردی ئاش.**

**﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلْوَزْنَ ﴾ مەبەستی زمانەی ترازوە (دەبێ ڕێك لە ناوەڕاست دا بێت لەکاتی کێشانەدا). ﴿ وَالْعَصْفُ ﴾: ڕووەك و گژوگیایە ئەگەر دەرەو بکرێ و ببڕدرێت پێش پێگەیشتن ئەوە پێی دەوترێت: (الْعَصْفُ). ﴿ وَٱلرَّيْحَانُ ﴾: دانەوێڵە کەیەتی (گەنم و جۆ) ﴿ وَٱلْحَبُّ ﴾ ئەوەی کە دەخورێت لە کشتوکاڵ، وە ﴿ وَٱلرَّيْحَانُ ﴾ لە زمانی عەرەبیدا بەرسق و ڕۆزی (دانەوێڵە) دەوترێت. وە هەندێکیان دەڵێن: ﴿ وَالْعَصْفُ ﴾: بریتییە لەوەی کە خوراوە لە دانەوێڵە. ﴿ وَٱلرَّيْحَانُ ﴾ یش ئەوەیە کە پێ گەیشتووە و نەخوراوە.جگە لە موجاهید دەڵێ: (الْعَصْفُ): گەڵای گەنمە. زەححاك دەڵێ: (الْعَصْفُ) کایە. ئەبو مالیك دەڵێ: (الْعَصْفُ): بەدەغڵ و دان دەوترێت لە سەرەتای سەوز بوونیدا، جوتیارەکان پێی دەڵێن هەبور. موجاهید دەڵێ: (الْعَصْفُ): گەڵای گەنمە، ﴿ وَٱلرَّيْحَانُ ﴾ دەنکە**

گەنمەکەیە. (وَالْمَارِجُ) ئەو گڕە زەرد و سەوزەیە کە بەرز دەبێتەوە کاتێ ئاگرەکە هەڵدەگیرسێنرێت.

-کەسانێك لە موجاهیدەوە گێڕاویانەتەوە کە دەڵێ: ﴿ رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ ﴿١٧﴾ ﴾خۆر لە زستاندا شوێنێکی هەیە لێوە هەڵدێ و لە هاوینیشدا شوێنێکی هەیە لێیەوە هەڵدێ. ﴿ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴾ شوێنی ئاوابوونیەتی لە زستان و لە هاویندا.

﴿ يَبْغِيَانِ ﴾ تێکەڵاوی یەکتر نابن.﴿ كَٱلْفَخَّارِ ﴾ ئەو پاپۆڕانەیە چارۆکەکانیان بەرز کرابێتەوە، بەڵام ئەگەر چارۆکەکانیان بەرز نەکرابێتەوە ئەوە (مُنْشَأَت) نییە [1].موجاهید دەڵێ: ﴿ كَٱلْفَخَّارِ ﴾ بەو شێوەی سواڵەت دروست دەکرێ. ﴿ شُوَاظٌ ﴾ بلێسە و گڕی ئاگر. موجاهید دەڵێ: ﴿ وَنُحَاسٌ ﴾ مسە بەسەریاندا دەتوێنرێتەوە سزا دەدرێن پێی.﴿ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ ﴾ دێ بە دڵیدا تاوانێك بکات ئەنجا خوا ﷻ بیر دەکەوێتەوە و وازی لێ دێنێت.

﴿ مُدْهَآمَّتَانِ ﴾ (دوو باخ) هەردووکیان ڕەشن لەبەر زۆر سەوزییان. ﴿ صَلْصَٰلٍ ﴾ قوڕێکە تێکەڵ بەلم کراوە دەنگی لێوە دێ، وەك چۆن سواڵەت دەنگی دێ (ئەگەر وشك بێتەوە و لێی بدرێت)، وە دەشوترێت: ترشاوە مەبەستیان پێی بۆگەنی کردووە [2]، وە دەوترێت: (صَلْصَالٍ) هەرچۆنێك دەوترێت (صَرَّالبَابُ) لە کاتی داخستنیدا وە دەشوترێت (صَرصَر) [3] هەروەها وەکو (كَبكَبتُهُ) واتە: (كَبَبْتُهُ) [4].

---

(١) پێ ی ناوترێت (مُنشَآتٌ).

(٢) وەك گۆشت کە بۆگەن دەکات پێی دەڵێن، صَلّ .

(٣) واتە: (صَلّ) بەمانای (صلصال) هەرچۆنێك (صَرّ) بەمانای (صرصر).

(٤) ئەوەش هەر وەك نموونەکەی پێشوو وایە.

- ﴿ فَٰكِهَةٌ وَنَخۡلٌ وَرُمَّانٌ ﴾هەندێکیان دەڵێن: هەنار و خورما میوە نییە[1]، بەڵام عەرەب بە دڵنیاییەوە هەردووکیان بە میوە دادەنێ. وەك لەم ئایەتەدا (خوا) ﷻ فەرموویەتی: ﴿ حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ ﴾ فەرمانی پێکردوون پارێزگاری لەسەر هەموو نوێژەکان بکەن و نەیان چوێنن، لە پاشان نوێژی عەسر ناوهێنا و دووبارەی کردۆتەوە لەبەر گرنگی زیاتر پێدانی، هەرچۆنێك (لەو ئایەتەدا باسی میوەی کردووە بەگشتی) ئەنجا دوو بارە ناوی خورما و هەناری هێناوە (لەبەر گرنگیان)، هەروەها وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسۡجُدُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴿١٨﴾ ﴾، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَكَثِيرٞ مِّنَ ٱلنَّاسِۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيۡهِ ٱلۡعَذَابُ ﴿١٨﴾ ﴾(دووبارە باسی کردنەوە) لە کاتێکدا لەسەرتای ئایەتەکەوە باسی کردوون کە دەفەرموێ: ﴿ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾

-جگە لە موجاهید دەڵێ:﴿ أَفۡنَانٖ ﴿٤٨﴾ ﴾ لق و پۆپی زۆر (میوە و درەختی زۆر). ﴿ وَجَنَى ٱلۡجَنَّتَيۡنِ دَانٖ ﴾ئەو میوانەی لێی دەکرێتەوە نزیکە دەستە.

-حەسەن دەڵێ: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ ﴾ نیعمەت و بەهرەکانی (خوا). قەتادە دەڵێ: ﴿ رَبِّكُمَا ﴾ واتە: (پەروەردگاری هەردووکتان) جنۆکە و مرۆڤ. ئەبو دەردا ﷺ دەڵێ:﴿ كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٖ ﴾ (خوا) لە تاوانێك خۆش دەبێت، نارەحەتی و ناخۆشییەك لادەبات، خەڵکانێك بەرز دەکاتەوە و خەڵکانێك نزم دەکاتەوە. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ بَرۡزَخٞ ﴾ بەربەست، (کۆسپ) (الأَنَامُ): خەڵك. ﴿

---

(١) چونکە لە ئایەتەکەدا وشەی (فاكهة) هێناوە پاشان دەفەرموێ (ونخل ورمان).

**نَضَّاخَتَانِ ﴾ دووکانی هەڵقوڵاو. ﴿ ذُو ٱلْجَلَٰلِ ﴾ خاوەن شکوی ڕێزدار. جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: ﴿ مَارِجٍ ﴾ بڵێسەی ئاگری بێ دووکەڵ، دەوترێت: (مَرَجَ الأَمِيرُ رَعِيَّتَهُ): ئەگەر ئەمیر لێیان گەڕا هەندێکیان ستەم لە هەندێکیان بکەن، وە دەوترێت: (مَرَجَ أَمْرُ النَّاسِ) واتە: ژیان و کاروباری خەڵك تێکچووە بەسەر یەکدا و خراپ بووە، ﴿ مَّرِيجٍ ﴾ تێکەڵ و پێکەڵ (ناڕوون). ﴿ مَرَجَ ﴾ دوو دەریاکە تێکەڵ بوون) لە: (مَرَجْتَ دَابَّتَكَ) وڵاخەکەت بەرەڵا کردووە وازت لێ هێناوە (هاتووە و وەرگیراوە).**

**﴿ سَنَفْرُغُ لَكُمْ ﴾ بە زووی لێپرسینەوەتان لەگەڵ دەکەین، هیچ شتێك سەرقاڵی ناکات لە هیچ شتێکی تر ئەم وتەی لە زمانی عەرەبیدا شتێکی باوە دەوترێت: بێگومان دەستم بەتاڵ دەبێت بۆت، لە کاتێکدا بە هیچ شتێکەوە سەرقاڵ نییە، وە دەڵێ: لە کاتێکدا ئاگات لە خۆت نییە پەلامارت دەدەم.**

## ١ - بابُ قَوْلِه: ﴿ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ ﴾ الرحمن

٤٨٧٨ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي الأَسْوَدِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ الصَّمَدِ الْعَمِّيُّ، حَدَّثَنَا أَبُو عِمْرَانَ الْجَوْنِيُّ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «جَنَّتَانِ مِنْ فِضَّةٍ، آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَجَنَّتَانِ مِنْ ذَهَبٍ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا، وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلاَّ رِدَاءُ الْكِبْرِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ»[١].

---

(١) بروانە: ٤٨٨٠، ٧٤٤٤.

## ١ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە بێجگە لەو دوو باخە (ی باسکران) دوو باخی تر هەن)

**٤٨٧٨ -ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( (باوەڕدار لە بەهەشت دا) دوو بەهەشتی هەیە قاپ و قاچاغ هەرچی شت لەو دوو بەهەشتە دایە زیون، وە دوو بەهەشتی تر هەیە قاپ و پاچاغ و هەرچی شت لەو دوو بەهەشتە دایە زێڕ و ئاڵتوونن. لە نێوان ئەو خەڵکانە (بەهەشتیانە) و نێوان ئەوەی کە سەیری پەروەردگاریان بکەن هیچ نییە جگە لە پەردەی گەورەیی، کە بەسەر زاتی خواوەیە لە بەهەشتی هەمیشەیی دا)).**

٢ - **بابٌ**: ﴿ حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴿٧٢﴾ ﴾ الرحمن

وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ حُورٌ ﴿٧٢﴾ ﴾ الرحمن. سُودُ الحَدَقسِ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ:﴿ مَّقْصُورَٰتٌ ﴿٧٢﴾ ﴾ الرحمن. مَحْبُوسَاتٌ، قُصِرَ طَرْفُهُنَّ وَأَنْفُسُهُنَّ على أَزْوَاجِهِنَّ، قَاصِرَاتٌ لَا يَبْغِينَ غَيْرَ أَزْوَاجِهِنَّ.

## ٢ - باسێک: (حۆریانی کە پەردەنشینی ناو دەوارن)

**-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: (حُورٌ) ژنانی چاو ڕەش. موجاهید دەڵێ:﴿ مَّقْصُورَٰتٌ ﴿٧٢﴾ ﴾:لە ماڵ ناچنە دەرەوە، چاویان وخۆشیان تەنها بۆ مێردەکانیانە.**

(قاصرات): **جگە لە مێرد و هاوسەرانی خۆیان کەسی تریان ناوێ و بەشوێنیدا ناگەڕێن.**

٤٨٧٩ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ الصَّمَدِ، حَدَّثَنَا أَبُو عِمْرَانَ الْجَوْنِيُّ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ فِي

الْجَنَّةِ خَيْمَةً مِنْ لُؤْلُؤَةٍ مُجَوَّفَةٍ، عَرْضُهَا سِتُّونَ مِيلاً، فِي كُلِّ زَاوِيَةٍ مِنْهَا أَهْلٌ، مَا يَرَوْنَ الآخَرِينَ يَطُوفُ عَلَيْهِمُ الْمُؤْمِنُونَ»[1].

**٤٨٧٩ -ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس لە باوکیە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لەبەهەشت دا چادرێك هەیە لە مرواری ناو بۆش پانیەکەی شەست میلە، لە هەر سوچێکدا ژن و هاوسەری تیایە، ئەوانی دیکە نایبینن باوەڕداران بەسەریاندا دەگەڕێن)).**

٤٨٨٠ - «وَجَنَّتَانِ مِنْ فِضَّةٍ، آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا، وَجَنَّتَانِ مِنْ كَذَا آنِيَتُهُمَا، وَمَا فِيهِمَا، وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلاَّ رِدَاءُ الْكِبْرِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ»[2].

**٤٨٨٠ - (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: باوەڕدار لەبەهەشت دا) دوو بەهەشتی هەیە قاپ و قاچاغ هەرچی شت لەو دوو بەهەشتەدایە زیون، وە دوو بەهەشتی تر هەیە قاپ و قاچاغ و هەرچی شت لەو دوو بەهەشتە دایە زێڕ و ئاڵتوون. وە لە نێوان ئەو خەڵکانە (بەهەشتیانە) و نێوان ئەوەی کە سەیری پەروەردگاریان بکەن هیچ نییە، جگە لە پەردەی گەورەیی کە بەسەر زاتی خواوەیە لە بەهەشتی هەمیشەیی دا).**

(١) بڕوانە: ٣٢٤٣.

(٢) بڕوانە: ٤٨٧٨.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٥٦ - سورة الوَاقِعَة

وَقَالَ مُجَاهِدٌ:﴿ رُجَّتِ ﴿٤﴾ ﴾ الواقعة: زُلْزِلَتْ. ﴿ وَبُسَّتِ ﴿٥﴾ ﴾ الواقعة: فُتَّتْ لُتَّتْ كَمَا يُلَتُّ السَّوِيقُ، المَخْضُودُ: المُوقَرُ حَمْلًا، وَيُقَالُ أَيْضًا: لَا شَوْكَ لَهُ. ﴿ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ ﴾ الواقعة: المَوْزُ، الْعُرُبُ: المُحَبَّبَاتُ إِلَى أَزْوَاجِهِنَّ. ﴿ ثُلَّةٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الواقعة: أُمَّةٌ. ﴿ يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ ﴾ الواقعة: دُخَانٌ أَسْوَدُ.﴿ يُصِرُّونَ ﴿٤٦﴾ ﴾ الواقعة: يُدِيمُونَ. ﴿ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾ ﴾ الواقعة: الإِبِلُ الظِّمَاءُ. ﴿ إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴿٦٦﴾ ﴾ الواقعة: لَمُلْزَمُونَ ﴿ فَرَوْحٌ ﴿٨٩﴾ ﴾ الواقعة: جَنَّةٌ وَرَخَاءٌ ﴿ وَرَيْحَانٌ ﴿٨٩﴾ ﴾ الواقعة: الرِّزْقُ. ﴿ وَنُنشِئَكُمْ ﴿٦١﴾ ﴾ الواقعة: فِي أَيِّ خَلْقٍ نَشَاءُ. وَقَالَ غَيْرُهُ:﴿ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾ الواقعة: تَعْجَبُونَ. ﴿ عُرُبًا ﴿٣٧﴾ ﴾ الواقعة: مُثَقَّلَةً وَاحِدُهَا عَرُوبٌ مِثْلُ صَبُورٍ وَصُبُرٍ، يُسَمِّيهَا أَهْلُ مَكَّةَ العَرِبَةَ، وَأَهْلُ المَدِينَةِ الغَنِجَةَ، وَأَهْلُ العِرَاقِ الشَّكِلَةَ. وَقَالَ فِي: ﴿ خَافِضَةٌ ﴿٣﴾ ﴾ الواقعة: لِقَوْمٍ إِلَى النَّارِ، وَ﴿ رَّافِعَةٌ ﴿٣﴾ ﴾ الواقعة: إِلَى الجَنَّةِ. ﴿ مَّوْضُونَةٍ ﴿١٥﴾ ﴾ الواقعة: مَنْسُوجَةٍ، وَمِنْهُ: وَضِينُ النَّاقَةِ، وَالْكُوبُ: لَا آذَانَ لَهُ وَلَا عُرْوَةَ، وَالأَبَارِيقُ: ذَوَاتُ الآذَانِ وَالْعُرى. ﴿ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ ﴾ الواقعة: جَارٍ. ﴿ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ ﴾ الواقعة: بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ.﴿ مُتْرَفِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾ الواقعة: ﴿ مَّا تُمْنُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ الواقعة: هِيَ

النُّطْفَةُ فِي أَرْحَامِ النِّسَاءِ. ﴿لِّلْمُقْوِينَ ﴿٧٣﴾﴾ الواقعة: لِلْمُسَافِرِينَ، وَالْقِيُّ: القَفْرُ. ﴿بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾﴾ الواقعة:: بِمُحْكَمِ القُرْآنِ، وَيُقَالُ: بِمَسْقِطِ النُّجُومِ إِذَا سَقَطْنَ، وَمَوَاقِعُ وَمَوْقِعٌ وَاحِدٌ. ﴿مُّدْهِنُونَ ﴿٨١﴾﴾ الواقعة: مُكَذِّبُونَ مِثْلُ. ﴿لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾﴾ القلم: ﴿فَسَلَٰمٌ لَّكَ ﴿٩١﴾﴾ الواقعة: أَيْ: مُسَلَّمٌ لَكَ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَابِ اليَمِينِ، وَأُلْغِيَتْ إِنَّ وَهْوَ مَعْنَاهَا كَمَا تَقُولُ: أَنْتَ مُصَدَّقٌ مُسَافِرٌ عَنْ قَلِيلٍ، إِذَا كَانَ قَدْ قَالَ: إِنِّي مُسَافِرٌ عَنْ قَلِيلٍ. وَقَدْ يَكُونُ كَالدُّعَاءِ لَهُ كَقَوْلِكَ: فَسَقْيًا مِنَ الرِّجَالِ. إِنْ رَفَعْتَ السَّلاَمَ فَهْوَ مِنَ الدُّعَاءِ. ﴿تُورُونَ ﴿٧١﴾﴾ الواقعة: تَسْتَخْرِجُونَ. أَوْرَيْتُ: أَوْقَدْتُ. ﴿لَغْوًا ﴿٢٥﴾﴾ الواقعة: بَاطِلًا. ﴿تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾﴾ الواقعة: كَذِبًا.

## بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

## ٥٦ - (تەفسیری) سوڕەتی واقیعە

**موجاهید دەڵێ: ﴿رُجَّتِ﴾ توند جوڵێنرا، هێنرایە لەرزین. ﴿وَبُسَّتِ﴾ (شاخەكان) زۆر وردكران و تێكەڵ كرا وەك سەوقات تێكەڵ بە ڕۆن دەكرێ. (المَخْضُودُ): قورس بوو بە بەر و سەمەر هەروەها دەوترێ: ئەوەیە دڕكی پێوە نەبێت.. ﴿مَّنضُودٍ﴾: مۆز (هۆنراو بە هێشووی مۆز). (الْعُرُبُ): شەیدایانی هاوسەرانی خۆیان، ئەویندارانی مێردەكانیان. ﴿ثُلَّةٌ﴾ كۆمەڵێكی زۆر. ﴿يَحْمُومٍ﴾ دوكەڵێكی ڕەش. ﴿يُصِرُّونَ﴾ بەردەوام دەبن. ﴿ٱلْهِيمِ﴾ حوشترانی تینوو. ﴿إِنَّا لَمُغْرَمُونَ﴾ زەرەرمەندان، خەسارەت باران، قەرزداران. ﴿فَرَوْحٌ﴾**

بەهەشت و ئاسودەیی، حەسانەوە. ﴿ وَرَيۡحَانٞ ﴾: ڕسق و ڕۆزی (دانەوێڵە). ﴿ وَنُنشِئَكُمۡ ﴾ (دروستتان دەکەین) لەسەر شێوەی هەر دروستکراوێ بمانەوێ.

-جگە لە موجاهید دەڵێ: ﴿ تَفَكَّهُونَ ﴾ سەرسام دەبوون. ﴿ عُرُبًا ﴾ پیتی ڕێ و بۆری هەبێت (عُرُب) کۆیە و تاکەکەی (عَرُوبٌ) وەك: (صَبُورٍ) لەگەڵ (صُبُرٍ) [١]. خەڵکی مەککە ناویان ناوە: (العَرِبَةَ) [٢] خەڵکی مەدینە پێی دەڵێن: (الغَنِجَةَ) [٣] خەڵکی عێراقیش ناویان لێ ناوە بە (الشَّكِلَةَ)[٤]. وە دەربارەی﴿ خَافِضَةٞ ﴾ دەڵێ: (قیامەت نزم کەرەوەی) کەسانێکە دەیانخاتە دۆزەخەوە. ﴿ رَّافِعَةٌ ﴾ (بەرزکەرەوەی) بۆ کەسانێك دەیانباتە بەهەشتەوە.﴿ مَّوۡضُونَةٖ ﴾ چنراو (بە ئاڵتون) لەو مانایەوە (وَضِينُ النَّاقَةِ) ڕەشۆی وشتر (چونکە چنراوە یان پارچەکانی دەچن بەسەر یەکتردا).(الْكُوبُ): (پەرداخ) لولە و دەسکی نییە. (الأَبَارِيقُ): سوراحی، گۆزە، کەلولە و دەسکی هەبێت.

﴿ مَّسۡكُوبٖ ﴾(ئاوی) ڕەوان، بڕوات. ﴿ وَفُرُشٖ مَّرۡفُوعَةٍ ﴾: (ڕاخەرانێك) کە هەندێکی وا بەسەر هەندێکیەوە. ﴿ مُتۡرَفِينَ ﴾ خۆش گوزەرانان. ﴿ مَّا تُمۡنُونَ ﴾: بریتی لەو تۆوەی (نوتفەی) لە منداڵدانی ئافرەتاندا. ﴿ لِّلۡمُقۡوِينَ ﴾[٥]: گەشتیاران (الْقِيُّ) بیابان و سەحرا.﴿ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴾بە (ئایەتە) ڕوونەکانی قورئان، وە دەشوترێ بەشوێنی ئاوابوونی ئەستێرەکان کاتێ ئاوا دەبن، وە (مَوَاقِعُ) کە کۆیە لەگەڵ

---

(١) واتە: (صَبور) کۆکەی (صُبُر)ـە.

(٢) ئافرەتێکە چاك بێت لەگەڵ مێردی.

(٣) قسەی جوان و شیرین بێت.

(٤) شکڵ و شێوەی جوان بێت.

(٥) بەمانای: سەحرا نشینان، هەژاران، دەوڵەمەندانیش دێت.

(مَوْقِعٌ) كە تاكە وەك یەكن (كەمانای كۆیان دەبێت). ﴿ مُّدۡهِنُونَ ﴾ باوەڕ ناكەن و بەدرۆی دەزانن، وەك ئەم ئایەتەیە: ﴿ لَوۡ تُدۡهِنُ فَيُدۡهِنُونَ وَمَا ﴾ واتە: ئەگەر تۆ نەرمی نیشان بدەیت ئەوسا ئەوانیش (بەرانبەرت) نەرمی دەنوێنن. ﴿ فَسَلَٰمٞ لَّكَ ﴾ واتە: سەلامەتی و بێ زیانی بۆ تۆ چونكە تۆ لە یارانی دەستی ڕاستیت، (إِنَّ) لابراوە و نەهێنراوە (لە قورئاندا) بەڵام ماناكەی هەیە وەك ئەوەی كە دەڵێ: (أَنْتَ مُصَدَّقٌ مُسَافِرٌ عَنْ قَلِيلٍ)[1] ئەگەر پێشتر وتبێتی: (إِنِّي مُسَافِرٌ عَنْ قَلِيلٍ ) وە هەندێ جار وشەی سەلام وەك دوعا بۆ كردن وایە، وەك ئەم وتەیەت: (فَسَقْيًا مِنَ الرِّجَالِ) ئەگەر وشەی (السَّلَامُ) بەمەرفوعی بخوێنیتەوە ئەو بۆ دوعا و پاڕانەوەیە (بەڵام ئەگەر بە مەنصوبی بیخوێنیتەوە ئەوە بۆ دوعایە). ﴿ تُورُونَ ﴿٧١﴾ ﴾ (ئاگری) لێ دەردەهێنن (أَوْرَيْتُ)[2] واتە: دامگیرساند. ﴿ لَغۡوٗا ﴿٢٥﴾ ﴾ پڕو پوچ : ﴿ تَأۡثِيمًا ﴿٢٥﴾ ﴾ درۆ (تاوانباركردن).

## ١ - بابٌ ﴿ وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ ﴿٣٠﴾ ﴾ الواقعة

٤٨٨١ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ فِي الْجَنَّةِ شَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لاَ يَقْطَعُهَا، وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ ﴿٣٠﴾ ﴾ الواقعة»[3].

---

(١) واتە: تۆ متمانەت پێ دەكرێ كە پاش كەمێكی تر سەفەر دەكەیت.

(٢) (اوریت) فیعلی ڕابردووە بۆ (تورون) كە فیعلی ڕانەبردووە.

(٣) بڕوانە: ٣٢٥٣.

## ١ - باسێک: (سێبەری بەردەوام)[١]

**٤٨٨١ - ئەبو هورەیرە ﷺ ئەم فەرموودەیە دەگەیەنێتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ((بەڕاستی لە بەهەشت دا درەختێك هەیە سوار سەد ساڵ دەڕوات لە سێبەرەکەیدا نایبڕێت، ئەگەر ویستان ئەم ئایەتە بخوێننەوە: (وە سێبەری درێژو بەردەوام) )).**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٥٧ - سورة الحَديدُ

قَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ ﴿٧﴾ ﴾ الحديد: مُعَمَّرِينَ فِيهِ. ﴿ مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴿٩﴾ ﴾ الحديد: مِنَ الضَّلاَلَةِ إِلَى الهُدى. ﴿ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ ﴿٢٥﴾ ﴾ الحديد: جُنَّةٌ وَسِلاَحٌ. ﴿ مَوْلَىٰكُمْ ﴿١٥﴾ ﴾ الحديد: أَوْلَى بِكُمْ. ﴿ لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾ الحديد: لِيَعْلَمَ أَهْلُ الكِتَابِ. يُقَالُ: الظَّاهِرُ على كُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا وَالْبَاطِنُ على كُلِّ شَيءٍ عِلْمًا. ﴿ ٱنظُرُونَا ﴿١٣﴾ ﴾ الحديد: أَنْتَظِرُونَا.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٥٧ - (تەفسیری) سورەتی حەدید

**-موجاهید دەڵێ: ﴿ جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ ﴾ تەمەنی درێژی پێداون لەسەر زەویدا. ﴿ مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾ لە گومڕاییەوە بۆ ڕێنموونی و هیدایەت. ﴿ وَمَنَٰفِعُ**

(١) یان سێبەری درێژ و بەرفراوان.

لِلنَّاسِ ﴾ كەبریتی یە لە قەڵغان و چەك. ﴿ مَوْلَىٰكُمْ ﴾ شیاوتانە، شایستەتانە. ﴿ لِئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ ﴾ واتە: تا نامەدارەكان بزانن. وە دەوترێت: (الظَّاهِرُ): بەسەر هەموو شتە دیار و ئاشكراكاندا زانایە (وَالْبَاطِنُ): بەسەر هەموو شتە نادیار و پەنهانەكاندا زانایە. ﴿ ٱنظُرُونَا ﴾ چاوەڕوانیمان بكەن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٥٨ - سورة المُجَادلَةُ

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ يُحَآدُّونَ ﴿٥﴾ ﴾ المجادلة: يُشَاقُّونَ اللَّهَ. ﴿ كُبِتُوا۟ ﴿٥﴾ ﴾ المجادلةأُخْزِيُوا، مِنَ الخِزى. ﴿ ٱسْتَحْوَذَ ﴿١٩﴾ ﴾ المجادلة: غَلَبَ.

## بەناوی خوای بەخشندە ی میهرەبان

## ٥٨ - (تەفسیری) سوڕەتی موجادیلە

موجاهید دەڵێ: ﴿ يُحَآدُّونَ ﴾ دژایەتی خوا دەكەن (سەرپێچی خوا دەكەن). ﴿ كُبِتُوا۟ ﴾ بە مانای (أُخْزِيُوا) دێت لە (الخِزي) وە وەرگێراو واتە: ڕیسوایی و سەرشۆڕی. ﴿ ٱسْتَحْوَذَ ﴾ زاڵ بووە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٥٩ - سورة الحَشْرِ

﴿ٱلْجَلَآءَ ﴿٣﴾﴾ الحشر: الإِخْرَاجُ مِنْ أَرْضٍ إلى أَرْضٍ.

## بەناوی خوای بەخشندە ی میهرەبان

## ٥٩ - (تەفسیری) سوڕەتی حەشر

**﴿ٱلْجَلَآءَ﴾: (دەرکردنە) لەوڵات و شوێنێکەوە بۆ وڵات و شوێنێکی تر.**

### ١ - بابٌ

٤٨٨٢ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: سُورَةُ التَّوْبَةِ؟ قَالَ: التَّوْبَةُ هِيَ الْفَاضِحَةُ، مَا زَالَتْ تَنْزِلُ وَمِنْهُمْ وَمِنْهُمْ، حَتَّى ظَنُّوا أَنَّهَا لَمْ تُبْقِ أَحَدًا مِنْهُمْ إِلاَّ ذُكِرَ فِيهَا. قَالَ: قُلْتُ: سُورَةُ الأَنْفَالِ؟ قَالَ: نَزَلَتْ فِي بَدْرٍ. قَالَ: قُلْتُ: سُورَةُ الْحَشْرِ. قَالَ نَزَلَتْ فِي بَنِي النَّضِيرِ[1].

### ١ - باسێک

**٤٨٨٢ - سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: بە ئیبنو عەبباسم ﷺ وت: سوڕەتی تەوبە؟ وتی: (سوڕەتی) تەوبە؟ وتی: تەوبە (سوڕەتی) ئابڕوو بردنە، بەردەوام (کەسی وایان هەیە) دادەبەزی تاوایان گومان دەبرد کەسیان نەهێشتووە ئیللا**

(١) بڕوانە: ٤٠٢٩.

باسی كراوه لەو سورەتە دا، (سەعید) دەڵێ: وتم: ئەی سورەتی ئەنفال؟ وتی: ئەو لەبەدردا دابەزی، دەڵێ: وتم: ئەی سورەتی حەشر؟ وتی: دەربارەی بەنی نەزیر دابەزی.

٤٨٨٣ - حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُدْرِكٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ حَمَّادٍ، أَخْبَرَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: سُورَةُ الْحَشْرِ؟ قَالَ: قُلْ سُورَةُ النَّضِيرِ[1].

٤٨٨٣ -سەعید دەڵێ: بەئیبنو عەبباسم ﷺ وت: سورەتی حەشر؟ وتی: بڵێ: سورەتی نەزیر.

## ٢ - بابٌ: ﴿ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ ﴿٥﴾ ﴾ الحشر

﴿لِّينَةٍ ﴿٥﴾ ﴾ الحشر، نَخْلَةٍ مَا لَمْ تَكُنْ عَجْوَةً أَوْ بَرْنِيَّةً.

٤٨٨٤ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَرَّقَ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ وَقَطَعَ، وَهِيَ الْبُوَيْرَةُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ ﴾ الحشر[2].

## ٢ - باسێک: (ئەوەی بڕیتان لە دار خورما)

﴿لِّينَةٍ ﴾: بەدار خورمایەك دەڵێن كە عەجوە و بەرنی نەبێت.

٤٨٨٤ - ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ دار خورماكانی بەنی نەزیر سوتاند و بڕینی [1] كە لە بوەیرە بوون، ئیتر خوای بەرز و بڵند ئەم

(١) بروانه: ٤٠٢٩.

(٢) بروانه: ٢٣٢٦.

**ئایەتە دابەزاند: (ئەوەی بڕیتان لە دار خورما یان لێی گەڕان بە وەستاوی لەسەر بنەکانیان ئەوە بە فەرمانی خوا بووە).**

## ٣ - بابٌ: قوله: ﴿ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ﴿٦﴾ ﴾ الحشر

٤٨٨٥ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ -غَيْرَ مَرَّةٍ- عَنْ عَمْرٍو، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسِ بْنِ الْحَدَثَانِ، عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَتْ أَمْوَالُ بَنِي النَّضِيرِ مِمَّا أَفَاءَ اللهُ عَلَى رَسُولِهِ ﷺ مِمَّا لَمْ يُوجِفِ الْمُسْلِمُونَ عَلَيْهِ بِخَيْلٍ وَلاَ رِكَابٍ، فَكَانَتْ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ خَاصَّةً، يُنْفِقُ عَلَى أَهْلِهِ مِنْهَا نَفَقَةَ سَنَتِهِ، ثُمَّ يَجْعَلُ مَا بَقِيَ فِي السِّلاَحِ وَالْكُرَاعِ، عُدَّةً فِي سَبِيلِ اللهِ[٢].

## ٣ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەوەی خوا دەست پێغەمبەری خۆی خست)

**٤٨٨٥ - عەمر لەزوهریەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لەمالیکی کوڕ ئەوسی کوڕی حەدەسانەوە گێڕایەوە لە عومەرەوە ﷺ وتی: ئەو ماڵ و سامانەی هۆزی بەنی نەزیر لەو دەست کەوتانە بوو خوا دەستی پێغەمبەری ﷺ خستبوو، لەو دەست کەوتانەبوو کە مسوڵمانان هیچ ئەسپ و وشترێکیان تاونەدا بوو (بۆ بەدەست هێنانی)، ئەو سامانانە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بە تایبەتی، پێغەمبەریش خەرجی ساڵێکی خێزانەکانی لێ دادەنا، پاشان ئەوەی دەمایەوە دەیدا بە چەك و ئەسپ بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ خەبات لە ڕێی خوادا.**

---

(١) واتە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە سوتاندنی دارخورماکانی بەنی نەزیر و بڕینیان، چونکە سوپاکەی ئەو کارەیان کرد نەك خۆی بەڵکە ئەو فەرمانی کرد بە سوتاندن وبڕینیان.

(٢) بڕوانە: ٢٩٠٤.

## ٤ - بابٌ: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ ﴿٧﴾﴾ الحشر

٤٨٨٦ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُوتَشِمَات، وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللهِ. فَبَلَغَ ذَلِكَ امْرَأَةً مِنْ بَنِي أَسَدٍ يُقَالُ لَهَا: أُمُّ يَعْقُوبَ، فَجَاءَتْ فَقَالَتْ: إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ لَعَنْتَ كَيْتَ وَكَيْتَ. فَقَالَ: وَمَا لِي لاَ أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَمَنْ هُوَ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَقَالَتْ: لَقَدْ قَرَأْتُ مَا بَيْنَ اللَّوْحَيْنِ فَمَا وَجَدْتُ فِيهِ مَا تَقُولُ. قَالَ: لَئِنْ كُنْتِ قَرَأْتِيهِ لَقَدْ وَجَدْتِيهِ، أَمَا قَرَأْتِ: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ ﴿٧﴾﴾ الحشر. قَالَتْ: بَلَى. قَالَ: فَإِنَّهُ قَدْ نَهَى عَنْهُ. قَالَتْ: فَإِنِّي أَرَى أَهْلَكَ يَفْعَلُونَهُ. قَالَ: فَاذْهَبِي فَانْظُرِي. فَذَهَبَتْ فَنَظَرَتْ فَلَمْ تَرَ مِنْ حَاجَتِهَا شَيْئًا، فَقَالَ: لَوْ كَانَتْ كَذَلِكَ مَا جَامَعَتْنَا[1].

## ٤ - باسێک: (وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی دان وەریبگرن)

**٤٨٨٦ -عەلقەمە لە عەبدوڵڵاوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: خوا نەفرینی کردووە لە ئافرەتانی خاڵ کوت و ئافرەتانی خاڵ بۆکوتراو (دەم و چاو هەڵگێراو)[2] دەموچاو بۆ هەڵگێراو[3] هەروەها ئافرەتانی ددان شاشکەر بەمەبەستی جوانی گۆڕەرانی دروست کراوی خوا، جا ئەم (وتەیە) گەشت بە ئافرەتێك لە بەنی ئەسەد پێ دەوترا ئوممو یەعقوب، ئەنجا ئەو ئافرەتە هات (بۆ لای عەبدوڵڵا) وتی: بێگومان پێم گەشتووە (لە تۆوە) کە نەفرینت کردووە لەوە و لەوە، عەبدوڵڵاش وتی: چۆن نەفرین ناکەم لە کەسێ پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی لێ کردووە؟ وە ئەو کەسە لە قورئانەکەی خواشدا (نەفرینی لێکراوە)، ئەنجا**

---

(١) بڕوانە: ٤٨٨٧، ٥٩٣١، ٥٩٣٩، ٥٩٤٣، ٥٩٤٤، ٥٩٤٨.

(٢) مووهەڵگر وەك ئەوەی لە ساڵۆنەکاندا دەکرێ لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا.

(٣) مو بۆ هەڵگیراو.

**ئافرەتەکە وتی: سوێند بەخوا دڵنیابە هەموو ئەوەم خوێندوەتەوە کە لە نێوان هەردوو بەرگی قورئانەکەدایە، بەڵام ئەوەی تۆ دەیڵێیت نەم دیوە تیایدا، عەبدوڵلا وتی: ئەگەر (بەوردی) بتخوێندایەتەوە بەدڵنیاییەوە دەتبینی، ئایا ئەم ئایەتەت نەخوێندوەتەوە (وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی دان وەریبگرن وەئەوەی لێتانی قەدەغە کرد وازی لێ بێنن)، ئافرەتەکە وتی: بەڵێ (خوێندومەتەوە) عەبدوڵلا وتی: دەی بێگومان ئەو (پێغەمبەر ﷺ) ئەوەی قەدەغە کردووە، ئافرەتەکە وتی: جا بەڕاستی من هاوسەرت دەبینم ئەو کارە دەکات، عەبدوڵلا وتی: دەی بڕۆ و سەیری بکە، ئەنجا ڕۆشت و سەیری کرد بەڵام هیچی نەبینی لەوەی کەویستی، ئەوسا عەبدوڵلا وتی: ئەگەر خێزانم وا بوایە پێکەوە نەدەبووین و هاوڕێیەتیم نەدەکرد.**

٤٨٨٧ - حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَن، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ ذَكَرْتُ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَابِسٍ حَدِيثَ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْوَاصِلَةَ فَقَالَ: سَمِعْتُهُ مِنِ امْرَأَةٍ يُقَالُ: لَهَا أُمُّ يَعْقُوبَ.. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ مِثْلَ حَدِيثِ مَنْصُورٍ[1].

**٤٨٨٧ -عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کرد لەو ئافرەتەی قژ دەلکێنێ (بەسەر و قژی ئافرەتەوە)، جا (عەبدوڕەحمان) دەڵێ: لە ئافرەتێك کە پێی دەوترا دایکی یەعقوب ئەویش لە عەبدوڵلاوە گێڕایەوە وێنەی فەرموودەکەی مەنصوری لێ بیست.**

(١) بڕوانە: ٤٨٨٦.

٥ - بابٌ: ﴿ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ ﴿٩﴾ ﴾ الحشر

٤٨٨٨ - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ قَالَ قَالَ عُمَرُ رضي الله عنه: أُوصِي الْخَلِيفَةَ بِالْمُهَاجِرِينَ الأَوَّلِينَ أَنْ يَعْرِفَ لَهُمْ حَقَّهُمْ، وَأُوصِي الْخَلِيفَةَ بِالأَنْصَارِ الَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالإِيمَانَ مِنْ قَبْلِ أَنْ يُهَاجِرَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَقْبَلَ مِنْ مُحْسِنِهِمْ وَيَعْفُوَ عَنْ مُسِيئِهِمْ[1].

## ٥ - باسێک: (وە ئەوانەی کە ماڵ و زێدیان ئامادە کردووە وە باوەڕیان (لە دڵیاندا) جێگیر کردووە)[2]

**٤٨٨٨ - عەمری کوڕ مەیمون وتی: عومەر ﷛ ئامۆژگاری خەلیفە (ی پاش خۆم) دەکەم سەبارەت بە کۆچەرە یەکەمینەکان کە مافەکانیان ڕەچاو بکات (پێیان بدات)، وە ئامۆژگاری خەلیفە (ی پاش خۆم) دەکەم بەرانبەر بەو ئەنصارییانەی کە لە پێش کۆچی پێغەمبەر ﷺ نیشتەجێ بوون لە مەدینە و کردیان بە بارەگای باوەڕ، کاری چاکی چاکەکانیان قەبوڵ بکات لە خراپی خراپەکارانیان چاوپۆشی بکات.**

٦ - بابٌ: ﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ﴿٩﴾ ﴾ الحشر

﴿ خَصَاصَةٌ ﴿٩﴾ ﴾ الحشر: الفاقة. ﴿ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحشر: الفَائِزُونَ بِالْخُلُودِ، والْفَلاَحُ: البَقَاءُ، حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ: عَجِّلْ. وَقَالَ الحَسَنُ: ﴿ حَاجَةً ﴿٩﴾ ﴾ الحشر: حَسَدًا.

---

(١) بڕوانە: ١٣٩٢.

(٢) بەم جۆرەش ڕاڤە دەکرێ: وە بۆ ئەوانەی لە مەدینەدا نیشتەجێ بوون و کردیان بە بارەگای باوەڕ.

## ٦ - باسێک: (وه باوی ئەوان ئەدەن بەسەر خۆیاندا) تا کۆتایی ئایەتەکە

﴿ خَصَاصَةٌ ﴾ زۆر پێویستی. ﴿ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ سەرکەوتوانی کە بەهەشتی هەمیشەییان بەدەست هێناوە. (الْفَلاَحُ) واتە: مانەوە و بەردەوام بوون، (حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ ) واتە: پەلە بکە و زوو وەرە. حەسن دەڵێ:﴿ حَاجَةً ﴾حەسادەت.

٤٨٨٩ - حَدَّثَنِي يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ كَثِيرٍ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ غَزْوَانَ، حَدَّثَنَا أَبُو حَازِمٍ الأَشْجَعِيُّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَتَى رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَصَابَنِي الْجَهْدُ. فَأَرْسَلَ إِلَى نِسَائِهِ فَلَمْ يَجِدْ عِنْدَهُنَّ شَيْئًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلاَ رَجُلٌ يُضَيِّفُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ يَرْحَمُهُ اللَّهُ؟». فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَذَهَبَ إِلَى أَهْلِهِ فَقَالَ لاِمْرَأَتِهِ: ضَيْفُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لاَ تَدَّخِرِيهِ شَيْئًا. قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا عِنْدِي إِلاَّ قُوتُ الصِّبْيَةِ. قَالَ: فَإِذَا أَرَادَ الصِّبْيَةُ الْعَشَاءَ فَنَوِّمِيهِمْ، وَتَعَالَيْ فَأَطْفِئِي السِّرَاجَ وَنَطْوِي بُطُونَنَا اللَّيْلَةَ. فَفَعَلَتْ ثُمَّ غَدَا الرَّجُلُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «لَقَدْ عَجِبَ اللَّهُ ﷻ أَوْ ضَحِكَ - مِنْ فُلاَنٍ وَفُلاَنَةَ». فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ ﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۝٩ ﴾ الحشر[1].

٤٨٨٩ -ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تووشی ماندویەتی و برسێتی بووم، پێغەمبەریش ﷺ کەسێکی نارد بۆ لای هاوسەرانی بەڵام هیچی لایان دەست نەکەوت، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئایا کەسێك هەیە ئەم شەو میوانداری ئەم

(١) بڕوانە: ٣٧٩٨.

پیاوه بکات ڕەحمەتی خوای لێ بێ؟) جا پیاوێکی ئەنصاری هەستا و وتی: من (میوانداری دەکەم) ئەی پێغەمبەری خوا، ئیتر پیاوەکەی بردەوه بۆ ماڵی خۆیان و بەخێزانەکەی وت: ئەمه میوانی پێغەمبەره ﷺ هیچ شتێکی لێ مەگرەوه[1]، هاوسەرەکەی وتی: سوێند بەخوا جگه له خواردنی منداڵەکان هیچمان نییه، (مێردەکەی) وتی: جا که منداڵەکانی ویستیان نانی ئێواره بخۆن بیان خەوێنه (خواردنەکه دانێ و) وەره چراکه بکوژێنەوه، ئەم شەو سکمان به برسێتی دەگوشین، ئافرەتەکەش وای کرد، له پاشان پیاوەکه (ئەنصاریەکه) بەیانی زوو ڕۆشت بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش فەرمووی: ((سوێند بەخوا بەڕاستی خوا ﷻ (بەو کارەی) فلان پیاو و فلان ئافرەت[2] خۆشحاڵ بوو - یان پێکەنی - جا بەو هۆیەوه خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتەی دابەزاند: (وه باوی ئەوان ئەدەن بەسەر خۆیاندا، با خۆشیان زۆر پێویست بن پێی).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٦٠ - سورة المُمْتَحَنَة

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً ۝٥﴾ الممتحنة: لَا تُعَذِّبْنَا بِأَيْدِيهِمْ فَيَقُولُونَ: لَوْ كَانَ هؤلاء عَلَى الحَقِّ مَا أَصَابَهُمْ هذا. ﴿بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ ۝١٠﴾ الممتحنة: أُمِرَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ بِفِرَاقِ نِسَائِهِمْ، كُنَّ كَوَافِرَ بِمَكَّةَ.

---

(١) هەرچی هەیه بۆی بێنه و درێغی لێ مەکه و خزمەتی باشی بکه.

(٢) مەبەست ژن و مێرده ئەنسارییەکەیه.

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٦٠ - (تەفسیری) سورەتی مومتەحینە

موجاهید دەڵێ: ﴿لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةً﴾: بەدەستی ئەوان (کافران) سزامان مەدە، چونکە دەڵێن (پێمان) ئەگەر ئەوانە لەسەر هەق بوونایە ئەوا سزایان تووش نەدەبوو. ﴿بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ﴾ هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ فەرمانیان پێ کرابوو بەجیا بوونەوە لە هاوسەرەکانیان کە لە مەککە بوون و بێ باوەڕبوون.

### ١ - بابٌ: ﴿لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ ۝١﴾ الممتحنة

٤٨٩٠ - حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَان، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ قَالَ: حَدَّثَنِي الْحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ أَنَّهُ سَمِعَ عُبَيْدَ اللهِ بْنَ أَبِي رَافِعٍ كَاتِبَ عَلِيٍّ يَقُولُ: سَمِعْتُ عَلِيًّا ﷺ يَقُولُ بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنَا وَالزُّبَيْرَ وَالْمِقْدَادَ فَقَالَ: «انْطَلِقُوا حَتَّى تَأْتُوا رَوْضَةَ خَاخٍ فَإِنَّ بِهَا ظَعِينَةً مَعَهَا كِتَابٌ فَخُذُوهُ مِنْهَا». فَذَهَبْنَا تَعَادَى بِنَا خَيْلُنَا حَتَّى أَتَيْنَا الرَّوْضَةَ فَإِذَا نَحْنُ بِالظَّعِينَةِ فَقُلْنَا أَخْرِجِي الْكِتَابَ فَقَالَتْ: مَا مَعِي مِنْ كِتَابٍ. فَقُلْنَا لَتُخْرِجِنَّ الْكِتَابَ أَوْ لَنُلْقِيَنَّ الثِّيَابَ. فَأَخْرَجَتْهُ مِنْ عِقَاصِهَا فَأَتَيْنَا بِهِ النَّبِيَّ ﷺ فَإِذَا فِيهِ مِنْ حَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ إِلَى أُنَاسٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ مِمَّنْ بِمَكَّةَ يُخْبِرُهُمْ بِبَعْضِ أَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا هَذَا يَا حَاطِبُ؟». قَالَ: لاَ تَعْجَلْ عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي كُنْتُ امْرَأً مِنْ قُرَيْشٍ وَلَمْ أَكُنْ مِنْ أَنْفُسِهِمْ وَكَانَ مَنْ مَعَكَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ لَهُمْ قَرَابَاتٌ يَحْمُونَ بِهَا أَهْلِيهِمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِمَكَّةَ فَأَحْبَبْتُ إِذْ فَاتَنِي مِنَ النَّسَبِ فِيهِمْ أَنْ أَصْطَنِعَ إِلَيْهِمْ يَدًا يَحْمُونَ قَرَابَتِي وَمَا فَعَلْتُ ذَلِكَ كُفْرًا وَلاَ ارْتِدَادًا عَنْ دِينِي. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّهُ قَدْ صَدَقَكُمْ». فَقَالَ عُمَرُ: دَعْنِي يَا رَسُولَ اللهِ فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ. فَقَالَ: «إِنَّهُ شَهِدَ بَدْرًا وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللهَ ﷻ اطَّلَعَ

عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ». قَالَ عَمْرٌو وَنَزَلَتْ فِيهِ: ﴿ لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ ﴿١﴾ ﴾ المتحنة: قَالَ: لاَ أَدْرِي الآيَةَ فِي الْحَدِيثِ أَوْ قَوْلُ عَمْرٍو[١].

حَدَّثَنَا عَلِيٌّ: قِيلَ لِسُفْيَانَ: فِي هَذَا فَنَزَلَتْ ﴿ لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ ﴿١﴾ ﴾: المتحنة، قَالَ سُفْيَانُ: هَذَا فِي حَدِيثِ النَّاسِ حَفِظْتُهُ مِنْ عَمْرٍو وَمَا تَرَكْتُ مِنْهُ حَرْفًا وَمَا أُرَى أَحَدًا حَفِظَهُ غَيْرِي

## ١ - باسێک: (دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بە دۆستی خۆتان)

**٤٨٩٠ -عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ڕافیعی نووسەری عەلی دەڵێ: لە عەلیم بیست ﷺ دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ من و زوبەیر و میقدادی نارد و فەرمووی: ((بڕۆن هەتا دەگەنە (رَوْضَةَ خَاخ)، جا بێگومان لەوێدا ئافرەتێکی تیایە نامەیەکی پێیە لێی سەنن)) ئێمەش دەرچووین و وڵاغەکانمان غاردا هەتا گەشتیە (رَوْضَةَ خَاخ)، یەکسەر بە ئافرەتەکە گەیشتین و وتمان (پێی): نامەکە دەربێنە، وتی: هیچ نامەیەکم پێ نییە. ئێمەش وتمان: سوێند بەخوا ئەو نامەیە دەردێنی یان جل و بەرگەکەت لەبەردا نایەڵین و دایدەکەنین، ئەوسا نامەکەی لەناو پەلکەکانیدا دەرهێنا، ئێمەش نامەکەمان هێنایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ تێیدا نوسرابوو: لە حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعەوە بۆ کەسانێك لە بتپەرەستانی خەڵکی مەککە، هەواڵی هەندێ کاروباری پێغەمبەری ﷺ پێدابوون، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەی حاتیب ئەم چییە؟ )) (حاتیب) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پەلەم لێ مەکە ! من کەسێك بووم لەناو قوڕەیشدا و لەوان نەبووم (بەڕەچەڵەك)، بەڵام ئەو کۆچەرانەی لەگەڵ تۆدان**

---

(١) بروانە: ٣٠٠٧.

هەموویان خزم و کەسیان هەیە لە مەککەدا، کەس و کار و ماڵ و سامانەکانیان دەپارێزن، ئیتر بۆیە منیش کە بەرەچەڵەك لەوان نەبووم پێم خۆش بوو (ویستم) چاکەیەکم بەسەریانەوە هەبێت (بەهۆیەوە) خزم وکەسەکانم بپارێزن، من کە ئەم کارەم کردووە لەبەر ئەوە نەبوو بێباوەڕ بووبم یان پاشگەز بوو بێتمەوە لە ئاینەکەم، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەو ڕاستی کرد لەگەڵتاندا))، عومەریش ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لێم گەڕێ با بدەم لە گەردنی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەو (حاتیب) بەشداری غەزای بەدری کردووە، تۆ چوزانیت لەوانەیە خوا ﷻ ئاگاداری بەشداربووانی بەدر بێت (چی دەکەن) و فەرموبێتی: چیتان دەوێ بیکەن چونکە بێگومان من لێتان خۆش بووم))، عەمر (ی کوڕی دینار)[1] دەڵێ: لە بارەی حاتیبەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بە دۆستی خۆتان)، دەڵێ: نازانم ئایەتەکە بەشێکە لە فەرموودەکە یان قسەی عەمر خۆیەتی.

(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) عەلی (کوڕی مەدینی) بۆ گێڕاینەوە وتی: پرسیار کرا لە سوفیان: دەربارەی ئەو (حاتیب) ئەم ئایەتە: ﴿لَا تَتَّخِذُوا۟ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە دابەزی؟ سوفیان وتی: ئەوە لە قسە و گێڕانەوەی خەڵکدا وایە، بەڵام ئەوەی من وەرم گرت و لە عەمرەوە یەك پیتیم لێ کەم نەکردۆتەوە، وە واش نازانم جگە لەمن لەبەری کردبێت[2].

---

(١) کە یەکێکە لە گێڕەرەوەکانی فەرموودەکە.

(٢) واتە: سوفیان ئەو زیادەیە بە دڵنیاییەوە دان پێدانانێ و نایسەلمێنێ.

## ٢ - بابٌ: ﴿إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ ﴿١٠﴾﴾ الممتحنة

٤٨٩١ - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَخِي ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَمِّهِ أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَمْتَحِنُ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ بِهَذِهِ الآيَةِ، بِقَوْلِ اللهِ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ ﴿١٢﴾﴾ الممتحنة: إِلَى قَوْلِهِ: ﴿غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾﴾ الممتحنة: قَالَ عُرْوَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: فَمَنْ أَقَرَّ بِهَذَا الشَّرْطِ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ قَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: «قَدْ بَايَعْتُكِ». كَلاَمًا وَلاَ وَاللهِ مَا مَسَّتْ يَدُهُ يَدَ امْرَأَةٍ قَطُّ فِي الْمُبَايَعَةِ، مَا يُبَايِعُهُنَّ إِلاَّ بِقَوْلِهِ: «قَدْ بَايَعْتُكِ عَلَى ذَلِكَ». تَابَعَهُ يُونُسُ وَمَعْمَرٌ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَقَالَ إِسْحَاقُ بْنُ رَاشِدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ وَعَمْرَةَ[1].

## ٢ - باسێک: (ئەگەر ئافرەتانی باوەڕدار هاتن بۆ لاتان بەکۆچ کەری)

**٤٨٩١ -عوروە دەگێڕێتەوە کە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کام لەئافرەتانی باوەڕدار کۆچی بکردایە بۆ خزمەتی، بەم ئایەتەی فەرمایشتەی خوایە تاقی دەکردنەوە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ هەرکاتێك ئافرەتانی باوەڕدار هاتن بۆلات کە پەیمانت لەگەڵ ببەستن) تا دەگاتە ئەم فەرمایشتەی خوا (لێ خۆشبووی میهرەبانە)، عوروە دەڵێ: عائیشە ﵂ وتی: جا هەر کام لە ئافرەتە باوەڕدارەکان دانی نا بەم مەرجەدا، ئەوسا پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو پێی: ((بێگومان پەیمانم لێ وەرگرتی)) بەوتە، ناسوێند بەخوا هەرگیز دەستی (پێغەمبەری خوا ﷺ) بەر دەستی ژنێك**

(١) بروانە: ٢٧١٣.

نەکەوتوە لە پەیمان داندا [١]، تەنها بە وتە پەیمانی لە ئافرەتان وەردەگرت: (بێگومان لەسەر ئەو مەرجە پەیمانم لێ وەرگرتی).

- هەریەك لەیونس و مەعمەر و عەبدوڕەحمان کوڕی ئیسحاق گێڕاویانەتەوە لەزوهری یەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی برازاکەی ئیبنو شیهاب زوهری دەکەن.

-وە ئیسحاقی کوڕی ڕاشید گێڕاویەتیەوە لەزوهرییەوە ئەویش گێڕاویەتیەوە لە هەریەك لە عوروە و عەمرە (ی کچی عەبدوڕەحمانە) وە [٢].

## ٣ - بابٌ: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ ﴿١٢﴾﴾ الممتحنة

٤٨٩٢ - حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﵂ قَالَتْ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَرَأَ عَلَيْنَا: ﴿أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا ﴿١٢﴾﴾ الممتحنة: وَنَهَانَا عَنِ النِّيَاحَةِ، فَقَبَضَتِ امْرَأَةٌ يَدَهَا فَقَالَتْ: أَسْعَدَتْنِي فُلاَنَةُ أُرِيدُ أَنْ أَجْزِيَهَا. فَمَا قَالَ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ شَيْئًا فَانْطَلَقَتْ وَرَجَعَتْ فَبَايَعَهَا[٣].

## ٣ - باسێک: ((ئەی موحەممەد ﷺ) هەر کاتێک ئافرەتانی باوەڕدار هاتن بۆلات کە پەمانت لەگەڵ ببەستن)

٤٨٩٢ -ئوممو عەتییە ﵂ دەڵێ: پەیمانمان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش ئەم ئایەتەی بەسەرماندا خوێندەوە (کە هیچ شتێك بە هاوبەشی خوا دانەنێین)، وە شیوەن و زاری قەدەغە کرد لێمان، جا ئافرەتێك [٤] دەستی کێشایە

---

(١) خێزان و حەڵاڵی نەبوو بێت.

(٢) ئیبن و شیهابی زوهری لەم سەنەدەدا لە عوروە و عەمرەوە ئەو فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

(٣) بڕوانە: ١٣٠٦.

(٤) کە ئوممو عەتییە بوو.

**دواوه (لەپەیمان دان) و وتی: فڵان ژن لەگەڵمدا شیوەنی گێڕاوه و ماڤی لەسەرمە) دەمەوێ ماڧەکەی بدەمەوە [1]، پێغەمبەریش ﷺ هیچی پێ نەفەرموو، ژنەکەش ڕۆشت و (شیوەنی لەگەڵ ژنەکە کرد و) گەڕایەوە (بۆلای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ پەیمانی لەگەڵدا بەست.**

٤٨٩٣ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، قَالَ: سَمِعْتُ الزُّبَيْرَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ ۝١٢﴾ الممتحنة: قَالَ: إِنَّمَا هُوَ شَرْطٌ شَرَطَهُ اللَّهُ لِلنِّسَاءِ.

**٤٨٩٣ -ئیبنو عەبباس ؓ دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە لەکاری چاکەدا بێ فەرمانیت نەکەن)، وتی: ئەمە مەرجێك بوو خوا بەمەرجی گرتبوو لەسەر ئافرەتان.**

٤٨٩٤ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ الزُّهْرِيُّ: حَدَّثَنَاهُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو إِدْرِيسَ سَمِعَ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ ؓ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: "أتبايِعُونِي على أَنْ لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا تَزْنُوا وَلَا تَسْرِقُوا". وَقَرَأَ آيَةَ النِّسَاءِ -وَأَكْثَرُ لَفْظِ سُفْيَانَ قَرَأَ الآيَةَ - "فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَعُوقِبَ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْهَا شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ فَسَتَرَهُ اللَّهُ فَهُوَ إِلَى اللَّهِ، إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ ". تَابَعَهُ عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ فِي الآيَةِ[2].

**٤٨٩٤ - عوبادەی کوڕی صامیت ؓ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین فەرمووی: (پەیمانم پێ ئەدەن کە هیچ شتێك نەکەن بە هاوبەشی خوا، وە زینا**

---

(١) واتە: منیش دەڕۆم لەگەل ئەودا شیوەنی بۆ دەگێرم.

(٢) بڕوانە: ١٨.

**نەکەن و دزی نەکەن؟ ئایەتەکەی ژنانی خوێندەوە - لە زۆربەی گێڕانەوەکانی سوفیاندا دەڵێ: ئایەتەکەی خوێندەوە [1] - جا هەر کەسێکتان پەیمانەکەی بردە سەر ئەوە پاداشتی لای خودایە، هەرکەسیش پێچەوانەی شتانێکی ئەو (پەیمانە)ی کرد سزا و تۆڵەی لێ سەنرا ئەوە گوناهەکەی سڕاوەتەوە، هەرکەسیش شتێکی لەوانەی تووش بوو خوا بۆی پۆشی ئەوە حەواڵەی لای خوا دەکرێ، ئەگەر ویستی سزای دەدات وە ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێت.**

**-عەبدوڕەزاق لە مەعمەرەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی فەرموودەکەی سوفیان دەکات دەربارەی ئایەتەکە.**

٤٨٩٥ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ مَعْرُوفٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ، قَالَ وَأَخْبَرَنِي ابْنُ جُرَيْجٍ أَنَّ الْحَسَنَ بْنَ مُسْلِمٍ أَخْبَرَهُ عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: شَهِدْتُ الصَّلَاةَ يَوْمَ الْفِطْرِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ فَكُلُّهُمْ يُصَلِّيهَا قَبْلَ الْخُطْبَةِ ثُمَّ يَخْطُبُ بَعْدُ، فَنَزَلَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ حِينَ مجلِّسُ الرِّجَالَ بِيَدِهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ يَشُقُّهُمْ حَتَّى أَتَى النِّسَاءَ مَعَ بِلالٍ فَقَالَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ ﴿١٢﴾ ﴾ الممتحنة: حَتَّى فَرَغَ مِنَ الآيَةِ كُلِّهَا، ثُمَّ قَالَ حِينَ فَرَغَ: "أَنْتُنَّ على ذَلِكَ". وَقَالَتِ امْرَأَةٌ وَاحِدَةٌ لَمْ يُجِبْهُ غَيْرُهَا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَا يَدْرِي الحَسَنُ مَنْ هِيَ. قَالَ: "فَتَصَدَّقْنَ" وَبَسَطَ بِلَالٌ ثَوْبَهُ فَجَعَلْنَ يُلْقِينَ الفَتَخَ وَالْخَوَاتِيمَ فِي ثَوْبِ بِلَالٍ[2].

(١) ژنانی لەگەڵدا نییە.

(٢) بروانە: ٩٨.

٤٨٩٥ -ئیبنو عەبباس ﷺ وتی: ئامادەی نوێژی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان بووم لە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر و عوسماندا ﷺ، هەموویان پێش وتاردان نوێژەکەیان دەکرد، پاشان دواتر وتاری دەدا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ (لەدوانگە) دابەزی دەڵێی ئێستا بە پێش چاومەوەیە کاتێ بە ئاماژەی دەستی پیاوانی دادەنیشاند و پاشان بەناو پیاوەکاندا ڕێگەی بۆ خۆی کردەوە و هات هەتا گەیشتە لای ئافرەتەکان لەگەڵ بیلالدا، جا فەرمووی[1]: (ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئافرەتانی باوەڕدار هاتن، بۆ لات کە پەیمانت لەگەڵ ببەستن لەسەر ئەوەی کە هیچ شتێك نەکەن بە هاوبەشی خوا و دزی و داوێن پیسی نەکەن و منداڵەکانیان نەکوژن، وە هیچ جۆرە بوختانێك هەڵنبەستن لە نێوان دەست و پێیاندا)، (خوێندیەوە) هەتا هەموو ئایەتەکەی تەواو کرد، پاشان کاتێ لە خوێندنەوەی ئایەتەکەی بوویەوە فەرمووی ((ئێوە لەسەر ئەوە (ی خوێنمەوە بۆتان) دەڕۆن و ڕازین؟)) تەنها یەك ئافرەت قسەی کرد جگە لەو هیچ ئافرەتێکی تر وەڵامی نەدایەوە، (وتی): بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا (ڕازین و پابەندین) - حەسەن[2] نازانی ئەو ئافرەتە کێ و ناوی چییە - پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کەواتە خێر بکەن و ماڵ ببەخشن)) بیلالیش ﷺ پۆشاکەکەی ڕاخستبوو، ئافرەتەکانیش ئەڵقە و ئەنگوستیلەیان فڕێ دەدایە پۆشاکەکەی بیلالەوە.

---

(١) ئەو ئایەتەی خوێندەوە بۆیان.

(٢) حەسەنەی کوڕی موسلیم کە گێڕەرەوەی فەرموودەکەیە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٦١ - سورة الصَّفِّ

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ ﴾ [١٤] الصف مَنْ يَتَّبِعُنِي إِلى اللهِ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ مَّرۡصُوصٞ ﴾ [٤] الصف: مُلْصَقٌ بَعْضُهُ بِبَعْضٍ. وَقَالَ غَيْرُهُ بِالرَّصَاصِ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٦١ - (تەفسیری) سورەتی صەف

**موجاهید دەڵێ: ﴿ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ ﴾: کێ شوێنم دەکەوێت بۆ لای خوا[1]. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ مَّرۡصُوصٞ ﴾ هەندێکی پەیوەستە بە هەندێکییەوە (پێکەوە نووساو). جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: (دەڵێی کۆشکی قایمی دروستکراوە) بە قوڕقوشم.**

## ١ - بابُ: ﴿ بِرَسُولٖ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُۖ ﴾ [٦] الصف

٤٨٩٦ - حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ لِي أَسْمَاءً، أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَنَا أَحْمَدُ، وَأَنَا الْمَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللهُ بِيَ الْكُفْرَ، وَأَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمِي، وَأَنَا الْعَاقِبُ»[2].

---

(١) واتە، بۆ لای ڕێباز و ئایینی خوا کە ئیسلامە.

(٢) بڕوانە: ٣٥٣٢.

## ١ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ((پێغەمبەرێک) کە دوای من دێ ناوی ئەحمەدە)

٤٨٩٦ - جوبەیری کوڕی موتعیم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە وتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست فەرمووی: ((من چەند ناوم هەیە: من موحەممەد و من ئەحمەدم وە من ئەو سڕەرەوەم کە خوا کوفر و بێ باوەڕیم پێ لادەبات، وە من ئەو کۆکەرەوەم کە خەڵکی (لە قیامەتدا) بەشوێن پێی مندا[1] کۆدەکرێنەوە، (دێن و دەچن بۆمەحشەر)، وە من کۆتاهەمین (ی پێغەمبەران)ـم[2])).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٦٢ - سورة الجمعة

### ١ - بابٌ: قولُهُ: ﴿وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا۟ بِهِمْ ۚ ﴿٣﴾﴾ الجمعة

وَقَرَأَ عُمَرُ: فَامْضُوا إلى ذِكْرِ اللَّهِ.

٤٨٩٧ - حَدَّثَنِي عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ بِلَالٍ، عَنْ ثَوْرٍ، عَنْ أَبِي الْغَيْثِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَأُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْجُمُعَةِ: ﴿وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا۟ بِهِمْ ﴿٣﴾﴾ الجمعة: قَالَ: قُلْتُ: مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَلَمْ يُرَاجِعْهُ حَتَّى سَأَلَ ثَلَاثًا، وَفِينَا سَلْمَانُ الْفَارِسِيُّ، وَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ عَلَى سَلْمَانَ ثُمَّ قَالَ: «لَوْ كَانَ الإِيمَانُ عِنْدَ الثُّرَيَّا لَنَالَهُ رِجَالٌ -أَوْ رَجُلٌ- مِنْ هَؤُلَاءِ»[3].

---

(١) یان پاش من وسەردەمی پێغەمبەرایەتی من، چونکە دوای من پێغەمبەری تر نایەت.

(٢) دوای من پێغەمبەر نایەت.

(٣) بڕوانە: ٤٨٩٨.

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٦٢ - (تەفسیری) سوڕەتی جوموعە

## ١ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە (ڕەوانەشی کردووە بۆ ناو) گەلانی کەی جیاواز لەوانە کە هێشتا پێیان نەگەشتوون (مسوڵمان نەبوون) ).

-عومەر ﷺ ئەم ئایەتەی بەم جۆرە خوێندەوە (فَامْضُوا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ)[1].

٤٨٩٧ -ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین سوڕەتی جوموعەی بۆ دابەزێنرا، (جا کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە) (وە (ڕەوانەشی کردووە بۆ ناو) گەلانی کە جیاواز لەوان کە هێشتا پێیان نەگەشتوون (مسوڵمان نەبوون) ).
دەڵێ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە کێن؟ بەڵام پێغەمبەر ﷺ وەڵامی نەدایەوە هەتا سێ جار پرسیاری کرد، سەلمانی فارسیش لەناومان دابوو، پێغەمبەری خوا دەستی خستە شەر (شانی) سەلمان، لە پاشان فەرمووی: ((ئەگەر ئیمان لە ئەستێرەی کۆش[2] بێت پیاوانێك - یان پیاوێك - لە ئائەمانە دەیگاتێ و بەدەستی دێنێ)).

٤٨٩٨ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ أَخْبَرَنِي ثَوْرٌ، عَنْ أَبِي الْغَيْثِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «لَنَالَهُ رِجَالٌ مِنْ هَؤُلاَءِ»[3].

---

(١) ئەمە خوێندنەوە بە تەفسیر و ڕاڤە دادەنرێت نەک جۆرە خوێندنەوەیەک، چونکە پێچەوانەیە لەگەڵ خوێندنەوەی هەموو قورئان خوێنەکاندا کە بە (فاسعوا الى ذكر الله). خوێندویانەتەوە. بڕوانە: معجم القراءات:٩/٤٦١.

(٢) كۆش، كۆمەڵە ئەستێرەیەكن، بۆیە ئەو ناوەنراوە لەبەر زۆریان كە لە شوێنێكی تەسكدان و ڕێك و پێكن. (ئەلمونجید: ٢٦٨/١)

(٣) بڕوانە: ٤٨٩٧.

٤٨٩٨ -ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: (( پیاوانێك لە ئائەمانە دەیگاتێ و بەدەستی دێنێ)).

٢ - **بابٌ:** ﴿ وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا ﴿١١﴾ ﴾ الجمعة.

٤٨٩٩ - حَدَّثَنِي حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا حُصَيْنٌ، عَنْ سَالِمِ بنِ أَبِي الجَعْدِ وَعَنْ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَقْبَلَتْ عِيرٌ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَنَحْنُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَثَارَ النَّاسُ إِلَّا اثْنَا عَشَرَ رَجُلاً فَأَنْزَلَ الله: ﴿ وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا ﴿١١﴾ ﴾ الجمعة[١].

## ٢ - باسێک: (هەر (کارێکی) بازرگانی، یان کارێکی بێهودە ببینن)

**٤٨٩٩ -جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: لەکاتێکدا ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا بووین[٢]، لە ڕۆژی هەینیدا کاروانێك (کەخواردنی پێ بوو) هات، خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد (چوون بەدەم کاروانەکەوە)، جگە لە دوانزە پیاو نەبێت (لە مزگەوتدا مانەوە) بەو هۆیەوە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: (هەرکاتێ بازرگانی یان کارێکی بێ هودە ببینن، بڵاوەی لێ دەکەن بۆ لای ئەو بازرگانی یە).**

(١) بڕوانە: ٩٣٦.

(٢) نوێژی هەینیمان ئەنجام دەدا و وتاری دەدا. بڕوانە ، إرشاد الساري:١١/١٤٢.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٦٣ - سُورةُ المُنافقِين

### ١ - بابٌ: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ①﴾ إلى ﴿لَكَٰذِبُونَ ①﴾ المنافقون

٤٩٠٠ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَجَاءٍ، حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ قَالَ: كُنْتُ فِي غَزَاةٍ فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ يَقُولُ: لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِهِ وَلَوْ رَجَعْنَا مِنْ عِنْدِهِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَمِّي أَوْ لِعُمَرَ فَذَكَرَهُ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَدَعَانِي فَحَدَّثْتُهُ فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ وَأَصْحَابِهِ فَحَلَفُوا مَا قَالُوا، فَكَذَّبَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَصَدَّقَهُ، فَأَصَابَنِي هَمٌّ لَمْ يُصِبْنِي مِثْلُهُ قَطُّ، فَجَلَسْتُ فِي الْبَيْتِ فَقَالَ لِي عَمِّي: مَا أَرَدْتَ إِلَى أَنْ كَذَّبَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَمَقَتَكَ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ ①﴾ المنافقون: فَبَعَثَ إِلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ فَقَرَأَ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ صَدَّقَكَ يَا زَيْدُ»[1].

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٦٣ - (تەفسیری) سوڕەتی مونافیقین

### ١ - باسێک: (کاتێک کە دوو ڕوان بێنە لات دەڵێن: شایەتی دەدەین کە بەڕاستی تۆ پێغەمبەری خوایت) تا دەگاتە (بێگومان درۆزنانن)

**٤٩٠٠ -زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ وتی: من لە غەزایەکدا بووم، گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی بوو دەیوت: دارایی مەبەخشن بەوانەی کە لەگەڵ**

(١) بروانه: ٤٩٠١، ٤٩٠٢، ٤٩٠٣، ٤٩٠٤..

پێغەمبەردان، تا بڵاوەی لێ بکەن لە چواردەوری، ئەگەر گەڕاینەوە لە لای ئەو (بۆ مەدینە) بێگومان دەسڵاتدار و بەڕێزەکان لات و بێڕێزەکان لە مەدینە دەر دەکەن. (زەید دەڵێ) منیش ئەمەم بۆ مامم باس کرد -یان بۆ عومەر - ئەویش باسی کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش بانگی کردم و منیش بۆم گێڕایەوە، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ ناردی بە شوێن عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی و هاوەڵانیدا، ئەوانیش سوێندیان خوارد ئەو قسەیەیان نەکردووە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ باوەڕی بە من نەکرد و باوەڕی بەو (عەبدوڵڵا) کرد، ئیتر غەم و پەژارەیەکم تووش بوو هەرگیز وێنەی ئەو غەمەم تووش نەبوو بوو، بۆیە لە ماڵدا دانیشتم، مامشم پێی وتم: بەوەی ویستت وای کرد کە پێغەمبەر ﷺ بە درۆزنی زانیت و باوەڕی پێنەکردی و ڕقی لێ هەڵگرتی، جا خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتەی دابەزاند: (کاتێك دووڕوان بێنە لات...) ئەوسا پێغەمبەر ﷺ ناردی بەشوێنمدا و ئایەتەکانی خوێندەوە و فەرمووی: ((بێگومان بە دڵنیاییەوە ئەی زەید خوا ڕاستی تۆی سەلماند)).

## ٢ - بابٌ: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيْمَـٰنَهُمْ جُنَّةً ﴿٢﴾ ﴾ المنافقون

﴿ جُنَّةً ﴿٢﴾ ﴾ المنافقون: يَجْتَنُّونَ بِهَا

٤٩٠١ - حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَمِّي فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ أُبَيٍّ ابْنَ سَلُولَ يَقُولُ لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا. وَقَالَ أَيْضًا: لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ. فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَمِّي فَذَكَرَ عَمِّي لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ أُبَيٍّ وَأَصْحَابِهِ، فَحَلَفُوا مَا قَالُوا، فَصَدَّقَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَكَذَّبَنِي، فَأَصَابَنِي هَمٌّ لَمْ يُصِبْنِي مِثْلُهُ، فَجَلَسْتُ فِي بَيْتِي، فَأَنْزَلَ

اللَّهُ ﷻ ﴿ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ ﴿١﴾ ﴾ المنافقون: إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُواْ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ ﴿٧﴾ ﴾ المنافقون: إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ﴿٨﴾ ﴾ المنافقون: فَأَرْسَلَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَرَأَهَا عَلَيَّ ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ صَدَّقَكَ»[1].

## ٢ - باسێک: (سوێندە (درۆ)کان خۆیان کرد بە قەڵغان (بۆخۆیان) )

**﴿ جُنَّةً ﴾: خۆیان پێ دەشارنەوە.**

**٤٩٠١ -زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ وتی: من لەگەڵ مامەم دا بووم، لە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلولم بیست دەیوت: دارایی مەبەخشن بەوانەی کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادان تا بڵاوەی لێ بکەن، هەروەها وتی: ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە بێگومان دەسەڵاتدار و بەڕێزەکان لات و بێڕێزەکان لە مەدینە دەر دەکەین، منیش ئەمەم بۆ مامم گێڕایەوە، مامیشم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕابوویەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە شوێن عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی و هاوڕێکانیدا (ئەو قسەی کرد بۆیان پێی وتن) ئەوانیش سوێندیان خوارد بوو کە ئەو قسەیەیان نەکردووە، پێغەمبەری خواش ﷺ باوەڕی پێ کردبوون و باوەڕ بە من نەکرد، بۆیە منیش غەم و پەژارەیەکم تووش بوو کە وێنەیم تووش نەبوو بوو، ئیتر لە ماڵە (دەسە و ئەژنۆ) دانیشتم، ئەنجا خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: (کاتێك کە دوو ڕوان بێنە لات) تا دەگاتە (ئەوانە ئەو کەسانەن کە دەڵێن: دارایی مەبەخشن بەوانەی کە لەگەڵ پێغەمبەران) تا دەگاتە (بێگومان دەسەڵاتدار و بەڕێزەکان لات و بێڕێزەکان لە مەدینە دەر دەکەن) ئەوسا پێغەمبەر ﷺ ناردی بەشوێنمدا و ئایەتەکانی خوێندەوە بۆم لە پاشان فەرمووی: ((بێگومان بەدڵنیاییەوە خوا ڕاستی تۆی سەلماند و دەرخست)).**

---

(١) بڕوانە: ٤٩٠١، ٤٩٠٢، ٤٩٠٣، ٤٩٠٤.

## ٣ - بابُ قوْلِه: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٣﴾ ﴾ المنافقون

٤٩٠٢ - حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْحَكَمِ، قَالَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ كَعْبٍ الْقُرَظِيَّ، قَالَ: سَمِعْتُ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ ﷺ قَالَ لَمَّا قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيّ: لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ. وَقَالَ أَيْضًا لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ. أَخْبَرْتُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ فَلاَمَنِي الأَنْصَارُ، وَحَلَفَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ مَا قَالَ ذَلِكَ، فَرَجَعْتُ إِلَى الْمَنْزِلِ فَنِمْتُ فَدَعَانِي رَسُولُ اللهِ ﷺ فَأَتَيْتُهُ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ صَدَّقَكَ». وَنَزَلَ ﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا۟ ﴿٧﴾ ﴾ المنافقون وَقَالَ ابْنُ أَبِي زَائِدَةَ: عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَمْرٍو، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ زَيْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

## ٣ - باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەوە (ی کەوترا)[2] لەبەر ئەوە بوو کە بەڕاستی ئەوان باوەڕیان هێناوە لە پاش بێ باوەڕ بوون ئینجا مۆرنرا بەسەر دڵیاندا، ئیتر ئەوان هیچ تێ ناگەن)

**٤٩٠٢ -کەعبی قورەزی وتی: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمم ﷺ بیست وتی: کاتێ عەبدوڵلای کوڕ ئوبەیی وتی: دارایی مەبەخشن بەوانەی لە گەڵ پێغەمبەری خوادان، هەروەها وتی: ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە[3]، منیش ئەم قسەیەم گەیاند بە پێغەمبەر ﷺ، جا ئەنصاریەکان سەرزەنشتیان کردم، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی سوێندی خوارد (بۆ پێغەمبەر ﷺ) کە ئەو قسەیەی نەکردووە، منیش گەڕامەوە بۆماڵەوە و خەوتم، ئەنجا**

(١) بڕوانە: ٤٩٠٠.

(٢) بە دوو ڕووەکان لە سەرەتای سورەتەکەوە.

(٣) (دەسەڵاتدار و بەڕێزەکان لات و بێڕێزەکان لە مەدینە دەردەکەین) وەك لە فەرموودەکانی پێشوودا هاتووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە شوێنمدا منیش ڕۆشتمە خزمەتی و فەرمووی: ((بێگومان خوا ڕاستی تۆی سەلماند)) وە ئەم ئایەتە دابەزی: (ئەوان ئەو کەسانەن کە دەڵێن: دارایی مەبەخشن...) تا کۆتایی ئایەتەکە.

- (ئەم فەرموودەیە بەم ڕێگەیەش گێڕدراوەتەوە): ئیبنو ئەبی زائیدە وتی و گێڕایەوە لە ئەعمەشەوە لە عەمرەوە ئەویش لە ئیبنو ئەبی لەیلاوە ئەویش لە زەیدەوە گێڕایەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ[1].

-بابٌ: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ ﴿٤﴾ ﴾ المنافقون

## - باسێک: (هەرکاتێک دەیان بینیت[2] لەش و قەڵافەتیان سەرسامت دەکات، وە ئەگەر (دووڕوان) قسەبکەن گوێ لە قسەکەیان دەگریت هەروەک داری هەڵسپێردراون، وا گومان دەبەن هەموو هاوار و قیرەیەک بۆ سەر ئەوانە، هەر ئەوانن دوژمن، کەواتە خۆتیان لێ بپارێزە خوا بیانکوژێ (یان خوا لەناویان بەرێ) چۆن وەردەگێڕدرێن لە هەق)

٤٩٠٣ - حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ مُعَاوِيَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ قَالَ خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ أَصَابَ النَّاسَ فِيهِ شِدَّةٌ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ

(١) نەسائی ئەم فەرموودەی بە نەبچڕاوی گێڕاوەتەوە لە سونەنی کوبراکەیدا بە ژمارە (١١٥٩٤)

(٢) واتە: دوو ڕووان.

أُبَيٍّ لأَصْحَابِهِ لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِهِ. وَقَالَ: لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ. فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ فَأَرْسَلَ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ فَسَأَلَهُ، فَاجْتَهَدَ يَمِينَهُ مَا فَعَلَ، قَالُوا: كَذَبَ زَيْدٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَوَقَعَ فِي نَفْسِي مِمَّا قَالُوا شِدَّةٌ، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ تَصْدِيقِي فِي: ﴿إِذَا جَاءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ ۝١﴾ المنافقون. فَدَعَاهُمُ النَّبِيُّ ﷺ لِيَسْتَغْفِرَ لَهُمْ فَلَوَّوْا رُءُوسَهُمْ. وَقَوْلُهُ: ﴿خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ ۝٤﴾ المنافقون. قَالَ: كَانُوا رِجَالاً أَجْمَلَ شَيْءٍ[1].

**٤٩٠٣ ـ ئەبو ئیسحاق دەڵێ: لە زەیدی کوڕ ئەرقەمم ﷺ بیست وتی: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ ڕۆشتین بۆ سەفەرێك (غەزایەك) خەڵکی لەو سەفەرەدا زۆر برسێتی و ناڕەحەتیان تووش بوو[2]، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بەهاوڕێکانی وت: دارایی مەبەخشن بەوانەی کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادان، تا بڵاوەی لێ بکەن لە چواردەوری، هەروەها وتی: ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە بێگومان دەسەڵاتدار و بەڕێزەکان لات و بێڕێزەکان لە مەدینە دەر دەکەن.**

**منیش ڕۆشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ئەو قسەیەم بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش ﷺ ناردی بە شوێن عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی دا و پرسیاری (ئەو قسەی خۆی) لێ کرد، عەبدوڵڵا سوێندی زۆری خوارد کە قسەی وای نەکردووە (ئەنصارییەکان) وتیان: زەید درۆی کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، ئیتر ئەوەی وتیان زۆر سەخت وناخۆش بوو لە دڵمدا، هەتا خوا ﷻ ڕاستی و ڕاستگۆیی منی سەلماند و ئەم ئایەتەی دابەزاند: (کاتێك کە دووڕوان بێنە لات) ئینجا پێغەمبەر ﷺ ئەوان (دوو ڕوان)ـی بانگ کرد تا داوای لێ خۆش بوونیان**

---

(١) بڕوانە: ٤٩٠٠.

**(٢) غەزای تەبوك بوو سەفەرێکی دوور و خۆراکیشیان کەم بوو.**

بۆ بكات (له خوا)، بەلاّم ئەوان (سەرپێچی دەكەن) سەریان با دەدەن. وە ئەم ئایەتەش (دابەزی) (دەڵێی) داری هەڵسپێردراون) دەڵێ: ئەو (دوو ڕوو)انە پیاوانێك بوون جوانترین لەش و قەلاّفەتیان هەبوو.

## ٤ - بابٌ:قوله: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوْاْ رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٥﴾ ﴾ المنافقون

﴿ لَوَّوْاْ ﴿٥﴾ ﴾ المنافقون حَرَّكُوا اسْتَهْزَءُوا بِالنَّبِيِّ ﷺ ويُقْرَأُ بِالتَّخْفِيفِ مِنْ لَوَيْتُ.

## ٤ - باسێك: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە كاتێ: پێیان بوترێ وەرن بۆ لای پێغەمبەری خوا تا داوای لێبوردنتان بۆ بكات (سەرپێچی دەكەن) سەریان با دەدەن، وە دەیان بینیت ڕوو وەرئەگێڕن لە كاتێكدا كە ئەوان خۆیان بەگەورە دەزانن)

﴿ لَوَّوْاْ ﴾: (سەریان) دەجولاّند گاڵتەیان دەكرد بە پێغەمبەر ﷺ، بە: (لَوَلَوا)یش دەخوێنرێتەوە كە لە (لوَيتُ) وەوە[1] وەرگیراوە.

٤٩٠٤ - حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَمِّي فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ ابْنَ سَلُولَ يَقُولُ: لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا، وَلَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ. فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَمِّي،

(١) واتە: (لَوَوا) لە (لوَيتُ)وە وەرگیراوەكە نافیع و یەعقوب وا خوێندویانەتەوە، ئەوانی تر بە (لَوَّوْا) خوێندویانەتەوە.

فَذَكَرَ عَمِّي لِلنَّبِيِّ ﷺ فَدَعَانِي فَحَدَّثْتُهُ، فَأَرْسَلَ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ أُبَيٍّ وَأَصْحَابِهِ فَحَلَفُوا مَا قَالُوا، وَكَذَّبَنِي النَّبِيُّ ﷺ وَصَدَّقَهُمْ، فَأَصَابَنِي غَمٌّ لَمْ يُصِبْنِي مِثْلُهُ قَطُّ، فَجَلَسْتُ فِي بَيْتِي وَقَالَ عَمِّي مَا أَرَدْتَ إِلَى أَنْ كَذَّبَكَ النَّبِيُّ ﷺ وَمَقَتَكَ. فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ﴿١﴾ ﴾ المنافقون: وَأَرْسَلَ إِلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ فَقَرَأَهَا وَقَالَ: «إِنَّ اللهَ قَدْ صَدَّقَكَ»[1].

**٤٩٠٤ -زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەڵێ: من لەگەڵ مامم دا بووم، وە گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلول بوو دەیوت: دارایی مەبەخشن بە وانەی کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادان تا بڵاوەی لێ بکەن، وە ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە، بێگومان دەسەڵاتدار و بەڕێزەکان لات و بێڕێزەکان لە مەدینە دەردەکەن، منیش ئەم قسەیەم گێڕایەوە بۆ مامم مامیشم گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ [2]، وە باوەڕی بەوان کرد. بۆیە منیش تووشی غەم و خەفەتێك بووم هەرگیز غەم و خەفەتی وام توش نەبوو بوو، ئیتر لەماڵی خۆمدا دانیشتم، مامم وتی: بەو کارەی کردت وای کرد پێغەمبەر ﷺ باوەڕی پێ نەکردی (و بەدرۆزنی دانایت) و ڕقی لێت هەستا، بەو هۆیەوە خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتەی دابەزاند: (کاتێك کە دووڕوان بێنە لات دەڵێن: شایەتی دەدەین کە بەڕاستی تۆ پێغەمبەری خودای)، جا پێغەمبەر ﷺ ناردی بە شوێنمدا و ئەو ئایەتەی بۆ خوێندمەوە و فەرمووی: ((بێگومان خوا ڕاستی تۆی سەلماند)).**

---

(١) بڕوانە: ٤٩٠٠.

(٢) لێرەدا لە فەرموودەکانی تردا دەڵێ: جا پێغەمبەر ﷺ بانگی کردم منیش قسەکەم بۆ گێڕایەوە، جا ناردی بە شوێن عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی و هاوڕێکانیدا، ئەوانیش سوێندیان خوارد ئەو قسەیان نەکردووە، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ باوەڕی بە من نەکرد.

## ٥ - بابٌ:قولُهُ: ﴿ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ أَسۡتَغۡفَرۡتَ لَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ لَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٦﴾ ﴾ المنافقون

٤٩٠٥ - حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ عَمْرٌو سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا فِي غَزَاةٍ -قَالَ سُفْيَانُ مَرَّةً فِي: جَيْشٍ - فَكَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: يَالَلأَنْصَارِ. وَقَالَ الْمُهَاجِرِيُّ: يَا لَلْمُهَاجِرِينَ. فَسَمِعَ ذَاكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «مَا بَالُ دَعْوَى جَاهِلِيَّةٍ؟» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ. فَقَالَ: «دَعُوهَا فَإِنَّهَا مُنْتِنَةٌ». فَسَمِعَ بِذَلِكَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ فَقَالَ فَعَلُوهَا، أَمَا وَاللَّهِ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ. فَبَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَامَ عُمَرُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «دَعْهُ لاَ يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّ مُحَمَّدًا يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ» وَكَانَتِ الأَنْصَارُ أَكْثَرَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ حِينَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ، ثُمَّ إِنَّ الْمُهَاجِرِينَ كَثُرُوا بَعْدُ. قَالَ سُفْيَانُ: فَحَفِظْتُهُ مِنْ عَمْرٍو: قَالَ عَمْرٌو سَمِعْتُ جَابِرًا كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ.

## ٥ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:(بۆ ئەوان یەکسانە داوای لێبوردنیان بۆ بکەیت یا داوای لێبوردنیان بۆ نەکەیت، هەرگیز خوا لێیان خۆش نابێت، بەڕاستی خوا ڕێنموونی گەلی لەڕێ لادەران ناکات )

**٤٩٠٥ -عەمر دەڵێ: لە جابیری کوڕی عەبدوڵلام ﷺ بیست وتی: ئێمە لە غەزایەکدابووین - سوفیان لە گێڕانەوەیەکدا دەڵێ: لە لەشکرێکدا بووین - ئینجا پیاوێك لە کۆچەران شەقێکی دا لە پیاوێکی ئەنصاری، پیاوە ئەنصاریەکە وتی: ئەنصارییەکان فریام کەون، کۆچەرییەکەش وتی: کۆچەران فریام کەون،**

پێغەمبەری خواش ﷺ گوێی لێ بوو و وتی: ((ئەم بانگەوازی سەردەمی نەفامییە چییە؟)) عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا پیاوێك لە کۆچەران شەقێکی داوە لە پیاوێکی ئەنصاری، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((وازی لێ بێنن[1] چونکە بەڕاستی کارێکی بۆگەن و پیسە))، ئینجا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی لەو باسەی بیست وتی: ئەو کارەیان کرد؟ جا سوێند بەخوا ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە بەدڵنیاییەوە دەسەڵاتدارە بەڕێزەکان لات و بێڕێزەکان لە مەدینە دەر دەکەین، ئەنجا ئەم قسەیە گەشت بە پێغەمبەر ﷺ و عومەر هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێمگەڕێ بابدەم لە گەردنی ئەم دووڕووە. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((وازی لێ بێنە، باخەڵك نەڵێن موحەممەد هاوەڵانی خۆی دەکوژێت))، جاران ئەنصارییەکان زۆرتر بوون لە کۆچەران، کاتێ کۆچەران هاتن بۆ مەدینە لە پاشان بێگومان دواتر کۆچەران زۆر بوون.

سوفیان دەڵێ: جا من ئەم فەرموودەیەم لە بەر کردووە (بەم شێوە) لە عەمرەوە عەمر وتی: لە جابیرەوە ﷺ بیستم وتی: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین.

## ٦ - بابٌ: قوله: ﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُواْ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّواْ ۝٧ ﴾ المنافقون، ويتفرقوا ﴿ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ۝٧ ﴾ المنافقون

## ٦ - باسێك: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەوانە ئەو کەسانەن کە دەڵێن دارایی مەبەخشن بە ئەوانەی کە لەگەڵ

(١) لە بانگەوازی نەفامی.

## پێغەمبەری خوادان تا بڵاوەی لێ بکەن) وە بڵاوببنەوە (لە کاتێکدا هەرچی گەنجینەکانی ئاسمانەکان و زەویی هەیە هەمووی هی خوایە، بەڵام دووڕووەکان نازانن)

٤٩٠٦ - حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عُقْبَةَ عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْفَضْلِ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: حَزِنْتُ عَلَى مَنْ أُصِيبَ بِالْحَرَّةِ فَكَتَبَ إِلَيَّ زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ وَبَلَغَهُ شِدَّةُ حُزْنِي يَذْكُرُ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَلأَبْنَاءِ الأَنْصَارِ» -وَشَكَّ ابْنُ الْفَضْلِ فِي أَبْنَاءِ أَبْنَاءِ الأَنْصَارِ - فَسَأَلَ أَنَسًا بَعْضُ مَنْ كَانَ عِنْدَهُ فَقَالَ هُوَ الَّذِي يَقُولُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «هَذَا الَّذِي أَوْفَى اللَّهُ لَهُ بِأُذُنِهِ».

**٤٩٠٦ -عەبدوڵڵای کوڕی فەزڵ دەگێڕێتەوە کە لە ئەنەسی کوڕی مالیکی ﷺ بیست دەیوت: دلگران بووم بۆ ئەوانەی (ئەنصاریانەی) لە حەڕڕەدا کوژران، ئەنجا زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ بۆی نووسیم - کە پێی گەشتبوو من زۆر دلگران بووم - دەڵێ ئەو لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((خودایە لە ئەنصارییەکان خۆشبە، وە لە منداڵانی ئەنصاریەکان خۆشبە)) وە عەبدوڵڵای کوڕی فەزڵ، گومانی هەیە دەربارەی (ئایا فەرموویەتی) منداڵی منداڵی ئەنصاریەکان - جا کەسێك کە لای ئەنەس بوو ﷺ پرسیار لە ئەنەس کرد (دەربارەی زەیدی کوڕی ئەرقەم)، ئەنەسیش وتی: زەید ئەو کەسەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ (لەبارەیەوە) دەفەرموێ: ئەو (زەید) ئەو کەسەیە کە خوا بیستنەکەی بەڕاست گێڕا)).**

## ٧ - بابٌ: ﴿يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾﴾ المنافقون

٤٩٠٧ - حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ حَفِظْنَاهُ مِنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: كُنَّا فِي غَزَاةٍ فَكَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: يَا لَلأَنْصَارِ. وَقَالَ الْمُهَاجِرِيُّ: يَا لَلْمُهَاجِرِينَ. فَسَمَّعَهَا اللَّهُ رَسُولَهُ ﷺ قَالَ: «مَا هَذَا؟». فَقَالُوا: كَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: يَا لَلأَنْصَارِ. وَقَالَ الْمُهَاجِرِيُّ: يَالَلْمُهَاجِرِينَ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «دَعُوهَا فَإِنَّهَا مُنْتِنَةٌ». قَالَ جَابِر: وَكَانَتِ الأَنْصَارُ حِينَ قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ أَكْثَرَ، ثُمَّ كَثُرَ الْمُهَاجِرُونَ بَعْدُ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ: أَوَقَدْ فَعَلُوا، وَاللَّهِ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ. فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رضي الله عنه: دَعْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «دَعْهُ لاَ يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّ مُحَمَّدًا يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ»[(١)].

## ٧ - باسێک: (دوو ڕووەکان دەڵێن، سوێند بێ ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە بێگومان دەسەڵاتدار و بەڕێزەکان لات و بێڕێزەکان لە مەدینە دەردەکەن، ڕێز و گەورەیی تەنها بۆ خوا و پێغەمبەری خوا و بۆ باوەڕدارانە، بەڵام دوو ڕووان نازانن)

**٤٩٠٧ -عەمری کوڕی دینار: دەڵێ لە جابیر کوڕی عەبدوڵڵام ﷺ بیست دەیوت: ئێمە لە غەزایەکدابووین، جا پیاوێك لە کۆچەران شەقێکی دا لە پیاوێکی ئەنصاری، پیاوە ئەنصارییەکە وتی: ئەی ئەنصارییەکان فریام کەون، کۆچەرییەکەش وتی: ئەی کۆچەریان فریام کەون، جا خوا ئەو (ئاژاوەی) بە**

(١) بروانە: ٣٥١٨.

پێغەمبەرەکەی ﷺ بیست (پێی گەیشت)، پێغەمبەریش فەرمووی: ((ئەمە چییە؟)) ئەوانیش وتیان: پیاوێك لە کۆچەران شەقێکی دا لە پیاوێك لە ئەنصارییەکان، جا ئەنصارییەکە وتی: ئەی ئەنصارییەکان فریام کەون، کۆچەرییەکەش وتی: ئەی کۆچەرییەکان فریام کەون، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((وازی لێ بێنن (بانگەوازی نەفامییە)، چونکە بێگومان بۆگەن و پیسە)) جابیر دەڵێ: ئەنصارییەکان کاتێ پێغەمبەر هات بۆ مەدینە زۆرتر بوون (لە کۆچەران)، لە پاشان دواتر کۆچەران زۆر بوون، ئەنجا عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی وتی: ئایا وایان کردووە؟ سوێند بە خوا ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە بێگومان دەسەڵاتدار و بەڕێزەکان لات و بێڕێزەکان لەمەدیینە دەردەکەن، عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وازم لێ بێنە با بدەم لە گەردنی ئەم دوو ڕووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((وازی لێ بێنە با خەڵك نەڵێن موحەممەد (هاوەڵانی خۆی دەکوژێت)).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ٦٤ - سورة التَّغَابُن

وَقَالَ. عَلْقَمَةُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ: ﴿ يُؤْمِنْ بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ ۥ ﴿١١﴾ ﴾ التغابن: هُوَ الذِي إِذَا أَصَابَتْهُ مُصِيبَةٌ رَضِيَ، وَعَرَفَ أَنَّهَا مِنَ اللَّهِ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ التَّغَابُنِ ﴿٩﴾ ﴾ التغابن: غَبْنُ أَهْلِ الْجَنَّةِ أَهْلَ النَّارِ. ﴿ إِنِ ارْتَبْتُمْ ﴿٤﴾ ﴾ الطلاق: إِنْ لَمْ تَعْلَمُوا أَتَحِيضُ أَمْ لَا تَحِيضُ فَاللَّائِي قَعَدْنَ عَنْ الْمَحِيضِ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ بَعْدُ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ.

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٦٤ - (تەفسیری) سوڕەتی تەغابون

-عەلقەمە لە عەبدوڵڵاوە گێڕایەوە کە دەڵێ: ﴿ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ﴿١١﴾ ﴾ التغابن: ئەو کەسەیە ئەگەر ناخۆشییەکی توش بوو پێی ڕازی یە، وە دەزانێ کە ئەو ناخۆشییە لە خواوەیە.

-موجاهید دەڵێ: ﴿ ٱلتَّغَابُنِ ﴿١١﴾ ﴾ التغابن: بەهەشتیەکان دۆزەخی یەکانیان خەڵەتاند [1].

﴿ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ ﴿٤﴾ ﴾ الطلاق: ئەگەر نەتانزانی ئافرەتەکە دەکەوێتە حەیزەوە یان ناکەوێتە حەیزەوە، جا ئەو ئافرەتانەی لە حەیز چوونەتەوە[2] و ئەوانەشی هێشتا (لەبەر منداڵییان) نەکەوتونەتە حەیزەوە، ئەو عیدەیان سێ مانگە [3].

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٦٥ - سورةُ الطَّلاقِ

وَقَالَ مُجَاهِدٌ:﴿ وَبَالَ أَمْرِهَا ﴿٩﴾ ﴾ الطلاق: جَزَاءَ أَمْرِهَا.

(١) چونکە بەهەشتیەکان پەیمانیان دا لەسەر مسوڵمان بوون بە بەهەشت و قازانجیان کرد، دۆزەخیەکانیش موسڵمان نەبوون زەرەریان کرد، قورئان چواندوونی بە کڕیار و فرۆشیار یەکێکیان ئەوەی کەیان دەخەڵەتێنێ لە مامەڵەدا.

(٢) لەبەر گەورەیی تەمەنیان ناکەونە حەیز.

(٣) بێجگە ئافرەتی مێرد مردوو کە عیدەکەی چوار مانگ و دە ڕۆژە.

## ١ - بَابٌ

٤٩٠٨ - حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمٌ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهْيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ عُمَرُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَتَغَيَّظَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ قَالَ: «لِيُرَاجِعْهَا ثُمَّ يُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيضَ فَتَطْهُرَ، فَإِنْ بَدَا لَهُ أَنْ يُطَلِّقَهَا فَلْيُطَلِّقْهَا طَاهِرًا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا فَتِلْكَ الْعِدَّةُ كَمَا أَمَرَهُ اللَّهُ»[1].

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٦٥ - (تەفسیری) سورەتی تەڵاق

-موجاهید دەڵێ: ﴿وَبَالَ أَمْرِهَا ۝٩﴾ الطلاق: سزای كارەكەی خۆی.

## ١ - باسێک

**٤٩٠٨ -سالیم دەڵێ عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ بۆی گێڕایەوە كە ئەو (عەبدوڵڵا) خێزانەكەی تەڵاق دا لە كاتێكدا لە حەیزدا بوو، جا عومەر بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ باس كردبوو پێغەمبەری خواش ﷺ لە بارمیەوە تووڕە بوو بوو، لە پاشان فەرمووی: (با بیگێڕێتەوە بۆ لای خۆی پاشان لای خۆی ڕایگرێ و بیهێڵێتەوە تا پاك دەبێتەوە، پاشان دەكەوێتە حەیزەوە جا پاك دەبێتەوە جا ئەو كاتە ئەگەر بۆی دەركەوت كە تەڵاقی بدات (باشە)، با بە پاكی تەڵاقی بدات پێش ئەوە بڕواتە لای (لەگەڵی جووت بێت)، ئەوە ئەو عیدەیەیە كە خوا فەرمانی پێ كردووە )).**

---

(١) بڕوانە: ٥٢٥١، ٥٢٥٢، ٥٢٥٣، ٥٢٥٨، ٥٢٦٤، ٥٣٣٣،٥٣٣٢، ٧١٦٠.

## ٢ - بابٌ: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ﴿٤﴾﴾ الطلاق:

﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ ﴿٤﴾﴾ الطلاق: وَاحِدُهَا: ذَاتُ حَمْلٍ.

٤٩٠٩ - حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ وَأَبُو هُرَيْرَةَ جَالِسٌ عِنْدَهُ فَقَالَ: أَفْتِنِي فِي امْرَأَةٍ وَلَدَتْ بَعْدَ زَوْجِهَا بِأَرْبَعِينَ لَيْلَةً. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ:آخِرُ الأَجَلَيْنِ. قُلْتُ أَنَا: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ﴿٤﴾﴾ الطلاق: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَنَا مَعَ ابْنِ أَخِي -يَعْنِي أَبَا سَلَمَةَ - فَأَرْسَلَ ابْنُ عَبَّاسٍ غُلاَمَهُ كُرَيْبًا إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ يَسْأَلُهَا فَقَالَتْ: قُتِلَ زَوْجُ سُبَيْعَةَ الأَسْلَمِيَّةِ وَهْيَ حُبْلَى، فَوَضَعَتْ بَعْدَ مَوْتِهِ بِأَرْبَعِينَ لَيْلَةً فَخُطِبَتْ فَأَنْكَحَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺوَكَانَ أَبُو السَّنَابِلِ فِيمَنْ خَطَبَهَا[1].

## ٢ - باسێک: (وە ژنانی سک پڕ عیدەیان ئەو کاتەیە کە سکەکەیان دابنێن، هەرکەسێک لەبەر فەرمانی خوا خۆی بپارێزێ خوا کاری بۆ ئاسان دەکات)

﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ ﴿٤﴾﴾: (کۆیە: ژنانی سک پڕ) تاکەکەی ژنی سک پڕ.

**٤٩٠٩ - ئەبو سەلەمە دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای ئیبنو عەبباس ﷺ لەو کاتەدا ئەبو هورەیرەش لای ئیبنو عەبباس دانیشتبوو، جاپیاوەکە وتی: وەڵامم بدەرەوە دەربارەی ژنێك دوا (مردنی) مێردەکەی بە چل شەو منداڵی بووە،**

(١) بڕوانە: ٥٣١٨.

**ئیبنو عەبباسیش وتی: ئەوکاتە یان دواتر (درێژترە ئەوە عیدەکەیەتی) (ئەبو سەلەمە دەڵێ) منیش وتم: (ژنانی سك پڕ عیدەیان ئەو کاتەیە کە سکەکەیان دابنێن)، ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: من ڕام لەگەڵ ئەم برازایەم دایە -واتە ئەبو سەلەمە - ئەنجا ئیبنو عەبباس کورەیبی غوڵامی نارد بۆلای ئوممو سەلەمە پرسیاری لێ بکات (لەو بارەیەوە)، ئوممو سەلەمەش وتی: مێردی سوبەیعەی ئەسلەمیی کوژرا ژنەکەی سك پڕ بوو، ئەنجا بەچل ڕۆژ دوای مردنی (مێردەکەی) منداڵەکەی بوو، ئەنجا خوازبێنی کرا و پێغەمبەری خواش ﷺ مارەی کرد، وە ئەبو سەنابیلیش لەو کەسانە بوو خوازبێنی سوبەیعەی کرد.**

٤٩١٠ - وَقَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ وَأَبُو النُّعْمَانِ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ قَالَ: كُنْتُ فِي حَلْقَةٍ فِيهَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى وَكَانَ أَصْحَابُهُ يُعَظِّمُونَهُ، فَذَكَرَ آخِرَ الأَجَلَيْنِ فَحَدَّثْتُ بِحَدِيثِ سُبَيْعَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ قَالَ: فَضَمَّزَ لِي بَعْضُ أَصْحَابِهِ. قَالَ مُحَمَّدٌ: فَفَطِنْتُ لَهُ فَقُلْتُ: إِنِّي إِذًا لَجَرِيءٌ إِنْ كَذَبْتُ عَلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ وَهْوَ فِي نَاحِيَةِ الْكُوفَةِ. فَاسْتَحْيَا وَقَالَ: لَكِنَّ عَمَّهُ لَمْ يَقُلْ ذَاكَ. فَلَقِيتُ أَبَا عَطِيَّةَ مَالِكَ بْنَ عَامِرٍ فَسَأَلْتُهُ فَذَهَبَ يُحَدِّثُنِي حَدِيثَ سُبَيْعَةَ فَقُلْتُ: هَلْ سَمِعْتَ عَنْ عَبْدِ اللهِ فِيهَا شَيْئًا فَقَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَبْدِ اللهِ فَقَالَ: أَتَجْعَلُونَ عَلَيْهَا التَّغْلِيظَ وَلاَ تَجْعَلُونَ عَلَيْهَا الرُّخْصَةَ؟ لَنَزَلَتْ سُورَةُ النِّسَاءِ الْقُصْرَى بَعْدَ الطُّولَى: ﴿ وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ﴿٤﴾ ﴾ الطلاق[1].

**٤٩١٠ - موحەممەد (ی کوڕی سیرین) دەڵێ: من لە کۆڕ و دانیشتنێکدا بووم کە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلای تیا بوو - هاوەڵەکانی بەگەورەیان دادەنا و**

(١) بڕوانە: ٤٥٣٢.

ڕێزیان دەگرت - (خەڵکەکە باسی ئافرەتی سك پڕیان کرد مێردی بمرێ و منداڵی ببێت)، عەبدوڕەحمانیش وتی: دوورترینی دوو ماوەکە عیدەیەتی (موحەممەد وتی): جا منیش فەرموودەکەی سوبەیعەی کچی حاریسم گێڕایەوە لە عەبدوڵلای کوڕی عوتبەوە (موحەممەد) دەڵێ: یەکێك لە هاوڕێکانی عەبدوڕەحمان ئاماژەی بۆ کردم کە بێدەنگ بم، منیش لێی تێگەشتم جا وتم: بێگومان بوێرم ئەگەر درۆ بکەم بە ناوی عەبدوڵلای کوڕی عوتبە کە لە لای کوفەیە، ئیتر ئەو (ئاماژەکەرە) شەرمی کرد و وتی: بەڵام مامی ئەو (عەبدوڵلای کوڕی عوتبە) وای نەوتووە، منیش بە ئەبو عەتییە کە مالیکی کوڕی عامیرە گەشتم و پرسیارم لێ کرد، ئەویش دەستی کرد بە گێڕانەوەی فەرموودەکەی سوبەیعە بۆم، منیش وتم: لەو بارەیەوە هیچت لە عەبدوڵلا بیستووە؟ ئەویش وتی: ئێمە لای عەبدوڵلا بووین، عەبدوڵلا وتی: ئایا بۆ ئەو عیددە سەخت و قورسەی لەسەر دادەنێن وە ئەو ڕوخسەت و ئاسانی یەی لەسەر دانانێن؟ سوێند بەخوا سوڕەتی ژنانە کورتەکەیان[1] پاش درێژەکەیان[2] دابەزیوە (کە ئەم ئایەتەیە): (وە ژنانی سك پڕ عیددەیان ئەو کاتەیە کە سکەکەیان دابنێن).

(١) کە سوڕەتی تەلاقە.

(٢) کە سوڕەتی بەقەرەیە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ٦٦ - سُورَةُ التَّحريم

### ١ - بابٌ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ۝١ ﴾ التحريم

٤٩١١ - حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنِ ابْنِ حَكِيمٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ فِي الْحَرَامِ: يُكَفِّرُ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاس: ﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ ۝٢١ ﴾ الأحزاب[1].

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٦٦ - (تەفسیری) سورەتی تەحریم

### ١ - باسێک: (ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆچی شتێک لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوویت، تۆ ڕەزامەندی ژنەکانت دەوێ لە کاتێکدا خوا لێ خۆشبووی میهرەبانە)

**٤٩١١ -سەعیدی کوڕی جوبەیر دەگێڕێتەوە کەئیبنو عەبباس ﷺ دەربارەی (ژن لەخۆ) حەرام کردن، بریتی (سوێند) بدات، وە ئیبنو عەبباس ﷺ وتی: (سوێند بە خوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا ﷺ سەر مەشقی و پێشەوایەتی چاك هەیە بۆ ئێوە).**

(١) بڕوانە: ٥٢٦٦.

٤٩١٢ - حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَشْرَبُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ وَيَمْكُثُ عِنْدَهَا، فَوَاطَيْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ عَنْ أَيَّتُنَا دَخَلَ عَلَيْهَا فَلْتَقُلْ لَهُ: أَكَلْتَ مَغَافِيرَ، إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ. قَالَ: «لاَ وَلَكِنِّي كُنْتُ أَشْرَبُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ فَلَنْ أَعُودَ لَهُ، وَقَدْ حَلَفْتُ لاَ تُخْبِرِي بِذَلِكِ أَحَدًا»[1].

**٤٩١٢ -عوبەیدەی کوڕی عومەیر لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە کەوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لای زەینەبی کچی جەحش هەنگوینی دەخواردەوە و لاشی دەمایەوە، جا من و حەفصە ڕێکەوتین (پێغەمبەر ﷺ ) بۆ لای هەر کامێکمان هات پێی بڵێت: مەغافیرت [2] خواردووە؟ بەڕاستی من بۆنی مەغافیرت لێ دەکەم، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: ((نەخێر (مەغافیرم نەخواردووە) بەڵکو من هەنگوینم خواردووەتەوە لای زەینەبی کچی جەحش، ئیتر جارێکی تر ناگەڕێمەوە بۆی وە سوێندیشم خوارد، بەڵام ئەم قسەیە بەکەس مەڵێ)).**

## ٢ - بابٌ: ﴿تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ ۝١﴾ التحريم، ﴿قَدْ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَـٰنِكُمْ ۝٢﴾ التحريم:

٤٩١٣ - حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ بِلاَلٍ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ حُنَيْنٍ أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ ﵄ يُحَدِّثُ أَنَّهُ قَالَ: مَكَثْتُ سَنَةً أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ عَنْ آيَةٍ، فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَسْأَلَهُ؛ هَيْبَةً لَهُ، حَتَّى خَرَجَ حَاجًّا فَخَرَجْتُ مَعَهُ فَلَمَّا رَجَعْتُ وَكُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ عَدَلَ إِلَى الأَرَاكِ لِحَاجَةٍ لَهُ -قَالَ - فَوَقَفْتُ لَهُ حَتَّى فَرَغَ،

---

(١) بڕوانە: ٥٢١٦، ٥٢٦٧، ٥٢٦٨، ٥٤٣١، ٥٥٩٩، ٥٦١٤، ٥٦٨٢، ٦٦٩١، ٦٩٧٢.

(٢) مەغافیر: **کەتیرەیەکی شیرینە و بۆنی ناخۆشە لە درەختێك پەیدا دەبێ ناو عورفوتە (إرشاد الساری، ١١/١٥٩)**

سِرْتُ مَعَهُ فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ مَنِ اللَّتَانِ تَظَاهَرَتَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ مِنْ أَزْوَاجِهِ؟ فَقَالَ: تِلْكَ حَفْصَةُ وَعَائِشَةُ. قَالَ: فَقُلْت: وَاللهِ إِنْ كُنْتُ لأُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكَ عَنْ هَذَا مُنْذُ سَنَةٍ، فَمَا أَسْتَطِيعُ، هَيْبَةً لَكَ. قَالَ: فَلاَ تَفْعَلْ، مَا ظَنَنْتَ أَنَّ عِنْدِي مِنْ عِلْمٍ فَاسْأَلْنِي، فَإِنْ كَانَ لِي عِلْمٌ خَبَّرْتُكَ بِهِ قَالَ: ثُمَّ قَالَ عُمَرُ: وَاللهِ إِنْ كُنَّا فِي الْجَاهِلِيَّةِ مَا نَعُدُّ لِلنِّسَاءِ أَمْرًا، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِنَّ مَا أَنْزَلَ وَقَسَمَ لَهُنَّ مَا قَسَمَ قَالَ: فَبَيْنَا أَنَا فِي أَمْرٍ أَتَأَمَّرُهُ إِذْ قَالَتِ امْرَأَتِي: لَوْ صَنَعْتَ كَذَا وَكَذَا قَالَ: فَقُلْتُ لَهَا: مَالَكِ وَلِمَا هَا هُنَا فِيمَا تَكَلُّفُكِ فِي أَمْرٍ أُرِيدُهُ؟ فَقَالَتْ لِي: عَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ، مَا تُرِيدُ أَنْ تُرَاجَعَ أَنْتَ، وَإِنَّ ابْنَتَكَ لَتُرَاجِعُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَتَّى يَظَلَّ يَوْمَهُ غَضْبَانَ. فَقَامَ عُمَرُ فَأَخَذَ رِدَاءَهُ مَكَانَهُ حَتَّى دَخَلَ عَلَى حَفْصَةَ فَقَالَ لَهَا: يَا بُنَيَّةُ، إِنَّكِ لَتُرَاجِعِينَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَتَّى يَظَلَّ يَوْمَهُ غَضْبَانَ؟ فَقَالَتْ حَفْصَةُ: وَاللَّهِ إِنَّا لَنُرَاجِعُهُ. فَقُلْتُ: تَعْلَمِينَ أَنِّي أُحَذِّرُكِ عُقُوبَةَ اللهِ وَغَضَبَ رَسُولِهِ ﷺ يَا بُنَيَّةُ لاَ يَغُرَّنَّكِ هَذِهِ الَّتِي أَعْجَبَهَا حُسْنُهَا حُبُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِيَّاهَا -يُرِيدُ عَائِشَةَ - قَالَ: ثُمَّ خَرَجْتُ حَتَّى دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ لِقَرَابَتِي مِنْهَا فَكَلَّمْتُهَا. فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: عَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ دَخَلْتَ فِي كُلِّ شَيْءٍ، حَتَّى تَبْتَغِي أَنْ تَدْخُلَ بَيْنَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَأَزْوَاجِهِ. فَأَخَذَتْنِي وَاللَّهِ أَخْذًا كَسَرَتْنِي عَنْ بَعْضِ مَا كُنْتُ أَجِدُ، فَخَرَجْتُ مِنْ عِنْدِهَا، وَكَانَ لِي صَاحِبٌ مِنَ الأَنْصَارِ إِذَا غِبْتُ أَتَانِي بِالْخَبَرِ، وَإِذَا غَابَ كُنْتُ أَنَا آتِيهِ بِالْخَبَرِ، وَنَحْنُ نَتَخَوَّفُ مَلِكًا مِنْ مُلُوكِ غَسَّانَ، ذُكِرَ لَنَا أَنَّهُ يُرِيدُ أَنْ يَسِيرَ إِلَيْنَا، فَقَدِ امْتَلأَتْ صُدُورُنَا مِنْهُ، فَإِذَا صَاحِبِي الأَنْصَارِيُّ يَدُقُّ الْبَابَ فَقَالَ: افْتَحِ افْتَحْ. فَقُلْتُ: جَاءَ الْغَسَّانِيُّ؟ فَقَالَ: بَلْ أَشَدُّ مِنْ ذَلِكَ. اعْتَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَزْوَاجَهُ. فَقُلْتُ: رَغَمَ أَنْفُ حَفْصَةَ وَعَائِشَةَ. فَأَخَذْتُ ثَوْبِيَ فَأَخْرُجُ حَتَّى جِئْتُ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَشْرُبَةٍ لَهُ يَرْقَى عَلَيْهَا بِعَجَلَةٍ، وَغُلاَمٌ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَسْوَدُ عَلَى رَأْسِ الدَّرَجَةِ فَقُلْتُ لَهُ: قُلْ: هَذَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ. فَأَذِنَ لِي -قَالَ عُمَرُ: -، فَقَصَصْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ هَذَا الْحَدِيثَ، فَلَمَّا بَلَغْتُ حَدِيثَ أُمِّ سَلَمَةَ تَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَإِنَّهُ لَعَلَى حَصِيرٍ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ شَيْءٌ، وَتَحْتَ رَأْسِهِ وِسَادَةٌ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ، وَإِنَّ عِنْدَ رِجْلَيْهِ

قَرَظًا مَصْبُوبًا، وَعِنْدَ رَأْسِهِ أَهَبٌ مُعَلَّقَةٌ فَرَأَيْتُ أَثَرَ الْحَصِيرِ فِي جَنْبِهِ فَبَكَيْتُ، فَقَالَ: «مَا يُبْكِيكَ؟». فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ كِسْرَى وَقَيْصَرَ فِيمَا هُمَا فِيهِ، وَأَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ. فَقَالَ: «أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ لَهُمُ الدُّنْيَا وَلَنَا الآخِرَةُ؟»[1].

## ٢ - باسێک: (تۆ ڕەزامەندی ژنەکانت دەوێ) (بێگومان خوا (ڕێگای) هەڵوەشاندنەوەی سوێندەکانتانی بۆ داناون)

**٤٩١٣ -عوبەیدوڵلای کوڕی حونەین دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباسی ﷻ بیست کە دەیگێڕایەوە دەیوت: یەك ساڵ مامەوە دەمویست کە پرسیار لە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بکەم دەربارەی ئایەتێك بەڵام نەمدەتوانی پرسیاری لێ بکەم، ئەوەندە بە سام بوو (لام)، هەتا ڕۆشت بۆ حەج منیش لەگەڵیدا ڕۆشتم، ئینجا کە گەڕایەوە ئێمە لە ڕێگادا بووین (عومەر) لایدایە بۆ لای درەختێکی ئاراك[2] بۆ دەست بەئاو گەیاندن، (ئیبنو عەبباس) دەڵێ: بەدیاریەوە وەستام تا لێبویەوە لە پاشان لەگەڵیدا ڕۆشتم و وتم: ئەی پێشەوای باوەڕداران ئەو دوو ئافرەتە کێ بوون لە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ کە پشتی یەکتریان گرت، لە دژی پێغەمبەر ﷺ، عومەریش وتی: حەفصە و عائیشە بوون، دەڵێ وتم: سوێند بەخوا من یەك ساڵە دەمەوێ پرسیاری ئەم باسەت لێ بکەم، بەڵام نەمدەتوانی لەبەر سام و هەیبەتت، عومەر وتی: ئیتر وامەکە، هەر شتێك پێت وایە من زانیاریم هەیە لەبارەیەوە پرسیارم لێ بکە، جا ئەگەر زانیاریم لێی هەبوو پێت دەڵێم وە هەواڵت دەدەمێ. دەڵێ: لە پاشان عومەر ﷺ وتی: سوێند بەخوا ئێمە لەسەردەمی نەفامیدا ژنانمان بە هیچ دانەدەنا (بێ ڕێز بوون لامان) تا خوا لەبارەیانەوە ئەوەی دایبەزاند دایبەزاند[3]، ئەوەی بۆی دابەش کردبوون دابەشی**

---

(١) بڕوانە: ٨٩.

(٢) ئەو درەختەی لقەو پۆپەکانی سیواکی لێ دەکرێ.

(٣) کە فەرمووی: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۝١٩﴾ النساء: واتە بە چاکی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن.

کرد [١]، جا کاتێ بیرم لە کارێك دەکردەوە هاوسەرم پێی وتم: ئەگەر وات بکردایە و وات بکردایە؟ منیش پێم وت: تۆی پەیوەندیت چییە بەم کارەوە؟ لە هیچ کارێکدا کە دەیکەم من داوای هیچ کارێکت لێ ناکەم. ئەنجا پێی وتم: ئەی کوڕی خەتتاب سەرم لێت سوڕ دەمێنێت، ناتەوێ و پێت ناخۆشە کە وەڵامی قسەت بدرێتەوە، کەچی کچەکەت بەرەو ڕووی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەستێ (وەڵامی دەداتەوە)، هەتا جاری وا هەیە ئەو ڕۆژە پێغەمبەر ﷺ بەتوڕەی ئەباتەسەر؟ ئینجا عومەر ﷺ لە شوێنی خۆیی هەستا و عەباکەی هەڵگرت ڕۆشت هەتا ڕۆشتە لای حەفصە و پێی وت: ئەی کچی خۆم بەرەو ڕووی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەستی (وەڵامی دەدەیتەوە)، تا ئەو ڕۆژە بەتوڕەیی بەسەریدا تێئەپەڕێ؟ حەفصەش وتی: سوێند بەخوا ئێمە ئاوەها ڕووبەڕووی دەبینەوە منیش وتم: چاك بزانە من لە تۆڵەی خوا و توڕەیی پێغەمبەرەکەی ﷺ ئاگادارت دەکەمەوە (دەتترسێنم)، ئەی کچەکەم بەوە مەخەڵەتێ کە هاوسەری جوانیەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ وا لێ کردووە کە خۆشی بوێ، خۆشەویستیەکەی لە دڵیدا چەسپیوە - مەبەستی عائیشەیە - وتی: پاشان لەوێ دەرچووم ڕۆشتمە لای ئوممو سەلەمە لەبەر ئەوەی خزمایەتیم لەگەڵی هەبوو [٢]، قسەم لەگەڵ کرد وتی: سەیرم لە تۆدێ ئەی کوڕی خەتتاب خۆت لە هەموو شتێکدا هەڵدەقورتێنێ هەتا دەتەوێ بڕۆیتە نێوان پێغەمبەر و هاوسەرانی؟ جا سوێند بەخوا ئەو وتەیە بەجۆرێ گرتمی شکانمی لەو حاڵەی کە بووم لێی چوومە دەرێ، لای ئەو (ئوممو سەلەمە) چوومە دەرێ، پێشتر هاوڕێیەکی ئەنصاریم هەبوو ئەگەر دیار نەبایە هەواڵی بۆ دەهێنام، ئەگەر ئەو دیار نەبوایە من هەواڵم بۆدەبرد، ئێمە (لەوکاتەدا) ترسمان لە پادشایەك لە

---

(١) کە فەرمووی: ﴿ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴿٢٣٣﴾ ﴾ البقرە. واتە، لەسەر باوکەیە ڕۆزی و کاڵای دایکەکان بە باشی.

(٢) دایکیان نامۆزان.

پادشاکانی غەسسان هەبوو [١] هەواڵمان پێ گەشتبوو کە دەیەوێ هێرشمان بۆ بێنێ، جا بەڕاستی پڕ بەدڵ لێی دەترساین ڕۆژی هاوڕێ ئەنصارییەکەم لە دەرگای دا و وتی: بیکەرەوە بیکەرەوە، وتم: بۆ غەسسانیەکە هاتووە؟ وتی: بەڵکو لەوە خراپتر، پێغەمبەری خوا ﷺ لە هاوسەرەکانی جیابۆتەوە، منیش وتم: لووتی حەفصە و عائیشە لەخاك نیشێ ! پۆشاکەکەم هەڵگرت و ڕۆشتمە دەرەوە تا چوومە ئەوێ، دەبینم پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژوورێکی بچووکی خۆیدابوو، سەرکەوتن بۆی بەپلیکانەیەکی دار خورما بوو، وە خزمەتکارە ڕەش پێستەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر پلەی پلیکانەکە دانیشتبوو، پێم وت: (بە پێغەمبەر ﷺ) بڵێ: ئەوە عومەری کوڕی خەتتابە، جامۆڵەت درام (بڕۆمە خزمەتی)، عومەر دەڵێ: ئەو باسەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە، جا کاتێ گەشتمە سەر قسەکانی ئوممو سەلەمە ﵂ پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد، ئەو لەسەر حەسیرێ بوو لە نێوان ئەو حەسیرەکەدا هیچ نەبوو، سەرینێکی چەرمی لەژێر سەردابوو پووشی دارخورمای تێ ئاخنرابوو، لای پێیەکایەوە کۆمەڵێ گەڵای دار سەلەمی لێ بوو (کەدەباغی پێ ئەکەن)، لە ژووری سەریەوە پێستێکی دەباغ نەکراو هەڵواسرابوو، جابەلاتەنیشتی یەوە شوێنەواری حەسیرەکەم بینی، بۆیە گریام، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بۆئەگریت؟)) عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان کیسرا و قەیسەر لەو ژیانەدان کەتیایان [٢] تۆش پێغەمبەری خوایت (ئەوەحاڵتە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئایا ڕازی نابیت کە ئەوان دونیایان بێ و ئێمەش دوا ڕۆژ)).

---

(١) ناوی جیبلەی کوڕ نەیهەم بوو.

(٢) واتە: لە ناز و نیعمەتان.

٣ - بابٌ: ﴿ وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِۦ وَأَظْهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُۥ وَأَعْرَضَ عَنۢ بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتْ مَنْ أَنۢبَأَكَ هَٰذَا قَالَ نَبَّأَنِىَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿٣﴾ ﴾ التحريم

فِيهِ: عَائِشَةُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

## ٣ - باسێک

## (کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ بە نهێنی لای هەندێ لەژنەکانی قسەیەکی درکاند، ئینجا ئەو (ژنە) قسەکەی کرد (بۆ هەوێکەی) خواش پێغەمبەری ﷺ ئاگادار کرد، (پێغەمبەر ﷺ) هەندێک (لەقسەکانی)ـی باسکرد و بێ دەنگ بوو لەهەندێکی تری، ئینجا کەپێی وت (ژنەکە) وتی: کێ ئەمەی پێ گەیاندنی فەرمووی خوای زانای ئاگادار پێی گەیاندم)

**-لەم باسەدا فەرموودەیە هەیە، عائیشە ﵂ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە [2].**

٤٩١٤ - حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عُبَيْدَ بْنَ حُنَيْنٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﵄ يَقُولُ: أَرَدْتُ أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ مَنِ الْمَرْأَتَانِ اللَّتَانِ تَظَاهَرَتَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَمَا أَتْمَمْتُ كَلاَمِي حَتَّى قَالَ عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ[3].

---

(١) بڕوانە: ٤٩١٢.

**(٢) کەفەرموودەی (٤٩١٢) صەحیحی بوخاری یە.**

(٣) بڕوانە: ٨٩.

**٤٩١٤ -ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ویستم کە پرسیار لە عومەر ﷺ بکەم جا وتم: ئەی پێشەوای باوەڕداران ئەو دوو ژنە کێ بوون کە پشتی یەکتریان گرت لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ ئینجا من قسەکەم تەواو نەکرد تا وتی: عائیشە و حەفصە بوون ﷺ.**

## ٤ - بابٌ: ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ﴿٤﴾ ﴾ التحريم

صَغَوْتُ وَأَصْغَيْتُ: مِلْتُ، ﴿ وَلِتَصْغَىٰٓ ﴿١١٣﴾ ﴾ الأنعام: لِتَمِيل.

## ﴿ وَإِن تَظَـٰهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوْلَىٰهُ وَجِبْرِيلُ وَصَـٰلِحُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ﴿٤﴾ ﴾ التحريم

﴿ ظَهِيرٌ ﴿٤﴾ ﴾ التحريم: عَوْنٌ. ﴿ تَظَـٰهَرُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾ البقرة: تَعَاوَنُونَ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ ﴿٦﴾ ﴾ التحريم:: أَوْصُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ بِتَقْوى اللَّهِ وَأَدِّبُوهُمْ.

## ٤ - باسێک: ((ئەی حەفصە و عائیشە) ئەگەر هەردووکتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای خودا (جێی خۆیەتی)، چونکە بەڕاستی دڵتان لایدا (لە حەق و ڕاستی)

(صَغَوْتُ) وە (أَصْغَيْتُ): **لامداوە.** ﴿ وَلِتَصْغَىٰٓ ﴿١١٣﴾ ﴾ الأنعام: **تا لابدا.**

**(وە ئەگەر پشتی یەکتر بگرن دژی پێغەمبەر ﷺ (سەرکەوتوو نابن)، چونکە بێگومان خوا پشگیری ئەوە و هەروەها جیبریل وئیمانداره چاکەکانیش، دوای ئەوان فریشتەکانیش پشتیوانی ئەون)، ﴿ظَهِيرٌ﴾: پشتیوان.**

**﴿تَظَاهَرُونَ﴾: پشتیوان وهاوکاری یەکتری دەبن.**

**موجاهید دەڵێ:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ ۝٦﴾ التحريم: **ئامۆژگاری خۆتان و کەس و کارتان بکەن بە پارێزگاری وە ئەدەبیان دادەن.**

٤٩١٥ - حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عُبَيْدَ بْنَ حُنَيْنٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ: أَرَدْتُ أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ عَنِ الْمَرْأَتَيْنِ اللَّتَيْنِ تَظَاهَرَتَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَمَكُثْتُ سَنَةً فَلَمْ أَجِدْ لَهُ مَوْضِعًا، حَتَّى خَرَجْتُ مَعَهُ حَاجًّا، فَلَمَّا كُنَّا بِظَهْرَانَ ذَهَبَ عُمَرُ لِحَاجَتِهِ فَقَالَ: أَدْرِكْنِي بِالْوَضُوءِ فَأَدْرَكْتُهُ بِالإِدَاوَةِ، فَجَعَلْتُ أَسْكُبُ عَلَيْهِ وَرَأَيْتُ مَوْضِعًا فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، مَنِ الْمَرْأَتَانِ اللَّتَانِ تَظَاهَرَتَا؟ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَمَا أَتْمَمْتُ كَلَامِي حَتَّى قَالَ عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ[1].

**٤٩١٥ - ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: ویستم پرسیار بکەم لە عومەر رضي الله عنه دەربارەی ئەو دوو ژنەی پشتی یەکتریان گرت لەدژی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا ساڵێك مامەوە شوێنێکی گونجاوم بۆ نەدۆزییەوە هەتا لەگەڵیدا ڕۆشتم بۆ حەج، جا کاتێ لە زەهران بووین عومەر رضي الله عنه ڕۆشت بۆ دەست بە ئاو گەیاندن و وتی: ئاوی دەستنوێژم بۆ بێنە، منیش لە جەوەنەیەکی بچووکدا بۆم برد، ئەنجا دەستم کرد بەئاو کردن بە دەستیان و شوێنێکی (گونجاوم بۆ پرسیارەکەم) بینی وتم:**

(١) بروانە: ٨٩.

ئەی پێشەوای باوەڕداران ئەو دوو ئافرەتە کێ بوو کە پشتی یەکتریان گرت (لە دژی پێغەمبەر ﷺ)؟ ئیبنو عەبباس وتی: جا وتەکەم تەواو نەکرد تا وتی: عائیشە و حەفصە بوون.

٥ - بابٌ: ﴿ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَٰتٍ مُّؤْمِنَٰتٍ قَٰنِتَٰتٍ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٍ سَٰٓئِحَٰتٍ ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا ﴿٥﴾ ﴾ التحريم

٤٩١٦ - حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ: اجْتَمَعَ نِسَاءُ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْغَيْرَةِ عَلَيْهِ فَقُلْتُ لَهُنَّ: عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبَدِّلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ. فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ[1].

## ٥ - باسێک: (دڵنیابن ئەگەر ئێوە تەڵاق بدات پەروەردگاری لە باتی ئێوە ژنانێکی باشتر لە ئێوەی دەداتێ، مسوڵمانانی بڕواداراني نزاکارانی، تەوبەکارانی، خواپەرەستانی ڕۆژووگرانی لەبێوەژنان و کیژان)

٤٩١٦ -ئەنەس ﷺ وتی: عومەر ﷺ وتی: هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ لەبەر هەوێ کێشانی یەکتری کۆبوونەوەیان لە دژی پێغەمبەر ﷺ کرد، منیش پێم وتن: دڵنیابن ئەگەر (پێغەمبەر ﷺ) ئێوە تەڵاق بدات پەروەردگاری لە باتی ئێوە هاوسەرانی باشتر لە ئێوە دەداتێ، بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ . . . . . ﴾.

(١) بڕوانە: ٤٠٢.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ٦٧ - سورة ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ ۝١﴾ الملك

التَّفَاوُتُ: الاخْتِلاَفُ، وَالتَّفَاوُتُ وَالتَّفَوُّتُ وَاحِدٌ. ﴿تَمَيَّزُ ۝٨﴾ الملك: تَقَطَّعُ، ﴿مَنَاكِبِهَا ۝١٥﴾ الملك: جَوَانِبِهَا. ﴿تَدَّعُونَ ۝٢٧﴾ الملك: (وَتَدْعُونَ) مِثْلُ تَذَّكَّرُونَ وَتَذْكُرُونَ. ﴿وَيَقْبِضْنَ ۝١٩﴾ الملك: يَضْرِبْنَ بِأَجْنِحَتِهِنَّ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿صَٰٓفَّٰتٍ ۝١٩﴾ الملك: بَسْطُ أَجْنِحَتِهِنَّ، ﴿وَنُفُورٍ ۝٢١﴾ الملك: الكُفُورُ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٦٧ - (تەفسیری) سورەتی ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ ۝١﴾ الملك[1].

**(التَّفَاوُتُ): ناڕێکی، جیاوازی، (التَّفَاوُتُ) لەگەڵ (التَّفَوُّتُ)[2] یەك شتن. ﴿تَمَيَّزُ﴾ الملك: پارە پارە ببێ. ﴿مَنَاكِبِهَا﴾[3]: قەراغ و لاشانیدا، ئەملا و لای زەوی.**

**﴿تَدَّعُونَ﴾ و (تَدْعُونَ)[4] یەك مانان (واتە: داواتان دەكرد)، وەك (تَذَّكَّرُونَ) و (تَذْكُرُونَ). وە ﴿وَيَقْبِضْنَ﴾: باڵیان دەدەن بەیەكدا.**

**موجاهید دەڵێ: ﴿صَٰٓفَّٰتٍ﴾: كراوەیی باڵەكانیانە. ﴿وَنُفُورٍ ۝٢١﴾: دووركەوتنەوە لەڕێبازی ڕاست (ڕاكردن لە هەق).**

---

(١) سورەتی مولك.

(٢) (تفوت) خوێندنەوەی حەمزە و كیسائی یە.

(٣) (مناكب) كۆی (منكب) واتە: شان.

(٤) یەعقوب كە یەكێكە لە قورئان خوێنەكان بە (وَتَدْعُونَ) خوێندویەتیەوە، بەلام نۆ قورئان خوێنەكەی تر بە (تَدَّعُونَ) خوێندوویانەتەوە. بڕوانە ؛ إرشاد الساری:١١/١٦٨.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٦٨ - سورة ﴿نٓ وَٱلْقَلَمِ﴾

وَقَالَ قَتَادَةُ: ﴿حَرْدٍ (٢٥)﴾ القلم: جِدٌّ فِي أَنْفُسِهِمْ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿يَتَخَٰفَتُونَ (٢٣)﴾ القلم: يَنتَجون السِّرارَ والكَلامَ الخفيَّ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿لَضَآلُّونَ (٢٦)﴾ القلم: أَضْلَلْنَا مَكَانَ جَنَّتِنَا. وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿كَٱلصَّرِيمِ (٢٠)﴾ القلم: كَالصُّبْحِ انْصَرَمَ مِنَ اللَّيْلِ، وَاللَّيْلِ انْصَرَمَ مِنَ النَّهَارِ، وَهْوَ أَيْضًا كُلُّ رَمْلَةٍ انْصَرَمَتْ مِنْ مُعْظَمِ الرَّمْلِ، وَالصَّرِيمُ أَيْضًا المَصْرُومُ، مِثْلُ قَتِيلٍ وَمَقْتُولٍ.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٦٨ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿نٓ وَٱلْقَلَمِ﴾ [١]

**قەتادە دەڵێ: ﴿حَرْدٍ﴾: بە لێبڕاوی لەناخ و دەروونی خۆیاندا (بێ بەش کردن). ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿يَتَخَٰفَتُونَ﴾: بەچرپە بە یەکتریان ئەووت، قسەی پەنهانیان دەکرد. ئیبنو عەبباس ﷺ وتی: ﴿لَضَآلُّونَ﴾: شوێنی باخەکانمان ون کردووە. غەیری ئیبنو عەبباس دەڵێ: ﴿كَٱلصَّرِيمِ﴾[٢]: وەك ڕوناکی بەیانی لە شەوی جیا بووبێتەوە، وەك شەو لەرۆژ جیابووبێتەوە، هەروەها لمێکە لە**

---

(١) ناوی سوڕەتی قەلەمە.

(٢) وەك باغێکی ڕنراوی لێ هات.

بەشێکی گەورە و زۆر لەکە جیا بووبێتەوە، وە (الصَّرِيمُ) (الْمَصْرُومُ)ـە واتە: باخی ڕنراو، وەك چۆن (قَتِيل) (مَقْتُول)ـە [1] بەمانای کوژراو دێت.

## ١ - بابٌ: ﴿ عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ ﴾ القلم

٤٩١٧ - حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ مُجَاهِدٌ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ ﴿ عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ ﴾ القلم: قَالَ: رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ لَهُ زَنَمَةٌ مِثْلُ زَنَمَةِ الشَّاةِ.

## ١ - باسێک: (دڵ ڕەقی کەللە شەق دوای ئەوەش زۆڵ)

**٤٩١٧ -موجاهید لە ئیبنو عەبباسەوە ﵄ دەگێڕێتەوە، دەربارەی ئەم ئایەتە (دڵ ڕەقی کەللە شەق دوا ئەوە زۆڵ) دەڵێ: پیاوێکە لە قورەیش زیادە گۆشتێ بە گوێیەوە شۆڕبۆتەوە وەکو مەڕێك گوێی بڕابێ و شۆڕ بووبێتەوە و لێی نەبووبێتەوە.**

٤٩١٨ - حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَعْبَدِ بْنِ خَالِد، قَالَ: سَمِعْتُ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ الْخُزَاعِيَّ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُول: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ الْجَنَّةِ؟ كُلُّ ضَعِيفٍ مُتَضَعِّفٍ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ، أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ النَّارِ؟ كُلُّ عُتُلٍّ جَوَّاظٍ مُسْتَكْبِرٍ»[2].

**٤٩١٨ - حاریسەی کوڕی وەهبی خوزاعی ﵁ دەڵێ:لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئایا هەواڵتان پێبدەم کێ بەهەشتییە؟ هەموو لاوازێکی خۆ بە بەکەم زان (خەڵك بەکەم زانی بەلاواز زان) ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات**

(١) واتە، (قتيل) بەمانای (مقتول) دێ واتە كوژراو.

(٢) بڕوانە: ٦٠٧١، ٦٦٥٧.

بۆی دێنێته جێ (سوێندەکەی ناخات)، ئایا هەواڵتان پێبدەم کێ دۆزەخییه؟ هەموو دڵ ڕەقێکی کەللە شەقی قەڵەوی بەفیزی خۆ بەزل زانێك)).

## ٢ - بابٌ: ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ ﴿٤٢﴾﴾ القلم

٤٩١٩ - حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ خَالِدِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِلاَلٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «يَكْشِفُ رَبُّنَا عَنْ سَاقِهِ فَيَسْجُدُ لَهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ وَمُؤْمِنَةٍ، وَيَبْقَى مَنْ كَانَ يَسْجُدُ فِي الدُّنْيَا رِئَاءً وَسُمْعَةً، فَيَذْهَبُ لِيَسْجُدَ فَيَعُودُ ظَهْرُهُ طَبَقًا وَاحِدًا»[١].

## ٢ - باسێک: (ڕۆژێ لاق دەردەخرێ)

٤٩١٩ ـ ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((پەروەردگارمان لاقی خۆی دەردەخات، ئەوسا هەموو باوەڕدارێکی پیاو و ئافرەت سوژدەی بۆ دەبەن، وە ئەوانە دەمێننەوە کەپێشتر لە دونیادا بۆ بەرچاویی و ڕووپامایی سوژدەیان دەبرد، ئەوسا دەیەوێ سوژدە ببات، ئەنجا پشتیان دەبێت یەك پارچە تەختە)).

(١) بروانه: ٢٢.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٦٩ - سورة الحَاقَّة

﴿ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٢١﴾ ﴾ الحاقة: يُرِيدُ فِيهَا الرِّضَا.﴿ ٱلْقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الحاقة: المَوْتَةَ الأُولَى التِي مُتُّهَا ثُمَّ أُحْيَا بَعْدَهَا. ﴿ مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الحاقة: أَحَدٌ يَكُونُ لِلْجَمْعِ وَلِلْوَاحِدِ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾ الحاقة: نِيَاطُ القَلْبِ. قَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ طَغَا ﴿١١﴾ ﴾ الحاقة: كَثُرَ، وَيُقَالُ: ﴿ بِٱلطَّاغِيَةِ ﴿٥﴾ ﴾ الحاقة: بِطُغْيَانِهِمْ، وَيُقَالُ: طَغَتْ عَلَى الخَزَّانِ. كَمَا طَغَى المَاءُ على قَوْمِ نُوحٍ.﴿ أَعْجَازُ نَخْلٍ ﴿٧﴾ ﴾ الحاقة: أُصُولُهَا.﴿ بَاقِيَةٍ ﴿٨﴾ ﴾ الحاقة: بَقِيَّةٍ.

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٦٩ - (تەفسیری) سوڕەتی حاقة

**- (ئیبنو جوبەیر دەڵێ): ﴿ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴾: مەبەستی ژیانێکە ڕەزامەندی تیایە (بۆ کەسە بەهەشتیەکە). ﴿ ٱلْقَاضِيَةَ ﴾: مردنەکەی یەکەم جار کە مردم لە پاشان دوای ئەوە زیندوو دەکرێمەوە. ﴿ مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴾: وشەی: (أَحَدٌ) بۆ کۆ و بۆ تاك بەکار دێت. ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: ﴿ ٱلْوَتِينَ ﴾: شادەماری دڵ. ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: ﴿ طَغَا ﴾: زۆر بوو (توغیانی کرد) وە دەوترێت ﴿ بِٱلطَّاغِيَةِ ﴾: بەهۆی سەرکەشیانەوە، بەنەفرەتیەکی زۆر گەورە (بەسزایەکی سەرکەش)، وە دەوترێت: (طَغَتْ عَلَى الخَزَّانِ): بایەکە لە دەست**

سەرپەرەشتیارانی دەرچوو. (كَمَا طَغَى المَاءُ على قَوْمِ نُوحٍ) هەرچۆنێك ئاوەكەی بەسەر گەلی نووحدا ﷺ هات لە دەست دەرچوو بوو. ﴿أَعْجَازُ نَخْلٍ﴾: قەدی دار خورماكان. ﴿بَاقِيَةٍ﴾: پاشماوە و شوێنەوار.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٧٠ - سورة ﴿سَأَلَ سَآئِلٌ﴾

الْفَصِيلَةُ أَصغَرُ آبَائِهِ، القُرْبَى إِلَيْهِ يَنْتَمِي مَنِ انْتَمَى. ﴿لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾﴾ المعارج: اليَدَانِ وَالرِّجْلاَنِ وَالأَطْرَافُ وَجِلْدَةُ الرَّأْسِ يُقَالُ لَهَا: شَوَاةٌ، وَمَا كَانَ غَيْرَ مَقْتَلٍ فَهُوَ شَوى،﴿عِزِينَ ﴿٣٧﴾﴾ المعارج: وَالْعِزُونَ: الجَمَاعَاتُ، وَوَاحِدُهَا عِزَةٌ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٧٠ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿سَأَلَ سَآئِلٌ﴾ [(١)]

(الْفَصِيلَةُ) خێڵ (هۆز) لەسەری باو باپیرانیەوە، بۆلای ئەو پاڵ دەدات ئەوەی خۆی پاڵ دەدات.

﴿لِّلشَّوَىٰ﴾: هەردوو دەست و هەردوو قاچ و پەنجەكان[(٢)] و پێستی سەر پێیان دەوترێ (شَوَاةٌ)، وە هەر (ئەندامێك یان كارێك) كوشندە نەبێت ئەو (شَوى)ـی پێ دەوترێت.

﴿عِزِينَ﴾: و (العِزون):كۆمەڵ كۆمەڵ و دەستە دەستە. (عِزِين) كۆیە تاكەكەی (عِزَةٌ)ـە.

---

(١) ناونیشانی سوڕەتی مەعاریجە.

(٢) بە چاوەكانیش دەوترێت (اطراف).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ٧١ - سورة: ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَا ﴾

﴿ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ ﴾ نوح: طَوْرًا كَذَا وَطَوْرًا كَذَا، يُقَالُ: عَدَا طَوْرَهُ. أَيْ قَدْرَهُ، وَالْكُبَّارُ أَشَدُّ مِنَ الكُبَارِ، وَكَذَلِكَ جُمَّالٌ وَجَمِيلٌ، لأَنَّهَا أَشَدُّ مُبَالَغَةً، وَكُبَّارٌ الكَبِيرُ، وَكُبَارًا أَيْضًا بِالتَّخْفِيفِ، وَالْعَرَبُ تَقُولُ: رَجُلٌ حُسَّانٌ وَجُمَّالٌ وَحُسَانٌ مُخَفَّفٌ وَجُمَالٌ مُخَفَّفٌ. ﴿ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ ﴾ نوح: مِنْ دَوْرٍ وَلَكِنَّهُ فَيْعَالٌ مِنَ الدَّوَرَانِ كَمَا قَرَأَ عُمَرُ: (الْحَيُّ القَيَّامُ). وَهْيَ مِنْ قُمْتُ. وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿ دَيَّارًا ﴾: أَحَدًا. ﴿ تَبَارًا ﴿٢٨﴾ ﴾ نوح: هَلاَكًا. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ ﴾ نوح: يَتْبَعُ بَعْضُهَا بَعْضًا. ﴿ وَقَارًا ﴿١٣﴾ ﴾ نوح: عَظَمَةً.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٧١ - (تەفسیری) سوڕەتی: ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَا ﴾[1]

**﴿ أَطْوَارًا ﴾: قۆناغی ئەوە و قۆناغی ئەوە، دەوترێ (عَدَا طَوْرَهُ):لە ئەندازەی خۆی تێپەڕی (الْكُبَّارُ) (لە ڕووی ماناوە) بە هێزتر لە((الكُبَارِ)، هەروەها (جُمَّالٌ) بەهێزترە لە (جَمِيلٌ)، چونكە وشەی یەكەمیان ماناكەی زیاتر بەهێزە لە وشەی دووهەمیان، وە (كُبَّارٌ) و (كُبَارٌ) واتە: گەورە، عەرەبیش دەڵێ: (رَجُلٌ حُسَّانٌ وَجُمَّالٌ) وە دەڵێن: (رَجُلٌ حُسَانٌ وجُمَالٌ)** [2]

---

(١) ناوی سوڕەتی نووحە ﷺ.

(٢) مەبەستی ئەوەی بەو شێوە یەش عەرەب بەكاری دێنێ كە وشەكەی پیتی دووەم دووبارە بووبێتەوە یان دووبارە نەبووبێتەوە یەك مانای دەبێ جیاوازیان نییە لە مانادا.

-﴿ دَيَّارًا ﴾: لە (دَوْر)ـەوە هاتووە،بەڵام لەسەر كێشی (فَيْعَالٌ)ـە[1] چاوگەكەی (الدَّوَرَانِ)ـە، وەك چۆن عومەر ﷺ (الحيّ القيّوم) بە (الْحَيُّ الْقَيَّامُ)ـی[2] خوێندۆتەوە كە لە (قُمْتُ)ـە هاتووە،

كەسێكی تر دەڵێ: ﴿ دَيَّارًا ﴾: یەك كەس. ﴿ تَبَارًا ﴾: لە ناوچوون.

-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ مِّدْرَارًا ﴾: پەیتا پەیتا هەندێكی بە شوێن هەندێكیدا دەبارێ. ﴿ وَقَارًا ﴾: شكۆ و گەورەیی.

## ١ - بابٌ: ﴿ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ ﴿٢٣﴾ ﴾ نوح

٤٩٢٠ - حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ وَقَالَ: عَطَاءٌ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ صَارَتِ الأَوْثَانُ الَّتِي كَانَتْ فِي قَوْمِ نُوحٍ فِي الْعَرَبِ بَعْدُ، أَمَّا وُدٌّ كَانَتْ لِكَلْبٍ بِدَوْمَةِ الْجَنْدَلِ، وَأَمَّا سُوَاعٌ كَانَتْ لِهُذَيْلٍ، وَأَمَّا يَغُوثُ فَكَانَتْ لِمُرَادٍ ثُمَّ لِبَنِي غُطَيْفٍ بِالْجُرُفِ عِنْدَ سَبَا، وَأَمَّا يَعُوقُ فَكَانَتْ لِهَمْدَانَ، وَأَمَّا نَسْرٌ فَكَانَتْ لِحِمْيَرَ، لآلِ ذِي الْكَلاَعِ. أَسْمَاءُ رِجَالٍ صَالِحِينَ مِنْ قَوْمِ نُوحٍ، فَلَمَّا هَلَكُوا أَوْحَى الشَّيْطَانُ إِلَى قَوْمِهِمْ أَنِ انْصِبُوا إِلَى مَجَالِسِهِمُ الَّتِي كَانُوا يَجْلِسُونَ أَنْصَابًا، وَسَمُّوهَا بِأَسْمَائِهِمْ فَفَعَلُوا فَلَمْ تُعْبَدْ حَتَّى إِذَا هَلَكَ أُولَئِكَ وَتَنَسَّخَ الْعِلْمُ عُبِدَتْ.

---

(١) ئەسڵەكەی (دیوار) بووە، واوەكەی گۆڕاوە بە یا و پاشان یایی یەكەم تێهەڵكێش بووە لە یای دووەمدا بووەتە دیارا.

(٢) ئەم خوێندنەوەیە خوێندنەوەیەكی شازە.

## ١ - باسێک: ( (دەست هەڵنەگرن لە پەرستنی) وەدد و سواع و یەغووس و یەعوق)

**٤٩٢٠ -ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئەو بتانەی کە لە ناو گەلی نووح ﷺ دا هەبوون کە دواتر هاتە ناو عەرەبەکان، جا سەبارەت بە بتی (وُدّ) ئەوە هی هۆزی کەلب بوو لە (دَوْمَةِ الْجَنْدَل) وە (سواع) هی هوزەیل بوو، (يَغُوث)یش هی هۆزی موراد بوو، لە پاشان بەنی غوتەیف بوو لە جەوف لای (سَبَأ) بەڵام (يَعُوق) بتی هەمەدان بوو، (نَسْر)یش بتی حیمیە بوو هی (آلِ ذِي الْكَلاَعِ) بوو. (ئەم بتانە) ناوی چەند پیاوێکی ساڵح بوون لە گەلی نووح ﷺ، جاکاتی مردن شەیتان خستیە دڵی گەلەکەیان کە لەو شوێن و جێگایانەدا کە ئەوان دادەنیشتن چەند پێکەرێکیان بۆ دانێن، وە بەناویانەوە پەیکەرەکان بنێن گەلەکەش ئەو کارەیان کرد، ئەو کاتە نەپەرستران هەتا ئەو کەسانە (ی پەیکەرەکانیان دانا) مردن، زانیاری دەربارەیان گۆڕا ئیتر پەرستران.**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ٧٢ - سورة ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ﴾

قَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿لِبَدًا ﴿١٩﴾﴾ الجن: أَعْوَانًا.

### ١ - بابٌ

٤٩٢١ - حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: انْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي طَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ،

وَقَدْ حِيلَ بَيْنَ الشَّيَاطِينِ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْهِمُ الشُّهُبُ فَرَجَعَتِ الشَّيَاطِينُ، فَقَالُوا: مَا لَكُمْ؟ فَقَالُوا: حِيلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ وَأُرْسِلَتْ عَلَيْنَا الشُّهُبُ. قَالَ: مَا حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ إِلاَّ مَا حَدَثَ، فَاضْرِبُوا مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا فَانْظُرُوا مَا هَذَا الأَمْرُ الَّذِي حَدَثَ. فَانْطَلَقُوا فَضَرَبُوا مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا يَنْظُرُونَ مَا هَذَا الأَمْرُ الَّذِي حَالَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ. قَالَ فَانْطَلَقَ الَّذِينَ تَوَجَّهُوا نَحْوَ تِهَامَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِنَخْلَةَ، وَهْوَ عَامِدٌ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ، وَهْوَ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ صَلاَةَ الْفَجْرِ، فَلَمَّا سَمِعُوا الْقُرْآنَ تَسَمَّعُوا لَهُ فَقَالُوا: هَذَا الَّذِي حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ. فَهُنَالِكَ رَجَعُوا إِلَى قَوْمِهِمْ فَقَالُوا: يَا قَوْمَنَا ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ۝١ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ۝٢﴾ الجن: وَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ عَلَى نَبِيِّهِ ﷺ: ﴿قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ ۝١﴾ الجن:. وَإِنَّمَا أُوحِيَ إِلَيْهِ قَوْلُ الْجِنِّ[1].

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٧٢ - (تەفسیری) سورەتی ﴿قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ﴾[2]

**ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿لِبَدًا﴾ واتە: پشتیوان وهاوکاران[3].**

## ١ - باسێک

**٤٩٢١ - عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانیدا ڕۆشت بەنیازی بازاڕی عوکاز بوون، لەوکاتەدا شەیتانەکان بەرگری**

(١) بڕوانە: ٧٧٣.

(٢) بە سورەتی جینن بەناوبانگە و لە قورئاندا بەو ناوەوە نووسراوە.

(٣) کۆی (لِبْدَة) کۆماکراو، تێك ئاڵاو لە ئایەتەکەدا ماناکە مەجازییە بە مانای:دەستە و تاقمی بەسەریەکدا کەوتوون.

کرابوون لەزانینی هەواڵی ئاسمان، (ئەگەر بڕۆشتنایە) چڵۆسکی ئاگرینیان بۆ دەهاوێژرا، بۆیە جنۆکەکان گەڕانەوە (بۆلای هۆزەکەیان) پێیان وتن: ئەوە چیتانە؟ ئەوانیش وتیان: بەربەستێك لە نێوان ئێمە و هەواڵی ئاسماندا دروست کراوە، چڵۆسکی ئاگرینمان بۆ دەهاوێژرێ! (ئیبلیس) وتی: دەی کەواتە شتێك ڕوویداوە کە ڕێگری دەکات لەوەی ئێوە هەواڵی ئاسمان بزانن، دەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی بگەڕێن وسەرنج بدەن بزانن چ شتێك لە نێوان ئێوە و هەواڵی ئاسماندا دروست بووە، دەڵێ: جا ئەو کۆمەڵە جنۆکەی ڕووە و تیهامە ڕۆشتبوون چوون بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، لەکاتێکدا کە لە نەخڵەدا بوو، پێغەمبەر ﷺ بەنیازی بازاڕی عوکاز بوو، لەو کاتەدا پێشنوێژی نوێژی بەیانی بۆهاوەڵانی دەکرد، جا کاتێ جنۆکەکان گوێیان لە قورئان خوێندنەکەی بوو بەجوانی گوێیان بۆ شل کرد، وتیان: سوێند بەخوا ئا ئەمەیە ڕێگری نێوان ئێوە و زانینی هەواڵی ئاسمان، ئەنجا لەو کاتەدا گەڕانەوە بۆلای هۆزەکەیان وتیان: ئەی هۆزەکەمان (بەڕاستی ئێمە قورئانێکی سەر سوڕهێنەرمان گوێ لێ بوو ڕێنموونی دەکات بۆ ڕێی ڕاست، بۆیە ئێمەش باوەڕمان پێ هێنا، وە هەرگیز کەس ناکەین بەهاوبەشی پەروەردگارمان)، جا ئیتر خوا ﷻ ﴿ قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ ﴿١﴾ ﴾ دابەزاند بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە بێگومان خوا وتەی جنۆکەکانی بەقورئان بۆ دابەزاند.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٧٣ - سورة المُزَّمِّل

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ تَبۡتِيلٗا ﴾ المزمل: أَخْلِصْ. وَقَالَ الحَسَنُ ﴿ أَنكَالٗا ﴾ المزمل: قُيُودًا. ﴿ مُنفَطِرُۢ بِهِۦ ﴾ المزمل: مُثْقَلَةٌ بِهِ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ كَثِيبٗا مَّهِيلًا ﴾ المزمل:، الرَّمْلُ السَّائِلُ. ﴿ وَبِيلٗا ﴾ المزمل: شَدِيدًا.

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٧٣ - (تەفسیری) سوڕەتی: موززەممیل

موجاهید دەڵێ: ﴿ تَبۡتِيلٗا ﴾ المزمل: دڵسۆز بە، یەکلابەرەوە (بۆ خوا و بەندایەتی ئەو). حەسەن دەڵێ: ﴿ أَنكَالٗا ﴾ المزمل: کۆت و زنجیری قورس. ﴿ مُنفَطِرُۢ بِهِۦ ﴾: (ئاسمان) پێی قورس دەبێ [1]. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ كَثِيبٗا مَّهِيلًا ﴾: لمی هەڵڕژاو. ﴿ وَبِيلٗا ﴾: سەخت.

(١) ئاسمان بەهۆی سەختی ئەو ڕۆژە لەت لەت دەبێ.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٧٤ - سورة المُدَّثِّر

قَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿عَسِيرٌ ۝٩﴾ المدثر: شَدِيد. ﴿قَسْوَرَةٍ ۝٥١﴾ المدثر: رِكْزُ النَّاسِ وَأَصْوَاتُهُمْ. وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: الأَسَدُ وَكُلُّ شَدِيدٍ قَسْوَرَةٌ. الرِّكز: الصوت. ﴿مُّسْتَنفِرَةٌ ۝٥٠﴾ المدثر: نَافِرَةٌ مَذْعُورَةٌ.

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٧٤ - (تەفسیری) سوڕەتی موددەسیر

**ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: ﴿عَسِيرٌ﴾: سەخت و گران. ﴿قَسْوَرَةٍ﴾: نووزەی خەڵك و دەنگیان. وە ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێ:** (القسورة)**: شێرە، وە هەموو بەهێزێك قەسوەرەیە.** (الرِّكزُ)**: دەنگی (نووزەیە).** ﴿مُّسْتَنفِرَةٌ﴾**: سڵكەری تۆقاو.**

## ١ - بابٌ

٤٩٢٢ - حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ: سَأَلْتُ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أَوَّلِ مَا نَزَلَ مِنَ الْقُرْآنِ، قَالَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١﴾ المدثر، قُلْتُ: يَقُولُونَ: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۝١﴾ العلق، فَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ

عَبْدِ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ وَقُلْتُ لَهُ مِثْلَ الَّذِي قُلْتَ، فَقَالَ جَابِر: لاَ أُحَدِّثُكَ إِلاَّ مَا حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺقَالَ: «جَاوَرْتُ بِحِرَاءٍ، فَلَمَّا قَضَيْتُ جِوَارِي هَبَطْتُ، فَنُودِيتُ، فَنَظَرْتُ عَنْ يَمِينِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، وَنَظَرْتُ عَنْ شِمَالِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، وَنَظَرْتُ أَمَامِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، وَنَظَرْتُ خَلْفِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَرَأَيْتُ شَيْئًا، فَأَتَيْتُ خَدِيجَةَ فَقُلْتُ دَثِّرُونِي وَصُبُّوا عَلَيَّ مَاءً بَارِدًا -قَالَ: - فَدَثَّرُونِي وَصَبُّوا عَلَيَّ مَاءً بَارِدًا قَالَ فَنَزَلَتْ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ ﴾ المدثر:[1].

## ١ - باسێک

**٤٩٢٢ -یەحیای کوڕی ئەبی کەسیر دەڵێ: پرسیارم لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان کرد، دەربارەی یەکەم (سوڕەت) لەقورئان دابەزی؟ وتی (سوڕەتی) ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴾: بوو وتم: دەڵێن (سوڕەتی) ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴾: بووە، ئەبو سەلەمەش وتی: پرسیارم لە جابیر کوڕی عەبدوڵلا ﷺ کرد لەو بارەیەوە، وە ئەوەی پێشتر وتم بەویشم وتەوە، جابریش وتی: هیچت بۆناگێڕمەوە ئەوە نەبێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی گێڕاینەوە فەرمووی: ((لە (غاری) حیڕا ئیعتیکافم کرد، جا کە ئیعتیکافەکەم تەواو کرد (لە شاخەکە) دابەزیمە خوارەوە، ئینجا بانگ کرام، سەیری لای ڕاستی خۆم کرد هیچم نەدی وە سەیری لای چەپی خۆم کرد و هیچم نەدی، وە سەیری پێشەوەی خۆم کرد و هیچم نەدی، سەیری پشتەوەی خۆم کرد و هیچم نەدی، ئینجا هاتمەوە بۆ لای خەدیجە ﷺ وتم: دامپۆشن و ئاوێکی ساردم پیاکەن))، فەرمووی: ((جا دایان پۆشیم و ئاوێکی ساردیان پیا کردم)) وتی: بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی (ئەی ئەو کەسەی کە خۆت پێچاوەتەوە هەستە (خەڵك) بێدارکەرەوە، وە پەروەردگارت بە گەورە بگرە).**

---

(١) بڕوانە: ٤.

## ٢ - بابٌ: قَوْلُهُ: ﴿ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢ ﴾ المدثر

٤٩٢٣ - حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ وَغَيْرُهُ قَالاَ: حَدَّثَنَا حَرْبُ بْنُ شَدَّادٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺقَالَ: «جَاوَرْتُ بِحِرَاءٍ». مِثْلَ حَدِيثِ عُثْمَانَ بْنِ عُمَرَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الْمُبَارَكِ[1].

## ٢ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (هەستە (خەڵکی) بێدار کەرەوە)

**٤٩٢٣ -ئەبو سەلەمە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: (لە (غاری) حیڕا ئیعتیکافم کرد)). -بەوێنەی فەرموودەکەی عوسمانی کوڕی عومەرە کە لە عەلی کوڕی موبارەکەوە گێڕاویەتیەوە.**

## ٣ - بابُ قَوْلِهِ: ﴿ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ۝٣ ﴾ المدثر

٤٩٢٤ - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ، حَدَّثَنَا حَرْبٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى قَالَ سَأَلْتُ أَبَا سَلَمَةَ: أَيُّ الْقُرْآنِ أُنْزِلَ أَوَّلُ؟ فَقَالَ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ ﴾ المدثر:. فَقُلْتُ: أُنْبِئْتُ أَنَّهُ: ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۝١ ﴾ العلق:. فَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ: أَيُّ الْقُرْآنِ أُنْزِلَ أَوَّلُ؟ فَقَالَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ ﴾ المدثر:. فَقُلْتُ أُنْبِئْتُ أَنَّهُ ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ

(١) بروانە: ٤.

ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ ﴾ العلق:. فَقَالَ: لاَ أُخْبِرُكَ إِلاَّ بِمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «جَاوَرْتُ فِي حِرَاءٍ فَلَمَّا قَضَيْتُ جِوَارِي، هَبَطْتُ فَاسْتَبْطَنْتُ الْوَادِيَ فَنُودِيتُ، فَنَظَرْتُ أَمَامِي وَخَلْفِي وَعَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي، فَإِذَا هُوَ جَالِسٌ عَلَى عَرْشٍ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَأَتَيْتُ خَدِيجَةَ فَقُلْتُ: دَثِّرُونِي وَصُبُّوا عَلَيَّ مَاءً بَارِدًا، وَأُنْزِلَ عَلَيَّ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ ﴾ المدثر:.»[1].

## ٣ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە پەروەردگارت بە گەورە بگرە)

**٤٩٢٤ -یەحیا دەڵێ: پرسیارم لە ئەبی سەلەمە کرد کام لە قورئان یەکەم جار دابەزێنرا؟ (ئەبو سەلەمەش) وتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴾: منیش وتم: پێم وتراوە کە یەکەم جار ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴾: دابەزیوە، ئەبو سەلەمەش وتی: پرسیارم لە جابیر کوڕی عەبدوڵڵا کرد ﷺ کام (سوڕەتی) قورئان یەکەم جار دابەزێنرا؟ ئەویش وتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴾: منیش وتم: پێم وتراوە کە ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴾: بووە، جابیریش وتی: تەنها ئەوەت بۆدەگێڕمەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (لە (غاری) حیڕا ئیعتیکافم کرد، جا کە ئیعتیکافەکەم تەواو کرد (لە شاخەکە) دابەزیمە خوارەوە گەشتمە ناو شیوەکە، ئینجا بانگم لێ کرا سەیری پێش و پاش وە (سەیری) لای ڕاست و لای چەپی خۆم کرد، جا بینیم ئەو (جیبریل ﷺ) لەسەر کورسیەك دانیشتووە لە نێوان ئاسمان و زەوی دا، ئیتر هاتمەوە بۆ لای خەدیجە و وتم: دامپۆشن وئاوێکی**

---

(١) بروانە: ٤.

سارد بکەن بەسەرمدا، وە ئەم ئایەتانەم بۆ دابەزێنرا (ئەی ئەو کەسە خۆت پێچاوەتەوە هەستە (خەڵك) بێدار کەرەوە، وە پەروەردگارت بەگەورە بگرە).

## ٤ - بابٌ: ﴿ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ ﴾ المدثر:

٤٩٢٥ - حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ. وَحَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ فَأَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهْوَ يُحَدِّثُ عَنْ فَتْرَةِ الْوَحْيِ فَقَالَ فِي حَدِيثِهِ: «فَبَيْنَا أَنَا أَمْشِي إِذْ سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا الْمَلَكُ الَّذِي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَجَئِثْتُ مِنْهُ رُعْبًا فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي. فَدَثَّرُونِي فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى:﴿ يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ ﴾ إِلَى ﴿ وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ ﴿٥﴾ ﴾ المدثر: - قَبْلَ أَنْ تُفْرَضَ الصَّلاَةُ - وَهْيَ الأَوْثَانُ»[1].

## ٤ - باسێک: (وە پۆشاکت بە پاک ڕابگرە)

**٤٩٢٥ -ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕحمان لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ:لە پێغەمبەرم ﷺ بیست کەباسی بچڕانی نیگای دەفەرموو جالە فەرموودەکەیدا فەرمووی: ((جا لە کاتێکدا من بە ڕێگادا دەڕۆشتم لە پڕ لەئاسمانەوە گوێم لە دەنگێك بوو، بۆیە سەرم بەرز کردەوە، جا دەبینم ئەو فریشتەیە کە لە (غاری) حیرا هات بۆ لام لە سەر کورسی یەك دانیشتووە لە نێوان ئاسمان و زەویدایە، منیش لێی تۆقیم[2] و گەڕامەوە (بۆ ماڵەوە) و وتم:**

(١) بڕوانە: ٤.

(٢) زۆر ترسام.

دامپۆشەن دامپۆشن، ئەوانیش دایان پۆشام، ئیتر بە هۆیەوە خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتانەی دابەزاند: (ئەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوە هەستە (خەڵك) بێدار کەرەوە، وە پەروەردگارت بە گەورە بگرە، وە پۆشات بە پاك ڕابگرە، وە واز لە بتپەرەستی بێنە)[1]، پێش ئەوەی نوێژ فەرز ببێت. (الرِّجْز) واتە: بت و پەیکەرە پەرەستراوەکان، لە پاشان (دابەزینی) نیگا زۆر بوو، وە بەردەوامیش بوو.

## ٥ - بابٌ: قَوْلُهُ: ﴿وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ۝٥﴾ المدثر: قَالَ: الرِّجْزُ والرِّجْسُ: العَذَابُ.

٤٩٢٦ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: سَمِعْتُ أَبَا سَلَمَةَ، قَالَ: أَخْبَرَنِي جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُحَدِّثُ عَنْ فَتْرَةِ الْوَحْيِ: «فَبَيْنَا أَنَا أَمْشِي سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ فَرَفَعْتُ بَصَرِي قِبَلَ السَّمَاءِ، فَإِذَا الْمَلَكُ الَّذِي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ قَاعِدٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَجَئِثْتُ مِنْهُ حَتَّى هَوَيْتُ إِلَى الأَرْضِ، فَجِئْتُ أَهْلِي فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي. زَمِّلُونِي. فَزَمَّلُونِي فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١﴾: إِلَى قَوْلِهِ: ﴿وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ۝٥﴾ المدثر:» -قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: وَالرِّجْزَ: الأَوْثَانَ - «ثُمَّ حَمِيَ الْوَحْيُ وَتَتَابَعَ»[2].

## ٥ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ( بەردەوام بە لە وازهێنان لە بت پەرستی و گوناه)

٤٩٢٦ -ئەبو سەلەمە دەڵێ: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ بۆی گێڕامەوە کە ئەو لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیست باسی پچڕانی نیگای دەکرد فەرمووی: ((جا لە کاتێکدا من بە ڕێگادا دەڕۆشتم، لە ئاسمانەوە گوێم لە دەنگێك بوو، بۆیە چاووم

(١) ئەگەر بە (الرِّجز) بخوێنرێتەوە بەڵام ئەگەر بە (الرُّجزَ) بخوێنرێتەوە ئەوە واتە: وە دەست لەگوناه هەڵبگرە.
(٢) بڕوانە: ٤.

بەرز كردەوە بۆ ئاسمان، یەكسەر ئەو فریشتەیەم بینی لە (غاری) حیرا هات بۆ لام، لەسەر كورسیەك دانیشتبوو لە نێوان ئاسمان و زەویدا، منیش زۆر لێی ترسام تا (لەترسا) كەوتمە سەر زەوی، ئینجا هاتمەوە بۆ لای خێزانم و وتم: دامپۆشن دامپۆشن، ئەوانیش دایان پۆشیم، ئیتر بەو هۆیەوە خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتانەی دابەزاند: (ئەی ئەو كەسەی خۆت پێچاوەتەوە) تا گەشتە (وە دەست هەڵبگرە)، ئەبو سەلەمە دەڵێ (والرِّجزَ) بت و پەرستراوەكانن - لە پاشان (دابەزینی) نیگا زۆر بوو.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٧٥ - سُورَةُ القِيَامَة

## ١ - بابٌ: قَوْلُهُ: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ۝١٦﴾ القيامة

وَقَالَ ابن عَبَّاس: ﴿سُدًى ۝٣٦﴾ القيامة: هَمَلًا. ﴿لِيَفْجُرَ أَمَامَهُۥ ۝٥﴾ القيامة، سَوْفَ أَتُوبُ، سَوْفَ أَعْمَلُ. ﴿لَا وَزَرَ ۝١١﴾ القيامة: لَا حِصْنَ.

٤٩٢٧ - حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ أَبِي عَائِشَةَ -وَكَانَ ثِقَةً -، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا نَزَلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ حَرَّكَ بِهِ لِسَانَهُ -وَوَصَفَ سُفْيَانُ - يُرِيدُ أَنْ يَحْفَظَهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ۝١٦﴾ القيامة:[1].

---

(١) بڕوانە: ٥.

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٧٥ - (تەفسیری) سوڕەتی قیامەت

## ١ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (زمانت مەجوڵێنە بە خوێندنەوەی سروش تا پەلی تیا بکەیت)

ـئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ سُدًى ﴾: پشت گوێ خستن، بەرەڵا کردن.﴿ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُ ۝٥ ﴾: لەداهاتوودا تەوبە دەکەم، لە داهاتوودا کاری چاك دەکەم. ﴿ لَا وَزَرَ ﴾: هیچ پەناگایەك نییە.

**٤٩٢٧ ـئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە کە نیگای بۆ دەهات بەپەلە زمانی (بە خوێندنەوە)ی نیگاکە دەجوڵاند، وە سوفیان باسی (چۆنیەتی زمان جوڵاندنەکەی) کرد، پێغەمبەر ﷺ (بەو کارە) دەیوسیت قورئانەکە لەبەرکات، ئیتر بەو هۆیەوە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند. (زمانت مەجوڵێنە بە خوێندنەوەی سرووشت تا پەلەی تیا بکەیت).**

### ٢ - بابٌ: ﴿ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْءَانَهُ ۝١٧ ﴾ القيامة

٤٩٢٨ - حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ مُوسَى بْنِ أَبِي عَائِشَةَ أَنَّهُ سَأَلَ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ ۝١٦ ﴾ القيامة. قَالَ: وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: كَانَ يُحَرِّكُ شَفَتَيْهِ إِذَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ، فَقِيلَ لَهُ: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ ۝١٦ ﴾ القيامة: - يَخْشَى أَنْ يَنْفَلِتَ مِنْهُ -﴿ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْءَانَهُ ۝١٧ ﴾ القيامة. أَنْ نَجْمَعَهُ فِي صَدْرِكَ،﴿ وَقُرْءَانَهُ ۝١٧ ﴾ القيامة: أَنْ تَقْرَأَهُ ﴿ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ ۝١٨ ﴾ القيامة: يَقُولُ: أُنْزِلَ عَلَيْهِ: ﴿ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُ ۝١٨ ﴾ ﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ ۝١٩ ﴾ القيامة: أَنْ نُبَيِّنَهُ عَلَى لِسَانِكَ[١].

---

(١) بڕوانە: ٥.

## ٢ - باسێک: (بەڕاستی[1] و بێگومان کۆکردنەوەی (قورئان) لە سنگتدا و خوێندنەوەی لەسەر ئێمەیە)

٤٩٢٨ -مووسا کوڕی ئەبی عائیشە دەگێڕێتەوە، کە ئەو پرسیار لە سەعیدی کوڕی جوبەیر کرد لەبارەی ئەم فەرموودەی خوای بەرز و بڵند: (زمانت مەجوڵێنە بە خوێندنەوەی سروشت)، (سەعید) وتی:ئیبنو عەبباس ﵄ وتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ نیگای بۆ دابەزێنرایە بەپەلە هەردوو لێوەکەی دەجوڵاند (بەخوێندنەوەی نیگاکە)، ئەنجا پێی وترا (زمانت مەجوڵێنە بە خوێندنەوەی سروشت)، (پێغەمبەر ﷺ) دەترسا لە بیری بچێت (بەڕاستی و بێگومان کۆکردنەوەی (قورئان) لەسنگتدا و خوێندنەوەی لەسەر ئێمەیە) کە کۆیکەینەوە لە سنگتدا ﴿وَقُرْءَانَهُۥ﴾، وە بیخوێنیتەوە (ئینجا کاتێ قورئانمان بۆ خوێندیتەوە) دەڵێ: ئەم ئایەتەی بۆ دابەزێنرا (تۆش شوێنی قورئان خوێندنەوەی ئەو (جیبریل ﵇) بکەوە، لە پاشان دڵنیابە ڕوون کردنەوەشی لەسەر ئێمەیە)، کە لە سەر زمانی تۆ ڕوونی بکەینەوە و دەری ببڕین.

### ٣ - بابٌ: ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾﴾ القيامة:

حلاله وحرامه،﴿جَمْعَهُۥ ﴿١٧﴾﴾ القيامة: تأليفه. قَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾﴾ القيامة: بَيَّنَّاهُ. ﴿فَٱتَّبِعْ ﴿١٨﴾﴾ القيامة: اعْمَلْ بِهِ.

---

[1] وەك بەڵێنمان داوە.

## ٣ - باسێک: (ئینجا کاتێ کە قورئانمان بۆ خوێندیتەوە (بەهۆی جیبریلەوە) تۆش شوێن خوێندنەوەی ئەو بکەوە)

**(شوێن کەوتەی) حەلاڵ و حەرامەکانی بە ﴿ جَمْعَهُۥ ﴾: کۆکردنەوەی قورئان (لەسنگتدا).**

**ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ القيامة: قورئانمان خوێندەوە (بۆت بەهۆی جیبریلەوە) ﴿ فَٱتَّبِعْ ﴾: تۆش کاری پێ بکە.**

٤٩٢٩ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مُوسَى بْنِ أَبِي عَائِشَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ:﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ ﴾ القيامة.: قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا نَزَلَ جِبْرِيلُ بِالْوَحْيِ، وَكَانَ مِمَّا يُحَرِّكُ بِهِ لِسَانَهُ وَشَفَتَيْهِ فَيَشْتَدُّ عَلَيْهِ وَكَانَ يُعْرَفُ مِنْهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ الآيَةَ الَّتِي فِي:﴿ لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿١﴾ ﴾ القيامة.: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ ﴾ القيامة.: قَالَ: عَلَيْنَا أَنْ نَجْمَعَهُ فِي صَدْرِكَ،. ﴿ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ القيامة.:فَإِذَا أَنْزَلْنَاهُ فَاسْتَمِعْ ﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾ ﴾ القيامة: عَلَيْنَا أَنْ نُبَيِّنَهُ بِلِسَانِكَ -قَالَ: - فَكَانَ إِذَا أَتَاهُ جِبْرِيلُ أَطْرَقَ، فَإِذَا ذَهَبَ قَرَأَهُ كَمَا وَعَدَهُ اللَّهُ. ﴿ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾ ﴾ القيامة: تَوَعُّدٌ[1].

**٤٩٢٩ -ئیبنو عەبباس ﷺ لەبارەی ئەم ئایەتەوە ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ ﴾ القيامة: وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ جیبریل ﷺ نیگای بۆ دابزاندایە، پێغەمبەر ﷺ هەمیشە بە (خوێندنەوەی) نیگاکە زمان وهەردوو لێوی دەجولاند، ئینجا ئەو (نیگا بۆ هاتنە) قورس بوو لەسەری، وە پێوەی دیار بوو**

---

(١) بروانە: ٥.

**هەستی پێ دەکرا، ئەنجا خوا ئەو ئایەتەی لە سوڕەتی﴿ لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١ ﴾** القيامة: **دایە دابەزاند:** ﴿ لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ ١٦ إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ ١٧ ﴾ القيامة: **فەرمووی لەسەر ئێمە پێویستە لەسنگتدا قورئان کۆبکەینەوە لەگەڵ خوێندنەوەشیدا** ﴿ فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ ١٨ ﴾ القيامة: **جا ئەگەر دامان بەزاند تۆ گوێ بگرە.** ﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا بَيَانَهُۥ ١٩ ﴾ القيامة: **لەسەر ئێمەیە لەسەر زمانی تۆ ڕوونی بکەینەوە، ئیبنو عەبباس دەڵێ: جا (ئیتر) کە جیبریل ﷺ بهاتایە بۆلای (نیگای بۆ بهێنایە) سەری دادەخست (و بێ دەنگ دەبوو)، جا کە جیبریل ﷺ دەڕۆشت قورئانەکەی دەخوێندەوە بەو شێوەی خوا بەڵێنی پێدابوو. وە** ﴿ أَوۡلَىٰ لَكَ فَأَوۡلَىٰ ٣٤ ﴾ القيامة: **ئەوە هەڕەشە لێ کردنە.**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٧٦ - سورة ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ ١ ﴾ الإنسان:

يُقَالُ مَعْنَاهُ أَتَى عَلَى الإِنْسَانِ، وَ ﴿ هَلۡ ﴾ الإنسان: تَكُونُ جَحْدًا وَتَكُونُ خَبَرًا، وهذا مِنَ الخَبَرِ، يَقُولُ كَانَ شَيْئًا فَلَمْ يَكُنْ مَذْكُورًا، وَذَلِكَ مِنْ حِينِ خَلَقَهُ مِنْ طِينٍ إلى أَنْ يُنْفَخَ فِيهِ الرُّوحُ،﴿ أَمۡشَاجٍ ٢ ﴾ الإنسان: الأَخْلاَطُ مَاءُ المَرْأَةِ، وَمَاءُ الرَّجُلِ الدَّمُ وَالْعَلَقَةُ. وَيُقَالُ إِذَا خُلِطَ مَشِيجٌ كَقَوْلِكَ: خَلِيطٌ. وَمَمْشُوجٌ مِثْلُ مَخْلُوطٍ، وَيُقَالُ:﴿ سَلَٰسِلَاْ وَأَغۡلَٰلًا ٤ ﴾ الإنسان: وَلَمْ يُجْرِ بَعْضُهُمْ ﴿ مُسۡتَطِيرًا ٧ ﴾ الإنسان: مُمْتَدًّا، البَلاَءُ وَالْقَمْطَرِيرُ

الشَّدِيدُ، يُقَالَ: يَوْمٌ قَمْطَرِيرٌ وَيوْمٌ قُمَاطِرٌ، وَالْعَبُوسُ وَالقَمْطَرِيرُ وَالْقُمَاطِرُ وَالْعَصِيبُ أَشَدُّ مَا يَكُونُ مِنَ الأَيَّامِ فِي البَلاَءِ. وَقَالَ مَعْمَرٌ: ﴿ أَسْرَهُمْ ﴿٢٨﴾ ﴾ الإنسان: شدَّةُ الخَلْقِ، وَكُلُّ شَيْءٍ شَدَدْتَهُ مِنْ قَتَبٍ فَهْوَ مَأْسُورٌ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٧٦ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ ﴿١﴾ ﴾ الإنسان:

**وتراوە ماناكەی: بەڵێ بەسەر مرۆڤدا هاتووە وە ﴿ هَلۡ ﴾: بۆ نەرێ كردن و ئەرێنی بەكاردێت لێرەدا بۆ ئەرێنیە [١]، دەڵێ: (مرۆڤ) شتێك بوو بەڵام باس كراو نەبوو [٢]، ئەوەش لەو كاتەی لە قوڕ دروست كردینەوە تا ئەو كاتەی ڕۆح كرا بە بەریدا.**

**﴿ أَمۡشَاجٍ ﴾: تێكەڵاو، ئاوی ژن و ئاوی پیاو، خوێن و خوێنی مەییو، وە ئەگەر شتی لەگەڵ شتێكی تر تێكەڵ بكرێ پێی دەوترێ (مَشِيجٌ) هەر وەك دەڵێ: (خَلِيطٌ) لە جیاتی (مَخْلُوط) بۆ (مَشِيجٌ) یش لەجیاتی (مَمْشُوجٌ) [٣].**

**وە دەوترێ ﴿ سَلَٰسِلَاْ وَأَغۡلَٰلًا ﴾: هەردووكیان دوو سەریان هەیە ـ هەندێ لە قورئان خوێنان بە یەك سەر ـ خوێندویانەتەوە [٤] (سَلَاسِلَ وَأَغْلَالاً). ﴿ مُسۡتَطِيرًا ﴾: بەڵایەكی بەربڵاوە (هەمووان دەگرێتەوە). (الْقَمْطَرِيرُ) (ڕۆژێكی) سەخت و دژوار دەوترێت: (يَوْمٌ قَمْطَرِيرٌ وَيوْمٌ قُمَاطِرٌ) (هەردووكیان دروستە یەك مانان)**

---

(١) بۆ تەحقوقە.

(٢) بەڵكو لەبیركراو بوو.

(٣) واتە: (مشيج وخليط) كە لەسەر كێشی (فیعل) بەمانای (مَمْشوج و مخلوط) دێن كە هەردووكیان لەسەر كێشی (مفعول).

(٤) ئەگەر بەدوو سەر بخوێنرێتەوە ئەوكاتە مونسەریفە بەڵام ئەگەر بە یەك سەر بخوێنرێتەوە ئەو كاتە غەیر مونسریفە. مانای (وَلَمْ يُجْرِ بَعْضُهُمْ) هەندێ لە قورئان خوێنەكان بە مونسریف نەیان خوێندوومەتەوە.

(الْعَبُوسُ وَالقَمْطَرِيرُ وَالْقُمَاطِرُ وَالْعَصِيبُ) هەر چوار وشەكە بە سەختترین و دژوارترین بەڵاو ناڕەحەتی دەوترێت كە لەرۆژەكاندا هەبێت.

مەعمەر دەڵێ: ﴿ أَسْرَهُمْ ﴾[1]: قایم دروست كراو، هەموو شتێك قایم و توندی بكەی لە كورتان و شتی وا، ئەو پێ دەڵێن (مَأْسُورٌ).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ٧٧ - سورة ﴿ وَالْمُرْسَلَاتِ ﴾

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ جِمَالَتٌ ﴿٣٣﴾ ﴾: حِبَالٌ. ﴿ ارْكَعُوا ﴿٤٨﴾ ﴾ المرسلات: صَلُّوا ﴿ لَا يَرْكَعُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ المرسلات: لَا يُصَلُّونَ. وَسُئِلَ ابن عَبَّاس: ﴿ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ المرسلات: ﴿ وَاللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنعام: ﴿ الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰ أَفْوَاهِهِمْ ﴿٦٥﴾ ﴾ يس. فَقَالَ: إِنَّهُ ذُو أَلْوَانٍ مَرَّةً يَنْطِقُونَ، وَمَرَّةً يُخْتَمُ عَلَيْهِمْ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٧٧ - (تەفسیری) سورەتی ﴿ وَالْمُرْسَلَاتِ ﴾[2]

موجاهید دەڵێ ﴿ جِمَالَتٌ ﴾: گوریس و حەبل[1].﴿ ارْكَعُوا ﴾: نوێژیان كرد.﴿ لَا يَرْكَعُونَ ﴾: نوێژناكەن. وە پرسیار لە ئیبنو عەبباس ﷺ كرا: ﴿ لَا يَنطِقُونَ ﴾:

---

(١) جومگە.

(٢) سورەتی مورسەلات.

﴿ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴾: ﴿ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ ﴾: (مانای ئەم ئایەتانە چۆنە کە وا دیارە پێچەوانەی یەکترین) ئەویش وتی: ئەوە چەند جۆر و شێوازێکە جار هەیە قسە دەکەن، جار هەیە مۆر دەدرێ لە دەم و زمانیان.

## ١ - بابٌ

٤٩٣٠ - حَدَّثَنِي مَحْمُودٌ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺقَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأُنْزِلَتْ عَلَيْهِ:﴿ وَٱلْمُرْسَلَٰتِ ﴿١﴾ ﴾ المرسلات: ، وَإِنَّا لَنَتَلَقَّاهَا مِنْ فِيهِ، فَخَرَجَتْ حَيَّةٌ، فَابْتَدَرْنَاهَا، فَسَبَقَتْنَا فَدَخَلَتْ جُحْرَهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وُقِيَتْ شَرَّكُمْ، كَمَا وُقِيتُمْ شَرَّهَا»[٢].

## ١ - باسێک

**٤٩٣٠ - عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین (سوڕەتی) ﴿ وَٱلْمُرْسَلَٰتِ ﴾: ی بۆ دابەزێنرا کە بێگومان ئێمە لە دەمی خۆی وەرمان دەگرت، لە پڕ مارێك دەرچوو ئێمەش دەست و بردمان کرد (بۆکوشتنی)، بەڵام مارەکە پێشمان کەوت و چووە کونەکەی خۆیەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((هەر چۆنێ ئێوە لەزیانی ئەو پارێزران، ئەویش (مارەکە) لە زیانی ئێوە پارێزراو بوو)).**

٤٩٣١ - حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ مَنْصُورٍ بهذا. وَعَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ مِثْلَهُ. وَتَابَعَهُ أَسْوَدُ

(١) بەمانای وشتران.
(٢) بڕوانە: ١٨٣٠.

بْنُ عَامِرٍ، عَنْ إِسْرَائِيلَ. وَقَالَ حَفْصٌ وَأَبُو مُعَاوِيَةَ وَسُلَيْمَانُ بْنُ قَرْمٍ، عَنِ الأعمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ.

قَالَ يَحْيَى بْن حَمَّادٍ: أَخْبَرَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ مُغِيرَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ. وَقَالَ ابن إِسْحَاقَ: عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الأسوَدِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ.

**٤٩٣١ -عەبدەی کوڕی عەبدوڵلا وتی: یەحیای کوڕی ئادەم بۆی گێڕاینەوە لە ئیسرائیلەوە ئەویش لە مەنصوورەوە ئەم فەرموودەی پێشووی گێڕایەوە.**

**-هەروەها ئیسرائیل گێڕاویەتیەوە لە ئەعمەشەوە ئەویش لە ئیبراهیمەوە لە عەلقەمەوە لە عەبدوڵلاوە ﷺ، بەوێنەی فەرموودەکەی پێشوو گێڕایەوە.**

**-وە ئەسوەدی کوڕی عامیر لە ئیسرائیلەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی یەحیای کوڕی ئادەم دەکات.**

**-وە حەفص و ئەبو موعاویە و سولەیمانی کوڕی قەرم گێڕاویانەتەوە لە ئەعمەشەوە، ئەویش لە ئیبراهیمەوە لە ئەسوەدەوە.**

**-یەحیای کوڕی حەمماد دەڵێ: ئەبو عەوانە بۆی گێڕاینەوە لە موغیرەوە لە ئیبراهیمەوە لە عەلقەمەوە لە عەبدوڵلاوە ﷺ[1].**

**-ئیبنو ئیسحاق دەڵێ و دەگێڕێتەوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەسوەدەوە لە باوکیەوە لە عەبدوڵلاوە [2].**

٤٩٣١م - حَدَّثَنَا قتَيْبَة، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأعمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأسوَدِ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: بَيْنَا نَحْن مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فى غَارٍ إِذْ نَزَلَتْ عَلَيْهِ: ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ ﴿١﴾﴾ المرسلات: فَتَلَقَّيْنَاهَا مِنْ فِيهِ، وَإِنَّ فَاهُ لَرَطْبٌ بِهَا، إِذْ خَرَجَتْ حَيَّةٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: "عَلَيْكُمْ أقْتُلُوهَا". قَالَ فَابْتَدَرْنَاهَا فَسَبَقَتْنَا، قَالَ: فَقَالَ: "وُقِيَتْ شَرَّكُمْ، كَمَا وُقِيتُمْ شَرَّ هَا"[3].

---

(١) مەبەستی بوخاری بە هێنانی ئەم سەنەدە ئەوەیە موغیرە لەگەڵ ئیسرائیلدا هاوڕان کە مامۆستای ئیبراهیم عەلقەمەیە.

(٢) مەبەستی بوخاری بە هێنانی ئەم سەنەدە ئەوەیە بیسەلمێنێت کە فەرموودەکە سەنەد و ڕشتەی تری هەیە لە ئەسوەدەوە کە لە لە ڕێگەی ئەعمەش و مەنسورەوە نەهاتبێت.

(٣) بڕوانە: ١٨٣٠.

٤٩٣١م - عەبدوڵڵا ﷺ وتی: لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە ئەشکەوتێکدا کە (سوڕەتی) ﴿ وَٱلْمُرْسَلَٰتِ ﴾: بۆ دابەزی ئێمە لەدەمی (پیرۆزی) وەرمان گرت، کە بێگومان هێشتا تەڕ بوو پێی. لە پڕ مارێك دەرچوو (لە کونێکەوە) پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بیگرن و بیکوژن)) ئێمەش دەست و بردمان کرد (بۆکوشتنی)، بەڵام لە دەستمان دەرچوو (خێرا ڕایکرد)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر چۆنێك ئێوە لە زیانی ئەو پارێزراو بوو، ئەویش (مارکە) لە زیانی ئێوە پارێزراو بوو)).

٢ – بابٌ: قولُهُ: ﴿ إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ ۝٣٢ ﴾ المرسلات

٤٩٣٢ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَابِسٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ: ﴿ إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ ۝٣٢ ﴾ المرسلات: قَالَ: كُنَّا نَرْفَعُ الْخَشَبَ بِقَصَرٍ ثَلاَثَةَ أَذْرُعٍ أَوْ أَقَلَّ، فَنَرْفَعُهُ لِلشِّتَاءِ فَنُسَمِّيهِ الْقَصَرَ[1].

## ٢ - باسێك: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (بەڕاستی دۆزەخ پریسکی وەك كۆشك (قەدی دارخورما) دەهاوێژێ)

٤٩٣٢ -عەبدوڕەحمانی کوڕی عابیس دەڵێ: لە ئیبنو عەبباسم ﷺ بیست لە بارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿ إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ ﴾: وتی: ئێمە دارمان دەبڕییەوە بە ئەندازەی سێ گەز یا کەمتر، جا هەڵمان دەگرت بۆ زستان پێمان دەوت قەصەر.

(١) بڕوانە: ٤٩٣٣.

## ٣ - بابٌ: قولُهُ: ﴿كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ٣٣﴾ المرسلات

٤٩٣٣ - حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَابِسٍ سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ ﴿تَرْمِى بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ ٣٢﴾ المرسلات: كُنَّا نَعْمِدُ إِلَى الْخَشَبَةِ ثَلَاثَةَ أَذْرُعٍ وَفَوْقَ ذَلِكَ، فَنَرْفَعُهُ لِلشِّتَاءِ فَنُسَمِّيهِ الْقَصَرَ. ﴿كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ٣٣﴾ المرسلات: حِبَالُ السُّفُنِ تُجْمَعُ حَتَّى تَكُونَ كَأَوْسَاطِ الرِّجَالِ[1].

## ٣ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (دەڵێی گوریس و حەبلی کەشتیانن) [2]

**٤٩٣٣ -عەبدوڕەحمانی کوڕی عابیس دەڵێ: لە ئیبنو عەبباسم ﷺ بیست دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿تَرْمِى بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ﴾: ئێمە دەچووین دارێکمان (دەبڕی بە ئەندازەی) سێ گەز و زیاتر لەوە، جا هەڵمان دەگرت بۆ زستان و پێمان دەوت قەصەر، ﴿كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ﴾: وەك حەبلی کەشتی کۆکرێتەوە تا بەئەندازەی ناو قەدی پیاوان بێت).**

## ٤ - بابٌ: ﴿هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ٣٥﴾ المرسلات

٤٩٣٤ - حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي غَارٍ إِذْ نَزَلَتْ عَلَيْهِ: ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ ١﴾

---

(١) بڕوانە: ٤٩٣٢.

(٢) بە جۆرێکی تریش مانا کراوە: نەڵێی کاروانی حوشتری زەردن.

المرسلات:، فَإِنَّهُ لَيَتْلُوهَا وَإِنِّي لأَتَلَقَّاهَا مِنْ فِيهِ وَإِنَّ فَاهُ لَرَطْبٌ بِهَا، إِذْ وَثَبَتْ عَلَيْنَا حَيَّةٌ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اقْتُلُوهَا». فَابْتَدَرْنَاهَا فَذَهَبَتْ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وُقِيَتْ شَرَّكُمْ، كَمَا وُقِيتُمْ شَرَّهَا».

قَالَ عُمَرُ حَفِظْتُهُ مِنْ أَبِي: فِي غَارٍ بِمِنًى[1].

## ٤ - باسێک: (ئەمڕۆ ڕۆژێکە (بێ باوەڕان) ناتوانن تێیدا قسە بکەن)

**٤٩٣٤ -عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: لەکاتێکدا ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین لە ئەشکەوتێکدا کە (سورەتی) ﴿ وَٱلْمُرْسَلَٰتِ ﴾: ی بۆدابەزی، جا بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ دەیخوێندەوە و منیش لەدەمی ئەو وەرم دەگرت، وە بێگومان دەمی پیرۆزی هێشتا تەڕ و پاراو بوو بە خوێندنەوەی، لەپڕ مارێك خۆی هەڵدایە ناومان، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بیکوژن))، ئێمەش دەست و بردمان کرد، بەڵام مارەکە ڕۆشت (و فریای نەکەوتین)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەرچۆنێ ئێوە لە زیانی ئەو (مارەکە) پارێزراو بوون ئەویش لە زیانی ئێوە پارێزرا)).**

**عومەر دەڵێ: لەباوکمەوە بەم جۆرە لەبەرم کردووە: (لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین) لە ئەشکەوتێکدا لە مینا.**

(١) بڕوانە: ١٨٣٠.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ٧٨ - سورة ﴿ عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ ﴿١﴾ ﴾

قَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴿٢٧﴾ ﴾ النبأ: لَا يَخَافُونَهُ. ﴿ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا ﴿٣٧﴾ ﴾ النبأ: لَا يُكَلِّمُونَهُ إِلَّا أَنْ يَأْذَنَ لَهُمْ. ﴿ صَوَابًا ﴿٣٨﴾ ﴾ النبأ: حَقًّا فِي الدنيا وعَمِلَ بِهِ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ ﴾ النبأ: مُضِيئًا.وقالَ غيره: ﴿ وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ ﴾ النبأ:غَسَقَت عينُهُ ويَغسِقُ الجُرحُ: يَسِلُ كأَنَهُ الغَسَّاقُ والغَسِقُ واحِدٌ ﴿ عَطَاءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾ ﴾ النبأ جَزَاءً كَافِيًا، أَعْطَانِي مَا أَحْسَبَنِي أَيْ كَفَانِي.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٧٨ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿ عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ ﴿١﴾ ﴾[1]

-موجاهید دەڵێ: ﴿ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴾: لە لێپرسینەوە نەدەترسان. ﴿ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا ﴾: کەس توانای قسە کردنی نییە لەگەڵ خوادا، مەگەر خۆی مۆڵەتیان بدات. ﴿ صَوَابًا ﴾: واتە: ڕاستی وتن لە دونیادا و کار پێکردنی.

-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ وَهَّاجًا ﴾: درەوشاوە و شەوقدار. جگە لە ئیبنو عەبباس وتی: ﴿ وَغَسَّاقًا ﴾: چاوی پڕ لە فرمێسك بوو (ويَغسِقُ الجُرحُ)

(١) ناونیشانی سوڕەتی نەبەئە.

(برینەکە) خوێن و کێمی لێ هات، دەڵێی (الغَسَّاقُ) لەگەڵ (الغَسِقُ) یەك مانان.

﴿ عَطَآءً حِسَابًا ﴾: پاداشتێکی تەواو، ئەوەندەی پێدام کە بەسم بێت.

١ - بابٌ: ﴿ يَوْمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ ﴾ النبأ: زُمَرًا

﴿ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ ﴾ النبأ: أي: زمرًا.

٤٩٣٥ - حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «مَا بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ». قَالَ: أَرْبَعُونَ يَوْمًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالَ: أَرْبَعُونَ شَهْرًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالَ: أَرْبَعُونَ سَنَةً؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالَ: «ثُمَّ يُنْزِلُ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً. فَيَنْبُتُونَ كَمَا يَنْبُتُ الْبَقْلُ لَيْسَ مِنَ الإِنْسَانِ شَيْءٌ إِلاَّ يَبْلَى إِلاَّ عَظْمًا وَاحِدًا وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ، وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[1].

## ١ - باسێک: (ئەو ڕۆژەی کە فوو دەکرێ بە کەڕەنادا، ئینجا پۆل پۆل دێن)

﴿ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ ﴾ النبأ: پۆل پۆل.

٤٩٣٥ -ئەبو صالح دەگێڕێتەوە لە ئەبو ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( نێوانی دوو فوو کردنەکە (بەشەیپوردا) چلە)) وتی: چل ڕۆژ؟ ئەبو هورەیرە وتی: دانم پیادا نەنا، وتی: چل مانگە؟ وتی: دانم پیادا نەنا، وتی چل ساڵە؟ وتی: دانم پیادا نەنا، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((لە پاشان خوا

(١) بڕوانە: ٤٨١٤.

لەئاسمانەوە بارانێك دەبارێنێ، ئینجا (مردووەكان) دەڕوێنەوە[1] چۆن سەوزە و ڕووەك دەڕوێن، هەرچی شتی مرۆڤە دەرزێ جگە لە ئێسكێك كە ئەویش كۆتا بەشی كلێنچكەیە، لە ویشەوە مرۆڤ دروست دەبێتەوە لە ڕۆژی قیامەت دا)).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ٧٩ - سورة ﴿ وَٱلنَّٰزِعَٰتِ ﴾

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ ٱلْءَايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٢٠﴾ ﴾ النازعات::عَصَاهُ وَيَدُهُ، يُقَالُ: النَّاخِرَةُ وَالنَّخِرَةُ، سَوَاءٌ مِثْلُ الطَّامِعِ وَالطَّمِعِ وَالْبَاخِلِ وَالْبَخِيلِ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: النَّخِرَةُ البَالِيَةُ، وَالنَّاخِرَةُ العَظْمُ المُجَوَّفُ الذِي تَمُرُّ فِيهِ الرِّيحُ فَيَنْخَرُ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ ٱلْحَافِرَةِ ﴿١٠﴾ ﴾ النازعات: التِي أَمْرُنَا الأَوَّلُ إِلَى الحَيَاةِ. وَقَالَ غَيْرُهُ:

﴿ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ ﴾ النازعات: مَتَى مُنْتَهَاهَا، وَمُرْسَى السَّفِينَةِ حَيْثُ تَنْتَهِي

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٧٩ - (تەفسیری) سورەتی ﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ﴾

-موجاهید دەڵێ: ﴿ ٱلْءَايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴾: گۆچانەكەی و دەستی، دەوترێ: (النَّاخِرَةُ وَالنَّخِرَةُ)[1] وەك یەك وان لەمانادا، وەك: (الطَّامِعِ وَالطَّمِعِ) و (وَالْبَاخِلِ وَالْبَخِيلِ).

---

(١) دروست دەبنەوە و زیندوو دەبنەوە.

هەندێك لە زانایان وتویانە: (النَّخِرَةُ): ئێسقانی ڕزیووە، بەڵام (النَّاخِرَةُ) ئێسقانێکە ناوەکەی بۆشە و هەوا دەڕوات بەناویدا و دەرزێ و دەپوکێتەوە.

-ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: ﴿ ٱلْحَافِرَةِ ﴾: (گەڕانەوە) بۆکاری سەرەتامان (گەڕانەوە) بۆ ژیان (لەپاش مردن).

-جگە لە ئیبنو عەبباس دەڵێ: ﴿ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴾: کۆتایی یەکەی کەی دەبێت. (مُرْسَى السَّفِينَةِ)، کەشتیەکە لەکۆتایی دا لە کوێدا لەنگەر دەگرێت.

## ١ - بابٌ

٤٩٣٦ - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ الْمِقْدَامِ، حَدَّثَنَا الْفُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا أَبُو حَازِمٍ، حَدَّثَنَا سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ بِإِصْبَعَيْهِ هَكَذَا بِالْوُسْطَى، وَالَّتِي تَلِي الإِبْهَامَ:«بُعِثْتُ وَالسَّاعَةَ كَهَاتَيْنِ" ﴿ ٱلطَّآمَّةُ ﴾: تَطمُ كل شيء[٢].

## ١- باسێک

٤٩٣٦ -سەهلی کوڕی سەعد رضي الله عنه وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بە هەردوو پەنجەی ئاوەهای کرد، پەنجەی ناوەڕاست و پەنجەی پاڵ پەنجە گەورەی[٣] فەرمووی: (من و قیامەت وەکو ئەو دوو پەنجە نێردراوین)).

﴿ ٱلطَّآمَّةُ ﴾: بەڵا و کارەساتێکە هەموو شت دەگرێتەوە (کە ڕۆژی قیامەتە).

---

(١) ئێسقانی ڕزیو ئەو وشەیە بە هەردوو شێوەکە خوێندراوەتەوە (النَّاخِرَةُ) و (النَّخِرَةُ).

(٢) بڕوانە: ٥٣٠١، ٦٥٠٣.

(٣) پەنجەی شایەتومان.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٨٠ - سورة ﴿ عَبَسَ ﴾

﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ ﴾ عبس: كَلَحَ وَأَعْرَضَ، وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿ مُّطَهَّرَةٍ ﴾ عبس: لَا يَمَسُّهَا إِلَّا المُطَهَّرُونَ، وَهُمُ المَلَائِكَةُ، وهذا مِثْلُ قَوْلِهِ: ﴿ فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا ﴿٥﴾ ﴾ النازعات::جَعَلَ المَلَائِكَةَ وَالصحُفَ مُطَهَّرَةً؛ لأَنَّ الصُّحُفَ يَقَعُ عَلَيْهَا التَّطْهِيرُ، فَجُعِلَ التَّطْهِيرُ لِمَنْ حَمَلَهَا أَيْضًا. ﴿ سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ ﴾ عبس: المَلَائِكَةُ وَاحِدُهُمْ سَافِرٌ، سَفَرْتُ أَصْلَحْتُ بَيْنَهُمْ، وَجُعِلَتِ المَلَائِكَةُ إِذَا نَزَلَتْ بِوَحْيِ اللَّهِ وَتَأْدِيَتِهِ كَالسَّفِيرِ الذِي يُصْلِحُ بَيْنَ القَوْمِ. وَقَالَ غَيْرُهُ ﴿ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ ﴾ عبس: تَغَافَلَ عَنْهُ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ لَمَّا يَقْضِ ﴿٢٣﴾ ﴾ عبس: لَا يَقْضِي أَحَدٌ مَا أُمِرَ بِهِ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ تَرْهَقُهَا ﴿٤١﴾ ﴾ عبس: تَغْشَاهَا شِدَّةٌ.﴿ مُّسْفِرَةٌ ﴿٣٨﴾ ﴾ عبس: مُشْرِقَةٌ. ﴿ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ ﴾ عبس: وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: كَتَبَةٍ. ﴿ أَسْفَارًا ﴿٥﴾ ﴾ الجمعة: كُتُبًا. ﴿ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ ﴾ عبس::تَشَاغَلَ، يُقَالُ: وَاحِدُ الأَسْفَارِ سِفْرٌ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٨٠ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿ عَبَسَ ﴾

**﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴾: ڕووی گرژ کرد و پشتی هەڵکرد. ﴿ مُّطَهَّرَةٍ ﴿١٤﴾ ﴾: دەستی لێ نادات جگە لە پاکان کە فریشتەکانن، ئەم وەك ئەم فەرمایشتەی خوا وایە: ﴿ فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا ﴾[1]: فریشتەکان و پەڕاوەکان پاکن، چونکە پەڕاوەکان پاککردنەوەکە بۆ ئەوانە بووە، ئینجا پاککردنەوەکە کراوە بە سیفەت بۆ ئەوەی هەڵیگرتووە (کە فریشتەکانن).**

---

(١) ئەوە وەسفی ئەسپی غەزاکارانە کەچی تەکبیر کردنە وەسفی غازیەکانە.

﴿ سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ ﴾: فریشتەکان، تاکەکە (سَافِرٌ) و مانای (سَفَرْتُ) نێوانمان چاك کردەوە, وە فریشتەکانیش کە نیگای خوا و ئامۆژگاری دێننە خوارەوە وەکو سەفیر وان کە نێوانی خەڵك چاك دەکەن. زانایەك دەڵێ: ﴿ تَصَدَّىٰ ﴾: خۆتی لێ بێ ئاگا دەکەیت. موجاهید دەڵێ: ﴿ لَمَّا يَقْضِ ﴾: هیچ کەس ئەوەی فەرمانی پێکراوە جێ بەجێی ناکات. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ تَرْهَقُهَا ﴾: سەختی و ناڕەحەتی دایدەپۆشێت.

﴿ مُّسْفِرَةٌ ﴾: گەش و جوانن، درەوشاوەن. ﴿ بِأَيْدِي سَفَرَةٍ ﴾: ئیبنو عەبباس دەڵێ: نوسەران (ی قورئانن). ﴿ أَسْفَارًا ﴾: کتێبەکان. ﴿ تَلَهَّىٰ ﴾: خۆت هەڵە دەکەیت، غافڵ دەبی، دەوترێت تاکی (أَسْفَار) (سِفْرٌ)ـە.

٤٩٣٧ - حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، قَالَ: سَمِعْتُ زُرَارَةَ بْنَ أَوْفَى يُحَدِّثُ عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺقَالَ: «مَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَهْوَ حَافِظٌ لَهُ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ، وَمَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَهْوَ يَتَعَاهَدُهُ وَهْوَ عَلَيْهِ شَدِيدٌ، فَلَهُ أَجْرَانِ».

٤٩٣٧ - عائیشە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (نموونەی ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێت و لە بەریشێتی لە ڕیزی فریشتە بەڕێزەکاندایە، وە نموونەی ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێ و (زوو زوو) دەوری دەکاتەوە ئەو کارە ناڕەحەت قورسە لەسەری، ئەو دوو پاداشتی بۆ هەیە)).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٨١ - سورة ﴿ إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴾

﴿ ٱنكَدَرَتْ ﴿٢﴾ ﴾ التكوير: انْتَثَرَتْ. وَقَالَ الحَسَنُ: ﴿ سُجِّرَتْ ﴿٦﴾ ﴾ التكوير: ذَهَبَ مَاؤُهَا فَلَا يَبْقَى قَطْرَةٌ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ ٱلْمَسْجُورِ ﴿٦﴾ ﴾ الطور: المَمْلُوءُ. وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿ سُجِّرَتْ ﴿٦﴾ ﴾ التكوير: أَفْضَى بَعْضُهَا إِلى بَعْضٍ، فَصَارَتْ بَحْرًا وَاحِدًا، وَالْخُنَّسُ تَخْنِسُ فِي مُجْرَاهَا تَرْجِعُ، وَتَكْنِسُ: تَسْتَتِرُ، كَمَا تَكْنِسُ الظِّبَاءُ. ﴿ تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾ ﴾ التكوير: ارْتَفَعَ النَّهَارُ. وَالظَّنِينُ المُتَّهَمُ وَالضَّنِينُ يَضَنُّ بِهِ.وَقَالَ عُمَرُ: ﴿ ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ ﴿٧﴾ ﴾ التكوير: يُزَوَّجُ نَظِيرَهُ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ وَالنَّارِ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾ الصافات: ﴿ عَسْعَسَ ﴿١٧﴾ ﴾ التكوير: أَدْبَرَ.

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٨١ - (تەفسیری) سورەتی ﴿ إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴾[1]

**﴿ ٱنكَدَرَتْ ﴾: (ئەستێرەکان) هەڵوەرین و کەوتنە خوارەوە (واتە: تاریك بوون). حەسەن دەڵێ: ﴿ سُجِّرَتْ ﴿٦﴾ ﴾ ٱلنُّفُوسُ (دەریاکان) ئاوەکەیان ڕۆشت یەك دڵۆپی تێدا نەما. موجاهید دەڵێ: ﴿ ٱلْمَسْجُورِ ﴾: پڕکراو. وەجگە لە موجاهید دەڵێ:**

(١) سورەتی تەکویریشی پێ دەوترێت.

﴿ سُجِّرَتْ ﴿٦﴾ ﴾: [1]: دەریاکان هەندێکی چو وە پاڵ هەندێکی وتێکەڵ بوون و هەموو بوون بە یەك دەریای گەورە. (الْخُنَّسُ) لە ڕۆشتن و خولانەوەیدا دەگەڕێتەوە. (تَكْنِسُ):خۆی دەشارێتەوە وەك ئاسك چۆن خۆی دەشارێتەوە. ﴿ تَنَفَّسَ ﴾: ڕۆژ بەرزبوویەوە (دونیا ڕووناك بوو). (الظَّنِينُ):گومان لێکراو، وە (الضَّنِينُ): ڕژدەیی بکات (لە گەیاندنی پەیامەکەیدا). عومەر دەڵێ: ﴿ ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ ﴾: لەگەڵ هاوشێوەی خۆیدا جووت دەکرێ، لەگەڵ خەڵکی بە هەشت و دۆزەخ دا لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ ﴾ واتە: (ئەوانەی ستەمیان کرد لەگەڵ هاوڕێکانیان (هاو وێنەکانیان) کۆیان بکەنەوە.﴿ عَسْعَسَ ﴾: پشتی هەڵکرد، ڕۆشت.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٨٢ - سورة ﴿ إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ ﴾ الانفطار

وَقَالَ الرَّبِيعُ بْنُ خُثَيْمٍ: ﴿ فُجِّرَتْ ﴿٣﴾ ﴾ الانفطار: فَاضَتْ. وَقَرَأَ الأَعْمَشُ وَعَاصِمٌ ﴿ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ ﴾ الانفطار: بِالتَّخْفِيفِ، وَقَرَأَهُ أَهْلُ الحِجَازِ بِالتَّشْدِيدِ، وَأَرَادَ مُعْتَدِلَ الخَلْقِ وَمَنْ خَفَّفَ، يَعْنِي فِي أَيِّ صورة شاءَ، إِمَّا حَسَنٌ وَإِمَّا قَبِيحٌ وَطَوِيلٌ وَقَصِيرٌ.

---

(١) ئیبنو کەسیر و ئەبو عەمر و یەعقوب بە﴿ سُجِرَتْ ﴾: خوێندویانەتەوە، بەڵام نافیع و ئیبنو عامیر و عاصیم و حەمزە و کیسائی و ئەبو جەعفەر و خەلەف بە ﴿ سُجِّرَتْ ﴾: خوێندویانەتەوە.

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٨٢ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿ إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ﴾

-ڕەبیعی کوڕی خوسەیم دەڵێ: ﴿ فُجِّرَتۡ ﴾: تێکەڵ کران، تەقێنرانەوە. ئەعمەش و عاصیم ئەم وشەیەیان بەم جۆرە خوێندۆتەوە ﴿ فَعَدَلَكَ ﴾: وە خەڵکی حیجاز بە (فَعَدَّ لَكَ) خوێندوویانەتەوە، مەبەستی ئەوەی: بەڕێك و پێکی و شێوەیەکی جوان دروستی کردووی[1]، بەڵام مانای: (فَعَدَلَكَ) واتە: لە هەر شێوەیەکدا بیویستایە دروستی دەکردی، بەجوانی یا بە ناشیرینی، بە درێژی یا بەکورتی (لە باڵادا).

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٨٣ - سورة ﴿ وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ﴾

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ بَلۡۜ رَانَ ﴿١٤﴾ ﴾ المطففين::ثَبْتُ الخَطَايَا. ﴿ ثُوِّبَ ﴿٣٦﴾ ﴾ المطففين: جُوزِيَ، وَقَالَ غَيْرُهُ: المُطَفِّفُ لَايُوَفِّي غَيْرَهُ.

---

(١) ئەم مانایە لەسەر خوێندنەوەی بە (فَعَدَّ لَكَ)ی حیجازیەکانە.

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٨٣ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿ وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ﴾ [1]

-موجاهید دەڵێ: ﴿ بَلۡۖ رَانَ ﴾[2]: گوناهەکان زاڵ بووە (بەسەر دڵیدا)، ژەنگاوی کردووە. ﴿ ثُوِّبَ ﴾: سزا و پاداشت دراوەتەوە. جگە لەموجاهید دەڵێ: (المُطَفِّفُ)[3] (ماف) بەرانبەر بە تەواوی نادات.

### ١ - بابٌ: ﴿ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦ ﴾ المطففين

٤٩٣٨ - حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، حَدَّثَنَا مَعْنٌ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: ﴿ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦ ﴾ المطففين: حَتَّى يَغِيبَ أَحَدُهُمْ فِي رَشْحِهِ إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ»[4].

### ١ - باسێک: (ڕۆژێکە کە خەڵک لە بەردەم پەروەردگاری جیهانیاندا دەوەستن)

٤٩٣٨ -عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ (لە مانای ئەم ئایەتەدا) فەرمووی: ﴿ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾: واتە: (ڕۆژێك کە هەموو خەڵك لە بەر بارەگای پەروەردگاری جیهانیان دا ڕادەوەستن ئەوەندە گەرمە)، کەسی وایان هەیە تا نیوەی گوێیەکانی لە عەرەقی خۆیدا نوقم دەبێت)).

---

(١) پێشی دەوترێت، سوڕەتی موتەففیفین.

(٢) توێژی ژەنی خستۆتە سەر دڵانیان.

(٣) کەمدەران و کەمکەران لەم کێشانە و پێوانەدا دزی دەکەن لە خەڵك و بە تەواو پێیان نادەن.

(٤) بروانە: ٦٥٣١.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٨٤ - سُورَةُ ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ﴾

قَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ ﴿٢٥﴾﴾ الحاقة: يَأْخُذُ كِتَابَهُ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِهِ ﴿وَسَقَ ﴿١٧﴾﴾ الانشقاق: جَمَعَ مِنْ دَابَّةٍ. ﴿ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴿١٤﴾﴾ الانشقاق: لَا يَرْجِعَ إِلَيْنَا.

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٨٤ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ﴾[1]

**موجاهید دەڵێ: ﴿كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ﴾: نامەی (کردەوەکانی) لە پشتیەوە وەردەگرێت. ﴿وَسَقَ﴾: (ئەوەی شەو) کۆی دەکاتەوە لە ئاژەڵان و گیانداران[2] ﴿ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴿١٤﴾﴾: (وا گومان دەبات) ناگەڕێتەوە بۆ لامان (و زیندوو نابێتەوە).**

## ١ - بابٌ: ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾﴾ الانشقاق

٤٩٣٩ - حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ الأَسْوَدِ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي مُلَيْكَةَ سَمِعْتُ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ.

---

(١) ناویشی سوڕەتی ئینشیقاقە.

(٢) هەموو گیانداران و باڵدارەکان و مرۆڤەکان دەگەڕێنەوە بۆ شوێن و جێگا و هێلانەی خۆیان لە شەودا.

٤٩٣٩م - حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٤٩٣٩م - حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي يُونُسَ حَاتِمِ بْنِ أَبِي صَغِيرَةَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ الْقَاسِمِ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ أَحَدٌ يُحَاسَبُ إِلاَّ هَلَكَ». قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، جَعَلَنِي اللَّهُ فِدَاءَكَ، أَلَيْسَ يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ ﴿ فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ ﴾ الانشقاق: قَالَ: «ذَاكَ الْعَرْضُ يُعْرَضُونَ، وَمَنْ نُوقِشَ الْحِسَابَ هَلَكَ»[1].

## ١ - باسێک: (جا دوای ئەوە پرسینەوەیەکی سووک و ئاسانی لەگەڵا دەکرێ)

**٤٩٣٩ - ئیبنو ئەبی مولەیکە دەڵێ: لە عائیشەم رضي الله عنها بیست وتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست.**

**٤٩٣٩م - ئیبنوئەبی مولەیکە لە عائیشەوە رضي الله عنها گێڕاویەتیەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

**٤٩٣٩م - ئیبنو ئەبی مولەیکە لە قاسیمەوە گێڕاویەتیەوە ئەویش لە عائیشەوە رضي الله عنها گێڕاویەتیەوە و دەڵێ: پێغەمەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرکەسێ لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێ تیادەچێ))، عائیشەش وتی: ئایا خوا عز وجل نافەرموێ: (ئینجا ئەو کەسەی کە نامەی (کردەوەی) درایە دەستی ڕاستی، جا دوا ئەوە پرسینەوەیەکی سووك و ئاسانی لەگەڵ دەکرێ) (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((ئەوە هەر پیشاندانێك پیشانیان دەرێ، هەرکەس لێکۆڵینەوە (مشت و مڕ)ی لەگەڵدا بکرێ تیاچووە)).**

---

(١) بروانە: ١٠٣.

## ٢ - بابٌ: ﴿لَتَرۡكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٖ ١٩﴾ الانشقاق

٤٩٤٠ - حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنِ النَّضْرِ، أَخْبَرَنَا هُشَيْمٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو بِشْرٍ جَعْفَرُ بْنُ إِيَاسٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: قَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿لَتَرۡكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٖ ١٩﴾ الانشقاق: حَالًا بَعْدَ حَالٍ، قَالَ هذا نَبِيُّكُمْ ﷺ.

## ٢ - باسێک: (بێگومان ئێوه له حاڵەتێکەوە تێئەپەڕن بۆ حاڵەتێکی تر)

**٤٩٤٠ -موجاهید دەڵێ: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما (دەربارەی ئەم ئایەتە) وتی: (بێگومان ئێوه له حاڵەتێکەوە تێئەپەڕن بۆ حاڵێکی تر) حاڵ له دوای حاڵ، پێغەمبەرەکەتان ﷺ ئەمەی فەرمووە.**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٨٥ - سورة ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡبُرُوجِ﴾

وَقَالَ مُجَاهِدٌ ﴿ٱلۡأُخۡدُودِ ٤﴾ البروج: شَقٌّ فِي الْأَرْضِ ﴿فَتَنُواْ ١٠﴾ البروج: عَذَّبُوا

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٨٥ - (تەفسیری) سوڕەتی بورووج

**-موجاهید دەڵێ: ﴿ٱلۡأُخۡدُودِ﴾: لەغەمە لە زەویدا، خەندەق لە زەویدا (چاڵی هەڵکەنراو).**

**﴿فَتَنُواْ﴾: سزایان دا.**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٨٦ - سورة الطَّارِقِ

هُوَ النَّجْمُ وما أَتاكَ لَيلاً فَهُوَ طَارِقٌ. ﴿ ٱلنَّجْمُ ٱلثَّاقِبُ ﴿٣﴾ ﴾ الطارق: المُضِيءُ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ ذَاتِ ٱلرَّجْعِ ﴿١١﴾ ﴾ الطارق: سَحَابٌ يَرْجِعُ بِالْمَطَرِ ﴿ ذَاتِ ٱلصَّدْعِ ﴿١٢﴾ ﴾ الطارق: تَتَصَدَّعُ بِالنَبَاتِ. وقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ لَقَوْلٌ فَصْلٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الطارق: لَحَقٌّ. ﴿ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ ﴿٤﴾ ﴾ الطارق: إِلاّ عَلَيها حافِظٌ.

## به ناوى خواى بەخشندەى میهرەبان

## ٨٦ - (تەفسیرى) سوڕەتى تاریق

(الطارق): بریتییە لە ئەستێرە، ئەوەى بەشەودا دەردەکەوێ و دەیبینى ئەو تاریقە. ﴿ ٱلنَّجْمُ ٱلثَّاقِبُ ﴾: (ئەستێرەى) درەخشانى (تاریکى کون کەر). موجاهید دەڵێ: ﴿ ذَاتِ ٱلرَّجْعِ ﴾: هەورێکە بارانى لێ دەبارێ. ﴿ ذَاتِ ٱلصَّدْعِ ﴾: زەوى یەکە (بە بەرز بوونى) ڕووەك درز دەبات. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ لَقَوْلٌ فَصْلٌ ﴾: (ئەم قورئانە) وتیەکى ڕاستە. ﴿ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ ﴾: مەگەر چاودێرێکى بەسەر وەیە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ٨٧ - سورة: ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴾

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ قَدَّرَ فَهَدَىٰ ۝٣ ﴾ الأعلى: قَدَّرَ الشَّقَاءَ وَالسَّعَادَةَ، وَهَدى الأَنْعَامَ لِمَرَاتِعِهَا.

٤٩٤١ - حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ ﷺقَالَ: أَوَّلُ مَنْ قَدِمَ عَلَيْنَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ فَجَعَلاَ يُقْرِئَانِنَا الْقُرْآنَ، ثُمَّ جَاءَ عَمَّارٌ وَبِلاَلٌ وَسَعْدٌ، ثُمَّ جَاءَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فِي عِشْرِينَ، ثُمَّ جَاءَ النَّبِيُّ ﷺ فَمَا رَأَيْتُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ فَرِحُوا بِشَيْءٍ فَرَحَهُمْ بِهِ، حَتَّى رَأَيْتُ الْوَلاَئِدَ وَالصِّبْيَانَ يَقُولُونَ: هَذَا رَسُولُ اللَّهِ قَدْ جَاءَ. فَمَا جَاءَ حَتَّى قَرَأْتُ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ۝١ ﴾ الأعلى: فِي سُوَرٍ مِثْلِهَا.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٨٧ - (تەفسیری) سورەتی ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴾ [(١)]

**موجاهید دەڵێ: ﴿ قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴾: بەدبەختی و بەختەوەری بۆ مرۆڤ دیاری کردووە، (وَهَدى الأَنْعَامَ لِمَرَاتِعِهَا) وە ئاژەڵانی فێرکردووە بۆ ڕۆشتن بۆ شوێنی لەوەڕیان.**

---

(١) ناویشی سورەتی ئەعلایە.

**٤٩٤١ -ئەبو ئیسحاق لە بەرائەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتی: یەکەم کەس کە هات بۆ ناومان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ موصعەبی کوڕ عومەیر و ئیبنو ئوممی مەکتوم بوون، ئەنجا هەردووکیان دەستیان کرد بە قورئان وتنەوە (بەخەڵکی)، لە پاشان عەممار و بیلال و سەعد ﷺ هاتن، پاشان عومەری کوڕی خەتتاب لەگەڵ بیست لە هاوەڵاندا ﷺ هاتن، لە پاشان پێغەمبەر ﷺ هات، ئەنجا هەرگیز خەڵکی مەدینەم نەدیوە بە هیچ شتێك ئەوەند دڵخۆش بووبن وەك دڵخۆشیان بە (هاتنی) پێغەمبەر ﷺ، جا پێغەمبەر ﷺ نەهاتبوو بۆ مەدینە من سوڕەتی ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ م خوێندبوو.**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٨٨ - سورة ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ﴾

وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ۝٣﴾ الغاشية: النَّصارى. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿عَيْنٍ ءَانِيَةٍ ۝٥﴾ الغاشية:بَلَغَ إِنَاهَا وَحَانَ شُرْبُهَا. ﴿حَمِيمٍ ءَانٍ ۝٤٤﴾ الرحمن: بَلَغَ إِنَاهُ. ﴿لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَـٰغِيَةً ۝١١﴾ الغاشية::شَتْمًا. الضَّرِيعُ: نَبْتٌ يُقَالَ لَهُ: الشِّبْرِقُ، يُسَمِّيهِ أَهْلُ الحِجَازِ الضَّرِيعَ إِذَا يَبِسَ، وَهْوَ سَمٌّ.﴿بِمُصَيْطِرٍ ۝٢٢﴾ الغاشية: بِمُسَلَّطٍ، وَيُقْرَأُ بِالصَّادِ وَالسِّينِ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿إِيَابَهُمْ ۝٢٥﴾ الغاشية: مَرْجِعَهُمْ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٨٨ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ﴾[1]

ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾﴾[2]: گاور و دەیانەكانن. موجاهید دەڵێ: ﴿عَيْنٍ ءَانِيَةٍ﴾: گەشتۆتە پلەی هەرە گەرمی و كاتی خواردنەوەی هاتووە. ﴿حَمِيمٍ ءَانٍ ﴿٤٤﴾﴾: گەشتۆتە ئەوپەڕی گەرمی (ئاوی گەرمی زۆر گەرم). ﴿لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةً﴾: جنێودان (قسەی هیچ و پوچ نابیستن تێیدا). (الضَّرِيعُ): ڕووەكێكە پێ دەوترێت: شیبریق، خەڵكی حیجاز ئەگەر وشك بوو پێی دەڵێن: (الضَّرِيعُ) كە ژەهرە و كوشندەیە. ﴿بِمُصَيْطِرٍ﴾: دەسەڵات، زۆردار، بە: (بِمُسَيطِرٍ) و (بِمُصَيطِرٍ) یش دەخوێنرێتەوە واتە: بە (س) و بە (ص). ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: ﴿إِيَابَهُمْ﴾: گەڕانەوەیان.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٨٩ - سورة ﴿وَٱلْفَجْرِ ﴿١﴾﴾

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: الوَتْرُ: اللَّهُ. ﴿إِرَمَ ذَاتِ ٱلْعِمَادِ ﴿٧﴾﴾ الفجر: القَدِيمَةِ وَالْعِمَادُ: أَهْلُ عَمُودٍ لَا يُقِيمُونَ.

﴿سَوْطَ عَذَابٍ ﴿١٣﴾﴾ الفجر: والذِي عُذِّبُوا بِهِ. ﴿أَكْلًا لَّمًّا ﴿١٩﴾﴾ الفجر: السَّفُّ. وَ ﴿جَمًّا ﴿٢٠﴾﴾ الفجر:

(١) بە سورەتی غاشییەش ناو دەبرێ.

(٢) واتە: هەوڵ دەرێكی ڕەنجەڕۆ.

:الكَثِيرُ وَقَالَ مُجَاهِدٌ: كُلُّ شَيْءٍ خَلَقَهُ فَهْوَ شَفْعٌ، السَّمَاءُ شَفْعٌ وَالْوَتْرُ اللَّهُ ﷻ. وَقَالَ غَيْرُهُ ﴿سَوْطَ عَذَابٍ ﴿١٣﴾﴾ الفجر: كَلِمَةٌ تَقُولُهَا العَرَبُ لِكُلِّ نَوْعٍ مِنَ العَذَابِ يَدْخُلُ فِيهِ السَّوْطُ.﴿لَبِٱلْمِرْصَادِ ﴿١٤﴾﴾ الفجر: إِلَيْهِ المَصِيرُ.﴿تَحَٰٓضُّونَ ﴿١٨﴾﴾ الفجر: تُحَافِظُونَ، وَتَحُضُّونَ يَأْمُرُونَ بِإِطْعَامِهِ. ﴿ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾﴾ الفجر: المُصَدِّقَةُ بِالثَّوَابِ. وَقَالَ الحَسَنُ: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ﴿٢٧﴾﴾ الفجر: إِذَا أَرَادَ اللَّهُ ﷻ قَبْضَهَا اطْمَأَنَّتْ إِلى اللَّهِ، وَاطْمَأَنَّ اللَّهُ إِلَيْهَا، وَرَضِيَتْ عَنِ اللَّهِ، وَرَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، فَأَمَرَ بِقَبْضِ رُوحِهَا، وَأَدْخَلَهَا اللَّهُ الجَنَّةَ، وَجَعَلَهُ مِنْ عِبَادِهِ الصَّالِحِينَ. وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿جَابُواْ ﴿٩﴾﴾ الفجر: نَقَبُوا مِنْ جِيبِ القَمِيصِ: قُطِعَ لَهُ جَيْبٌ. يَجُوبُ الفَلاَةَ: يَقْطَعُهَا﴿لَّمًّا ﴿١٩﴾﴾ الفجر: لَمَمْتُهُ أَجْمَعَ أَتَيْتُ عَلَى آخِرِهِ.

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٨٩ - (تەفسیری) سورەتی ﴿وَٱلْفَجْرِ ﴿١﴾﴾ [١]

**موجاهید دەڵێ: (الوَتْرُ):خودایە. ﴿إِرَمَ ذَاتِ ٱلْعِمَادِ ﴿٧﴾﴾: (ئیرەمە) کۆنەکەیان، پێشوەکەیان. (الْعِمَادُ): خاوەن کۆڵەکەکان کە لە شوێنێکدا نیشتەجێ نابن[٢]. ﴿سَوْطَ عَذَابٍ﴾: کە پێی سزا دران ﴿أَكْلًا لَّمًّا﴾: بە هەڵپە خواردن. ﴿جَمًّا ﴿٦﴾﴾ زۆر (خۆشویستنی ماڵ و سامان).**

---

(١) ناوی سورەتی فەجریشە.

(٢) لە چادر و دەواردا دەژین لە شوێنێکدا دانامەزرێن و بەردەوام شوێنیان دەگۆڕن، دەکرێ بەمانای خاوەن پایە و دەسەڵات یان کۆشك و تەلاری بەرز و پایەدار، مانا بکرێ.

-موجاهید دەڵێ: هەرچی شتێك خوا دروستی کردبێ، جووتە ئاسمان جووتە، تاك و تەنها خوایە ﷻ.

-جگە لە موجاهید دەڵێ: ﴿ سَوۡطَ عَذَابٍ ﴾: وشەیەکە عەرەب بەکاری دێنێ بۆ هەموو جۆرە سزایەك کە قامچی تیا بەکار بێت. ﴿ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ ﴾: سەرئەنجام بۆ لای ئەوە. ﴿ تَحَٰٓضُّونَ ﴾: بەردەوام دەبن (لەسەری). وە (تَحُضُّونَ): فەرمان دەکەن بە پێدانی خۆراك پێی. ﴿ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴾: باوەڕی هەیە بە پاداشتی دواڕۆژ.

-حەسەن دەڵێ: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ﴾: کاتێ خوا ﷻ ویستی گیانی بکێشێ دڵنیایە و دڵخۆشە بە گەڕانەوەی بۆ لای خوا، خواش دڵنیایە لێی و پێی خۆشە کە دەگەڕێتەوە بۆ لای، ئەو کەس لە خوا ڕازییە و خواش لەو کەسە ڕازییە، ئەوسا خوا فەرمان دەکات بە کێشانی گیانی و دەیخاتە بەهەشتەوە و دەیباتە ڕیزی بەندە چاکەکانیەوە.

-جگە لە حەسەن دەڵێ: ﴿ جَابُواْ ﴾: (شاخی بەردیان) دەبڕی و دەتاشی لە (جِيبَ القَمِيصُ)وە هاتووە: واتە کراسەکە یەخەی بۆ برا (يَجُوبُ الفَلاَةَ) زەوی دەبڕی و دەڕوات. ﴿ لَّمًّا ﴾[1]: گشیتم پێچایەوە، هەموویم کۆکردەوە.

(١) لم: واتە: توند کۆی کردەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٩٠ - سورة ﴿لَآ أُقْسِمُ﴾:

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿٢﴾﴾ البلد: مَكَّةَ لَيْسَ عَلَيْكَ مَا عَلَى النَّاسِ فِيهِ مِنَ الإِثْمِ. ﴿وَوَالِدٍ ﴿٣﴾﴾ البلد: آدَمَ ﴿وَمَا وَلَدَ ﴿٣﴾﴾ البلد: ﴿لُّبَدًا ﴿٦﴾﴾ البلد: كَثِيرًا. وَ ﴿ٱلنَّجْدَيْنِ ﴿١٠﴾﴾ البلد: الخَيْرُ وَالشَّرُّ. ﴿مَسْغَبَةٍ ﴿١٤﴾﴾ البلد: مَجَاعَةٍ ﴿مَتْرَبَةٍ ﴿١٦﴾﴾ البلد: السَّاقِطُ فِي التُّرَابِ. يُقَالُ: ﴿فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴿١١﴾﴾ البلد: فَلَمْ يَقْتَحِمِ العَقَبَةَ فِي الدُّنْيَا، ثُمَّ فَسَّرَ العَقَبَةَ فَقَالَ: ﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوْ إِطْعَٰمٌ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ ﴿١٤﴾﴾ البلد.

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٩٠ - (تەفسیری) سورەتی ﴿لَآ أُقْسِمُ﴾ [1]

**-موجاهید دەڵێ: ﴿بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ﴾: مەككە، ئەو گوناهەی لەسەر خەڵكە دەربارەی (جەنگ كردن) لەو شاردا لەسەر تۆ نییە [2]. ﴿وَوَالِدٍ﴾: ئادەم ﷺ ﴿وَمَا وَلَدَ﴾: [3] ﴿لُّبَدًا﴾: (ماڵی) زۆر. ﴿ٱلنَّجْدَيْنِ﴾: (رێی) چاكە و خراپە. ﴿مَسْغَبَةٍ ﴿١٤﴾﴾: برسێتی. ﴿مَتْرَبَةٍ﴾: (هەژاری) لە خاك و خۆڵدا كەوتوو (زۆر هەژاری). دەوترێ.**

---

(١) ناویشی سورەتی بەلەدە.

(٢) تەنها بۆ تۆ حەڵاڵ كرا جەنگی تیا بكەیت بۆماوەیەكی دیاری كراو بۆ كەسی كە دروست نییە.

(٣) لە پێغەمبەران و پیاو چاكان كە لە نەوەی ئادەمن ﷺ.

﴿ فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴾: كەچی هێشتا لە دونیادا پەلاماری پلەی سەختی نەداوە، پاشان ڕاڤەی (الْعَقَبَة) دەکات و دەفەرموێ: (تۆ چوزانیت پلەی سەختی کامەیە، ئازاد کردنی کۆیلەیە، یان نان دانە لە ڕۆژی گرانی برسێتی دا).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٩١ - سورة ﴿ وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا ﴾

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ وَضُحَىٰهَا ﴿١﴾ ﴾ الشمس: ضَوْؤُها. ﴿ طَحَىٰهَا ﴿٦﴾ ﴾ الشمس: دَحَاهَا. ﴿ بِطَغْوَىٰهَآ ﴿١١﴾ ﴾ الشمس: بِمَعَاصِيهَا. ﴿ وَلَا يَخَافُ عُقْبَٰهَا ﴿١٥﴾ ﴾ الشمس: عُقْبَى أَحَدٍ[1].

٤٩٤٢ - حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَمْعَةَ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَخْطُبُ وَذَكَرَ النَّاقَةَ وَالَّذِي عَقَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ﴿ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشْقَىٰهَا ﴿١٢﴾ ﴾ الشمس: انْبَعَثَ لَهَا رَجُلٌ عَزِيزٌ عَارِمٌ، مَنِيعٌ فِي رَهْطِهِ، مِثْلُ أَبِي زَمْعَةَ». وَذَكَرَ النِّسَاءَ فَقَالَ «يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ يَجْلِدُ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ، فَلَعَلَّهُ يُضَاجِعُهَا مِنْ آخِرِ يَوْمِهِ». ثُمَّ وَعَظَهُمْ فِي ضَحِكِهِمْ مِنَ الضَّرْطَةِ وَقَالَ: «لِمَ يَضْحَكُ أَحَدُكُمْ مِمَّا يَفْعَلُ؟». وَقَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَمْعَةَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مِثْلُ أَبِي زَمْعَةَ عَمِّ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ»[2].

---

(١) بڕوانە: ٤٩٤٢.

(٢) بڕوانە: ٣٣٧٧.

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٩١ - (تەفسیری) سورەتی ﴿ وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ﴾ [1]

-موجاهید دەڵێ: ﴿ وَضُحَىٰهَا ﴾: ڕووناکی خۆر. ﴿ طَحَىٰهَا ﴾: (زەوی) ڕایخستووە و بڵاوی کردووەتەوە. ﴿ بِطَغۡوَىٰهَآ ﴾: بەهۆی تاوان و سەرکەشییانەوە. ﴿ وَلَا يَخَافُ عُقۡبَٰهَا ﴾: (خوا ناترسێ) لە پاشەڕۆژی ئەم (تۆڵەسەندنە)ی هیچ کامیان.

٤٩٤٢ -هیشام لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە بۆی گێڕایەوە کە ئەو (عەبدوڵڵا) لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیست، کە وتاری دەدا و باسی وشترەکەی (صالح) و ئەو کەسەی کرد کە سەری بڕی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (کاتێ کە خراپترینیان هەستایەوە) پیاوێکی زۆر بەهێزی زۆر خراپی خاوەن پشتیوان بوو لە هۆزەکەیدا وەك ئەبی زەمعە وابوو، هەستایەوە بۆ وشترەکە (و سەربڕی) )) وە باسی ئافرەتانیشی کرد و فەرمووی: (کەسێکتان دەڕوات دارکاری ژنەکەی دەکات وەك چۆن دارکاری بەندەکەی دەکات، کەچی لەوانەیە لە کۆتایی ڕۆژەکەدا لەگەڵی دا بخەوێ (جووت بێ) ))، لە پاشان ئامۆژگاری کردن لە بارەی پێکەنینیان (بەیەکتری) بەهۆی ترلێدانەوە فەرمووی: ((بۆچی کەسێکتان پێدەکەنێت (بەشتێ) کە خۆشی وا دەکات))[2].

-ئەبو معاویە دەڵێ: هیشام بۆی گێڕاینەوە لە باوکیەوە ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی زەمعەوە ؓ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((وەکو ئەبو زەمعەی مامی زوبەیر کوڕی عەووام ؓ وابوو)).

---

(١) ناونیشانی سورەتی: شەمسە.

(٢) خۆشی تڕ و بای لێ دەبێتەوە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ٩٢ - سورة ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ﴾

وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿بِٱلۡحُسۡنَىٰ ۝٩﴾ الليل: بِالْخَلَفِ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿تَرَدَّىٰٓ ۝١١﴾ الليل: مَاتَ. وَ ﴿تَلَظَّىٰ ۝١٤﴾ الليل: تَوَهَّجُ وَقَرَأَ عُبَيْدُ بْنُ عُمَيْرٍ تَتَلَظَّى.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٩٢ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ﴾ [١]

-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿بِٱلۡحُسۡنَىٰ﴾ [٢] بە پڕکردنەوەی جێگای (باوەڕی نییە).

-موجاهید دەڵێ: ﴿تَرَدَّىٰٓ﴾: مرد، تیاچوو. ﴿تَلَظَّىٰ﴾: بڵێسە دەدات (گڵپە و گڕپە دەبەستێ).

-وە عوبەیدی کوڕی عومەیر بە: (تَتَلَظَّى) خوێندویەتیەوە.

## ١ - بابٌ: ﴿وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ﴾

٤٩٤٣ - حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ بْنُ عُقْبَةَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ دَخَلْتُ فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ عَبْدِ اللَّهِ الشَّأْمَ فَسَمِعَ بِنَا أَبُو الدَّرْدَاءِ فَأَتَانَا فَقَالَ: أَفِيكُمْ مَنْ يَقْرَأُ؟ فَقُلْنَا: نَعَمْ. قَالَ: فَأَيُّكُمْ أَقْرَأُ؟ فَأَشَارُوا إِلَيَّ فَقَالَ: اقْرَأْ. ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ۝١ وَٱلنَّهَارِ

---

(١) بەمناوی سوڕەتی: لەیل ناونراوە لە قورئاندا.

(٢) بە چاکە (کە بەهەشتە یا لا اله الا الله) یە.

إِذَا تَجَلَّىٰ ﴿٢﴾ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٣﴾ ﴾ الليل: قَالَ: أَنْتَ سَمِعْتَهَا مِنْ فِي صَاحِبِكَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: وَأَنَا سَمِعْتُهَا مِنْ فِي النَّبِيِّ ﷺ وَهَؤُلَاءِ يَأْبَوْنَ عَلَيْنَا[1].

## ١ - باسێک: (وە (سوێند) بە ڕۆژ کاتێ کە ڕووناک دەبێتەوە)

**٤٩٤٣ -عەلقە دەڵێ: لەگەڵ چەند کەسێکی هاوڕێی عەبدوڵڵا (ی کوڕی مەسعوود)دا ﷺ چووینە شام، ئەبو دەرداش بیستبووی ئێمە (چووینەتە شام) بۆیە هات بۆ لامان و وتی: ئایا تیاتاندایە قورئان بخوێنێ؟ ئێمەش وتمان بەڵێ، وتی: کامتان شارەزاترە لە قورئان خوێندندا (زۆرتر قورئانی لەبەرە)؟ ئەوانیش ئاماژەیان بۆ من کرد (ئەبو دەردا بە منی) وت: بخوێنە، منیش ﴿ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ﴿١﴾ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ﴿٢﴾ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٣﴾ ﴾[2] (ئەبو دەردا) وتی: تۆ خۆت لەدەمی هاوڕێکەت[3] بیستووە؟ وتم بەڵێ، وتی: منیش بەو شێوە لە دەمی (پیرۆزی) پێغەمبەرم ﷺ بیستووە کەچی ئەمانە (خەڵکی شام) ڕازی نین بەو (خوێندنەوەی) ئێمە.**

## ٢ - بابٌ: ﴿ وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٣﴾ ﴾

٤٩٤٤ - حَدَّثَنَا عُمَرُ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: قَدِمَ أَصْحَابُ عَبْدِ اللَّهِ عَلَى أَبِي الدَّرْدَاءِ، فَطَلَبَهُمْ فَوَجَدَهُمْ فَقَالَ: أَيُّكُمْ يَقْرَأُ عَلَى قِرَاءَةِ عَبْدِ اللَّهِ؟ قَالَ: كُلُّنَا. قَالَ: فَأَيُّكُمْ يَحْفَظُ؟ وَأَشَارُوا إِلَى عَلْقَمَةَ. قَالَ: كَيْفَ سَمِعْتَهُ يَقْرَأُ ﴿ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ﴿١﴾ ﴾ الليل:

---

(١) بڕوانە: ٣٢٨٧.

**(٢) واتە: (سوێند بە شەو کاتێك کە (زەوی) دادەپۆشێ وە بەڕۆژ کاتێ کە ڕووناك دەبێتەوە، وە بە نێر و مێ ) ئەم خوێندنەوەیەکی شازە، زۆربەی قورئان خوێنەکان بە ﴿ وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴾ خوێندویانەتەوە.**

**(٣) واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ.**

قَالَ عَلْقَمَةُ: (وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى). قَالَ: أَشْهَدُ أَنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ هَكَذَا، وَهَؤُلَاءِ يُرِيدُونِي عَلَى أَنْ أَقْرَأَ ﴿وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ٣﴾ الليل: وَاللَّهِ لاَ أُتَابِعُهُمْ[1].

## ٢ - باسێک: (وە بەو زاتەی کە نێر و مێی دروست کردووە)

**٤٩٤٤ ـ ئیبراهیم دەڵێ: هاورێکانی عەبدوڵڵا ﷺ ڕۆشتن (بۆ شام) بۆ لای ئەبو دەردا، ئەویش بەشوێنیاندا گەڕا و دۆزینیەوە و وتی: کامتان لەسەر شێوەی عەبدوڵڵا قورئان دەخوێنێتەوە؟ وتی: هەموومان (ئەبو دەردا) وتی: ئەی کامتان قورئانی لەبەرە؟ ئاماژەیان بۆ عەلقەمە کرد (ئەبو دەردا) وتی: ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ١﴾: چیت لێ بیستووە چۆن دەیخوێندەوە؟ عەلقەمە وتی: (وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى) ئەبو دەردا) وتی: شایەتی دەدەم منیش لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە هەر ئاوەها دەیخوێندەوە. (کەچی) ئائەمانە دەیانەوێ من بە ﴿وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ٣﴾ سَوّنها ﴾ بیخوێنمەوە، سوێند بەخوا شوێنیان ناکەوم (بەگوێیان ناکەم).**

## ٣ - بابٌ: قَوْلُهُ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ٥﴾ الليل

٤٩٤٥ - حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺقَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي بَقِيعِ الْغَرْقَدِ فِي جَنَازَةٍ فَقَالَ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَمَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ». فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ نَتَّكِلُ؟ فَقَالَ: «اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ». ثُمَّ قَرَأَ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ٥ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ٦﴾: إِلَى قَوْلِهِ: ﴿لِلْعُسْرَىٰ ١٠﴾ الليل[2].

---

(١) بروانە: ٣٢٨٧.

(٢) بروانە: ١٣٦٢.

## ٣ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئینجا ئەو کەسەی (ماڵ و سامان) ببەخشێ و لە خوا بترسێت و پارێزکاربێت)

**٤٩٤٥ - عەلی ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین لە بەقیعی غەرقەد لەگەڵ مردوویەکدا (ئامادەبووین)، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بێگومان هەرکەس لە ئێوە شوێنەکەی لە بەهەشت و شوێنەکەی لە دۆزەخ دا نوسراوە))، هاوەڵانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا دەی بۆچی پشت بەو (نووسینە) نەبەستین؟ پێغەمبەریش فەرمووی: ((هەوڵبدەن و کار بکەن هەموو کەسێ ئامادەکراوە (بۆئەوەی بۆی دروست کراوە)، لە پاشان ئەم ئایەتانەی خوێندەوە (ئینجا ئەو کەسەی (ماڵ و سامان) ببەخشێ و لە خوا بترسێ و پارێزگار بێت، وە بڕوای ببێ بەوەی زۆر چاکە) تا گەشتە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە (بۆ ڕێی ئاسان (کە چاکەیە).**

### ٤ - بابُ قوله: ﴿وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ۝٦﴾ الليل:

٤٩٤٥ - حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ، حَدَّثَنَا الأَعمَشُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺقَالَ: كُنَّا قعُودًا عِنْدَ النَّبِيِّ - صلى الله عليه وسلم - فَذَكَرَ الحدِيثَ.

## ٤ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە بڕوای ببێ بەوەی زۆر چاکە)[1]

**٤٩٤٥ - عەلی ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین، ئیتر هەموو فەرموودەکەی گێڕایەوە و باس کرد (بە وێنەی فەرموودەکەی پێشوو).**

---

(١) کە (لا إله الا الله) یە یان بەهەشت.

## ٥ - بابٌ: ﴿ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ ۝٧ ﴾ الليل:

٤٩٤٦ - حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ خَالِدٍ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ فِي جَنَازَةٍ فَأَخَذَ عُودًا يَنْكُتُ فِي الأَرْضِ فَقَالَ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ أَوْ مِنَ الْجَنَّةِ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلاَ نَتَّكِلُ؟ قَالَ: «اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ.ثم قرأ: ﴿ فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ۝٦ ﴾ الليل: قَالَ شُعْبَةُ: وَحَدَّثَنِي بِهِ مَنْصُورٌ فَلَمْ أُنْكِرْهُ مِنْ حَدِيثِ سُلَيْمَانَ.

## ٥ - باسێک: (ئەوە زوو یارمەتی دەدەین بۆ ڕێی ئاسان (کە چاکەیە))

**٤٩٤٦ -ئەبو عەبدوڕەحمانی سولەمی لە عەلی یەوە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە ئەو (پێغەمبەر ﷺ) لە (سەر قەبرانی) مردوویەکدا بوو، چیلکەدارێکی گرت بە دەستیەوە زەوییەکەی پێ دەکۆڵی، ئەنجا فەرمووی: ((بێگومان هەر کەس لەئێوە شوێنەکەی لە دۆزەخدا یان بەهەشتدا نووسراوە))، هاوەڵانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا دەی بۆچی پشت بەو (نووسینە) نەبەستین؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەوڵبدەن و کار بکەن، هەموو کەسێ ئامادەکراوە (بۆ ئەوەی بۆی دروست کراوە)، (جا ئەم ئایەتانەی خوێندەوە) (ئینجا ئەو کەسەی (ماڵ و سامان) ببەخشێ و لە خوا بترسێ و پارێزگار بێت، وە بڕوای ببێ بەوەی زۆر چاکە) تا کۆتایی ئایەتە.**

**شوعبە دەڵێ: مەنصور ئەو فەرموودەی بۆ گێڕامەوە هیچی تیا نەبوو پێچەوانەی فەرموودەکەی سولەیمان بێت بە ڕەخنە لێی بگرم.**

## ٦ - بابُ قَوْلِهِ: ﴿ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ ﴾ الليل

٤٩٤٧ - حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَمَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ». فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلاَ نَتَّكِل؟ قَالَ: «لاَ، اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ». ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ ﴾ الليل، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾ الليل[1].

## ٦ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە ئەو کەسەی ڕژدی بکات و خۆی بێ نیاز بزانێ)

**٤٩٤٧ - عەلی ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین فەرمووی: ((بێگومان هەرکەس لە ئێوە شوێنەکەی لە بەهەشتدا یا لە دۆزەخدا نوسراوە)) ئێمەش وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا دەی ئایا پشت بەو (نووسینە) نەبەستین؟ ئەویش فەرمووی: ((نەخێر، کاربکەن هەموو کەس ئامادە کراوە (بۆ ئەوەی بۆی دروست کراوە)، لە پاشان ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: (ئینجا ئەو کەسەی (ماڵ و سامان) ببەخشێ و لە خوا بترسێت و پارێزگار بێت، وە بڕوای ببێ بەوەی زۆر چاکە [2]، ئەوە زوو یارمەتی دەدەین بۆ ڕێی ئاسان (کە چاکەیە) ) تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە: (ئەوە بێگومان ڕێی سەختی بۆ ئاسان دەکەین).**

---

(١) بڕوانە: ١٣٦٢.

(٢) کە بەهەشتە یان (لا اله الا الله)ـە

## ٧ - بابٌ: قوْله: ﴿وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾﴾ الليل:

٤٩٤٨ - حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: كُنَّا فِي جَنَازَةٍ فِي بَقِيعِ الْغَرْقَدِ، فَأَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَعَدَ وَقَعَدْنَا حَوْلَهُ، وَمَعَهُ مِخْصَرَةٌ فَنَكَّسَ، فَجَعَلَ يَنْكُتُ بِمِخْصَرَتِهِ ثُمَّ قَالَ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ وَمَا مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ إِلاَّ كُتِبَ مَكَانُهَا مِنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، وَإِلاَّ قَدْ كُتِبَتْ شَقِيَّةً أَوْ سَعِيدَةً». قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلاَ نَتَّكِلُ، عَلَى كِتَابِنَا وَنَدَعُ الْعَمَلَ فَمَنْ كَانَ مِنَّا مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى أَهْلِ السَّعَادَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنَّا مِنْ أَهْلِ الشَّقَاءِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ. قَالَ: «أَمَّا أَهْلُ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ وَأَمَّا أَهْلُ الشَّقَاوَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاءِ». ثُمَّ قَرَأَ ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾﴾ الليل[1].

## ٧ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە بڕوای نەبێ بە چاکە (کە لا اله الا اللّٰه یە یا بەهەشتە))

**٤٩٤٨ - عەلی ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ جەنازەیەکدا بووین لە بەقیعی غەرقەد دا، پێغەمبەری خواش ﷺ هات بۆ لامان و دانیشت و ئێمەش بەدەوریدا دانیشتین، و دار دەستێکی بەدەستەوە بوو سەری داخستبوو، جا بە دار دەستەکەی زەویەکەی هەڵدەکەند، پاشان فەرمووی: ((هیچ کام لە ئێوە نییە وە هیچ گیاندارێك نییە، مەگەر شوێنی نووسراوە لە بەهەشت و دۆزەخ دا، وە نووسراوە بەدبەختە یا**

(١) بڕوانە: ١٣٦٢.

بەختەوەرە)) پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەی بۆپشت بەوە نەبەستین بۆمان نووسراوە و واز لە کردەوە کردن بێنین، ئەنجا هەرکامێکمان لە بەختەوەران بوو ئەوە دەڕوات بەرەو کردەوەی بەختەوەران، ئەوەشمان لە بەدبەختان بوو ئەوە دەڕوات بەرەو کردەوەی بەدبەختان؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((جا ئەوەی بەختەوەرە کاری بەختەوەری بۆ ئاسان دەکرێ وە ئەوەش بەدبەختە ئەوە کردەوەی بەدبەختی بۆ ئاسان دەکرێ))، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (جا ئەو کەسەی ماڵ ببەخشێ و پارێزکاربێت و باوەڕی بە بەهەشت هەبێ، ئەوە بێگومان ئێمە ڕێی ئاسانی بۆ خۆش دەکەین (کە بەهەشتە)، بەڵام ئەو کەسەی ڕژدی بکات و خۆی بێنیاز بزانێ، وە بڕوای بە بەهەشت نەبێ، ئەوە بێگومان ڕێی سەختی بۆ ئاسان دەکەین).

## ٨ - بابٌ: ﴿ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾ الليل

٤٩٤٩ - حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، قَالَ: سَمِعْتُ سَعْدَ بْنَ عُبَيْدَةَ يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ فِي جَنَازَةٍ فَأَخَذَ شَيْئًا فَجَعَلَ يَنْكُتُ بِهِ الأَرْضَ فَقَالَ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ وَمَقْعَدُهُ مِنَ الْجَنَّةِ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلاَ نَتَّكِلُ؟ عَلَى كِتَابِنَا وَنَدَعُ الْعَمَلَ قَالَ: «اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ، أَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ، وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاءِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ». ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ ﴾ الليل[1].

---

(١) بڕوانە: ١٣٦٢.

# ٨ - باسێک: (ئەوە بێگومان ڕێی سەختی بۆ ئاسان دەکەین)

٤٩٤٩ -ئەبو عەبدوڕەحمانی سولەمی لە عەلی یەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە (سەر قەبرانی) مردوویەکدا بوو، جا شتێکی گرت بە دەستیەوە زەوییەکەی پێ دەکۆڵی، جا فەرمووی: ((بێگومان هەر کەس لە ئێوە شوێنەکەی لە دۆزەخدا یان لە بەهەشت دا نووسراوە))، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا دەی بۆچی پشت بەو (نووسینە)مان نەبەستین و واز لە کارکردن بێنین؟ فەرمووی: ((کاربکەن هەموو کەسێ ئامادەکراوە بۆ ئەوەی کە بۆی دروست کراوە، جا ئەوەی لە بەختەوەرانە کاری بەختەوەرانیان بۆ ئاسان دەکرێ، وە ئەوەش لەبەدبەختانە کاری بەدبەختانی بۆ ئاسان دەکرێ))، پاشان ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: (ئینجا ئەو کەسەی (ماڵ و سامان) ببەخشێ و لە خوا بترسێت و پارێزگار بێت، وە بڕوای ببێ بەوەی زۆر چاکە ) تاکۆتای ئایەتەکان[1].

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٩٣ - سورة ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ﴾

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ إِذَا سَجَىٰ ۝٢ ﴾ الضحى: اسْتَوى. وَقَالَ غَيْرُهُ أَظْلَمَ وَسَكَنَ.

﴿ عَآئِلًا ۝٨ ﴾ الضحى: ذُو عِيَالٍ.

---

(١) تا کۆتای ئایاتی (١٠) سورەتی لەیل.

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٩٣ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿وَالضُّحَىٰ﴾[1]

-موجاهید دەڵێ: ﴿إِذَا سَجَىٰ﴾: باڵی كێشا (بەسەر هەموو شتێكدا). جگە لە موجاهید دەڵێ: تاریكی بوو، ئارامی گرت. ﴿عَآئِلًا﴾[2]: خاوەن منداڵ و خێزان.

### ١ - بابُ ﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ۝٣﴾ الضحى

٤٩٥٠ - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا الأَسْوَدُ بْنُ قَيْسٍ، قَالَ: سَمِعْتُ جُنْدُبَ بْنَ سُفْيَانَ ﷺ قَالَ: اشْتَكَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ يَقُمْ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، فَجَاءَتِ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: يَا مُحَمَّدُ إِنِّي لأَرْجُو أَنْ يَكُونَ شَيْطَانُكَ قَدْ تَرَكَكَ، لَمْ أَرَهُ قَرِبَكَ مُنْذُ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا. فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ ﴿وَالضُّحَىٰ ۝١ وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ۝٢ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ۝٣﴾ الضحى[3].

## ١ -باسی ئەم ئایەتە: (پەروەدگارت وازی لێ نەهێناویت و لێت دڵگیر نەبووە)

٤٩٥٠ -جوندەبی كوڕی سوفیان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش كەوت، دوو شەویان سێ شەو هەڵنەستا بۆ شەو نوێژ، ئینجا ئافرەتێك[4] هات و وتی: ئەی موحەممەد (من ئومێد دەكەم بەڕاستی شەیتانەكەت وازی لێ هێنابێت،

---

(١) سوڕەتی زوحا.

(٢) هەژارو نەدار.

(٣) بڕوانە: ١١٢٤.

(٤) كە عەوراى كچی حەرب بوو خوشكی ئەبو سوفیان و خێزانی ئەبو لەهەب بوو. (إرشاد الساري: ٧/٤٢٣).

دوو شەو یان سێ شەوە نەمدیوە نزیکت بوبێتەوە، ئیتر بەو هۆیەوە خوا ﷻ ئەم ئایەتانەی دابەزاند:

(سوێند بەچێشتەنگاو، وە سوێند بە شەو کاتێك کەئارام دەگرێ، پەروەردگارت وازی لێ نەهێناویت و لێت دلگیر نەبوو).

٢ - بَابٌ: قَوْلُهُ: ﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ۝٣ ﴾ الضحى

تُقْرَأُ ﴿ مَا وَدَّعَكَ ۝٣ ﴾ الضحى: بِالتَّشْدِيدِ وَالتَّخْفِيفِ بِمَعْنًى وَاحِدٍ، مَا تَرَكَكَ رَبُّكَ.وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: مَا تَرَكَكَ وَمَا أَبْغَضَكَ.

## ٢ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوا گەورە: (پەروەردگارت وازی لێ نەهێناویت وە لێت دڵگیر نەبووە)

﴿ مَا وَدَّعَكَ ﴾: بە (وَدَّعَكَ) و (وَدَعَكَ) دەخوێنرێتەوە، هەردووکیان یەك مانایان هەیە: واتە: پەروەردگارت وازی لێ نەهێناوی. ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: وازی لێ نەهێناویت و لێت بێزار نەبوو رقی لێ هەڵنەگرتووی.

٤٩٥١ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ، قَالَ: سَمِعْتُ جُنْدَبًا الْبَجَلِيَّ، قَالَتِ امْرَأَةٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أُرَى صَاحِبَكَ إِلاَّ أَبْطَأَكَ. فَنَزَلَتْ ﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ۝٣ ﴾ الضحى[1].

---

(١) بروانە: ١١٢٤.

٤٩٥١ -ئەسوەدی كوڕی قەیس وتی: لە جوندەبی بەجەلیم ﷺ بیست وتی: ئافرەتێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان هاوڕێكەت (جیبریل ﷺ) وای لێكردووی سست بی (لە قورئان خوێندندا)، بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (پەروەردگارت وازی لێ نەهێناوی و لێت دلگیر نەبوو).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٩٤ - سورة ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ﴾

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿وِزْرَكَ ﴿٢﴾﴾ الشرح: فِي الجَاهِلِيَّةِ. ﴿أَنقَضَ ﴿٣﴾﴾ الشرح: أَثْقَلَ. ﴿مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٥﴾﴾ الشرح: قَالَ ابن عُيَيْنَةَ: أَيْ مَعَ ذَلِكَ العُسْرِ يُسْرًا آخَرَ، كَقَوْلِهِ: ﴿قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ ﴿٥٢﴾﴾ التوبة: وَلَنْ يَغْلِبَ عُسْرٌ يُسْرَيْنِ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿فَٱنصَبْ ﴿٧﴾﴾ الشرح: فِي حَاجَتِكَ إِلى رَبِّكَ. وَيُذْكَرُ عَنِ ابن عَبَّاسٍ: ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ ﴿١﴾﴾ الشرح: شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلإِسْلَامِ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٩٤ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ﴾[1]

-موجاهید دەڵێ: ﴿وِزْرَكَ﴾: (باری گران) لە سەردەمی نەفامی دا. ﴿أَنقَضَ﴾: قورسی كردبوو.

﴿مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا﴾: ئیبنو عویەینە دەڵێ: لەگەڵ ئەو ناڕەحەتیەدا ئاسانییەكی تر هەیە، وەك ئەم فەرمایشتە (ئایا چاوەڕوانی چی دەكەن بۆ ئێمە بێجگە لە یەكێ

(١) ناویشی: سوڕەتی شەرحە.

له دوو شته زۆر چاكه‌كه (سه‌ركه‌وتن یا شه‌هیدبوون) )، وه هه‌رگیز ناڕه‌حه‌تیه‌ك زاڵ نابێت به‌سه‌ر دوو ئاسانیدا.

-موجاهید ده‌ڵێ: ﴿ فَٱنصَبۡ ﴾: (خۆت ماندوو بكه) له پێویستی (پاڕانه‌وه‌ی) خۆتدا بۆ لای په‌روه‌ردگارت.

-وه له ئیبنو عه‌بباسه‌وه ده‌گێردرێته‌وه كه ده‌رباره‌ی: ﴿ أَلَمۡ نَشۡرَحۡ ﴾: وتوویه‌تی: خوا سینه‌ی گوشاد كردووه بۆ ئیسلام و مسوڵمان بوون.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٩٥ - سورة ﴿ وَٱلتِّينِ ﴾

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: هُوَ التِّينُ وَالزَّيْتُونُ الذِي يَأْكُلُ النَّاسُ. يُقَالُ: ﴿ فَمَا يُكَذِّبُكَ ﴿٧﴾ ﴾ التين: فَمَا الذِي يُكَذِّبُكَ بِأَنَّ النَّاسَ يُدَانُونَ بِأَعْمَالِهِمْ، كَأَنَّهُ قَالَ: وَمَنْ يَقْدِرُ عَلَى تَكْذِيبِكَ بِالثَّوَابِ وَالْعِقَابِ

## به ناوی خوای به‌خشنده‌ی میهره‌بان

## ٩٥ - (ته‌فسیری) سوره‌تی﴿ وَٱلتِّينِ ﴾: [١]

-موجاهید ده‌ڵێ: ئه‌و هه‌نجیر و زه‌یتونه‌یه كه خه‌ڵكی ده‌یخۆن، وه ده‌وترێت: ﴿ فَمَا يُكَذِّبُكَ ﴾: جا چ شتێك بێ بڕوات ده‌كات كه خه‌ڵك به گوێره‌ی كرده‌وه‌كانیان پاداشت و سزا بدرێنه‌وه؟ وه‌ك ئه‌وه وایه بڵێ: كێ ده‌توانێت بێ باوه‌ڕت كات به پاداشت و سزا وه‌رگرتن.

---

(١) پێی ده‌ڵێن سوره‌تی تین.

## ١ - بابٌ

٤٩٥٢ - حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَدِيٌّ، قَالَ: سَمِعْتُ الْبَرَاءَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ فِي سَفَرٍ فَقَرَأَ فِي الْعِشَاءِ فِي إِحْدَى الرَّكْعَتَيْنِ بِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ. ﴿تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾﴾ التين: الْخَلْقِ[1].

## ١ - باسێک

**٤٩٥٢ -عەدلی دەڵێ: لە بەڕائم ﷺ بیست گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا لە سەفەرێکدا لە نوێژی عیشادا لە یەکێك لە دوو ڕکاتەکەدا سورەتی (والتِّينِ وَالزَّيْتُونِ)ى خوێند.﴿تَقْوِيمٍ﴾: دروست کردن (شکڵ و شێوە).**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٩٦ - سورة ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ﴾

وَقَالَ قُتَيْبَةُ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَتِيقٍ، عَنِ الحَسَنِ قَالَ: اكْتُبْ فِي المُصْحَفِ فِي أَوَّلِ الإِمَامِ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾﴾ الفاتحة، وَاجْعَلْ بَيْنَ السُّورَتَيْنِ خَطًّا. وَقَالَ مُجَاهِدٌ:﴿نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾﴾ العلق:عَشِيرَتَهُ.﴿ٱلزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾﴾ العلق: المَلاَئِكَةَ.وَقَالَ مَعْمَرٌ﴿ٱلرُّجْعَىٰٓ ﴿٨﴾﴾ العلق: المَرْجِعُ. ﴿لَنَسْفَعًۢا ﴿١٥﴾﴾ العلق: قَالَ: لَنَأْخُذَنْ و لَنَسْفَعَن بِالنُّونِ وَهْيَ الخَفِيفَةُ، سَفَعْتُ بِيَدِهِ أَخَذْتُ.

---

(١) بروانە: ٧٦٧.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٩٦ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴾[١]

**قوتەیبە وتی: حەمماد بۆی گێڕاینەوە لە یەحیای کوڕی عەتیقەوە گێڕایەوە ئەویش لە حەسەنەوە وتی: لە قورئاندا لەسەرەتای قورئانەوە (سوڕەتی فاتیحەوە) ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾: بنووسە، وە لە نێوان هەردوو سوڕەتێکدا خەتێك دانێ و بیکێشە.**

**-موجاهید دەڵێ: ﴿ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ ﴾: هۆز و عەشیرەتەکەی. ﴿ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴾: [٢]: فریشتەکان. ﴿ ٱلرُّجْعَىٰٓ ﴾: گەڕانەوە. ﴿ لَنَسْفَعًۢا ﴾: بێگومان دەیگرین، ڕادەکێشین. (لَنَسْفَعَن) [٣] نونی تەوکیدی یەك نونە لە (سَفَعْتُ بِيَدِهِ) هاتووە کە بە مانای: دەستیم گرت دێت.**

## ١ - بابٌ

٤٩٥٣ - حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ مَرْوَانَ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ أَبِي رِزْمَةَ، أَخْبَرَنَا أَبُو صَالِحٍ سَلْمَوَيْهِ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ، عَنْ يُونُسَ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ شِهَابٍ، أَنَّ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ أَخْبَرَهُ أَنَّ عَائِشَةَ - زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺقَالَتْ كَانَ أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الرُّؤْيَا الصَّادِقَةُ فِي النَّوْمِ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ، ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الْخَلاَءُ فَكَانَ يَلْحَقُ بِغَارِ حِرَاءٍ فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ -قَالَ وَالتَّحَنُّثُ التَّعَبُّدُ - اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى أَهْلِهِ، وَيَتَزَوَّدُ لِذَلِكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ فَيَتَزَوَّدُ بِمِثْلِهَا، حَتَّى فَجِئَهُ الْحَقُّ وَهْوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ،

---

(١) سوڕەتی عەلەقیش ناو دەبرێ.

(٢) فریشتەی زەبیر بەدەست، کار بە دەستانی دۆزەخ.

(٣) لە قورئاندا بە ئەلف نوسراوە کە تەنوینی سەرە (لَنَسْفَعاً)

فَجَاءَهُ الْمَلَكُ فَقَالَ: اقْرَأْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا أَنَا بِقَارِئٍ». قَالَ: «فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجُهْدُ ثُمَّ أَرْسَلَنِي. فَقَالَ اقْرَأْ. قُلْتُ مَا أَنَا بِقَارِئٍ. فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجُهْدُ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي. فَقَالَ: اقْرَأْ. قُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ. فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ حتَّى بَلَغَ مِنِّي الجُهْدُ ثُمَّ أَرْسَلَنِي. فَقَالَ:﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ۝٢ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ۝٣ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ۝٤ ﴾ العلق: ". الآيَاتِ إلى قَوْلِهِ ﴿ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ۝٥ ﴾ العلق:. فَرَجَعَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تَرْجُفُ بَوَادِرُهُ حَتَّى دَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ فَقَالَ: "زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي". فَزَمَّلُوهُ حَتَّى ذَهَبَ عَنْهُ الرَّوْعُ، قَالَ لَخدِيجَةَ: "أَيْ خَدِيجَةُ، مَا لِي، لَقَدْ خَشِيتُ على نَفْسِي". فَأَخْبَرَهَا الخَبَرَ. قَالَتْ خَدِيجَةُ: كَلاَّ أَبْشِرْ، فَوَاللَّهِ لَا يُخْزِيكَ اللَّهُ أَبَدًا، فَوَاللَّهِ إِنَّكَ لَتَصِل الرَّحِمَ، وَتَصْدُقُ الَحدِيثَ، وَتَحْمِلُ الكَلَّ، وتَكْسِبُ الَمعْدُومَ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الَحقِّ. فَانْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ بْنَ نَوْفَلٍ وَهْوَ ابن عَمِّ خَدِيجَةُ أَخِي أَبِيهَا، وَكَانَ امْرَأً تَنَصَّرَ فِي الجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ يَكْتُبُ الكِتَابَ العَرَبِيَّ وَيَكْتُبُ مِنَ الإِنْجِيلِ بِالْعَرَبِيَّةِ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكْتُبَ، وَكَانَ شَيْخًا كَبِيراً قَدْ عَمِيَ فَقَالَتْ خَدِيجَةُ: يَا ابن عَمِّ، اسْمَعْ مِنِ ابن أَخِيكَ. قَالَ وَرَقَةُ: يَا ابن أَخِي، مَاذَا تَرى؟ فَأَخْبَرَهُ النَّبِيُّ خَبَرَ مَا رَأَى. فَقَالَ وَرَقَةُ: هذا النَّامُوسُ الذِي أنْزِلَ عَلَى مُوسَى، لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعًا، لَيْتَنِي أَكُون حَيًّا -ذَكَرَ حَرْفًا - قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: "أَوَمُخْرِجِيَّ هُمْ؟ ". قَالَ وَرَقَة: نَعَمْ، لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ بِمَا جِئْتَ بِهِ إِلَّا أُوذِيَ، وإِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ حَيًّا أَنْصُرْكَ نَصْرًا مُؤَزَّرًا. ثمَّ؛ يَنْشَبْ وَرَقَةُ أَنْ تُوُفِّيَ، وَفَتَرَ الوَحْيُ، فَتْرَة حَتَّى حَزِنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[1].

(١) بروانه: ٣.

## ١ - باسێک

٤٩٥٣ -ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە کە عوروەی کوڕی زوبەیر بۆی گێڕایەوە کە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: سەرەتای نیگا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بە خەو بینینی ڕاست لە خەودا دەستی پێ کرا، جا هەر خەوێکی دەبینی وەك ڕۆژی ڕووناك دەهاتە دی [1]، لە پاشان گۆشەگیری لا خۆشەویست کرا، ئیتر (مانگی ڕەمەزان) دەڕۆشت بۆ ئەشکەوتی حیڕا و لەوێدا بەندایەتی دەکرد - (التَّحَنُّثُ) واتە: بەندایەتی - بەچەند شەو لەوێ دەمایەوە (بەندایەتی دەکرد) پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای خێزانی، وە بۆ ئەو کارە توێشووی لەگەڵ خۆی دەبرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆ لای خەدیجە ﵂، بەشی ئەوەندەی تر خواردنی لەگەڵ خۆی دەبرد (بەم شێوە بەردەوام بوو)، هەتا هەقی بۆ هات لە کاتێکدا لە ئەشکەوتی حیڕا دابوو، ئیتر فریشتەکە [2] هات بۆ لای و فەرمووی: بخوێنە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی ((من خوێندەوار نیم)) فەرمووی: ((ئەنجا گرتمی و (زۆر بە توندی) باوەشی پیاکردم تا توانام لێ بڕا، پاشان بەرەڵڵای کردم و فەرمووی: بخوێنە، وتم: ((من خوێندەوار نیم، ئینجا بۆ دووەم جار گرتمی و گوشیمی بەخۆیەوە تا توانام لێ بڕا، لە پاشان بەرەڵڵای کردم و وتی: بخوێنە، وتم خوێندەوار نیم بۆ سێیەم جار گرتمی و گوشیمی بەخۆیەوە تا توانام لێ بڕا، لە پاشان بەرەڵڵای کردم و فەرمووی: بخوێنە بەناوی پەروەردگارتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە، مرۆڤی دروست کردووە لە خوێنێکی بەستوو، بخوێنە پەروەردگاری تۆ (لە هەموو کەس) بەخشندەترە ئەوەی کە (مرۆڤی) فێری (نووسین) کردووە بەقەڵەم).

---

(١) یان وەك هەڵهاتنی ڕۆژ دەهاتە دی.

(٢) کە جبریلە ﵇.

ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ بەم (پێنج ئایەتەوە) گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، لەترسا دڵی ئەلەرزی هەتا ڕۆشتە ژوورەوە بۆ لای خەدیجە رضي الله عنها و فەرمووی: ((دامپۆشن، دامپۆشن))، ئەوانیش دایان پۆشی تا ترسەکە بەسەر چوو، بە خەدیجەی فەرموو: ((ئەی خەدیجە من چیمە. سوێند بەخوا بەڕاستی لەخۆم ترسام))[1]، ئینجا هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە، خەدیجەش رضي الله عنها وتی: نا (وانیە) مژدەت لێ بێ جا سوێند بەخوا، خوا هەرگیز تۆ ڕیسوا ناکات، دەی سوێند بەخوا تۆ پەیوەندی خزمایەتی بەجێ دێنی لە قسەت دا، ڕاستگۆیت کاری لاواز و بێ دەسەلات ئەگرێتە ئەستۆ.

ماڵ دەدەیت بە نەداران و خواردن دەرخواردی میوان دەدەیت، یارمەتی لێقەوماوان و ڕووداوێك دەدەیت بەسەر خەڵكدا بێت لە ڕێی هەقدا.

ئیتر خەدیجە رضي الله عنها لەگەڵ خۆی بردی هەتا گەیاندیە لای وەرەقەی کوڕی نەوفل -کە کوڕە مامی خەدیجە بوو برای باوکی خەدیجە بوو، کەسێك بوو پێشتر لەسەردەمی نەفامیدا بوو بوویە گاور و ئەو بەزمانی عەرەبی نووسینی دەنووسی، بەزمانی عەرەبی ئینجیلی دەنووسیەوە ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بوایە کە بینوسێت، وەرەقە پیاوێکی پیری بەتەمەن بوو کوێر بوو بوو - خەدیجە وتی: ئەی مامە گوێ بگرە لەم برازای خۆت [2]، وەرەقەش وتی: ئەی برازای خۆم، چیت بینیوە؟ پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی دیبووی بۆی گێڕایەوە وەرەقەش وتی: ئەوە ئەو فریشتەیە کە [3] خوا نێرراوەتە خوارەوە بۆ سەر مووسا عليه السلام، خۆزگە لە کاتی بانگەوازەکەیدا لاو بوومایە، خۆزگە زیندوو بوومایە - وشەیەکی وت - پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( ئایا گەلەکەم دەرم دەکەن؟

---

(١) کە بمرم یا نەخۆش بکەوم لە ترسی ئەوەی کە دیم و بەسەرما هات.

(٢) مەبەستی پێغەمبەر بوو ﷺ.

(٣) کە جبریلە عليه السلام.

وەرەقە وتی: بەڵێ چونکە هەر کەسێك وێنەی ئەم پەیامەی تۆی هێنابێ ئەزیەت و ئازار دراوە، جا ئەگەر گەشتمە ئەو ڕۆژگارەی تۆ (پێغەمبەریەکەت ئاشکرا دەکەیت) یارمەتیەکی زۆر باشت دەدەم، پاشان زۆری پێ نەچوو وەرەقە مرد، دابەزینی نیگاش بۆ ماوەیەك بچڕا و نەهات (بە شێوەیە وەستا و بچڕا) هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دلگران بوو.

٤٩٥٤ - قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ شِهَابٍ: فَأَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ، أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيَّ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهْوَ يُحَدِّثُ عَنْ فَتْرَةِ الْوَحْيِ، قَالَ فِي حَدِيثِهِ: «بَيْنَا أَنَا أَمْشِي سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ فَرَفَعْتُ بَصَرِي، فَإِذَا الْمَلَكُ الَّذِي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَفَرِقْتُ مِنْهُ، فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي». فَدَثَّرُوهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ﴿٥﴾﴾ المدثر: قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: وَهْيَ الأَوْثَانُ الَّتِي كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يَعْبُدُونَ. قَالَ: ثُمَّ تَتَابَعَ الْوَحْيُ[1].

٤٩٥٤ -جابیری کوڕ عەبدوڵڵای ئەنصاری رضي الله عنهما وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی دواکەوتنی نیگای دەکرد و لە باسەکەیدا فەرمووی: ((لە کاتێکدا بەڕێگادا دەڕۆشتم گوێم لە دەنگێك بوو لە ئاسمانەوە، جا چاوم بەرز کردەوە (بۆ ئاسمان) یەکسەر ئەو فریشتەیەم بینی کە لە ئەشکەوتی حیڕا هات بۆ لام، لەسەر کورسی یەك لە نێوان ئاسمان و زەویدا دانیشتبوو، منیش زۆر لێی ترسام و گەڕامەوە (بۆ ماڵەوە) و وتم: دامپۆشن، دامپۆشن)) ئەوانیش دایان پۆشی، بەو هۆیەوە خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتانەی دابەزاند: (ئەی ئەو کەسەی خۆت

(١) بڕوانە: ٤.

پێچاوەتەوە، هەستە (خەڵك) بێدار کەرەوە و پەروەردگارت بە گەورە بگرە، وە پۆشاکت پاك ڕاگرە)

ئەبو سەلەمە دەڵێ: (الرُّجزُ): ئەو بت و پەرستراوانەن کە جاران خەڵکی سەردەمی نەفامی دەیان پەرستن.

جابیر وتی: لە پاشان نیگا بەگەرمی بەردەوام بوو (دادەبەزی).

## ٢ - بابٌ: ﴿ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ﴾ العلق

٤٩٥٥ - حَدَّثَنَا ابْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ أَنَّ عَائِشَةَ ﵂قَالَتْ أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ فَجَاءَهُ الْمَلَكُ فَقَالَ: ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ ﴾ العلق:

## ٢ - باسێك: (مرۆڤی دروست كردووه له خوێنێكی بهستوو)

٤٩٥٥ - عائیشە ﵂ دەڵێ: سەرەتای دەست پێکردنی نیگا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەخەو بینینی چاك و ڕاست دەستی پێکرا، ئینجا فریشتەکە (جیبریل ﵇ ) هات بۆ خزمەتی و فەرمووی: (( (ئەی موحەممەد ﷺ) بخوێنە بەناوی پەروەردگارتەوە، کە هەموو شتێکی دروست کردووە، مرۆڤی دروست کردووە لەخوێنێکی بەستوو، بخوێنە پەروەردگاری تۆ (لە هەموو کەس) بەخشندەترە).

## ٣ - بابٌ: قولُهُ: ﴿ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ۝٣ ﴾ العلق

٤٩٥٦ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ ح وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ قَالَ مُحَمَّدٌ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الرُّؤْيَا الصَّادِقَةُ جَاءَهُ الْمَلَكُ فَقَالَ: ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ۝٢ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ۝٣ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ۝٤ ﴾ العلق.

## ٣ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (بخوێنە پەروەردگاری تۆ لە هەموو کەس بەخشندە ترە)

**٤٩٥٦ - عائیشە ﵂ دەڵێ: سەرەتای دەست پێکردنی نیگا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەخەو بینینی چاك و ڕاست دەستی پێکرا، ئینجا فریشتەکە (جیبریل ﵇) هات بۆ خزمەتی و فەرمووی: (( (ئەی موحەممەد ﷺ) بخوێنە بەناوی پەروەردگارتەوە، کە هەموو شتێکی دروست کردووە، مرۆڤی دروست کردووە لە خوێنێکی بەستوو بخوێنە پەروەردگاری تۆ (لە هەموو کەس) بەخشندەترە)، ئەوەی کە (مرۆڤ) فێر (ی نووسین) کردووە بە قەڵەم ).**

## ٤ - بابٌ: ﴿ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ۝٤ ﴾ العلق

٤٩٥٧ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عُرْوَةَ قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: فَرَجَعَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى خَدِيجَةَ فَقَالَ: «زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي». فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[1].

---

(١) بڕوانە: ٣.

## ٤ - باسێک: (ئەوەی کە (مرۆڤی) فێری (نووسین) کردووە بە قەڵەم)

**٤٥٥٧ -عوروە گێڕایەوە دەڵێ: عائیشە ﵂ وتی: ئینجا پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ لای خەدیجە ﵂ و فەرمووی: ((دامپۆشن دامپۆشن))، ئەنجا فەرموودەکەی (بەدرێژی) گێڕایەوە.**

**٥ - بابٌ:** ﴿ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾ ﴾ العلق.

٤٩٥٨ - حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ عَبْدِ الْكَرِيمِ الْجَزَرِيِّ، عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ: لَئِنْ رَأَيْتُ مُحَمَّدًا يُصَلِّي عِنْدَ الْكَعْبَةِ لأَطَأَنَّ عَلَى عُنُقِهِ. فَبَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «لَوْ فَعَلَهُ لأَخَذَتْهُ الْمَلاَئِكَةُ». تَابَعَهُ عَمْرُو بْنُ خَالِدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ عَبْدِ الْكَرِيمِ.

## ٥ – باسێک : (وا نییە (کەبیری لێ دەکاتەوە) بەڕاستی ئەگەر واز نەهێنێ ڕای دەکێشین (بەقژی) پێشە سەری پێشەسەرێکی درۆزنی بەهەڵەداچوو)

**٤٩٥٨ -ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: ئەبو جەهل وتی: سوێند بەخوا ئەگەر موحەممەد ببینم لە پەنا کەعبەدا نوێژ بکات پێ دەخەمە سەر بۆتەقەی ملی، ئەو وتەیە گەشت بە پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی: ((ئەگەر ئەو کارە بکات بێگومان فریشتەکان سزای دەدەن (پارچە پارچەی دەکەن) )).**

**-عەمری کوڕی خالید گێڕاویەتیەوە لەعوبەیدوڵڵاوە ئەویش لەعەبدولکەریمە بەم گێڕانەوە پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عەبدوڕەزاقی کردووە.**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ٩٧ - سورة ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ ﴾:

يُقَالُ: المَطْلَعُ هُوَ الطُّلُوعُ، وَالْمَطْلِعُ المَوْضِعُ الذِي يُطْلَعُ مِنْهُ. ﴿ أَنزَلْنَٰهُ ﴿١﴾ ﴾ القدر: الهَاءُ كِنَايَةٌ عَنِ القُرْآنِ أَنْزَلْنَاهُ مَخْرَجَ الجَمِيعِ، وَالْمُنْزِلُ هُوَ اللَّهُ، وَالْعَرَبُ تُوَكِّدُ فِعْلَ الوَاحِدِ فَتَجْعَلُهُ بِلَفْظِ الجَمِيعِ، لِيَكُونَ أَثْبَتَ وَأَوْكَدَ.

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٩٧ - (تەفسیری) سورەتی ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ ﴾:[1]

**دەوترێت (المَطْلَعُ)[2]: بریتییە لە هەڵهاتنی شەبەق، (وَالْمَطْلِعُ): ئەو شوێنە خۆری لێوە هەڵدێت. ﴿ أَنزَلْنَٰهُ ﴾: ئەو پیتی (هُ) مەبەست پێی قورئانە ﴿ أَنزَلْنَٰهُ ﴾: بەشێوەی گشتی و کۆ بەکاری هێناوە کەچی دابەزێنەرەکەش خوای تاك و تەنهایە، چونکە عەرەبەکان کارێك کە بکەرەکەی کەسێکە بەهێز و دووپاتی دەکاتەوە بە بەکارهێنانی بکەری کۆ و گشتی بۆی بۆ ئەوەی چەسپاوتر و بەهێزتربێت.**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ٩٨ - سورة ﴿ لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾

﴿ مُنفَكِّينَ ﴿١﴾ ﴾ البينة: زَائِلِينَ. ﴿ قَيِّمَةٌ ﴿٣﴾ ﴾ البينة: القَائِمَةُ دِينُ القَيِّمَةِ، أَضَافَ الدِّينَ إِلَى المُؤَنَّثِ.

---

(١) سورەتی قەدر.

(٢) سەرەتای ڕۆژ، کات و ساتی بەرەبەیان

# بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٩٨ - (تەفسیری) سوورەتی ﴿ لَمۡ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾[١]

﴿ مُنفَكِّينَ ﴾:[٢] بەرەڵایان، واز لێ هێنراوان. ﴿ قَيِّمَةٌ ﴾: ڕاست و دروست، بەنرخ.

(دِينُ القَيِّمَةِ) دینی داوتە پاڵ مێینە، (چونکە دین بەمانای (ملة)[٣] یە).

## ١ - بابٌ

٤٩٥٩ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ سَمِعْتُ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لأُبَيٍّ: «إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ ﴿ لَمۡ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ۝١ ﴾ البينة: قَالَ: وَسَمَّانِي؟ قَالَ: «نَعَمْ». فَبَكَى[٤].

## ١ - باسێک

**٤٩٥٩ - ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەئوبەی فەرموو: ((بێگومان خوای گەورە فەرمانی پێ کردم کە﴿ لَمۡ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾: بەسەرتدا بخوێنم، ئوبەیی وتی: خوای گەورە ناوی هێناوم؟ فەرمووی: ((بەڵێ ناوی هێناوی)) جا ئوبەیی گریا.**

---

(١) سوورەتی بەیینە.

(٢) بەمانای: واز هێنەرانیش ماناکراوە.

(٣) کە وشەکە مێ یە.

(٤) بڕوانە: ٣٨٠٩.

## ٢ - بابٌ

٤٩٦٠ - حَدَّثَنَا حَسَّانُ بْنُ حَسَّانَ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺقَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لأُبَيٍّ: «إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ». قَالَ أُبَيٌّ: اللَّهُ سَمَّانِي لَكَ؟ قَالَ: «اللَّهُ سَمَّاكَ لِي». فَجَعَلَ أُبَيٌّ يَبْكِي. قَالَ قَتَادَةُ: فَأُنْبِئْتُ أَنَّهُ قَرَأَ عَلَيْهِ: ﴿ لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ﴿١﴾ ﴾ البينة:[1].

## ٢ - باسێک

**٤٩٦٠ -ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەئوبەی فەرموو: ((بێگومان خوا فەرمانی پێ کردووم کە قورئان بخوێنم بەسەرت دا))، ئوبەی ﷺ وتی: خوا ناوی منی هێناوە بۆت؟ فەرمووی: ((خوا ناوی تۆی هێنا بۆم))، ئیتر ئوبەی دەست کرد بە گریان، قەتادە دەڵێ: جا هەواڵم پێ درا کە (سورەتی) ﴿ لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ﴾: بەسەردا خوێندووە.**

## ٣ - بابٌ

٤٩٦١ - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي دَاوُدَ أَبُو جَعْفَرٍ الْمُنَادِي، حَدَّثَنَا رَوْحٌ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ لأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: «إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي أَنْ أُقْرِئَكَ الْقُرْآنَ». قَالَ: اللَّهُ سَمَّانِي لَكَ! قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ: وَقَدْ ذُكِرْتُ عِنْدَ رَبِّ الْعَالَمِينَ؟ قَالَ: «نَعَمْ». فَذَرَفَتْ عَيْنَاهُ[2].

---

(١) بروانە: ٣٨٠٩.

(٢) بروانە: ٣٨٠٩.

## ٣ - باسێک

٤٩٦١ -ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئوبەی کوڕی کەعبی فەرموو: ((بەدڵنیاییەوە خوا فەرمانی پێکردووم کەقورئانت بۆبخوێنم))، (ئوبەی) وتی: ئایا خوا ناوی منی هێنا بۆت؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((بەڵێ)) وتی: من لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە ناو هێنراوم؟ فەرمووی((بەڵێ)) ئیتر هەردوو چاوی فرمێسکیان پیا هاتە خوارەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ٩٩ -سورة ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا﴾

يُقَالُ: ﴿أَوْحَىٰ لَهَا ۝٥﴾ الزلزلة: أَوْحَى إِلَيْهَا، وَوَحَى لَهَا وَوَحَى إِلَيْهَا وَاحِدٌ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٩٩ - (تەفسیری) سورەتی ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا﴾:[١]

دەوترێ: ﴿أَوْحَىٰ لَهَا﴾: نیگای بۆلا کرد، (وَحَى لَهَا) و (وَحَى إِلَيْهَا) لەمانادا وەك یەك وان[٢].

---

(١) ناونیشانی سورەتی: زەلزەلەیە.

(٢) هەر چوار ڕستەکە هەمان مانا دەگەیەنن (أوحى لها، أوحى إلها وَحَى لها، وَحى إليها) بەمانای، نیگای بۆ کردوون.

## ١ - بابُ قوْلِه: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ ﴾ الزلزلة

٤٩٦٢ - حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ السَّمَّانِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺقَالَ: «الْخَيْلُ لِثَلاَثَةٍ: لِرَجُلٍ أَجْرٌ، وَلِرَجُلٍ سِتْرٌ، وَعَلَى رَجُلٍ وِزْرٌ، فَأَمَّا الذِي لَهُ أَجْرٌ، فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللهِ فَأَطَالَ لَهَا فِي مَرْجٍ أَوْ رَوْضَةٍ، فَمَا أَصَابَتْ فِي طِيَلِهَا ذَلِكَ فِي الْمَرْجِ وَالرَّوْضَةِ كَانَ لَهُ حَسَنَاتٍ، وَلَوْ أَنَّهَا قَطَعَتْ طِيَلَهَا فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ كَانَتْ آثَارُهَا وَأَرْوَاثُهَا حَسَنَاتٍ لَهُ، وَلَوْ أَنَّهَا مَرَّتْ بِنَهَرٍ فَشَرِبَتْ مِنْهُ وَلَمْ يُرِدْ أَنْ يَسْقِيَ بِهِ كَانَ ذَلِكَ حَسَنَاتٍ لَهُ، فَهْيَ لِذَلِكَ الرَّجُلِ أَجْرٌ، وَرَجُلٌ رَبَطَهَا تَغَنِّيًا وَتَعَفُّفًا وَلَمْ يَنْسَ حَقَّ اللهِ فِي رِقَابِهَا وَلاَ ظُهُورِهَا، فَهْيَ لَهُ سِتْرٌ، وَرَجُلٌ رَبَطَهَا فَخْرًا وَرِئَاءً وَنِوَاءً، فَهْيَ عَلَى ذَلِكَ وِزْرٌ". فَسُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الْحُمُرِ. قَالَ: «مَا أَنْزَلَ اللهُ عَلَيَّ فِيهَا إِلاَّ هَذِهِ الآيَةَ الْفَاذَّةَ الْجَامِعَةَ: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨ ﴾ الزلزلة:»[1].

## ١ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئینجا هەرکەسێک بە ئەندازەی هەرە وردیلەیە چاکەی کردبێ دەیبینێتەوە )

**٤٩٦٢ - ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێرێتەوە کە پێغەمبەری خوار فەرمووی: ((ئەسپ بۆ سێ پیاوە: بۆ پیاوێك پاداشتە، بۆ پیاوێکیش داپۆشەر (ی کەموکوڕییەکان)ە، بۆ پیاوێکیش تاوان و گوناهە، جا ئەوەیان بۆی دەبێتە پاداشت ئەوە پیاوێکە دایبەستێت بۆ غەزا و خەبات لە رێی خوادا، ئەنجا پەتی بۆ درێژ دەکات لە لەوەڕگا یا سەوزایی و مێرگێکدا، جا لەو پەت بۆ درێژ کردنەدا چەند بلەوەڕێ**

(١) بڕوانە: ٢٣٧١.

لەو لەوەڕگا و مێرگ و سەوزاییەدا، ئەوە هەمووی بۆی دەبێتە چاکە و پاداشت، خۆ ئەگەر پەتەکەی بپچڕێنێت و سەرێ یا دوو سەر غار کات، ئەوە شوێن سمەکانی و تەرس و میزەکەی دەبێتە چاکە بۆی، وە ئەگەر بەلای ڕووبارێکدا بڕوات و لێی بخواتەوە با خاوەنەکەشی نەیەوێت ئاوی بدات ئەوە ئەو ئاو خواردنەوەش بە چاکە بۆی دەنوسرێت، کەواتە بۆ ئەو پیاوە پاداشتە. پیاوێکیش ئەسپەکە دابەستێت تا لە خەڵك بێ نیاز بێت و چاوی لە دەستی خەڵك نەبێت، وە مافی خوایشی لەبیر بێ تێیدا لە زەکات لێ دانیان و سواربوونیان بۆ خەبات، جا ئەسپ بۆ ئەوە داپۆشەری (کەم و کوڕییە). پیاوێکیش دایبەستووە بەمەستی شانازی و ڕوپامایی و دوژمنایەتی کردن (ی خەڵکی مسوڵمان)، جا ئەسپ بۆ ئەو پیاوە تاوانە و گوناهە)).

ئەنجا پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا دەربارەی گوێدرێژ فەرمووی: ((دەربارەی گوێدرێژ خوا هیچ شتێکی بۆ دانەبەزاندووم جگە لەم ئایەتە گشتگیرە کەم وێنەیە: (ئەنجا هەر کەسێك بە ئەندازەی هەر وردیلەیەك چاکەی کردبێت دەیبینێتەوە، وە هەرکەسێك بە ئەندازەی هەر وردیلەیەك خراپەی کردبێت دەیبینێتەوە).

## ٢ - بابٌ: ﴿ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ ﴾ الزلزلة

٤٩٦٣ - حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ السَّمَّانِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ -رضي الله عنه-: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْحُمُرِ فَقَالَ: «لَمْ يُنْزَلْ عَلَيَّ فِيهَا شَيْءٌ إِلاَّ هَذِهِ الآيَةُ الْجَامِعَةُ الْفَاذَّةُ ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ ﴾ الزلزلة:»[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٣٧١.

## ٢ - باسێک: (وە هەر کەسێک بە ئەندازەی هەر وردیلەیەک خراپەی کردبێ دەیبینێتەوە)

٤٩٦٣ ـ ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا دەربارەی گوێدرێژ، ئەویش فەرمووی: ((لە بارەی گوێدرێژەوە هیچ شتێکم بۆ دانەبەزێنراوە، جگە لەم ئایەتە گشتگیرە کەم وێنەیە: (ئینجا هەر کەسێك بەئەندازەی هەر وردیلەیەك چاکەی کردبێ دەیبینێتەوە، وە هەر کەسێك بە ئەندازەی هەر وردیلەیەك خراپەی کردبێ دەیبینێتەوە).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١٠٠ - سورة ﴿ وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ﴾:

وقَالَ مُجَاهِدٌ: الكَنُودُ: الكَفُورُ، يُقَالُ: ﴿ فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا ﴿٤﴾ ﴾ العاديات: رَفَعْنَ بِهِ غُبَارًا ﴿ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ ﴿٨﴾ ﴾ العاديات: مِنْ أَجْلِ حُبِّ الخَيْرِ. ﴿ لَشَدِيدٌ ﴿٨﴾ ﴾ العاديات: لَبَخِيلٌ وَيُقَالُ لِلْبَخِيلِ: شَدِيدٌ ﴿ وَحُصِّلَ ﴿١٠﴾ ﴾ العاديات: مُيِّزَ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٠٠ - (تەفسیری) سورەتی ﴿ وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ﴾:[1]

موجاهید دەڵێ: (الكَنُودُ) نا سوپاس، سپڵە و ناشکور. دەوترێت: ﴿ فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا ﴾: کە بەو (هێرش بردنە) تەپ و تۆز هەڵدەستێنن. ﴿ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ ﴾: لە پێناو

(١) ناویشی: عادییاتە.

خۆش ویستنی ماڵ و سامان ﴿لَشَدِيدٌ ﴿٨﴾﴾: بێگومان ڕژدەیە، چروکە، وە بە چروك و ڕژدە دەوترێ: (شَدِيد).﴿وَحُصِّلَ﴾: جیاکراوتەوە (ئەوەی لە سینە دایە لە چاکە و خراپە).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١٠١ - سورة ﴿ٱلْقَارِعَةُ﴾:

﴿كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ ﴿٤﴾﴾ القارعة: كَغَوْغَاءِ الجَرَادِ يَرْكَبُ بَعْضُهُ بَعْضًا، كَذَلِكَ النَّاسُ يَجُولُ بَعْضُهُمْ فِي بَعْضٍ. ﴿كَٱلْعِهْنِ ﴿٥﴾﴾ القارعة: كَأَلْوَانِ العِهْنِ. وَقَرَأَ عَبْدُ اللَّهِ (كَالصُّوفِ).

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٠١ - (تەفسیری) سورەتی ﴿ٱلْقَارِعَةُ﴾[1]

﴿كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ﴾: وەکو کوللەی زۆر هەندێکی سواری هەندێکی بووبێت، خەڵکیش بەو جۆرەن (لە قیامەتدا) دێن بەناو یەکتری دا. ﴿كَٱلْعِهْنِ﴾: وەك جۆرەکانی خوری. عەبدوڵڵا بە (كَالصُّوفِ) خوێندویەتیەوە.

(١) سورەتی: قاریعە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١٠٢ - سورة ﴿ أَلۡهَىٰكُمُ ﴾:

وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ ٱلتَّكَاثُرُ ۝١ ﴾ التكاثر: مِنَ الأَمْوَالِ وَالأَوْلَادِ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٠٢ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿ أَلۡهَىٰكُمُ ﴾: [1]

**-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ ٱلتَّكَاثُرُ ﴾[2]: لە ماڵ و سامان و منداڵدا.**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١٠٣ - سورة ﴿ وَٱلۡعَصۡرِ ﴾:

وَقَالَ يَحْيَى: العَصر: الدَّهْرُ أَقْسَمَ بِهِ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٠٣ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿ وَٱلۡعَصۡرِ ﴾: [3]

**-یەحیا دەڵێ: (العَصر) کات و زەمان و ڕۆژگارە، (خوا) سوێندی پێ خواردووە.**

(١) سوڕەتی تەکاسور.

(٢) پێشبڕکێ بەزۆری ماڵ و منداڵ.

(٣) سوڕەتی عەسر.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١٠٤ - سورة ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ﴾

﴿ٱلْحُطَمَةِ ﴿٤﴾﴾ الهمزة: اسْمُ النَّارِ، مِثْلُ ﴿سَقَرَ ﴿٤٨﴾﴾ القمر: وَ ﴿لَظَىٰ ﴿١٥﴾﴾ المعارج:

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٠٤ - (تەفسیری) سوڕەتی: ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ﴾:[١]

﴿ٱلْحُطَمَةِ﴾: ناوی ئاگری دۆزەخە، وەك: ﴿سَقَرَ﴾: و ﴿لَظَىٰ﴾: (كە هەردووكیان ناوی دۆزەخن).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١٠٥ - سورة ﴿أَلَمْ تَرَ﴾:

قَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿أَلَمْ تَرَ ﴿١﴾﴾ الفيل: أَلَمْ تَعْلَم.قال مجاهد: ﴿أَبَابِيلَ ﴿٣﴾﴾ الفيل: مُتَتَابِعَةً مُجْتَمِعَةً. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿مِّن سِجِّيلٍ ﴿٤﴾﴾ الفيل: هِيَ سَنْكِ وَكِلْ[٢].

(١) سوڕەتی: هۆمەزە.

(٢) (سَنْكِ) واتە: بەرد (كِل ) واتە: قوڕ. هەردوو وشەكە فارسین كراونەتە عەرەبی.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٠٥ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿أَلَمْ تَرَ﴾:[١]

موجاهید دەڵێ: ﴿أَلَمْ تَرَ﴾: ئایا نەتزانی. موجاهید دەڵێ: ﴿أَبَابِيلَ﴾: پۆل پۆلی یەك لە دوای یەك. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿مِّن سِجِّيلٍ﴾: وردە زیخی گڵین، بەردی قوڕین[٢].

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## ١٠٦ – سورة ﴿لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ﴾

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿لِإِيلَافِ ۝١﴾ قريش: أَلِفُوا ذَلِكَ، فَلَا يَشُقُّ عَلَيْهِمْ فِي الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ﴿وَءَامَنَهُم ۝٤﴾ قريش:.مِنْ كُلِّ عَدُوِّهِمْ فِي حَرَمِهِمْ. قَالَ ابن عُيَيْنَةَ: ﴿لِإِيلَافِ ۝١﴾ قريش: لِنِعْمَتِي على قُرَيْشٍ.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٠٦ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ﴾[٣]

موجاهید دەڵێ: ﴿لِإِيلَافِ﴾: هۆگری هاتووچۆ بووبوون، ناڕەحەت نەبوو بەلایانەوە لە زستان (بۆ یەمەن) و لە هاویندا (بۆ شام) ﴿وَءَامَنَهُم﴾: (لەترس

---

(١) سوڕەتی فیل.

(٢) قوڕێك بوو بێت بە بەرد.

(٣) سوڕەتی قورەیش.

پاراستنی) له هەموو دوژمنێك له سنووری مەككەدا. ئیبنو عویەینه دەڵێ: ﴿ لِإِيلَٰفِ ﴾: بەهۆی بەهرەی خۆمەوه بەسەر قوڕەیشەوه.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١٠٧ - سورة ﴿ أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴾

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ يَدُعُّ ﴿٢﴾ ﴾ الماعون: يَدْفَعُ عَنْ حَقِّهِ، يُقَالُ: هُوَ مِنْ دَعَعْتُ. ﴿ يُدَعُّونَ ﴿١٣﴾ ﴾ الطور: يُدْفَعُونَ. ﴿ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ﴾ الماعون: لاَهُونَ. وَ ﴿ ٱلۡمَاعُونَ ﴿٧﴾ ﴾ الماعون: المَعْرُوفَ كُلُّهُ. وَقَالَ بَعْضُ العَرَبِ: ﴿ ٱلۡمَاعُونَ ﴿٧﴾ ﴾ الماعون: المَاءُ. وَقَالَ عِكْرِمَةُ أَعْلاَهَا الزَّكَاةُ المَفْرُوضَةُ، وَأَدْنَاهَا عَارِيَّةُ المَتَاعِ.

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٠٧ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿ أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴾ [1]

موجاهید دەڵێ: ﴿ يَدُعُّ ﴾: پاڵ دەنێ (بەهەتیوەوە) بۆ وازهێنانی لەمافەكەی، دەوترێت: (يَدُعُّ) له (دَعَعْتُ) [2] هاتووه و وەرگیراوه. ﴿ يُدَعُّونَ ﴾: پاڵیان پێوە دەنرێ ﴿ سَاهُونَ ﴾: بێ ئاگایان. ﴿ ٱلۡمَاعُونَ ﴾: هەموو چاكەیەك، هەندێ له عەرەبەكان دەڵێن: ﴿ ٱلۡمَاعُونَ ﴾: ئاوه. عیكریمه دەڵێ: لای سەرووی (ماعون)

---

(١) سوڕەتی ماعوون.

(٢) واته: توند و دڵڕەقانه پاڵم پێوەنا (ئەلمونجید، ٢/٤٧).

زەكاتی فەرز و پێویستە، لای خوارشی دانی كەل و پەل و شتومەكە بەخەڵك و دراوسێ بەخواستن دواتر بیگێڕنەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١٠٨ - سورة ﴿إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ﴾

وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿شَانِئَكَ ﴿٣﴾﴾ الكوثر: عَدُوَّكَ.

### ١ - بابٌ

٤٩٦٤ - حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ ﷺقَالَ: لَمَّا عُرِجَ بِالنَّبِيِّ ﷺ إِلَى السَّمَاءِ قَالَ: «أَتَيْتُ عَلَى نَهَرٍ حَافَتَاهُ قِبَابُ اللُّؤْلُؤِ مُجَوَّفًا فَقُلْتُ: مَا هَذَا يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: هَذَا الكَوْثَرُ»[1].

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٠٨ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ﴾[2]

ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿شَانِئَكَ﴾: دوژمن و ناحەزت.

### ١ - باسێک

٤٩٦٤ ـ ئەنەس ﷺ دەڵێ: كاتێ پێغەمبەر ﷺ بەرزكرایەوە بۆ ئاسمان فەرمووی: ((ڕۆشتمە سەر ڕووبارێك هەردوو لا و تەنیشتەكانی گومەزی مرواری ناو بۆش بوو، جا وتم: جیبریل ئەمە چییە؟ فەرمووی: ئەمە كەوسەرە)).

(١) بروانە: ٣٥٧٠.

(٢) سوڕەتی كەوسەر.

٤٩٦٥ - حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ يَزِيدَ الْكَاهِلِيُّ، حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂قَالَ: سَأَلْتُهَا عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى:﴿ إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ۝١ ﴾ الكوثر: قَالَتْ: نَهَرٌ أُعْطِيَهُ نَبِيُّكُمْ ﷺ، شَاطِئَاهُ عَلَيْهِ دُرٌّ مُجَوَّفٌ آنِيَتُهُ كَعَدَدِ النُّجُومِ. رَوَاهُ زَكَرِيَّاءُ وَأَبُو الأَحْوَصِ وَمُطَرِّفٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ.

**٤٩٦٥ ـ ئەبو عوبەیدە دەگێڕێتەوە لە عائیشە ﵂ دەڵێ: پرسیاری لە عائیشە کرد لەبارەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بێگومان ئێمە کەوسەرمان بە تۆ بەخشیوە)، عائیشە وتی: کەوسەر ڕووبارێکە دراوە بە پێغەمبەرەکەتان لەسەر هەردوو قەراغ و کەنارەکەی مرواری ناو بۆش دانراوە، پەرداخەکانی بە ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمانن.**

**ـ ئەم فەرموودەیە هەریەك لەزەکەریيا و ئەبو لئەحوەص و موتەڕیف گێڕاویانەتەوە لە ئەبی ئیسحاقەوە.**

٤٩٦٦ - حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، حَدَّثَنَا أَبُو بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ أَنَّهُ قَالَ فِي الْكَوْثَرِ: هُوَ الْخَيْرُ الَّذِي أَعْطَاهُ اللَّهُ إِيَّاهُ. قَالَ أَبُو بِشْرٍ: قُلْتُ لِسَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ: فَإِنَّ النَّاسَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُ نَهَرٌ فِي الْجَنَّةِ. فَقَالَ سَعِيدٌ: النَّهَرُ الَّذِي فِي الْجَنَّةِ مِنَ الْخَيْرِ الَّذِي أَعْطَاهُ اللَّهُ إِيَّاهُ[1].

**٤٩٦٦ ـ ئیبنو عەبباس ﵄ دەربارەی کەوسەر دەڵێ: بریتی لەو خێر و چاکەی خوا داوێتی بە پێغەمبەر ﷺ.**

**ئەبو بیشیر دەڵێ: بە سەعیدی کوڕی جوبەیرم وت: بێگومان خەڵکی لایان وایە کەوسەر ڕووبارێکە لە بەهەشت دا، سەعیدیش وتی: ئەو ڕووبارەی لە بەهەشت دایە یەکێکە لەو چاکانەی کە خوا داوێتی بە پێغەمبەر ﷺ.**

(١) بڕوانە: ٦٥٧٨.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١٠٩ - سورة ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾

يُقَالُ: ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾ ﴾ **الكافرون**: الكُفْرُ. ﴿ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾ ﴾ **الكافرون**: الإِسْلاَمُ وَلَمْ يَقُلْ: دِينِي، لأَنَّ الآيَاتِ بِالنُّونِ فَحُذِفَتِ اليَاءُ كَمَا قَالَ: ﴿ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ ﴾ **الشعراو**: وَ ﴿ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ ﴾ **الشعراو**. وَقَالَ غَيْرُهُ: ﴿ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ ﴾ الكافرون: الآنَ، وَلَا أُجِيبُكُمْ فِيمَا بَقِيَ مِنْ عُمُرِي. ﴿ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٣﴾ ﴾ **الكافرون**: وَهُمُ الذِينَ قَالَ: ﴿ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ﴿٦٤﴾ ﴾ **المائده**[1].

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٠٩ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾:[2]

**دەوترێت: ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴾: واتە بێ باوەڕی و کوفر. ﴿ وَلِىَ دِينِ ﴾: ئیسلام، نەیفەرمووە: (دِينِي) چونکە کۆتایی ئایەتەکان بە پیتی (ن) هاتووە بۆیە پیتی (ی) (دِينِي) لابراوە، وەك ئەم دوو وشەیە: ﴿ يَهْدِينِ ﴾: و ﴿ يَشْفِينِ ﴾:، کەپێشتر: (يَهدينِي و يَشْفِينِي) بوون.**

**-جگە لە فەڕا دەڵێ: ﴿ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴾:[3] ئێستا (ئەوەی ئێوە دەیپەرستن نایپەرستم)، وە لەم بەشەی تەمەنیشم ماوە وەڵامتان نادەمەوە. ﴿ وَلَآ أَنتُمْ**

(١) بروانە: ٦٤، ٦٨.

(٢) سوڕەتی کافیروون.

(٣) واتە: من ئەو (بتان)ـە ناپەرستم کە ئێوە دەیپەرستن.

عَـٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ﴾:[١] وه ئەوان ئەو كەسانەن كه خوا دەربارەيان دەفەرموێ: (وه ئەو (قورئان)ـەی بۆ تۆ نێردراوه لەلايەن پەروەرگارتەوه سەركەش و كوفری زۆربەی ئەوان زياد دەكات).

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١١٠ - سورة ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴾

### ١ - بابٌ

٤٩٦٧ - حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ الرَّبِيعِ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂قَالَتْ مَا صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ صَلاَةً بَعْدَ أَنْ نَزَلَتْ عَلَيْهِ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١﴾ النصر: إِلاَّ يَقُولُ فِيهَا: «سُبْحَانَكَ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي».

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١١٠ - (تەفسيری) سورەتی ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴾[٢]

### ١ - باسێك

٤٩٦٧ - عائيشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەر نوێژێكی بكردايه پاش ئەوەی ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴾[٣] بۆ دابەزی لەو نوێژەدا دەيفەرموو: (سُبْحَانَكَ رَبَّنَا

---

(١) وه نێوەش ئەو (خوای)ـه ناپەرستن كه من دەيپەرستم.

(٢) سورەتی نەسر.

(٣) واته، كاتێ يارمەتی خوا هات لەگەڵ سەركەوتن.

**وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي) واتە: ئەی پەروەردگاری ئێمە پاك و بێگەردی ستایش بۆ تۆ، ئەی خودایە لێم خۆش بە.**

## ٢ - بابٌ

٤٩٦٨ - حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂قَالَت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي». يَتَأَوَّلُ الْقُرْآنَ[1].

## ٢ - باسێک

**٤٩٦٨ - عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوڕنوش و سوژدەکانیدا زۆر دەیفەرموو: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي)) واتە: ((ئەی خودایە پەروەردگاری ئێمە پاك و بێگەردی و ستایش بۆ تۆ، ئەی خودایە لێم خۆش بە)) ڕاڤەی ئەوەی دەکرد لە قورئاندا فەرمانی پێکراوە.**

## ٣ - بابٌ: قَوْلُهُ: ﴿وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ۝٢﴾ النصر

٤٩٦٩ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، عَنْ سُفْيَانُ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ عُمَرَ ﵁ سَأَلَهُمْ عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ۝١﴾ النصر: قَالُوا: فَتْحُ الْمَدَائِنِ وَالْقُصُورِ. قَالَ: مَا تَقُولُ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ؟ قَالَ: أَجَلٌ، أَوْ مَثَلٌ ضُرِبَ لِمُحَمَّدٍ ﷺ، نُعِيَتْ لَهُ نَفْسُهُ[2].

---

(١) بڕوانە: ٧٩٤.

(٢) بڕوانە: ٣٦٢٧.

## ٣- باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە خەڵکت دی پۆل پۆل دێنە ناو ئاینی خواوە )

**٤٩٦٩ -سەعید کوڕی جوبەیر لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: عومەر ﷺ پرسیاری لێ کردن لەبارەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵندەوە: ﴿ إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴾: هاوەڵان وتیان: ئازاد کردنی شاران و کۆشکانە و عومەر وتی: ئیبنو عەبباس دەڵێ چی (لە بارەیەوە)؟ ئیبنو عەبباس وتی: کاتی مردن یا نموونەیەك هێنراوەتەوە بۆ محەممەد ﷺ هەواڵی مردنی خۆی پێدراوە.**

## ٤ - بَابٌ: قَوْلُهُ: ﴿ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ﴿٣﴾ ﴾ النصر

﴿ تَوَّابَۢا ﴿٣﴾ ﴾ النصر: تَوَّابٌ عَلَى العِبَادِ، وَالتَّوَّابُ مِنَ النَّاسِ التَّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ.

٤٩٧٠ - حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ عُمَرُ يُدْخِلُنِي مَعَ أَشْيَاخِ بَدْرٍ، فَكَأَنَّ بَعْضَهُمْ وَجَدَ فِي نَفْسِهِ فَقَالَ: لِمَ تُدْخِلُ هَذَا مَعَنَا وَلَنَا أَبْنَاءٌ مِثْلُهُ فَقَالَ عُمَرُ: إِنَّهُ مِنْ حَيْثُ عَلِمْتُمْ. فَدَعَا ذَاتَ يَوْمٍ -فَأَدْخَلَهُ مَعَهُمْ - فَمَا رُئِيتُ أَنَّهُ دَعَانِي يَوْمَئِذٍ إِلاَّ لِيُرِيَهُمْ. قَالَ: مَا تَقُولُونَ فِي قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴿١﴾ ﴾ النصر: فَقَالَ بَعْضُهُمْ: أُمِرْنَا نَحْمَدُ اللَّهَ وَنَسْتَغْفِرُهُ، إِذَا نُصِرْنَا وَفُتِحَ عَلَيْنَا. وَسَكَتَ بَعْضُهُمْ فَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا فَقَالَ لِي: أَكَذَاكَ تَقُولُ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ؟ فَقُلْتُ: لاَ. قَالَ: فَمَا تَقُولُ؟ قُلْتُ: هُوَ أَجَلُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَعْلَمَهُ لَهُ، قَالَ:﴿ إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴾: وَذَلِكَ عَلاَمَةُ أَجَلِكَ.﴿ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ﴿٣﴾ ﴾ النصر: فَقَالَ عُمَرُ: مَا أَعْلَمُ مِنْهَا إِلاَّ مَا تَقُولُ[١].

---

(١) بڕوانە: ٣٦٢٧.

## ٤ - باسێک: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەوسا ئیتر پەروردگارت بە پاک ڕابگرە بەهۆی ستایشی یەوە، وە داوای لێبوردنی لێ بکە، چونکە بێگومان ئەو زۆر گیرا کەری پەشیمانییە)

﴿ تَوَّابًا ﴾: زۆر گیراکەری پەشیمانییە بۆ بەندەکان. (التَّوَّابُ مِنَ النَّاسِ): کەسێکە زۆر تەوبە بکات و پەشیمان بێتەوە لە تاوانەکانی.

٤٩٧٠ -سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: عومەر ﷺ لەگەڵ چەند پیاوێکی بەتەمەنی بەشداربووی بەدردا منیشی دەبردە کۆڕ و کۆبوونەوەی خۆیەوە، جا پێدەچوو هەندێکیان لەناخیاندا تورە بوو (پێی ناخۆش بوو)، وتبووی: بۆچی عومەر ئەمە (ئیبنو عەبباس) لەگەڵ ئێمەدا دێنێتە ژوورەوە (بۆکۆڕ و کۆبوونەوە)، لەکاتێکدا ئێمەش کوڕانی هاوتەمەنی ئەومان هەیە (و نایان هێنێنە ژوورەوە)؟ (عومەریش) وتی: بێگومان ئەو لەوکەسانەیە کە خۆتان دەزانن. (ئیبنو عەبباس) وتی جا ڕۆژێکیان (عومەر ئیبنو عەبباسی) بانگ کردبوویە ژوورەوە لەگەڵیاندا (ئیبنو عەبباس دەڵێ:) جا گومان وابوو ئەو ڕۆژە هەر بۆ ئەوەی بانگ کردبووم تا (شارەزایی) منیان نیشان بدات، عومەر وتی: دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: ﴿ إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴾: چی دەڵێن؟ هەندێکیان وتیان فەرمانمان پێکراوە کە سوپاسی خوا بکەین و داوای لێ خۆشبوونی لێ بکەین، ئەگەر یارمەتی دراین و سەرخراین (لە جەنگدا)، هەندێکیان بێدەنگ بوون هیچیان نەوت، ئینجا بە منی وت: ئەی ئیبنو عەبباس تۆش هەروا دەڵێیت؟ منیش وتم: نەخێر، وتی: کەواتە چی دەڵێی؟ وتم ئەوە مردن و وەفاتی پێغەمبەری خوایە ﷺ لێی ئاگادارکراوە، (خوا) فەرموویەتی: ﴿ إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴾: واتە: کاتێک

**كه يارمەتی و كۆمەكی خوا هات لەگەڵ سەركەوتن (ئازاد كردنی شاری مەككە) ) ئەونیشانەی (نزیك بوونەوەی) مردنتە، (ئەوسا ئیتر پەروەردگارت بەپاك ڕابگرە و بەهۆی ستایشیەوە داوای لێبوردن بكە)، عومەریش ﷺ وتی: منیش هەر وای دەزانم كە تۆ دەیڵێیت.**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١١١ - سورة ﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴾

﴿ وَتَبَّ ﴾ المسد: تبَابٌ خُسْرَانٌ. تَتْبِيبٌ تَدْمِيرٌ.

## ١ - بابٌ

٤٩٧١ - حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺقَالَ لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ الشعراء: وَرَهْطَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ، خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى صَعِدَ الصَّفَا فَهَتَفَ: «يَا صَبَاحَاهْ». فَقَالُوا: مَنْ هَذَا؟ فَاجْتَمَعُوا إِلَيْهِ. فَقَالَ: «أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ خَيْلاً تَخْرُجُ مِنْ سَفْحِ هَذَا الْجَبَلِ أَكُنْتُمْ مُصَدِّقِيَّ». قَالُوا: مَا جَرَّبْنَا عَلَيْكَ كَذِبًا. قَالَ: «فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ». قَالَ أَبُو لَهَبٍ: تَبًّا لَكَ مَا جَمَعْتَنَا إِلاَّ لِهَذَا؟! ثُمَّ قَامَ. فَنَزَلَتْ:﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ ﴾ المسد: ( وَقَدْ تَبَّ) هَكَذَا قَرَأَهَا الأَعْمَشُ يَوْمَئِذٍ[1].

---

(١) بروانە: ١٣٩٤.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١١١ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ﴾

﴿وَتَبَّ﴾: لەناو چوو. (تَبَابٌ) لەناو چوون و زیان لێ كەوتن، دۆڕان. ( تَتْبِيبٌ) تیاچوون، قڕبوون.

## ١ - باسێك

٤٩٧١ -سەعیدی كوڕی جوبەیر لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: كاتێ ئەم ئایەتە دابەزی (خزم و كەسە زۆر نزیكەكانت بترسێنە) (كەس و كارە هەڵبژێراوەكانت)، پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ دەرچوو تا چوویە سەر كێوی صەفا و هاواری كرد وتی: ((هۆ خەڵكینە فریاكەون))، ئەوانیش وتیان: ئەوە كێیە؟ ئینجا لێی كۆبوونەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((پێم بڵێن ئەگەر هەواڵتان پێ بدەم بەدڵنیاییەوە كۆمەڵە سوارێ (چەكدارێ) لە پەنا ئەو شاخەوە دەردەچن و دێن (دەدەن بەسەتاندا)، ئایا ئێوە باوەڕم پێ دەكەن؟ وتیان: ئێمە درۆمان لێ نەدیوی. فەرمووی: ((دەی بەڕاستی من ئاگاداركەرەوەی ئێوەم پێش (هاتنی) سزای سەختی (قیامەت)، ئەبو لەهەب وتی: تیاچوون بۆ تۆ بۆ ئا ئەمە ئێمەت كۆكردەوە؟ پاشان (پێغەمبەر ﷺ) هەستاو ئیتر ئەم سوڕەتە دابەزی: ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ﴾: واتە: لەناوچێ هەردوو دەستی ئەبو لەهەب وە لەناویش چوو.

ئەعمەش لەو ڕۆژگارەدا بەم جۆرە خوێندیەوە: (وَقَدْ تَبَّ) (لەجیاتی: وَتَبَّ).

**٢ - بابُ قَوْلِه:** ﴿وَتَبَّ ۝١ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ۝٢﴾ المسد:

٤٩٧٢ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَامٍ، أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ إِلَى الْبَطْحَاءِ فَصَعِدَ إِلَى الْجَبَلِ فَنَادَى: «يَا صَبَاحَاهْ». فَاجْتَمَعَتْ إِلَيْهِ قُرَيْشٌ فَقَالَ: «أَرَأَيْتُمْ إِنْ حَدَّثْتُكُمْ أَنَّ الْعَدُوَّ مُصَبِّحُكُمْ أَوْ مُمَسِّيكُمْ، أَكُنْتُمْ تُصَدِّقُونِي؟». قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ: «فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ». فَقَالَ أَبُو لَهَبٍ: أَلِهَذَا جَمَعْتَنَا تَبًّا لَكَ؟!. فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١﴾ المسد: إِلَى آخِرِهَا[1].

## ٢ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە لە ناویش چوو، دارای یەكەیی و ئەوە كردیی (لە دوژمنایەتی پێغەمبەر ﷺ) سوودی پێ نەگەیاند)

**٤٩٧٢ -ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە بوتحا و سەركەوتە سەر كێوەكە و بە دەنگی بەرز هاواری كرد: ((هۆ خەڵكینە فریاكەون)) ئیتر هەموو قوڕەیشیەكان لێی كۆبوونەوە، ئینجا فەرمووی: ((پێم بڵێن ئەگەر هەواڵتان پێ بدەم كە دوژمن بەیانی زوو یان ئێوارە (لە ناكاو) دەدات بەسەرتاندا، ئایا ئێوە باوەڕم پێ دەكەن؟))وتیان بەڵێ، فەرمووی: ((دەی بەڕاستی من ئاگاداركەرەوەم بۆ ئێوە لە پێش (هاتنی) سزای سەختی (قیامەت)، جا ئەبو لەهەب وتی: بۆ ئا ئەمە ئێمەت كۆكردۆتەوە؟ تیاچوون بۆ تۆ، بەو هۆیەوە خواش ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: (هەردوو دەستی ئەبو لەهەب لەناوچێ لەناویش چوو) تا كۆتایی (سورەتەكە).**

---

(١) بڕوانە: ١٣٩٤.

## ٣ - بابُ قَوْلِه: ﴿ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ ﴾ المسد:

٤٩٧٣ - حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: قَالَ أَبُو لَهَبٍ: تَبًّا لَكَ، أَلِهَذَا جَمَعْتَنَا؟! فَنَزَلَتْ: ﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ ﴾ المسد[1].

# ٣ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (بێگومان لەمەولا دەچێتە ناو ئاگری بڵێسەدار)

**٤٩٧٣ -ئیبنو عەبباس ﷺ وتی: ئەبولەهەب وتی: تیاچوون بۆ تۆ بۆ ئا ئەمە ئێمەت كۆكردۆتەوە؟ بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (هەردوو دەستی ئەبو لەهەب لەناوچێ، لەناویش چوو)**

## ٤ - بابُ قَوْلِه: ﴿ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴿٤﴾ ﴾ المسد:

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴿٤﴾ ﴾ المسد: تَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ. ﴿ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ ﴿٥﴾ ﴾ المسد: يُقَالُ: مِنْ مَسَدٍ لِيفِ المُقْلِ، وَهْيَ السِّلْسِلَةُ التِي فِي النَّارِ.

---

(١) بڕوانە: ١٣٩٤.

## ٤ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (لەگەڵ ژنەکەیدا کە هەڵگری دار و چووگە (بۆ نانەوەی ئاژاوە )

-موجاهید دەڵێ: ﴿ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴾ ئەو ژنە دوو زمانی دەكرد. ﴿ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدِۭ ﴾: دەوترێت: (مِنْ مَسَدٍ) توێكل وریشاڵی داری دۆم [١]، وە دەوترێ: (مِنْ مَسَدٍ): ئەو زنجیرە ئاسنەیە لە دۆزەخدا (دۆزەخیان پێ دەبەستەوە).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١١٢ - سُورَةُ الإخلاص ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾:

قَوْلُهُ: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ الإخلاص: يُقَالُ: لَا يُنَوَّنُ أَحَدٌ، أَيْ: وَاحِدٌ.

## ١ - بَابٌ

٤٩٧٤ - حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، حَدَّثَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ، وَشَتَمَنِي وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ، فَأَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ: لَنْ يُعِيدَنِي كَمَا بَدَأَنِي، وَلَيْسَ أَوَّلُ الْخَلْقِ بِأَهْوَنَ عَلَيَّ مِنْ إِعَادَتِهِ، وَأَمَّا شَتْمُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ: اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا، وَأَنَا الأَحَدُ الصَّمَدُ لَمْ أَلِدْ وَلَمْ أُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لِي كُفْأً أَحَدٌ»[٢].

---

(١) دارێكە وەك دار خورما وایە.

(٢) بڕوانە: ٣١٩٣.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١١٢ - (تەفسیری) سوڕەتی ئیخلاس ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾[١]

وە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾: دەوترێت: (أَحَدُ) لەکاتی نەوەستان لەسەری بە دوو بۆر (ـٌ) ناخوێنرێتەوە، (بەڵکو بە یەك بۆر (ـُ) دەخوێنرێتەوە). وە (أَحَدٌ) واتە: تاك و تەنها[٢].

### ١ - باسێک

٤٩٧٤ -ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ((خوای بەرز و بڵند فەرموویەتی: نەوەی ئادەم باوەڕی پێ نەکردم ئەو مافەی نەبوو (باوەڕم پێ نەکات)، وە جنێوی پێ دام و مافی ئەوەی نەبوو، ئینجا باوەڕ نەکردنی پێم ئەوەیە دەڵێ: دروستم ناکاتەوە (بۆ جاری دووەم)، وەك لەسەرەتاوە دروستی کردووم، وە دروست کردنی یەکەم جار ئاسانتر نییە بەلامەوە لە دروست کردنەوەی دووبارە، وە جنێودانیشی پێم ئەوەیە کە دەڵێ: خوا مندالی بۆ خۆی داناوە لەکاتێکدا من تەنها و بێ نیازم (لە هەموو شتێك)، کەسم لێ نەبووە و لە کەس نەبووم، وە هەرگیز هیچ کەس هاوشێوە و هاوتای من نییە.

### ٢ -بابُ قَوْلِهِ ﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢﴾ الإخلاص:

وَالْعَرَبُ تُسَمِّي أَشْرَافَهَا الصَّمَدَ. قَالَ أَبُو وَائِلٍ: هُوَ السَّيِّدُ الذِي انْتَهَى سُؤْدَدُهُ.

٤٩٧٥ - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ قَالَ وَحَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «قَالَ اللهُ: كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ، وَشَتَمَنِي

(١) سورەتی ئیخلاس.

(٢) ئەسڵەکەی (واحد) بووە پیتی واو گۆڕاوە بە هەمزە.

وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ، أَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ أَنْ يَقُولَ: إِنِّي لَنْ أُعِيدَهُ كَمَا بَدَأْتُهُ، وَأَمَّا شَتْمُهُ إِيَّايَ أَنْ يَقُولَ: اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا، وَأَنَا الصَّمَدُ الَّذِي لَمْ أَلِدْ وَلَمْ أُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لِي كُفُؤًا أَحَدٌ». ﴿ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾ ﴾ الإخلاص: كُفُؤاً وَكَفِيئاً وَكِفَاءً وَاحِدٌ[1].

## ٢ -باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەو خوایە بێ نیاز و جێی نیاز و ئومێدە )

**-عەرەب بە پیاوە دیار وگەورەکانی دەڵێ: (الصَّمَدُ).**

**-ئەبو وائیل دەڵێ: (الصَّمَدُ) ئەو پیاو و کەسایەتیە گەورەیە کە گەورەیی یەکەی لە چڵە پۆپەدا بێت [2]**

**٤٩٧٥ -ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوا فەرموویەتی: نەوەی ئادەم باوەری پێ نەکردم ئەو مافەی نەبوو (باوەڕم پێ نەکات)، وە جنێوی پێ دام و مافی ئەوەی نەبوو، ئینجا باوەڕ نەکردنی پێم ئەوەیە دەڵێ: دروستم ناکاتەوە (بۆ جاری دووەم) وەك لەسەرەتاوە دروستی کردووەم، وە جنێودانیشی پێم ئەوەیە کە دەڵێ: خوا منداڵی بۆ خۆی داناوە لە کاتێکدا من تەنها و بێ نیازم (لە هەموو شتێك) کەسم لێ نەبووە و لە کەس نەبووم، وە هەرگیز هیچ کەس هاوشێوە و هاوتای من نییە. (وەك قورئان دەفەرمووی): (کەسی لێ نەبووە و لە کەس نەبووە، وە هەرگیز هیچ کەس هاوشێوە و هاوتای نییە).**

**(كُفُؤاً) و (كَفِيئاً) ( كِفَاءً): هەر سێ وشەکە یەك مانایان هەیە[1].**

---

(١) بڕوانە: ٣١٩٣.

(٢) ئەوەندە گەورە بێت لەوە گەورەتر نەبێت.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١١٣ - سورة ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ﴾

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ٱلۡفَلَقِ ①﴾ الفلق: الصُبْحُ.﴿غَاسِقٍ ③﴾ الفلق: اللَّيْلُ. ﴿إِذَا وَقَبَ ③﴾ الفلق: غُرُوبُ الشَّمْسِ، ويُقَالُ: هو أَبْيَنُ مِنْ فَرَقِ وَفَلَقِ الصُّبْحِ. ﴿وَقَبَ ③﴾ الفلق: إِذَا دَخَلَ فِي كُلِّ شَيْءٍ وَأَظْلَمَ.

### ١ - بابٌ

٤٩٧٦ - حَدَّثنا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَاصِمٍ وَعَبْدَةَ، عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ قَالَ سَألت أُبَيَ بْنَ كَعْبٍ عَنِ الْمعَوِّذَتَيْنِ فَقَالَ سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: "قِيلَ لِي فَقُلْتُ:" فَنَحْنُ نَقُولُ كَمَا قَالَ رَسُول اللَّهِ ﷺ[٢].

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

### ١٣ - (تەفسیری) سوڕەتی ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ﴾:[٣]

**-موجاهید دەڵێ: ﴿ٱلۡفَلَقِ﴾: بەرە بەیان، کازیوەی بەیان. ﴿غَاسِقٍ﴾: (تاریکی) شەو. ﴿إِذَا وَقَبَ﴾: (کاتی) ئاوابوونی خۆر، دەوترێت: لەبەرە بەیان و شەبەقی بەیان ڕوونترە[١] ﴿وَقَبَ﴾: شەو کە چووە هەموو شوێنێك و تاریك بوو.**

---

(١) کە هاوشێوەو هاوتایە.

(٢) بڕوانە: ٤٩٧٧.

(٣) سوڕەتی فەلەق.

## ١ - باسێک

٤٩٧٦ -زیڕی کوڕی حوبەیش دەڵێ: پرسیارم لە ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ کرد لە بارەی هەردوو مەعوزاتەکەوە [٢] ئەویش وتی: منیش ئەو پرسیارەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((پێم وتراوە [٣] منیش وتوومە))، (ئوبەی) وتی: ئێمە هەر ئەوە دەڵێین کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (کە دوو سوڕەتن لە قورئاندا).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ١١٤ - سورة ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾

وَيُذْكَرُ عَنِ ابن عَبَّاسٍ:﴿ٱلْوَسْوَاسِ﴾: إِذَا وُلِدَ خَنَسَهُ الشَّيْطَانُ، فَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ ذَهَبَ، وَإِذَا لَمْ يُذْكَرِ اللَّهُ ثَبَتَ على قَلْبِهِ.

## ١ - بابٌ

٤٩٧٧ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ أَبِي لُبَابَةَ، عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ وَحَدَّثَنَا عَاصِم، عَنْ زِرٍّ قَالَ سَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ قُلْتُ: يَا أَبَا الْمُنْذِرِ، إِنَّ أَخَاكَ ابْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ كَذَا وَكَذَا. فَقَالَ أُبَيٌّ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ لِي: "قِيلَ لِي فَقُلْتُ"، قَالَ: فَنَحْنُ نَقُولُ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[٤].

---

(١) فَرِقَ: بەرهەبەیان یان بەیان (القاموس المحیط: ٩٩٩).

(٢) واتە: سوڕەتی (قُل أعوذ برب الفلق) و (قل أعوذ برب الناس) سوڕەتی فەلەق و ناس.

(٣) لە لایەن جیبریلەوە ﷺ کە ئەو دوو سوڕەتە بەشێکن بە قورئان.

(٤) بڕوانە: ٤٩٧٦.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١١٤ - (تەفسیری) سورەتی ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾:[1]

-لە ئیبنو عەبباسەوە رضي الله عنهما دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: ﴿ٱلْوَسْوَاسِ﴾: کاتێ منداڵ لەدایك دەبێ شەیتان تێوەی دەژەنێ، جا ئەگەر یادی خوای بکرێ دەڕوات، بەڵام ئەگەر یادی خوا نەکرێ لەسەر دڵی دەمێنێتەوە.

## ١ - باسێک

٤٩٧٧ -زیڕی کوڕی حوبەیش دەڵێ: پرسیارم لە ئوبەی کوڕی کەعب رضي الله عنه کرد وتم: ئەی ئەبا مونزیر ئیبنو مەسعوودی رضي الله عنه برات ئاوا و ئاوا دەڵێ: (دەڵێ: هەردوو مەعوزاتەکە قورئان نین)، ئوبەیش رضي الله عنه وتی: منیش ئەو پرسیارەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد پێغەمبەریش ﷺ بە منی فەرموو: ((پێم وتراوە[2] منیش وتوومە ))، (ئوبەی) وتی: ئێمەش هەر ئەوە دەڵێین کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (کە دوو سورەتن لە قورئاندا).

---

(١) سوورەتی ناس.

(٢) لە لایەن جیبریلەوە عليه السلام کە ئەو دوو سورەتە بەشێکن بە قورئان.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٦٦- كِتَابُ فضائل القرآن

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٦٦- پەڕاوی فەزڵ و گەورەیی قورئان

## ١ - بابُ كيف نُزُولُ الوَحْيِ وَأَوَّلُ مَا نَزَلَ

قَالَ ابن عَبَّاس: المُهَيْمِنُ: الأَمِينُ، القُرْآنُ أَمِينٌ عَلَى كُلِّ كِتَابٍ كان قَبْلَهُ.

٤٩٧٨ - ٤٩٧٩ - حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ شَيْبَانَ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: أَخْبَرَتْنِي عَائِشَةُ وَابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ قَالاَ: لَبِثَ النَّبِيُّ ﷺ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ يُنْزَلُ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ، وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرًا[1].

## ١-باسی نیگا چۆن دابەزی؟ وە ئەوەی یەکەم جار دابەزی

**-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: (المُهَيْمِنُ): پارێزەر و چاودێر، وە قورئانیش چاودێر و پارێزەری هەموو کتێبێکی پێش خۆشیەتی.**

**٤٩٧٨ - ٤٩٧٩ - ئەبو سەلەمە دەڵێ: عائیشە و ئیبنو عەبباس ﷺ بۆیان گێڕامەوە و هەردووکیان وتیان: پێغەمبەر ﷺ لە مەککەدا دە ساڵ مایەوە، وە قورئانی بۆ دادەبەزی، وە لە مەدینەش دا دە ساڵ مایەوە.**

(١) بڕوانە: ٤٤٦٤.

٤٩٨٠ - حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: أُنْبِئْتُ أَنَّ جِبْرِيلَ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ وَعِنْدَهُ أُمُّ سَلَمَةَ فَجَعَلَ يَتَحَدَّثُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لأُمِّ سَلَمَةَ: «مَنْ هذا؟». أَوْ كَمَا قَالَ. قَالَت: هَذَا دِحْيَةُ. فَلَمَّا قَامَ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا حَسِبْتُهُ إِلاَّ إِيَّاهُ، حَتَّى سَمِعْتُ خُطْبَةَ النَّبِيِّ ﷺ يُخْبِرُ خَبَرَ جِبْرِيلَ. أَوْ كَمَا قَالَ. قَالَ أَبِي: قُلْتُ لأَبِي عُثْمَانَ: مِمَّنْ سَمِعْتَ هَذَا؟ قَالَ: مِنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ[١].

**٤٩٨٠ -موعتەمیر دەڵێ: لە باوكم بیست وتی: ئەبو عوسمان بۆی گێڕاینەوە وتی: هەواڵم پێدرا كە جیبریل ﷺ هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ، لەو كاتەدا ئوممو سەلەمەی لابوو، ئەنجا دەستی كرد بە قسەكردن (لەگەڵ پیاوێكدا)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی بە ئوممو سەلەمە ﵂: ((ئەمە كێیە؟))یان وەك ئەوەی فەرموو، ئوممو سەلەمەش وتی: ئەوە دیحێیە، جا كاتێ پێغەمبەر ﷺ هەستا ئوممو سەلەمە وتی: سوێند بەخوا هەر وامزانی دیحێیە لە گەڵیدا هەتا گوێم لە ووتارەكەی پێغەمبەر ﷺ بوو، باسی ئەم هەواڵی جیبریلی ﷺ گێڕایەوە، یان وەك ئەوەی كە فەرمووی. (موعتەمیر دەڵێ:) باوكم وتی: بە ئەبی عوسمانم وت: ئەم فەرموودەیەت لە كێ بیستووە؟ وتی: لە ئوسامەی كوڕی زەیدم ﷺ بیستووە.**

٤٩٨١ - حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيٌّ إِلاَّ أُعْطِيَ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُوتِيتُ وَحْيًا أَوْحَاهُ اللَّهُ إِلَيَّ فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٢].

**٤٩٨١ -ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هیچ پێغەمبەرێك نیە لە پێغەمبەران ﷺ مەگەر وێنەی ئەو (موعجیزانەی) پێدراوە كە خەڵك بە**

---

(١) بروانە: ٣٦٣٣.

(٢) بروانە: ٧٢٧٤.

**هۆیەوە باوەڕبێنن، بەڵام بێگومان ئەو (موعجیزەی) بەمن دراوە نیگایەکە خوا ناردوویەتی بۆم (کە قورئانە)، بۆیە ئومێد دەکەم لە ڕۆژی دواییدا لە هەموویان شوێنکەوتووم زیاتر بێت)).**

٤٩٨٢ - حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ اللَّهَ تَعَالَى تَابَعَ عَلَى رَسُولِهِ ﷺ قَبْلَ وَفَاتِهِ حَتَّى تَوَفَّاهُ أَكْثَرَ مَا كَانَ الْوَحْيُ، ثُمَّ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَعْدُ.

**٤٩٨٢ -ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: بێگومان خوای بەرز و بڵند پەیتا پەیتا نیگای دەنارد بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، لە پێش وەفاتی دا تا ئەو ڕۆژەی خوا گیانی کێشا و بردیەوە (بۆ لای خۆی)، لەو کاتەدا لە هەموو کات زیاتر نیگای بۆ دەهات، لە پاشان دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد.**

٤٩٨٣ - حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: سَمِعْتُ جُنْدَبًا يَقُولُ: اشْتَكَى النَّبِيُّ ﷺ فَلَمْ يَقُمْ لَيْلَةً أَوْ لَيْلَتَيْنِ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: يَا مُحَمَّدُ، مَا أُرَى شَيْطَانَكَ إِلاَّ قَدْ تَرَكَكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ۝١ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ۝٢ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ۝٣ ﴾ الضحى:

**٤٩٨٣ -جوندەب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەخۆش کەوت بۆیە شەوێك یا دوو شەو هەڵنەسا بۆ شەونوێژ، ئینجا ژنێك هات بۆ خزمەتی وتی: ئەی موحەممەد وابزانم شەیتانەکەت وازی لێ هێناوی، بەم هۆیەوە خوا ﷻ ئەم ئایەتانەی دابەزاند: (سوێند بە چێشتەنگاو، وە سوێند بە شەو کاتێك ئارام دەگرێ، پەروەردگارت وازی لێ نەهێناویت و لێت دلگیر نەبووە).**

## ٢ - بابٌ: نَزَلَ الْقُرْآنُ بِلِسَانِ قُرَيْشٍ وَالْعَرَبِ

﴿ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا ﴾ يوسف: ﴿ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴾ الشعراء:

٤٩٨٤ - حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، حَدَّثَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: وَأَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ: فَأَمَرَ عُثْمَانُ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ، وَسَعِيدَ بْنَ الْعَاصِ، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ، وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ أَنْ يَنْسَخُوهَا فِي الْمَصَاحِفِ، وَقَالَ لَهُمْ: إِذَا اخْتَلَفْتُمْ أَنْتُمْ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ فِي عَرَبِيَّةٍ مِنْ عَرَبِيَّةِ الْقُرْآنِ فَاكْتُبُوهَا بِلِسَانِ قُرَيْشٍ، فَإِنَّ الْقُرْآنَ أُنْزِلَ بِلِسَانِهِمْ فَفَعَلُوا[1].

## ٢ - باسێک: قورئان بە زمانی قوڕەیش و عەرەب دابەزیوە

**(قورئانێکی عەرەبی یە)، (بەزمانێکی عەرەبی ڕوون و ڕەوان).**

**٤٩٨٤ -ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ وتی: ئینجا عوسمان ﷺ فەرمانی کرد بە زەیدی کوڕی سابیت و سەعدی کوڕی عاص و عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر و عەبدوڕەحمانی کوڕی حاریسی کوڕی هیشام ﷺ کە چەند قورئانێك لەبەر ئەو (قورئانە) بنووسنەوە، وە پێی وتن: ئەگەر ئێوە (قوڕەیشی یەکان) و زەیدی کوڕی سابیت لە وشەیەکی عەرەبی وشە عەرەبیەکانی قورئاندا ڕاتان جیاواز بوو، ئەوە بە زمانی قوڕەیش ئەو وشەیە بنووسن، چونکە بێگومان قورئان بە زمانی ئەوان (قوڕەیش) دابەزێنراوە، ئەوانیش وایان کرد (کە عوسمان وتی).**

٤٩٨٥ - حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا عَطَاءٌ. وَقَالَ مُسَدَّدٌ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ قَالَ: أَخْبَرَنِي صَفْوَانُ بْنُ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ، أَنَّ يَعْلَى كَانَ يَقُولُ: لَيْتَنِي أَرَى رَسُولَ اللهِ ﷺ حِينَ يُنْزَلُ عَلَيْهِ الْوَحْيُ. فَلَمَّا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ بِالْجِعْرَانَةِ وَعَلَيْهِ ثَوْبٌ قَدْ أَظَلَّ عَلَيْهِ وَمَعَهُ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِهِ إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ مُتَضَمِّخٌ بِطِيبٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ

(١)بڕوانە: ٣٥٠٦.

اللهِ، كَيْفَ تَرَى فِي رَجُلٍ أَحْرَمَ فِي جُبَّةٍ بَعْدَ مَا تَضَمَّخَ بِطِيبٍ؟ فَنَظَرَ النَّبِيُّ ﷺ سَاعَةً، فَجَاءَهُ الْوَحْيُ، فَأَشَارَ عُمَرُ إِلَى يَعْلَى أَنْ تَعَالَ، فَجَاءَ يَعْلَى فَأَدْخَلَ رَأْسَهُ، فَإِذَا هُوَ مُحْمَرُّ الْوَجْهِ يَغِطُّ كَذَلِكَ سَاعَةً، ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ فَقَالَ: «أَيْنَ الَّذِي يَسْأَلُنِي عَنِ الْعُمْرَةِ آنِفًا؟». فَالْتُمِسَ الرَّجُلُ فَجِيءَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «أَمَّا الطِّيبُ الَّذِي بِكَ فَاغْسِلْهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَأَمَّا الْجُبَّةُ فَانْزِعْهَا، ثُمَّ اصْنَعْ فِي عُمْرَتِكَ كَمَا تَصْنَعُ فِي حَجِّكَ»[1].

**٤٩٨٥ - صەفوانی کوڕی یەعلای کوڕی ئومەییە دەگێڕێتەوە کە یەعلا دەیوت: خۆزگە پێغەمبەری خوام ﷺ بدیایە کاتێ نیگای بۆ دێت، جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە جیعرانە بوو پۆشاکێکی بەسەریەوە بۆکراو بوو بە سێبەر، چەند کەسێك لە هاوەڵانی لەگەڵیدا بوون لەوێدا، لەوکاتەدا عەرەبێکی دەشتەکی هات بۆنی خۆشی زۆر پێوە بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕات چی دەربارەی کەسێك ئیحرام (ی عومرە) بە جوبەیەکەوە دابەستبێت، دوا ئەوەی بۆنی خۆشی زۆری لێ دراوە؟ پێغەمبەریش ﷺ ماوەیەك ڕوانی پاشان نیگای بۆ هات،عومەریش ﷺ بە دەستی ئاماژەی کرد بۆ یەعلا کە وەرە، یەعلاش هات و سەری کرد بە ژێر (پۆشاکەکەدا)، بینی پێغەمبەر ﷺ ڕووخساری سوور هەڵگەڕاوە و پرخە پرخێتی، سەعاتێك (یان ماوەیەك) بەو جۆرە بوو لە پاشان (کەمە کەمە) باری لەشی سووك بوو (کەبەهۆی قورسی نیگاکەوە بوو)، جا فەرمووی: (( کوا ئەو کەسەی تۆزێ لەمەو پێش پرسیاری عەمرەی لێ دەکردم؟)) جا گەڕان بە شوێن پیاوەکەدا هێنایان بۆی خزمەتی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی پێی: (سەبارەت بەو بۆنە خۆشەی پێتەوەیە ئەوە سێ جار بیشۆرە، جوبەکەشت دایکەنە لەبەرت، لە پاشان چۆن حەج دەکەیت، هەمان شت لە عەمرەکەشتدا بکە)).**

(١) بڕوانە: ١٥٣٦.

## ٣ - بابُ جَمْعِ القُرْآنِ

٤٩٨٦ - حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ السَّبَّاقِ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺقَالَ: أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ مَقْتَلَ أَهْلِ الْيَمَامَةِ، فَإِذَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ عِنْدَه، قَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: إِنَّ عُمَرَ أَتَانِي فَقَالَ: إِنَّ الْقَتْلَ قَدِ اسْتَحَرَّ يَوْمَ الْيَمَامَةِ بِقُرَّاءِ الْقُرْآنِ، وَإِنِّي أَخْشَى أَنْ يَسْتَحِرَّ الْقَتْلُ بِالْقُرَّاءِ بِالْمَوَاطِنِ، فَيَذْهَبَ كَثِيرٌ مِنَ الْقُرْآنِ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَأْمُرَ بِجَمْعِ الْقُرْآنِ. قُلْتُ لِعُمَرَ: كَيْفَ تَفْعَلُ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟! قَالَ عُمَرُ: هَذَا وَاللَّهِ خَيْرٌ. فَلَمْ يَزَلْ عُمَرُ يُرَاجِعُنِي حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَدْرِي لِذَلِكَ، وَرَأَيْتُ فِي ذَلِكَ الَّذِي رَأَى عُمَرُ. قَالَ زَيْدٌ: قَالَ أَبُو بَكْر: إِنَّكَ رَجُلٌ شَابٌّ عَاقِلٌ لاَ نَتَّهِمُكَ، وَقَدْ كُنْتَ تَكْتُبُ الْوَحْيَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَتَتَبَّعِ الْقُرْآنَ فَاجْمَعْهُ فَوَاللَّهِ لَوْ كَلَّفُونِي نَقْلَ جَبَلٍ مِنَ الْجِبَالِ مَا كَانَ أَثْقَلَ عَلَيَّ مِمَّا أَمَرَنِي مِنْ جَمْعِ الْقُرْآنِ. قُلْتُ: كَيْفَ تَفْعَلُونَ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟! قَالَ: هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ. فَلَمْ يَزَلْ أَبُو بَكْرٍ يُرَاجِعُنِي حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَدْرِي لِلَّذِى شَرَحَ لَهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ ﷺ، فَتَتَبَّعْتُ الْقُرْآنَ أَجْمَعُهُ مِنَ الْعُسُبِ وَاللِّخَافِ وَصُدُورِ الرِّجَالِ، حَتَّى وَجَدْتُ آخِرَ سُورَةِ التَّوْبَةِ مَعَ أَبِي خُزَيْمَةَ الأَنْصَارِيِّ لَمْ أَجِدْهَا مَعَ أَحَدٍ غَيْرِهُ: ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ ﴿١٢٨﴾ ﴾ التوبة: حَتَّى خَاتِمَةِ بَرَاءَةَ، فَكَانَتِ الصُّحُفُ عِنْدَ أَبِي بَكْرٍ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ عِنْدَ عُمَرَ حَيَاتَهُ، ثُمَّ عِنْدَ حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ ﷺ[1].

## ٣ - باسی کۆکردنەوەی قورئان[2]

**٤٩٨٦ - ئیبنو شیهاب لە عوبەیدی کوڕی سەبباقەوە دەگێڕێتەوە کە زیدی کوڕی سابیت ﷺ وتی: ئەبو بەکر ﷺ لەو ڕۆژانەی خەڵکی لە یەمامە کوژران ناردی**

(١) بڕوانە: ٢٨٠٧.

(٢) مەبەست پێی کۆکردنەوەی قورئانە لەو بەڕەو پێستانەدا کە تیا نوسراوە.

بە شوێنم دا (و ڕۆشتم)، جا دەبینم عومەری کوڕی خەتتابی لایە، ئەبو بەکر وتی: لەراستیدا عومەر هاتووە بۆلام و دەڵێ: بەڕاستی لە ڕۆژی یەمامەدا کوشتار زۆر بووە لەناو قورئان خوێناندا، وەمن دەترسم لە شوێنەکانی تر (ی جەنگ)ـدا کوشتن زۆر ببێ لە ناو قورئان خوێناندا، بەو هۆیە زۆرێك لەقورئان بفەوتێت ونەمێنێ، بۆیە من ڕام وایە فەرمان بکەیت بە کۆکردنەوەی قورئان، منیش بە عومەرم وت: چۆن شتێك دەکەیت کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردووە؟ عومەریش وتی وەڵلاهی ئەو (کۆکردنەوەیە) کارێکی چاکە، جا بەردەوام عومەر لەو بارەیەوە پێی دەوتمەوە، تاخوا دڵمی بۆ ئەو کارە والا کرد و پێی ڕازی بووم، منیش ڕا و بۆچوونم وەك عومەری لێهات، زەید وتی: ئەبو بەکر وتی: بەڕاستی تۆ کەسێکی گەنج و ژیری گومانمان لێت نییە [١]، پێشتر نیگات بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەنوسیەوە، کەواتە بگەڕێ بە شوێن (ئایەت و سوڕەتەکانی) قورئاندا و کۆی بکەرەوە - (زەید وتی) سا سوێند بەخوا ئەگەر داوای گواستنەوەی شاخێك لە شاخەکانیان لێ بکردمایە، لەو فەرمانی پێکردم قورستر نەبوو بەلامەوە لە کۆکردنەوەی قورئانە، (زەید دەڵێ) وتم: چۆن هەردووکتان شتێك دەکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردووە؟ ئەبو بەکر ﷺ وتی: وڵلاهی ئەوە کارێکی چاکە جا بەردەوام لەو بارەیەوە پێی دەوتمەوە، تا خوا دڵمی بۆ ئەو کارە والا کرد و پێی ڕازی بووم،کە دڵی ئەبو بەکر و دڵی عومەری بۆ والا کردبوو، ئیتر منیش هەستام و گەڕام بەشوێن (سوڕەت وئایەتەکانی) قورئاندا و کۆم دەکردەوە لە پەلی دار خورما [٢] و تەنکە بەرد و سوڵەت و سنگی کەسەکان [٣] دا (گەڕام)، تا کۆتایی سوڕەتی تەوبەم لای خوزەیمەی ئەنصاری دۆزیەوە جگە لەو

---

(١) کە درۆ بکەیت یان شتت لە بیر بچێت کە زیان بە قورئانەکە بگەیەنێت.

(٢) لقی دار خورما کە گەڵاکانی لێ کرابێتەوە تەنك و ڕێکیان کردووە لەسەریان نووسیوە.

(٣ ) کە قورئانیان لەبەر کردووە لە سنگیاندا.

لای کەسی تر ئەو کۆتاییەی سورەتی تەوبەم نەدی: (سوێند بەخوا بەڕاستی پێغەمەرێکتان لەخۆتان بۆ هاتووە نارەحەتی و ناخۆشی ئێوە قورس و گرانە بەلایەوە، وە زۆر سورە لەسەر (باوەڕهێنان) تان) تا کۆتایی سورەتی بەرائەت، وە ئەو پیست و شتانەی کە قورئانیان تیادا کۆکرابۆوە لای ئەبو بەکر بوو تا وەفاتی کرد، لە پاشان لای عومەر تا وەفاتی کرد لە پاشان لای حەفصەی کچی عومەر بوو ﵄.

٤٩٨٧ - حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ، حَدَّثَنَا ابْنُ شِهَابٍ، أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ حَدَّثَهُ، أَنَّ حُذَيْفَةَ بْنَ الْيَمَانِ قَدِمَ عَلَى عُثْمَانَ، وَكَانَ يُغَازِي أَهْلَ الشَّأْمِ فِي فَتْحِ إِرْمِينِيَةَ وَأَذْرَبِيجَانَ مَعَ أَهْلِ الْعِرَاقِ، فَأَفْزَعَ حُذَيْفَةَ اخْتِلاَفُهُمْ فِي الْقِرَاءَةِ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ لِعُثْمَانَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَدْرِكْ هَذِهِ الأُمَّةَ قَبْلَ أَنْ يَخْتَلِفُوا فِي الْكِتَابِ اخْتِلاَفَ الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى. فَأَرْسَلَ عُثْمَانُ إِلَى حَفْصَةَ أَنْ أَرْسِلِي إِلَيْنَا بِالصُّحُفِ نَنْسَخُهَا فِي الْمَصَاحِفِ ثُمَّ نَرُدُّهَا إِلَيْكِ، فَأَرْسَلَتْ بِهَا حَفْصَةُ إِلَى عُثْمَانَ، فَأَمَرَ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ وَسَعِيدَ بْنَ الْعَاصِ وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ فَنَسَخُوهَا فِي الْمَصَاحِفِ، وَقَالَ عُثْمَانُ لِلرَّهْطِ الْقُرَشِيِّينَ الثَّلاَثَةِ: إِذَا اخْتَلَفْتُمْ أَنْتُمْ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ فِي شَيْءٍ مِنَ الْقُرْآنِ فَاكْتُبُوهُ بِلِسَانِ قُرَيْشٍ، فَإِنَّمَا نَزَلَ بِلِسَانِهِمْ. فَفَعَلُوا، حَتَّى إِذَا نَسَخُوا الصُّحُفَ فِي الْمَصَاحِفِ رَدَّ عُثْمَانُ الصُّحُفَ إِلَى حَفْصَةَ وَأَرْسَلَ إِلَى كُلِّ أُفُقٍ بِمُصْحَفٍ مِمَّا نَسَخُوا، وَأَمَرَ بِمَا سِوَاهُ مِنَ الْقُرْآنِ فِي كُلِّ صَحِيفَةٍ أَوْ مُصْحَفٍ أَنْ يُحْرَقَ[1].

٤٩٨٧ -ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ بۆی گێڕایەوە کە حوزەیفەی کوڕی یەمان ﵁ هات بۆ لای عوسمان ﵁، وە حوزەیفە خەڵکی شامی ئامادە دەکرد کە (کۆببنەوە) لەگەڵ خەڵکی عێراقدا بۆ ئازادکردنی ئیرمینیا و ئەزەربیجان، ئینجا حوزەیفە زۆر ترسا لە جیاوازیان[2] لە قورئان

(١) بڕوانە: ٣٥٠٦.

( ٢ ) لە نێوان خەڵکی شام و خەڵکی عێراق دا، چونکە هەر وڵاتێکیان بە جۆرێ دەیخوێند.

**خوێندندا، بۆیە حوزەیفە ﷺ بە عوسمانی وت: ئەی پێشەوای باوەڕداران فریای ئەم ئوممەتە بکەوە پێش ئەوەی لە قورئاندا جیاوازییان تێبکەوێت، وەك جیاوازی جوولەکە و گاورەکان، جا عوسمان ﷺ ناردی بۆ لای حەفصە ﷺ، ئەو پەڕە قورئانانەمان بۆبنێرە چەند قورئانێکی لەبەر دەنووسینەوە لە پاشان پەڕە قورئانەکانت بۆ دەگێڕینەوە، حەفصەش پەڕەکانی نارد بۆ عوسمان ﷺ، ئینجا (عوسمان) فەرمانی کرد بە زەیدی کوڕی سابیت و عەبدوڵلای کوڕ زوبەیر و سەعدی کوڕی عاص و عەبدوڕەحمانی کوڕی حاریسی کوڕی هیشام ﷺ، ئەوانیش چەند قورئانیەکیان لەبەر نوسی یەوە، وە عوسمان وتی: بەسێ کەسە قوڕەیشی یەکە: ئەگەر ئێوە و زەیدی کوڕی سابیت لە هەر شتێکی قورئاندا ڕاتان جیابوو، ئەوە وشە جیاوازە بە زمانی قوڕەیش بنووسن، چونکە بێگومان (قورئان) بە زمانی ئەوان (قوڕەیش) دابەزیوە، ئەوانیش (نووسەرەکان) بەو جۆرەیان کرد (کەعوسمانی فەرمانی کرد)، عوسمان پەڕە قورئانییەکانی گێڕایەوە بۆحەفصە ﷺ، لەو قورئانانەی نووسیانەوە بۆ هەر لا و شارێك قورئانێکی نارد، وە فەرمانی کرد بە هەرچی قورئانی تر هەیە لە پەڕە و قورئانی تردا بوو کە بسوتێنرێت.**

٤٩٨٨ - قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَأَخْبَرَنِي خَارِجَةُ بْنُ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، سَمِعَ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ قَالَ: فَقَدْتُ آيَةً مِنَ الأَحْزَابِ حِينَ نَسَخْنَا الْمُصْحَفَ قَدْ كُنْتُ أَسْمَعُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ بِهَا، فَالْتَمَسْنَاهَا فَوَجَدْنَاهَا مَعَ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيِّ: ﴿ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأحزاب: فَأَلْحَقْنَاهَا فِي سُورَتِهَا فِي الْمُصْحَفِ[1].

---

(١) بروانە: ٢٨٠٧.

٤٩٨٨ - (هەر بە سەنەدەکەی پێشوو) ئیبنو شیهاب دەڵێ: خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابیت بۆی گێڕامەوە کە لە زەیدی کوڕی سابیتی بیستووە وتی: کاتێ قورئانەکانمان نووسی یەوە ئایەتێکم لە (سورەتی) ئەحزاب ون کردبوو، کە بێگومان جاران گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیخوێندەوە، جا بۆی گەڕاین وە لای خوزەیمەی کوڕی سابیتی ئەنصاری [1] دۆزیمانەوە: (لەناو باوەڕدارانەدا پیاوانێك هەن ڕاستیان کرد لەو پەیمانەی کە دابوویان بەخوا) ئینجا ئەو ئایەتەمان خستە لای سوڕەتەکەی خۆی (سورەتی ئەحزاب) لە قورئانەکەدا.

## ٤ - بابُ ذِكْرِ كَاتِبِ النَّبِيِّ ﷺ

٤٩٨٩ - حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ ابْنَ السَّبَّاقِ قَالَ: إِنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ قَالَ: أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ ﷺقَالَ: إِنَّكَ كُنْتَ تَكْتُبُ الْوَحْيَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَاتَّبِعِ الْقُرْآنَ. فَتَتَبَّعْتُ حَتَّى وَجَدْتُ آخِرَ سُورَةِ التَّوْبَةِ آيَتَيْنِ مَعَ أَبِي خُزَيْمَةَ الأَنْصَارِيِّ لَمْ أَجِدْهُمَا مَعَ أَحَدٍ غَيْرَهُ:﴿ لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ ﴿١٢٨﴾ ﴾ التوبة: إِلَى آخِرِهِ[2].

## ٤ -باسی نووسەری[3] پێغەمبەر ﷺ

٤٩٨٩ -ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئیبنو سەبباق وتی: بێگومان زەیدی کوڕی سابیت ﷺ وتی: ئەبو بەکر ﷺ ناردی بەشوێنمدا و وتی: بێگومان تۆ جاران نیگات بۆ

(١) ئەم هاوەڵە جیایە لە ئەبو خوزەیمە کە کۆتایی سورەتی تەوبەی لابوو (إرشاد السار ی١١/٢٦٥ -٢٦٦).

(٢) بروانە: ٢٨٠٧.

(٣) مەبەست نووسەری قورئانە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەنوسی جابگەڕێ بە شوێن (ئایەتەکانی) قورئاندا (کۆیکەرەوە و بینووسەرەوە)، (زەید دەڵێ): منیش گەڕام (کۆم کردنەوە و نووسیمەوە) تا دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی تەوبەم لای خوزەیمەی ئەنصاری دۆزیەوە، کە ئەو دوو ئایەتەم لای کەسی تر جگە لە ئەو نەدۆزییەوە: (سوێند بەخوا بەڕاستی لە خۆتان پێغەمبەرێکتان بۆهاتووە ناڕەحەتی و ناخۆشی ئێوە قورس و گرانە بەلایەوە) تا کۆتای ئایەتەکە.

٤٩٩٠ - حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ لاَ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ادْعُ لِي زَيْدًا وَلْيَجِئْ بِاللَّوْحِ وَالدَّوَاةِ وَالْكَتِفِ" أَوِ "الْكَتِفِ وَالدَّوَاةِ" - ثُمَّ قَالَ: «اكْتُبْ: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ ﴿٩٥﴾﴾ النساء: " وَخَلْفَ ظَهْرِ النَّبِيِّ ﷺ عَمْرُو بْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الأَعْمَى قَالَ: يَا رَسُولَ الله، فَمَا تَأْمُرُنِي؟ فَإِنِّي رَجُلٌ ضَرِيرُ البَصَرِ؟. فَنَزَلَتْ مَكَانَهَا ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ﴿٩٥﴾﴾ النساء[1].

٤٩٩٠ -بەرا ﷺ دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی (دانیشتوان (لە جیهادی ڕێی خوادا) لەباوەڕداران یەکسان نین لەگەڵ تێکۆشەرانی ڕێگەی خوادا) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((زەیدم بۆ بانگ کەن با ئێسك و مەرەکەبدان ئێسکی دەفە شانەکەش - یان ئێسکی دەفەشان و مەرەکەبدانەکە (لەگەڵ خۆی) بێنێت))، لە پاشان فەرمووی: ((بنووسە: (دانیشتوان (لە جیهاد لە ڕێی خواد) یەکسان نین)، لەوکاتەدا عەمری کوڕی ئوممی مەکتومی نابیناش لە پشت پێغەمبەرەوە ﷺ بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چ

(١) بروانە: ٢٨٣١.

فەرمانێکم پێ دەکەیت؟ چونکە بەڕاستی من پیاوێکی نابینام [١] جاهەر لەشوێنی ئایەتەکە (پێشوو)دا ئەم ئایەتە دابەزی: (دانیشتوان (لەجیهادی ڕێی خودا) لە باوەڕداران جگە لە خاوەن عوزرەکان [٢] یەکسان نین (لەگەڵ تێکۆشەران) ).

## ٥ - بابٌ: أُنْزِلَ الْقُرْآنُ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ

٤٩٩١ - حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ حَدَّثَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺقَالَ: «أَقْرَأَنِي جِبْرِيلُ عَلَى حَرْفٍ فَرَاجَعْتُهُ، فَلَمْ أَزَلْ أَسْتَزِيدُهُ وَيَزِيدُنِي حَتَّى انْتَهَى إِلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ»[٣].

## ٥ - باسێک: قورئان لەسەر حەوت شێوە (خوێندنەوە)[٤] دابەزێنراوە

٤٩٩١ - عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە کەئیبنو عەبباس ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((جیبریل ﷺ لەسەر یەك شێوە قورئانی پێ دەخوێندم، جا بەردەوام داوام دەکرد شێوەکانم بۆ زیاد کات، ئەویش بۆی زیاد دەکردم هەتا بە حەوت شێوە کۆتایی هات)).

٤٩٩٢ - حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ الْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَبْدٍ الْقَارِيَّ

---

(١) ناتوانم جیهاد بکەم.

( ٢) نەخۆش، کوێر، شەل.

(٣ ) بڕوانە: ٣٢١٩.

(٤ ) مەبەست ئەوەیە لە قورئاندا حەوت جۆر و شێوە خوێندنەوە لە هەندێ ئایەت دا هەیە و دروستە قورئان خوێندنەوە پێیان،نەك هەموو قورئان بەحەوت جۆر بخوێنرێتەوە.

حَدَّثَاهُ أَنَّهُمَا سَمِعَا عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ يَقُولُ: سَمِعْتُ هِشَامَ بْنَ حَكِيمٍ يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَاسْتَمَعْتُ لِقِرَاءَتِهِ فَإِذَا هُوَ يَقْرَأُ عَلَى حُرُوفٍ كَثِيرَةٍ لَمْ يُقْرِئْنِيهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَكِدْتُ أُسَاوِرُهُ فِي الصَّلَاةِ، فَتَصَبَّرْتُ حَتَّى سَلَّمَ، فَلَبَّبْتُهُ بِرِدَائِهِ فَقُلْتُ: مَنْ أَقْرَأَكَ هَذِهِ السُّورَةَ الَّتِي سَمِعْتُكَ تَقْرَأُ؟ قَالَ: أَقْرَأَنِيهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ. فَقُلْتُ: كَذَبْتَ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ أَقْرَأَنِيهَا عَلَى غَيْرِ مَا قَرَأْتَ، فَانْطَلَقْتُ بِهِ أَقُودُهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: إِنِّي سَمِعْتُ هَذَا يَقْرَأُ بِسُورَةِ الْفُرْقَانِ عَلَى حُرُوفٍ لَمْ تُقْرِئْنِيهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَرْسِلْهُ اقْرَأْ يَا هِشَامُ». فَقَرَأَ عَلَيْهِ الْقِرَاءَةَ الَّتِي سَمِعْتُهُ يَقْرَأُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَذَلِكَ أُنْزِلَتْ». ثُمَّ قَالَ: «اقْرَأْ يَا عُمَرُ». فَقَرَأْتُ الْقِرَاءَةَ الَّتِي أَقْرَأَنِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَذَلِكَ أُنْزِلَتْ، إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ»[1].

**٤٩٩٢ -عوروەی كوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە كە میسوەری كوڕی مەخرەمە و عەبدوڕەحمانی كوڕی عەبدولقادری بۆیان گێڕایەوە كەهەردووكیان لە عومەری كوڕی خەتتابیان ﷺ بیست دەیوت: لە هیشامی كوڕی حەكیمم ﷺ بیست لە ژیانی پێغەمبەری خوادا سوڕەتی فورقانی دەخوێند، منیش گوێم گرت بۆقورئان خوێندنەكەی، جادەبینم ئەو بە چەند شێوەیەك دەیخوێنێ، زۆر جیا لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوە بەمنی نەخوێندبوو، بۆیە خەریك بوو لە نوێژەكەدا پەلاماری بدەم [2]، بەڵام ئارامم گرت تا سەلامی دایەوە (لەنوێژەكە)، ئینجا یەخەی جلەكانیم گرت و وتم: كێ ئەم سوڕەتەی پێ خوێندوی بەو شێوەی كە من گوێم لێ بوو دەتخوێند؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خوێندووم، وتم: درۆ دەكەیت، چونكە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ بەمنی خوێندووە جیاواز لەوەی تۆ خوێندت، ئینجا دامەبەر و بردم بۆ خزمەتی**

---

(١) بڕوانە: ٢٤١٩.

(٢) سەری بگرم.

پێغەمبەری خوا ﷺ ووتیم: (ئەی پێغەمبەر ﷺ) من گوێم لەم (پیاو)ـە بوو سورەتی فورقانی دەخوێند بە شێوازێك کە جەنابت ئەو شێوازەت بە من نەخوێندووە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەرەڵای کە، هیشام بیخوێنە))، هیشامیش بەو شێوەی کە من گوێ بیستی بووم دەیخوێند بۆ پێغەمبەریش ﷺ خوێندەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئابەو جۆرە دابەزێنراوە ))، لە پاشان فەرمووی: ((ئەی عومەر بیخوێنە))منیش بەو شێوە خوێندنەی کە پێغەمبەر ﷺ خۆی پێی خوێندووم خوێندم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئا بەو جۆرە دابەزێنراوە، بێگومان ئەم قورئانە لەسەر حەوت شێوە (خوێندەوە) دابەزێنراوە، بۆیە بەکام لەو حەوتە ئاسانە (بۆتان) بیخوێنن)).

## ٦ - بابُ تَأْلِيفِ الْقُرْآنِ

٤٩٩٣ - حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَنَّ ابْنَ جُرَيْجٍ أَخْبَرَهُمْ قَالَ: وَأَخْبَرَنِي يُوسُفُ بْنُ مَاهَكَ قَالَ: إِنِّي عِنْدَ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂ إِذْ جَاءَهَا عِرَاقِيٌّ فَقَالَ: أَيُّ الْكَفَنِ خَيْرٌ؟ قَالَتْ: وَيْحَكَ، وَمَا يَضُرُّكَ؟ قَالَ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، أَرِينِي مُصْحَفَكِ. قَالَتْ: لِمَ؟ قَالَ: لَعَلِّي أُوَلِّفُ الْقُرْآنَ عَلَيْهِ، فَإِنَّهُ يُقْرَأُ غَيْرَ مُؤَلَّفٍ. قَالَتْ: وَمَا يَضُرُّكَ أَيَّهُ قَرَأْتَ قَبْلُ، إِنَّمَا نَزَلَ أَوَّلَ مَا نَزَلَ مِنْهُ سُورَةٌ مِنَ الْمُفَصَّلِ فِيهَا ذِكْرُ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، حَتَّى إِذَا ثَابَ النَّاسُ إِلَى الإِسْلاَمِ نَزَلَ الْحَلاَلُ وَالْحَرَامُ، وَلَوْ نَزَلَ أَوَّلَ شَيْءٍ: لاَ تَشْرَبُوا الْخَمْرَ. لَقَالُوا: لاَ نَدَعُ الْخَمْرَ أَبَدًا. وَلَوْ نَزَلَ: لاَ تَزْنُوا. لَقَالُوا: لاَ نَدَعُ الزِّنَا أَبَدًا. لَقَدْ نَزَلَ بِمَكَّةَ عَلَى مُحَمَّدٍ ﷺ وَإِنِّي لَجَارِيَةٌ أَلْعَبُ: ﴿ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ ﴾ القمر، وَمَا نَزَلَتْ سُورَةُ الْبَقَرَةِ وَالنِّسَاءِ إِلاَّ وَأَنَا عِنْدَهُ. قَالَ: فَأَخْرَجَتْ لَهُ الْمُصْحَفَ فَأَمْلَتْ عَلَيْهِ آيَ السُّوَرِ[1].

---

(١) بڕوانە: ٤٨٧٦.

## ٦ -باسی ڕیزبەندی (ئایەت و سوڕەتەكانی) قورئان [1]

٤٩٩٣ -یوسفی كوڕی ماهەك وتی: من لای عائیشەی دایكی ئیمانداران بووم ﵂ كاتێ پیاوێكی عێراقی هات بۆ لای، وتی: كام كفنە چاكە (بۆ مردوو)؟ عائیشە ﵂ وتی: هاوار بۆ تۆ چ زیانێكی هەیە بۆت [2]؟ وتی: ئەی دایكی ئیمانداران قورئانەكەی خۆتم نیشان دە، عائیشە وتی: بۆچی؟ وتی: بۆ ئەوەی لەسەر شێوەی ئەو ڕیزبەندی (سوڕەتەكانی) قورئان ڕێكخەم چونكە قورئان بەڕیزبەند ناخوێنرێ، عائیشە ﵂ وتی: چ زیانێكی بۆت هەیە هەركامی لە پێش دا بخوێنی، بێگومان ئەوەی سەرەتا لە قورئان دابەزی سوڕەتێك بوو لەسوڕەتە كورتە ئایەت كورتەكان باسی بەهەشت و دۆزەخی تیا بوو، تا خەڵك گەڕانەوە بۆلای ئیسلام (و باوەڕیان دامەزراو بوو) جا حەڵاڵ و حەرام دابەزی، ئەگەر یەكەم شتێك: عارەق مەخۆنەوە دابەزیایە بێگومان خەڵكەكە دەیان وت: هەرگیز واز لەعارەق ناهێنین، وە ئەگەر زینا مەكەن (لەسەرەتاوە) دابەزیایە، بەدڵنیاییەوە دەیان وت: هەرگیز واز لە زینا ناهێنین، سوێند بەخوا و بەڕاستی كەلە مەككە ئەم ئایەتە (بەڵكو بەڵێنیان ڕۆژی دواییە و بەو (سزای) ئەو ڕۆژە سەختتر و تاڵترە)، بۆ موحەممەد ﷺ دابەزی من كیژۆڵەیەك بووم یاریم دەكرد (لەگەڵ منداڵان) وەكاتێ سوڕەتی بەقەڕە و نیسائیش دابەزی من لای پێغەمبەر بووم [3] ﷺ (یوسف) دەڵێ: ئینجا عائیشە قورئانەكە (خۆیی) بۆ ئەو (پیاوە عێراقی یەكە) دەرهێنا و ئایەتەكانی سوڕەتەكانی پێ وت و بۆی خوێندەوە.

---

(١) مەبەست بە (تألیف) كۆكردنەوەی ئایەتەكانی ناو هەر سوڕەتێك و كۆكردنەوەی سوڕەتەكان بە ڕیزبەندی نێوانیان.

(٢) لەپاش مردن لە هەر كفنێكدا كفن كرێیت سپی بێت یا ڕەنگێكی تر.

(٣) واتە: هاوسەری بووە شووی پێ كردووە و گوێزراوەتەوە.

٤٩٩٤ - حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ يَزِيدَ، سَمِعْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ وَالْكَهْفِ وَمَرْيَمَ وَطَهَ وَالأَنْبِيَاءِ: إِنَّهُنَّ مِنَ الْعِتَاقِ الأُوَلِ، وَهُنَّ مِنْ تِلاَدِي[1].

**٤٩٩٤ - عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: لە (سوڕەتەکانی) بەنی ئیسرائیل[2] و کەهف و مەریەم و تاها و ئەنبیا، بێگومان ئەم سوڕەتانە لە سوڕەتە دێرینە نایابەکانی سەرەتان، وە لەو سوڕەتانەن لە مێژە لەبەرم کردوون).**

٤٩٩٥ - حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، أَنْبَأَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، سَمِعَ الْبَرَاءَ ﷺ قَالَ: تَعَلَّمْتُ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ①﴾ الأعلى: قَبْلَ أَنْ يَقْدَمَ النَّبِيُّ ﷺ.

**٤٩٩٥ -ئەبو ئیسحاق لە بەرائی ﷺ بیست وتی: سوڕەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾: فێر بوو بووم پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کۆچ بکات و بێت بۆ مەدینە.**

٤٩٩٦ حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ شَقِيقٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ، قَدْ عَلِمْتُ النَّظَائِرَ الَّتِي كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَؤُهُنَّ اثْنَيْنِ اثْنَيْنِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ. فَقَامَ: عَبْدُ اللَّهِ وَدَخَلَ مَعَهُ عَلْقَمَةُ، وَخَرَجَ عَلْقَمَةُ فَسَأَلْنَاهُ فَقَالَ: عِشْرُونَ سُورَةً مِنْ أَوَّلِ الْمُفَصَّلِ عَلَى تَأْلِيفِ ابْنِ مَسْعُودٍ آخِرُهُنَّ الْحَوَامِيمُ، ﴿حمٓ ①﴾ الدخان: وَ ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ①﴾ النبأ[3].

---

(١) بڕوانە: ٤٧٠٨.

( ٢ ) **واتە: سوڕەتی الإسراء.**

(٣) بڕوانە: ٧٧٥.

٤٩٩٦ -شەقیق دەڵێ: عەبدوڵلا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ دەڵێ: بێگومان من فێری ئەو سوڕەتانە بوو بووم هاوشێوەی یەکترین، جاران پێغەمبەر ﷺ دوو لە ڕکاتێکدا دەیخوێندن، جا عەبدوڵلا (لە کۆڕەکە) هەستا و (ڕۆشتە ماڵەوە) عەلقەمەش لەگەڵیدا ڕۆشتە ماڵەوە، جا عەلقەمە هاتە دەرەوە و ئێمەش پرسیارمان لێکرد و ئەویش وتی: بیست سوڕەت لەسەرەتای سوڕەت کورتە ئایەت کورتەکان لەسەر شێوازی قورئانەکەی ئیبنو مەسعوود ﷺ ڕیزبەندی کراوە، کۆتایی ئەو (بیست سوڕەتە) لەوانەن بە (حم) مەکان دەست پێ دەکەن [1]، ﴿ حمٓ ۝١ ﴾ الدخان: ی سوڕەتی دوخان و سوڕەتی: ﴿ عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ﴾:

## ٧ - بابٌ: كَانَ جِبْرِيلُ يَعْرِضُ القُرْآنَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ

وَقَالَ مَسْرُوقٌ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنْ فَاطِمَةَ ﷺ أَسَرَّ إِلَى النَّبِيُّ ﷺ: "أَنَّ جِبْرِيلَ كَانَ يُعَارِضُنِي بِالْقُرْآنِ كُلَّ سَنَةٍ، وَإِنَّهُ عَارَضَنِي العَامَ مَرَّتَيْنِ، وَلاَ أُرَاهُ إِلاَّ حَضَرَ أَجَلِي"[2].

## ٧ - باسێک: جیبریل ﷺ قورئانی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەخوێندەوە

-مەسروق لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە فاتیمەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەنهێنی فەرمووی پێم: ((بێگومان جیبریل ﷺ هەموو ساڵێك (یەك جار) قورئانی لەگەڵمدا دەخوێندەوە، بەڵام ئەمساڵ دوو جاری لەگەڵم خوێندەوە، بۆیە هەر ئەو گومانە دەبەم کە کاتی مردنم هاتووە)).

٤٩٩٧ - حَدَّثَنَا يَحْيَى بْن قَزَعَةَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابن عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ بِالخَيْرِ، وَأَجْوَدُ مَا يَكُونُ فِي

---

(١) لە هەندێ نوسخەی بوخاریدا بەم جۆرەیە:لە (حم) مكان، (حم)ی سورەتی دوخان و عم یتسألون.

(٢) بڕوانە: ٣٦٢٣.

شَهْرِ رَمَضَانَ؛ لأَنَّ جِبْرِيلَ كَانَ يَلْقَاهُ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ حَتَّى يَنْسَلِخَ، يَعْرِضُ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْقُرْآنَ، فَإِذَا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ كَانَ أَجْوَدَ بِالخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ المُرْسَلَةِ[1].

**٤٩٩٧ -عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە بەخشندەترین کەس بوو بۆ ماڵ بەخشین، وە لەمانگی ڕەمەزاندا بەرزترین بەخشندە چۆنە وابوو، چونکە لە هەموو شەوێکی ڕەمەزاندا تا ڕەمەزان کۆتایی دەهات، جیبریل ﷺ بەخزمەتی دەگەشت، پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی بۆ دەخوێندەوە جا کە جیبریل ﷺ پێی دەگەیشت لە بەخشینی ماڵ و ساماندا لەبای توند و بەهێز بەخشندەتر بوو.**

٤٩٩٨ - حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ يَزِيدَ، حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ يَعْرِضُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ الْقُرْآنَ كُلَّ عَامٍ مَرَّةً، فَعَرَضَ عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ فِي الْعَامِ الَّذِي قُبِضَ، وَكَانَ يَعْتَكِفُ كُلَّ عَامٍ عَشْرًا، فَاعْتَكَفَ عِشْرِينَ فِي الْعَامِ الَّذِي قُبِضَ[2].

**٤٩٩٨ -ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: (جیبریل ﷺ) هەموو ساڵێك (یەك جار) قورئانی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەخوێندەوە، بەڵام لەو ساڵەدا کە گیانی کێشرا (وەفاتی کرد) دوو جار هەموو قورئانی بۆ خوێندەوە، وە پێغەمبەر ﷺ جاران هەموو ساڵێك دە (شەو و ڕۆژ) ئیعتیکافی دەکرد، بەڵام لەو ساڵەی کەوەفاتی کرد بیست (شەو و ڕۆژ) ئیعتیکافی کرد.**

## ٨ - بابُ الْقُرَّاءِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ

٤٩٩٩ - حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ مَسْرُوقٍ: ذَكَرَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ فَقَالَ: لاَ أَزَالُ أُحِبُّهُ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «خُذُوا الْقُرْآنَ مِنْ أَرْبَعَةٍ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ وَسَالِمٍ، وَمُعَاذٍ، وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ»[3].

---

(١) بڕوانە: ٦.
(٢) بڕوانە: ٢٠٤٤.
(٣) بڕوانە: ٣٧٥٨.

# ٨ -باسی قورئان خوێنەکان [1] لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ

**٤٩٩٩ - مەسروق دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ باسی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودی کرد ﷺ و وتی: بۆ هەمیشە خۆشم دەوێ، (چونکە) لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: ((قورئان لە چوار کەسەوە وەرگرن و فێرببن: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود و سالیم و موعاز و ئوبەیی کوڕی کەعب ﷺ)).**

٥٠٠٠ - حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا شَقِيقُ بْنُ سَلَمَةَ قَالَ: خَطَبَنَا عَبْدُ اللَّهِ فَقَالَ: وَاللَّهِ لَقَدْ أَخَذْتُ مِنْ فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِضْعًا وَسَبْعِينَ سُورَةً، وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ أَنِّي مِنْ أَعْلَمِهِمْ بِكِتَابِ اللَّهِ، وَمَا أَنَا بِخَيْرِهِمْ. قَالَ شَقِيقٌ: فَجَلَسْتُ فِي الْحِلَقِ أَسْمَعُ مَا يَقُولُونَ، فَمَا سَمِعْتُ رَادًّا يَقُولُ غَيْرَ ذَلِكَ.

**٥٠٠٠ - شەقیقی کوڕی سەلەمە دەڵێ: عەبدوڵڵا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ وتاری بۆ خوێندنەوە و وتی: وەڵڵاهی بەدڵنیاییەوە حەفتاو ئەوەندە سوڕەتم لەدەمی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتووە، وەڵڵاهی دیارە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ چاك دەزانن کەمن لە هەموویان شارەزا ترم بە قورئانەکەی خوا، بەلام لە هەموویان چاکتر نیم، شەقیق دەڵێ: ئینجا لەکۆڕەکەدا دانیشتم گوێم دەگرت (بزام سەبارەت بە قسەکەی عەبدوڵڵا) چی دەڵێن، بەلام لە زانا و شارەزایەکم نەبیست شتێکی تر بڵێ (پێچەوانەی وتەکەی عەبدوڵڵا بێت).**

(١) مەبەست ئەو هاوەڵانەیە کە شارەزان لە خوێندنەوەی قورئاندا یان قورئانیان لەبەرە.

٥٠٠١- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: كُنَّا بِحِمْصَ فَقَرَأَ ابْنُ مَسْعُودٍ سُورَةَ يُوسُفَ، فَقَالَ: رَجُلٌ مَا هَكَذَا أُنْزِلَتْ، قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أَحْسَنْتَ. وَوَجَدَ مِنْهُ رِيحَ الْخَمْرِ فَقَالَ: أَتَجْمَعُ أَنْ تُكَذِّبَ بِكِتَابِ اللَّهِ وَتَشْرَبَ الْخَمْرَ؟!. فَضَرَبَهُ الْحَدَّ.

**٥٠٠١- عەلقەمە دەڵێ: ئێمە لە حیمص بووین، ئیبنو مەسعوود ﷺسوڕەتی یوسفی خوێند، پیاوێ وتی: ئابەو جۆرە دانەبەزێنراوە، ئیبنو مەسعوود وتی: (ئەوەندە سوڕەتم) بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندۆتەوە، فەرموویەتی پێم: (خوێندنەوەکەت) زۆر چاکە. لەو کاتەدا بۆنی عارەقی لە کابرا هەست پێ کرد بۆیە وتی: ئایا تۆ دوو شتت لە خۆتدا کۆ کردۆتەوە، باوەڕت بەکتێبی خوا (قورئان) نی یە وعەرەقیش دەخۆیتەوە؟! جا سزای شەراب خۆری لێ دا[1].**

٥٠٠٢- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ: وَاللَّهِ الَّذِي لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ مَا أُنْزِلَتْ سُورَةٌ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ إِلاَّ أَنَا أَعْلَمُ أَيْنَ أُنْزِلَتْ، وَلاَ أُنْزِلَتْ آيَةٌ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ إِلاَّ أَنَا أَعْلَمُ فِيمَ أُنْزِلَتْ، وَلَوْ أَعْلَمُ أَحَدًا أَعْلَمَ مِنِّي بِكِتَابِ اللَّهِ تُبَلِّغُهُ الإِبِلُ لَرَكِبْتُ إِلَيْهِ.

**٥٠٠٢-مەسروق دەڵێ: عەبدوڵلا ﷺ وتی: سوێند بەو خوایەی جگە لەو پەرەستراوێکی تر نییە، هەر سوڕەتێك لە قورئان دابەزێنرا بێت من دەزانم لە کوێ دابەزیوە، وە هەر ئایەتێك لە قورئان دابەزێنرابێت، من دەزانم دەربارەی چی دابەزیوە، وە ئەگەر بزانم کەسێك هەیە لە من شارەزاترە بە قورئانەکەی خوا (بۆ گەیشتن پێی) وشتر دەیگاتێ، بەدڵنیاییەوە بەسواری وشتر دەڕۆشتم بۆ لای (و ئەو زانیارییەی لێ وەردەگرم).**

(١) خۆی لێی نەدا بەڵکو بەرپرسانی لێ ئاگادار کردوو ئەوان سزایان دا (إرشاد الساري لشرح صحيح البخاري: ٢٧٨/١١)

٥٠٠٣- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ: مَنْ جَمَعَ الْقُرْآنَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَ: أَرْبَعَةٌ كُلُّهُمْ مِنَ الأَنْصَارِ: أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَأَبُو زَيْدٍ. تَابَعَهُ الْفَضْلُ، عَنْ حُسَيْنِ بْنِ وَاقِدٍ، عَنْ ثُمَامَةَ، عَنْ أَنَسٍ[1].

**٥٠٠٣- قەتادە دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ کرد: کێ لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەموو قورئانی لەبەر کردبوو؟ وتی: چوار کەس هەموویان ئەنصاری بوون: ئوبەیی کوڕی کەعب و، موعازی کوڕی جەبەل و، زەیدی کوڕی سابیت و، ئەبو زەید.**

**-فەزڵ لە حوسەینی کوڕی واقیدەوە گێڕاویەتیەوە لە سومامەوە ئەویش لە ئەنەسەوە ﷺ ئەم فەموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی (گێڕانەوەکەی حەفصی کوڕی عومەر) دەکات.**

٥٠٠٤- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنِي ثَابِتٌ الْبُنَانِيُّ وَثُمَامَةُ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: مَاتَ النَّبِيُّ ﷺ وَلَمْ يَجْمَعِ الْقُرْآنَ غَيْرُ أَرْبَعَةٍ: أَبُو الدَّرْدَاءِ، وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَأَبُو زَيْدٍ. قَالَ: وَنَحْنُ وَرِثْنَاهُ[2].

**٥٠٠٤-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد تەنها چوار کەس هەموو قورئانیان لەبەر کرد بوو: ئەبو دەردا و موعازی کوڕی جەبەل و زەیدی کوڕی سابیت و ئەبو زەید، (ئەنەس) دەڵێ: ئێمە میرات گری بووین[3].**

٥٠٠٥- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الْفَضْلِ، أَخْبَرَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ عُمَرُ: أُبَيٌّ أَقْرَؤُنَا، وَإِنَّا لَنَدَعُ مِنْ لَحَنِ أُبَيٍّ، وَأُبَيٌّ

---

(١) بڕوانە: ٣٨١٠.

(٢) بڕوانە: ٤٤٨١.

(٣) مەبەستی ئەبو زەید کە مامی ئەنەس بووە کە مردووە کەسی لێ بەجێ نەماوە، بۆیە ئەنەس دەڵێ: ئێمە میراتی ئەومان وەرگرت.

يَقُولُ أَخَذْتُهُ مِنْ فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلاَ أَتْرُكُهُ لِشَيْءٍ. قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ﴿١٠٦﴾ ﴾ البقرة[1].

**٥٠٠٥- سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبنو عەبباسەوە ﵄ دەیگێڕێتەوە کە وتی: عومەر ﵁ دەڵێ: ئوبەیی لە هەمووومان شارەزاترە لە قورئاندا، لەگەڵ ئەوەش دا ئێمە هەندێ قورئان خوێندنی ئوبەیی هەیە وازی لێ دێنین[2] (وەری ناگرین)، کە ئوبەیی دەڵێ: لە دەمی پێغەمبەری خوا ﷺ وەرم گرتووەو لەبەر ئەوە لەبەر هیچ شتێك وازی لێ ناهێنم، خوای بەرز و بڵند دەفەرموێ: (ئەگەر ئایەتێك (لە ئایەتەکانی قورئان) بسڕینەوە یا دوای خەین[3]، یەکێکی تر باشتر لەو یان وەك ئەو دێنین).**

## ٩- بابُ فَضْلِ فَاتِحَةِ الكِتَابِ

٥٠٠٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنِي خُبَيْبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّى قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي، فَدَعَانِي النَّبِيُّ ﷺ فَلَمْ أُجِبْهُ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي كُنْتُ أُصَلِّي. قَالَ: «أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ: ﴿ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ ﴿٢٤﴾ ﴾ الأنفال." ثُمَّ قَالَ: "أَلاَ أُعَلِّمُكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ مِنَ الْمَسْجِدِ؟». فَأَخَذَ بِيَدِي، فَلَمَّا أَرَدْنَا أَنْ نَخْرُجَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ قُلْتَ: "لأُعَلِّمَنَّكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ". قَالَ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ﴾ الفاتحة. هِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ»[4].

---

(١) بڕوانە: ٤٤٨١.

(٢) چونکە ئەو ئایەتانەی خوێندنەوەکەی نەسخ بۆتەوە بە قورئان نەماوە.

(٣) عەبدوڵلا بە (نَنْسَأْها) دەیخوێندەوە واتە دوایی خەین، بەڵام ئەوانی تر بە (نُنْسِها) خوێندویانەتەوە واتە: پشت گوێی دەخەین.

(٤) بڕوانە: ٤٤٧٤.

# ٩- باسی فەزڵ و گەورەیی سورەتی فاتیحە

**٥٠٠٦- ئەبو سەعیدی کوڕی موعەللا ﷺ دەڵێ: من (لە مزگەوتدا) نوێژم دەکرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردم منیش وەڵامم نەدایەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من نوێژم دەکرد (بۆیە وەڵامم نەدایتەوە)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئایا خوا نەیفەرمووە: وەڵامی خوا و پێغەمبەر بدەنەوە کاتێ بانگی کردن))، لە پاشان فەرمووی پێم: ((ئایا پێش ئەوەی لە مزگەوت بڕۆیتە دەرەوە فێری گەورەترین سورەتت بکەم لە قورئاندا؟)) ئینجا دەستی گرتم، جا کە ویستمان لە مزگەوت بڕۆینە دەرەوە عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ فەرمووت: ((بێگومان گەورەترین سورەتی قورئانت فێر دەکەم))، فەرمووی: (( (سورەتی) ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢ ﴾ ئەو سورەتە حەوت ئایەتی دوبارە بووەوەیەوە، ئەو قورئانی گەورەیە کە بە من بەخشراوە)).**

٥٠٠٧- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا وَهْبٌ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ مَعْبَدٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: كُنَّا فِي مَسِيرٍ لَنَا فَنَزَلْنَا، فَجَاءَتْ جَارِيَةٌ فَقَالَتْ: إِنَّ سَيِّدَ الْحَيِّ سَلِيمٌ، وَإِنَّ نَفَرَنَا غُيَّبٌ فَهَلْ مِنْكُمْ رَاقٍ؟ فَقَامَ مَعَهَا رَجُلٌ مَا كُنَّا نَأْبُنُهُ بِرُقْيَةٍ، فَرَقَاهُ فَبَرَأَ، فَأَمَرَ لَهُ بِثَلاَثِينَ شَاةً وَسَقَانَا لَبَنًا، فَلَمَّا رَجَعَ قُلْنَا لَهُ: أَكُنْتَ تُحْسِنُ رُقْيَةً أَوْ كُنْتَ تَرْقِي؟ قَالَ: لاَ، مَا رَقَيْتُ إِلاَّ بِأُمِّ الْكِتَابِ. قُلْنَا: لاَ تُحْدِثُوا شَيْئًا حَتَّى نَأْتِيَ -أَوْ نَسْأَلَ- النَّبِيَّ ﷺ فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ ذَكَرْنَاهُ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «وَمَا كَانَ يُدْرِيهِ أَنَّهَا رُقْيَةٌ؟! اقْسِمُوا وَاضْرِبُوا لِي بِسَهْمٍ».

وَقَالَ أَبُو مَعْمَرٍ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، مُحَمَّدُ بْنُ سِيرِينَ، حَدَّثَنِي مَعْبَدُ بْنُ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ بِهذا[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٢٧٦.

٥٠٠٧-ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەفەرێکی خۆماندا بووین ئینجا (شەو) دابەزین و لامان دا (لە لای خێڵێکی عەرەب)، جا کچێك هات و وتی: گەورەی خێڵەکە (دووپشك) پێوەی داوە، وە بێگومان پیاوەکانمان لەماڵەوە نین، دەی ئایا کەسێکتان تیایە دوعای بۆ بکات؟ ئینجا پیاوێك هەستا و چوو لەگەڵ کچەکە (بە سورمەتێ) کە ئێمە گومانان وا نەبوو دوعایە، جا دوعای بۆ کرد و چاك بوویەوە، ئەوسا (گەورەی خێڵەکە) فەرمانی کرد سی سەر مەڕی پێدا و شیری داینە، ئینجا کە گەڕاینەوە وتمان بەو کەسە (دوعاکەی کرد)، ئایا تۆ دوعاکردن بۆ نەخۆش دەزانیت یان تۆ پێشتر دوعات بۆ نەخۆش کردوە؟ وتی: نەخێر، من تەنها بە (خوێندنی) سورەتی فاتیحە دوعام بۆ کردوە، وتمان هیچ شتیك مەکەن (بە مەڕەکان) هەتا دەچینەوە بۆ خزمەت - یان پرسیار دەکەین لە - پێغەمبەر ﷺ، جا کاتێ گەشتینەوە مەدینە ڕووداوەکەمان بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، ئەویش فەرمووی: ((ئەو نەیزانیوە کە بێگومان فاتیحە دوعا و نوشتەیە (بۆ نەخۆش). (مەڕەکان) دابەشکەن بەشێکیش بۆ من دابنێن)).

## ١٠- بابُ فَضْل سورةِ البَقَرَة

٥٠٠٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺقَالَ: مَنْ قَرَأَ بِالآيَتَيْنِ"[١].

## ١٠- باسی گەورەیی (سورەتی) بەقەرە

٥٠٠٨- ئەبو مەسعوود ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە کە فەرمووی: ((هەر کەسێك دوو ئایەتەکە بخوێنێ)).

(١) بڕوانە: ٤٠٠٨.

٥٠٠٩- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺقَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ قَرَأَ بِالآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ»[1].

**٥٠٠٩-ئەبو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێك دوو ئایەتەکەی کۆتای سوڕەتی بەقەرە لە شەوێکدا بخوێنێت، ئەو دوو ئایەتەی بەسە)).**

٥٠١٠ - وَقَالَ عُثْمَانُ بْنُ الْهَيْثَمِ: حَدَّثَنَا عَوْفٌ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺقَالَ: وَكَّلَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِحِفْظِ زَكَاةِ رَمَضَانَ، فَأَتَانِي آتٍ فَجَعَلَ يَحْثُو مِنَ الطَّعَامِ، فَأَخَذْتُهُ فَقُلْتُ: لأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. فَقَصَّ الْحَدِيثَ، فَقَالَ: إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ آيَةَ الْكُرْسِيِّ، لَنْ يَزَالَ مَعَكَ مِنَ اللَّهِ حَافِظٌ وَلاَ يَقْرَبُكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «صَدَقَكَ وَهُوَ كَذُوبٌ، ذَاكَ شَيْطَانٌ»[2].

**٥٠١٠- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕایسپاردم بە پارێزگاری کردنی زەکاتی (سەر فیترەی) ڕەمەزان، ئەنجا کەسێك هات بۆ لام و بەهەردوو دەستی (بەمشت) لە خواردنەکەی دەبرد، منیش گرتم وتم: دەتبەم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئیتر فەرموودەکەی گێڕایەوە[3]، ئەنجا (ئەو کەسەی خواردنەکەی دەبرد) وتی: کاتێ چوویتە ناونوێنی نوستنەکەت ئایەتە لکورسی بخوێنە، بەردەوام لە لایەن خواوە پارێزگارت بەسەرەوەیە، وە تا ڕۆژ دەکەیتەوە شەیتان نزیکت نابێتەوە. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ڕاستی پێ وتوویت[4] و خۆی زۆر درۆزنە ئەو شەیتانێك بوو (لە شەیتانەکان) )).**

---

(١) بڕوانە: ٤٠٠٨.

(٢) بڕوانە: ٢٣١١.

(٣) وەک لە باسی وەکالەتدا ڕابوورد.

(٤) دەربارەی گەورەیی ئایەتە لکورسی.

## ١١- بابُ فَضْلِ الكَهْفِ

٥٠١١- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يَقْرَأُ سُورَةَ الْكَهْفِ وَإِلَى جَانِبِهِ حِصَانٌ مَرْبُوطٌ بِشَطَنَيْنِ، فَتَغَشَّتْهُ سَحَابَةٌ، فَجَعَلَتْ تَدْنُو وَتَدْنُو، وَجَعَلَ فَرَسُهُ يَنْفِرُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «تِلْكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ بِالْقُرْآنِ»[1].

## ١١- باسی گەورەیی (سورەتی) کەهف

**٥٠١١- بەڕا ﷺ دەڵێ: پیاوێك سورەتی کەهفی دەخوێند، ئەسپێکیش لە تەنیشتیدا بە دوو گوریس بەسترابوویەوە، پەڵە هەورێکیش بەسەریەوە بوو (دای پۆشیبوو)، جا دوو جار پەڵە هەورەکە لێی نزیك دەبوویەوە و ئەسپەکەش ئەسڵەمییەوە، ئەنجا بەیانی کە ڕۆژ بوویەوە پیاوەکە هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ئەو ڕووداوەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەوە (ی دایپۆشیت) ئارامی بوو بەهۆی (خوێندنی) قورئانەکەوە دابەزیوە)).**

## ١٢- بابُ فَضْلِ سُورَةِ الفَتْحِ

٥٠١٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَسِيرُ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ وَعُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ يَسِيرُ مَعَهُ لَيْلاً، فَسَأَلَهُ عُمَرُ عَنْ شَيْءٍ فَلَمْ يُجِبْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ سَأَلَهُ فَلَمْ يُجِبْهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ فَلَمْ يُجِبْهُ، فَقَالَ عُمَرُ: ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ، نَزَرْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ كُلَّ ذَلِكَ لاَ يُجِيبُكَ. قَالَ عُمَرُ: فَحَرَّكْتُ بَعِيرِي حَتَّى كُنْتُ أَمَامَ النَّاسِ، وَخَشِيتُ أَنْ يَنْزِلَ فِيَّ قُرْآنٌ، فَمَا نَشِبْتُ أَنْ سَمِعْتُ صَارِخًا يَصْرُخُ. قَالَ:

---

(١) بڕوانە: ٣٦١٤.

فَقُلْتُ: لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ يَكُونَ نَزَلَ فِيَّ قُرْآنٌ. قَالَ: فَجِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَقَالَ: «لَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ اللَّيْلَةَ سُورَةٌ لَهِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ». ثُمَّ قَرَأَ ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١﴾ الفتح[1].

## ١٢- باسی گەورەیی (سوڕەتی) فەتح

**٥٠١٢-زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکێ لە سەفەرەکانیدا بە ڕێگادا دەڕۆشت بەشەودا، عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ لەگەڵیدا دەڕۆشت، ئەنجا عومەری کوڕی خەتتاب دەربارەی شتێك پرسیاری لێ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ وەڵامی نەدایەوە، لە پاشان پرسیاری لێ کردەوە بەڵام وەڵامی نەدایەوە، دواتر پرسیاری لێ کردەوە و هەر وەڵامی نەدایەوە، بۆیە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ وتی: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ نەکات عومەر، سێ جار بەرۆکی پێغەمبەرت گرت و پرسیارت لێ کرد وەڵامی نەدایتەوە، عومەر وتی: وشترەکەم لێخوڕی هەتا پێش خەڵکەکە کەوتم و ترسام قورئان لە بارەمەوە دابەزێت، زۆری پێ نەچوو گوێم لێ بوو کەسێك بە دەنگی بەرز بانگم دەکات، عومەر دەڵێ: وتم: سوێند بە خوا ترسام کە قورئان دەربارەم دابەزی بێت، وتی بۆیە هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا و ﷺ سەلامم لێ کرد و ئەویش فەرمووی: ((سوێند بەخوا ئەمشەو سوڕەتێکم بۆ دابەزێنراوە لام خۆشەویسترە لە هەرچی خۆری لێ هەڵهاتووە))، لە پاشان سوڕەتی ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١﴾ی خوێندەوە.**

---

(١) بڕوانە: ٤١٧٧.

## ١٣- بابٌ فَضْل: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ﴾ الإخلاص

فِيهِ عَمْرَةُ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

٥٠١٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، أَنَّ رَجُلاً سَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ﴾ الإخلاص.

يُرَدِّدُهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ -وَكَأَنَّ الرَّجُلَ يَتَقَالُّهَا- فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ»[2].

## ١٣- باسی گەورەیی (سوڕەتی) ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ﴾

**لەم باسەدا فەرموودەیەکی تیایە کە عەمرە دەیگێڕێتەوە لە عائیشەوە ﵂ لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**

**٥٠١٣- ئەبو سەعدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك گوێی لە پیاوێکی تر بوو ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ﴾ی دەخوێند و دووبارەی دەکردەوە، ئینجا کە ڕۆژ بوویەوە پیاوەکە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەو (ڕووداوە)ی گێڕایەوە بۆی پێغەبەر ﷺ، پێدەچوو پیاوەکە ئەوەی بەکەم دەزانی، پێغەمبەر خواش ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، ئەو سوڕەتە بە ئەندازەی سێ یەکی قورئانە)).**

٥٠١٤ - وَزَادَ أَبُو مَعْمَرٍ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَخْبَرَنِي

---

(١) بڕوانە: ٧٣٧٥.

(٢) بڕوانە: ٦٦٤٣، ٧٣٧٤.

أَخِي قَتَادَةُ بْنُ النُّعْمَانِ أَنَّ رَجُلاً قَامَ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ ﷺ يَقْرَأُ مِنَ السَّحَرِ: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ ۝١ ﴾ الإخلاص. لاَ يَزِيدُ عَلَيْهَا، فَلَمَّا أَصْبَحْنَا أَتَى رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ نَحْوَهُ.

**٥٠١٤-ئەبو مەعمەر (لە گێڕانەوەكەیدا) زیادەیەكی هێناوە دەڵێ: ئیسماعیلی كوڕی جەعفەر لە مالیكی كوڕی ئەنەسەوە گێڕاویەتیەوە، لە عەبدوڕەحمانی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبی صەعصەعەوە لە باوكیەوە لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە گێڕاویەتیەوە و دەڵێ: قەتادەی كوڕی نوعمانی برام بۆی گێڕامەوە كە پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەستا پێش بانگی بەیانی ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ ۝١ ﴾ی دەخوێند، هیچی تری لێ زیاد نەدەكرد، جا كە ڕۆژمان لێ بوویەوە پیاوەكە هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، ئیتر بەوێنەی فەرموودەكەی پێشوو دەیگێڕێتەوە.**

٥٠١٥- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ وَالضَّحَّاكُ الْمَشْرِقِيُّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لأَصْحَابِهِ: «أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ ثُلُثَ الْقُرْآنِ فِي لَيْلَةٍ». فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ وَقَالُوا: أَيُّنَا يُطِيقُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: «اللَّهُ الْوَاحِدُ الصَّمَدُ ثُلُثُ الْقُرْآنِ». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: عَنْ إِبْرَاهِيمَ مُرْسَلٌ، وَعَنِ الضَّحَّاكِ الْمَشْرِقِيِّ مُسْنَدٌ.

**٥٠١٥-ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: ((ئایا كەسێك لە ئێوە ناتوانێ لە شەوێكدا سێ یەكی قورئان بخوێنێ؟)) جا (هاوەڵان) ئەوەیان بە لاوە قورس و زەحمەت بوو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا كێ لە ئێمە دەتوانێ ئەوە بكات؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ ۝١ ﴾ (هاوتای) سێ یەكی قورئانە)).**

**ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە لە ڕێگەی ئیبراهیمەوە مورسەلە [1]، بەڵام لە زەححاکی مەشریقییەوە پەیوەستە [2].**

## ١٤ - بابُ فَضْلِ المُعَوِّذَاتِ

٥٠١٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا اشْتَكَى يَقْرَأُ عَلَى نَفْسِهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ وَيَنْفُثُ، فَلَمَّا اشْتَدَّ وَجَعُهُ كُنْتُ أَقْرَأُ عَلَيْهِ وَأَمْسَحُ بِيَدِهِ رَجَاءَ بَرَكَتِهَا[3].

## ١٤- باسی گەورەیی سوڕەتە پەنا پێ گیراوەکان [4]

**٥٠١٦- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر نەخۆش بکەوتایە، سوڕەتە پەنا پێ گیراوەکانی دەخوێند بەسەر خۆیداو فووی دەکرد بە خۆیدا، ئینجا کاتێ کە نەخۆشی یەکەی سەخت بوو من (ئەو سوڕەتانەم) دەخوێند بەسەریدا دەستی خۆیم دەهێنا بە لاشەیدا، بەهیوای فەڕ و بەرەکەتی دەستەکانی خۆی.**

٥٠١٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا الْمُفَضَّلُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ جَمَعَ كَفَّيْهِ ثُمَّ نَفَثَ فِيهِمَا فَقَرَأَ فِيهِمَا: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ الإخلاص، وَ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١﴾ الفلق، وَ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾ الناس. ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا مَا اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ، يَبْدَأُ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ وَوَجْهِهِ وَمَا أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ[5].

---

(١) مورسەل: بەو فەرموودەیە دەڵێن (تابعی) لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیگێڕێتەوە و ناوی سەحابە نەهێنێ لە ڕستەکەیدا.

(٢) (مُسنَد) ئەوە فەرموودە سەنەدەکەی پەیوەست بێت نەپچڕابێ لە سەرتاوە تا کۆتایی.

(٣) بڕوانە: ٤٤٣٩.

(٤) مُعَوِّذات: بەم سێ سوڕەتە دەڵێن: ئیخلاس و فەلەق و ناس.

(٥) بڕوانە: ٥٧٤٨، ٦٣١٩.

**٥٠١٧- عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەموو شەوێك کە دەڕۆشتە ناو نوێنی نووستنەکەی هەردوو دەستی دەخستە پاڵ یەکتری، پاشان فووی پیا دەکردن و (سوڕەتەکانی) ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ۝١﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾ی دەخوێند بە هەردوو دەستیدا، لە پاشان ئەوەندەی بیتوانیایە دەستەکانی دەهێنا بەلاشەیدا، دەستەکانی بە هێنانی بەسەری و ڕووخساری و پێشەوەی لاشەی دەستی پێدەکرد، سێ جار ئەم کارەی دەکرد.**

## ١٥- بابُ نُزُولِ السَّكِينَةِ وَالْمَلاَئِكَةِ عِنْدَ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ

٥٠١٨ - وَقَالَ اللَّيْثُ حَدَّثَنِي يَزِيدُ بْنُ الْهَادِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ قَالَ: بَيْنَمَا هُوَ يَقْرَأُ مِنَ اللَّيْلِ سُورَةَ الْبَقَرَةِ وَفَرَسُهُ مَرْبُوطٌ عِنْدَهُ إِذْ جَالَتِ الْفَرَسُ، فَسَكَتَ فَسَكَتَتْ، فَقَرَأَ فَجَالَتِ الْفَرَسُ، فَسَكَتَ وَسَكَتَتِ، الْفَرَسُ، ثُمَّ قَرَأَ فَجَالَتِ الْفَرَسُ، فَانْصَرَفَ، وَكَانَ ابْنُهُ يَحْيَى قَرِيبًا مِنْهَا فَأَشْفَقَ أَنْ تُصِيبَهُ، فَلَمَّا اجْتَرَّهُ رَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ حَتَّى مَا يَرَاهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ حَدَّثَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «اقْرَأْ يَا ابْنَ حُضَيْرٍ، اقْرَأْ يَا ابْنَ حُضَيْرٍ». قَالَ: فَأَشْفَقْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْ تَطَأَ يَحْيَى وَكَانَ مِنْهَا قَرِيبًا، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَانْصَرَفْتُ إِلَيْهِ، فَرَفَعْتُ رَأْسِي إِلَى السَّمَاءِ، فَإِذَا مِثْلُ الظُّلَّةِ فِيهَا أَمْثَالُ الْمَصَابِيحِ، فَخَرَجَتْ حَتَّى لاَ أَرَاهَا. قَالَ: «وَتَدْرِي مَا ذَاكَ؟». قَالَ: لاَ. قَالَ: «تِلْكَ الْمَلاَئِكَةُ دَنَتْ لِصَوْتِكَ، وَلَوْ قَرَأْتَ لأَصْبَحَتْ يَنْظُرُ النَّاسُ إِلَيْهَا، لاَ تَتَوَارَى مِنْهُمْ». قَالَ ابْنُ الْهَادِ: وَحَدَّثَنِي هَذَا الْحَدِيثَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ خَبَّابٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنْ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ.

# ١٥- باسی دابەزینی ئارامی و فریشتە لە كاتی خوێندنی قورئاندا

٥٠١٨- ئوسەیدی كوڕی حوزەیر ﷺ دەڵێ: لە كاتێكدا ئەو (ئوسەید) لە شەودا سوڕەتی بەقەرەی دەخوێند ماینەكەشی لە لایدا بەسرابوویەوە، ماینەكە دەستی كرد بە سمكۆڵان[1]، جا ئەو (ئوسەید) لە قورئان خوێندن وەستا، ماینەكەش لە سمكۆڵان وەستا، پاشان قورئانی خوێند ماینەكەش سمكۆڵانی دەكرد، ئینجا ئوسەید بێدەنگ بوو ماینەكەش وەستا، پاشان قورئانی خوێند ماینەكەش دەستی كردەوە بە سمكۆڵان، ئینجا (ئوسەید) ڕۆشت، یەحیای كوڕی نزیك بوو لە ماینەكەوە و دەترسا ماینەكە ئازاری پێ بگەیەنێت، جا كاتێ یەحیای دەرهێنا (لە شوێنەكە و دوری خستەوە لە ماینەكە) سەری بەرز كردەوە بۆ ئاسمان، (جا دەبینێ شتێكی وەك پەڵە هەور شتێ وەك چراخانی لە ناودایە بەرز بوویە بۆئاسمان) [2] تا لەچاوی ئەو ون بوون، جا كە ڕۆژی لێ بوویەوە (ڕۆشت بۆ مزگەوت و) باسەكەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: (( (قورئان) بخوێنە كوڕی حوزەیر (قورئان) بخوێنە كوڕی حوزەیر)) [3]، (ئوسەید) دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ترسام ماینەكە پێ بنێ بە یەحیادا، چونكە نزیك بوو لێیەوە، جا كە سەرم بەرز كردەوە و ڕۆشتم بۆ لای یەحیا سەرم بەرزكردەوە بۆ ئاسمان، جا دەبینم شتێك وەك پەڵە هەور وایە شتێكی وەك چراخانی لە ناودایە ئینجا بەرزبوویەوە [4] تا لە چاووم ون بوو (نەمدەبینی)، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((دەزانی ئەوە چی بووە؟)) وتی نەخێر، فەرمووی: ((ئەوانە فریشتە بوون لەبەر دەنگی (قورئان خوێندن)ـەكەت (دابەزیبوون)، نزیك

---

(١) سمكۆڵان: دەست بەزەویدا دانی وڵاخی بەرزە و هەڵكۆڵینی (فەرهەنگی خاڵ: ٣٢٥)

(٢) ئەم زیادەیە لە صەحیحی موسلیم دا هاتووە و ئیبنو حەجەریش لە فتح الباری دا دەڵێ: ئەبو عوبەیدە هێناویەتی (فتح الباری: ٧٨/١١، و صحیح مسلم حدیث: ١٨٥٩).

(٣) بەمانای ئەوە نیە لەو كاتەدا قورئان بخوێنە كە لە خزمەتیدا باسەكەی بۆ گێڕاوەتەوە، بەڵكو دەفەرموێ بەردەوام قورئان بخوێنە، چونكە بەهۆیەوە فریشتە و ئارامی دابەزیوە.

(٤) وشەی (فخرجت) لە هەندێ نوسخەدا بە (فعرجت) هاتووە واتە: بەرزبوویەوە.

بووبوونەوە ئەگەر بەردەوام قورئانت بخوێندایە کە ڕۆژ دەبوویەوە خەڵك سەیری ئەو فریشتانەیان دەکرد (دەیان بینین) لێیان نەدەشارانەوە)).

-ئیبنو لهاد دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی خەبباب ئەم فەرموودەی بۆ گێڕامەوە لە ئەبی سەعیدی خودریەوە، ئەویش لە ئوسەیدی کوڕی حوزەیرەوە[1].

## ١٦- بَابُ مَنْ قَالَ: لَمْ يَتْرُكِ النَّبِيُّ ﷺ إِلَّا مَا بَيْنَ الدَّفَّتَيْنِ

٥٠١٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَشَدَّادُ بْنُ مَعْقِلٍ عَلَى ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، فَقَالَ لَهُ شَدَّادُ بْنُ مَعْقِلٍ: أَتَرَكَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ شَيْءٍ؟ قَالَ: مَا تَرَكَ إِلاَّ مَا بَيْنَ الدَّفَّتَيْنِ. قَالَ: وَدَخَلْنَا عَلَى مُحَمَّدِ ابْنِ الْحَنَفِيَّةِ فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: مَا تَرَكَ إِلاَّ مَا بَيْنَ الدَّفَّتَيْنِ.

## ١٦- باسی ئەو کەسەی دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ جگە لەوەی لە نێوان هەردوو بەرگەکەی قورئاندا (لە پاش مردنی) هیچی تری بەجێ نەهێشتووە.

٥٠١٩-عەبدولعەزیز کوڕی ڕوفەیع دەڵێ: من و شەددادی کوڕی مەعقیل ڕۆشتین بۆ لای ئیبنو عەبباس ﵄، شەددادی کوڕی مەعقیل پێی وت: ئایا پێغەمبەر ﷺ (جگە لە قورئان) شتێکی بەجێهێشتووە؟ (ئیبنو عەبباس) وتی: جگە لە قورئان هیچی بەجێ نەهێشتووە (پاش وەفاتی)، (عەبدولعەزیز) دەڵێ: ڕۆشتین بۆ لای موحەممەدی کوڕی حەنەفییە و هەمان پرسیارمان لێ کرد، ئەویش وتی: جگە لە قورئان (ئەوەی لە نێوان دوو بەرگەکە دایە) [2]

---

(١) ئەمە ڕێگەیەکی تری فەرموودەکەیە پەیوەستە بەڵام ڕێگەی یەکەم موعلەقە و پەیوەست نییە.

(٢) مەبەستی نێوان دوو بەرگ هەر قورئانە چونکە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ قورئان لە بەرگێکدا کۆنەکرابوویەوە.

## ١٧- بابُ فَضْلِ القُرْآنِ عَلَى سَائِرِ الكَلَامِ

٥٠٢٠- حَدَّثَنَا هُدْبَةُ بْنُ خَالِدٍ أَبُو خَالِدٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، حَدَّثَنَا أَنَسٌ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺقَالَ: «مَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَالأُتْرُجَّةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَرِيحُهَا طَيِّبٌ، وَالَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَالتَّمْرَةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَلاَ رِيحَ لَهَا، وَمَثَلُ الْفَاجِرِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الرَّيْحَانَةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْفَاجِرِ الَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ طَعْمُهَا مُرٌّ وَلاَ رِيحَ لَهَا»[1].

## ١٧- باسی فەزڵ و گەورەیی قورئان بەسەر هەموو ووتەکانی کەدا

**٥٠٢٠-ئەنەسی کوڕی مالیك لە ئەبو مووساوە ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((نموونەی ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێت (و کاری پێ دەکات) وەك ترنج [2] وایە، تامی خۆشە و بۆنیشی خۆشە، وە ئەو کەسەی قورئان ناخوێنێت وەك خورما وایە، تامی خۆشە و بۆنی نییە، وە نموونەی ئەو دوو ڕوو (ناپاك) انەی قورئان دەخوێنێت وەك ڕیحانە وایە، بۆنی خۆشە و تامی تاڵە، وە نموونەی ئەو ناپاکەی قورئان ناخوێنێت وەك گوژاڵکە وایە، تامی تاڵە و بۆنیشی نییە)).**

٥٠٢١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ، حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺقَالَ: «إِنَّمَا أَجَلُكُمْ فِي أَجَلِ مَنْ خَلاَ مِنَ الأُمَمِ كَمَا بَيْنَ صَلاَةِ الْعَصْرِ وَمَغْرِبِ الشَّمْسِ، وَمَثَلُكُمْ وَمَثَلُ الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَعْمَلَ عُمَّالاً، فَقَالَ: مَنْ

---

(١) بڕوانە: ٥٠٥٩، ٥٤٢٧، ٧٥٦٠.

(٢) الأُتْرُجَّةِ: درەختی ترنج، بەری ترنج (درەختێکە لە ڕەگەزی لیمۆیە) (المونجید بەکوردی: ٣٣/١)

يَعْمَلُ لِي إِلَى نِصْفِ النَّهَارِ عَلَى قِيرَاطٍ؟ فَعَمِلَتِ الْيَهُودُ، فَقَالَ: مَنْ يَعْمَلُ لِي مِنْ نِصْفِ النَّهَارِ إِلَى الْعَصْرِ؟ فَعَمِلَتِ النَّصَارَى، ثُمَّ أَنْتُمْ تَعْمَلُونَ مِنَ الْعَصْرِ إِلَى الْمَغْرِبِ بِقِيرَاطَيْنِ قِيرَاطَيْنِ، قَالُوا: نَحْنُ أَكْثَرُ عَمَلاً وَأَقَلُّ عَطَاءً، قَالَ: هَلْ ظَلَمْتُكُمْ مِنْ حَقِّكُمْ؟ قَالُوا: لاَ. قَالَ: فَذَاكَ فَضْلِي أُوتِيهِ مَنْ شِئْتُ»[1].

**٥٠٢١-ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان ماوە و کاتی ئێوە (ی مسوڵمان) بە بەراورد بەماوە و کاتی ئەو گەلانەی کە پێشتر بوون، وەکو نێوانی نوێژی عەسر و ئێوارە وایە، وە نموونەی ئێوە و نموونەی جوولەکە و گاورەکان وەك پیاوێك وایە چەند کرێکارێکی بەکرێ گرتبێ (کاری بۆ بکەن)، ئینجا پێیان دەڵێ: کێ کارم بۆ دەکات تا نیوەڕۆ[2] بە قیراتێك؟ ئیتر جوولەکەکان کارەکەیان بۆ کرد، ئینجا وتی: کێ کارم بۆ دەکات لە نیوەڕۆوە تا عەسر (بە قیراتێك)؟ گاورەکانیش کارەکەیان بۆ کرد، پاشان ئێوە (مسوڵمانان) لە عەسرەوە تا ئێوارە کاردەکەن بە دووقیرات، (گاور و جوولەکەکان) وتیان: ئێمە کارمان زۆرتر کردوە کەمتریش کرێمان پێدراوە، (خوای گەورە) فەرمووی: ئایا لە ماف و کرێکەتان هیچ ستەمێکم لێ کردوون؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: کەواتە ئەوە بەهرەی خۆمە دەیدەم بە هەرکەسێ کە بمەوێ.**

## ١٨- بابُ الوَصَاةِ بِكِتَابِ اللهِ ﷻ.

٥٠٢٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ مِغْوَلٍ، حَدَّثَنَا طَلْحَةُ قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى: أَوْصَى النَّبِيُّ ﷺ؟ فَقَالَ: لاَ. فَقُلْتُ: كَيْفَ كُتِبَ عَلَى النَّاسِ الْوَصِيَّةُ، أُمِرُوا بِهَا وَلَمْ يُوصِ؟ قَالَ: أَوْصَى بِكِتَابِ اللَّهِ[3].

---

(١) بڕوانە: ٥٥٧.

(٢) تا نیوەی ڕۆژەکە.

(٣) بڕوانە: ٢٧٤٠.

## ١٨- باسی وەسێت کردنی (پێغەمبەر ﷺ بەدەست گرتن) بە کتێبەکەی خواوە ﷻ

٥٠٢٢-تەڵحە دەڵێ: پرسیارم کرد لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفا رضي الله عنهما، ئایا پێغەمبەر ﷺ وەسێتی کردوە (بەهیچ شتێك)؟ عەبدوڵڵا وتی: نەخێر، ئەنجا وتم: ئەی چۆن وەسێت کردن لەسەر خەڵکی پێویست کراوە، وە فەرمانیان پێ کراوە بە وەسێت کردن (پێغەمبەریش ﷺ) وەسێتی نەکردوە؟ وتی: (پێغەمبەر ﷺ) وەسێتی کرد (بەدەست گرتن و کارکردن) بە کتێبەکەی خواوە (کە قورئانە).

## ١٩- بابٌ: مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُرْآنِ وَقَوْلُهُ تَعَالى: ﴿ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ ﴿٥١﴾ ﴾ العنكبوت

٥٠٢٣- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَمْ يَأْذَنِ اللَّهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِلنَّبِيِّ ﷺ يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ». وَقَالَ صَاحِبٌ لَهُ: يُرِيدُ يَجْهَرُ بِهِ[1].

## ١٩- باسێک: کەسێک بە قورئان بێنیاز نەبێ (لە وتەی تر)، وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئایا بۆ ئەوان بەس نییە کە ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە بۆ سەر تۆ دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا)

٥٠٢٣-ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان لە ئەبو ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە ئەو دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خوا بۆ هیچ

(١) بڕوانە: ٥٠٢٤، ٧٤٨٢، ٧٥٤٤.

**شتێك گوێی نەگرتووە ئەوەندەی گوێی بۆ پێغەمبەرێك گرتووە قورئان بەدەنگی بەرزو خۆش بخوێنێ، (یان بە قورئان بێنیاز بێت لە شتی تر) ))، هاوڕێیەکی ئەبو سەلەمە وتی: مەبەستی بە (يَتَغَنَّى): ئەوەی بەدەنگی بەرز و ئاشکرا بیخوێنێ.**

٥٠٢٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ،عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا أَذِنَ اللَّهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِلنَّبِيِّ أَنْ يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ». قَالَ سُفْيَانُ: تَفْسِيرُهُ يَسْتَغْنِي بِهِ[١].

**٥٠٢٤-ئەبو سەلەمە لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((خوا بۆ هیچ شتێك[٢] گوێی نەگرتووە، ئەوەندەی گوێی گرتووە بۆ پێغەمبەرێك کە قورئان بە دەنگی خۆش بخوێنێ)). سوفیان[٣] دەڵێ: مانای (يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ) واتە: بە قورئان بێنیاز بێت لە هەموو وتە و شتێکی تر.**

## ٢٠- بابُ اغْتِبَاطِ صَاحِبِ الْقُرْآنِ

٥٠٢٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ حَسَدَ إِلاَّ عَلَى اثْنَتَيْنِ، رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْكِتَابَ وَقَامَ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ، وَرَجُلٌ أَعْطَاهُ اللَّهُ مَالاً فَهْوَ يَتَصَدَّقُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ»[٤].

---

(١) بڕوانە: ٥٠٢٣.
(٢) لە گێرانەوەیەکدا دەفەرموێ (بۆ هیچ پێغەمبەرێک) لە بری (هیچ شتێک).
(٣) کە یەکێکە لەو کەسانەی ئەم فەرموودەی گێراوەتەوە.
(٤) بڕوانە: ٧٥٢٩.

# ٢٠- باسی خۆزگە و ئاوات خواستن بەو کەسەی قورئان دەزانێ و لەبەریەتی

**٥٠٢٥-عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((خۆزگە خواستن دروست نییە لە دوو شت دا نەبێ: پیاوێك خوا (شارەزایی) قورئانی پێ بەخشی بێت و لە کاتەکانی شەودا بیخوێنێ (و کاری پێ بکات)، وە پیاوێکیش خوا ماڵ و سامانی پێ بەخشی بێت، جا ئەو کەسە لە کاتەکانی شەو و ڕۆژدا دەیبەخشێت)).**

٥٠٢٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا رَوْحٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ، سَمِعْتُ ذَكْوَانَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺقَالَ: «لاَ حَسَدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ عَلَّمَهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ فَهُوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، فَسَمِعَهُ جَارٌ لَهُ فَقَالَ: لَيْتَنِي أُوتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ فُلاَنٌ فَعَمِلْتُ مِثْلَ مَا يَعْمَلُ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً فَهُوَ يُهْلِكُهُ فِي الْحَقِّ، فَقَالَ رَجُلٌ: لَيْتَنِي أُوتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ فُلاَنٌ فَعَمِلْتُ مِثْلَ مَا يَعْمَلُ»[1].

**٥٠٢٦-ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خۆزگە خواستن دروست نییە لە دوو شت دا نەبێ: پیاوێك خوا فێری قورئانی کردوە جا ئەو کەسە لە کاتەکانی شەو و کاتەکانی ڕۆژدا دەوری دەکاتەوە، دراوسێکەی گوێی لێ بێ و بڵێ: کاشکێ ئەوەی بە فلانە کەس بەخشراوە بە منیش ببەخشرایە، ئەوسا ئەوەی ئەو دەیکات منیش بمکردایە، پیاوێکیش خوا ماڵ و سامانێکی زۆری پێ بەخشیوە، جا ئەو کەسە لە ڕێگەی هەقدا لە ناوی ببات (بیبەخشێت)، پیاوێك بڵێ: کاشکێ ئەوەی بە فلانە کەس بەخشراویە بەمنیش ببەخشرا، جا ئەوەی ئەو دەیکات (لە ماڵ بەخشین) منیش بمکردایە)).**

---

(١) بڕوانە: ٧٢٣٢، ٧٥٢٨.

## ٢١- بابٌ: خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ القُرْآنَ وَعَلَّمَهُ

٥٠٢٧- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَلْقَمَةُ بْنُ مَرْثَدٍ: سَمِعْتُ سَعْدَ بْنَ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ عُثْمَانَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ». قَالَ: وَأَقْرَأَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ فِي إِمْرَةِ عُثْمَانَ حَتَّى كَانَ الْحَجَّاجُ، قَالَ: وَذَاكَ الذِي أَقْعَدَنِي مَقْعَدِي هَذَا[١].

## ٢١- باسێک: چاکترینتان ئەو کەسەیە کە قورئان فێرببێ و خەڵکیش فێر بکات

**٥٠٢٧-عوسمان ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((باشترینتان ئەو کەسەیە قورئان فێرببێ و خەڵکی فێر بکات)).**

**(سەعدی کوڕی عوبەید) دەڵێ: ئەبو عەبدوڕەحمان لە خیلافەتی عوسمانەوە تا کاتی حەجاج [٢] قورئانی فێری خەڵکی کردوە، وە (عەبدوڕەحمان) وتی: ئەو (فەرموودە) [٣] لەم جێگادا (ئەو ماوە زۆرە) داینیشاندووم [٤].**

٥٠٢٨- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ مَرْثَدٍ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ أَفْضَلَكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ»[٥].

**٥٠٢٨-عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان گەورەترینتان ئەو کەسەیە فێری قورئان ببێت وخەڵکی فێر بکات)).**

---

(١) بڕوانە: ٥٠٢٨.

(٢) ئەمیر و لێپرسراوی عێراق بوو.

(٣) (باشترینتان ئەو کەسەیە....).

(٤) قورئان بەخەڵک بڵێم و ماندوو نەبم، چونکە چاوم بڕیوەتە ئەو پاداشتە گەورەیە.

(٥) بڕوانە: ٥٠٢٧.

٥٠٢٩- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: إِنَّهَا قَدْ وَهَبَتْ نَفْسَهَا للهِ وَلِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «مَا لِي فِي النِّسَاءِ مِنْ حَاجَةٍ». فَقَالَ رَجُلٌ: زَوِّجْنِيهَا. قَالَ: «أَعْطِهَا ثَوْبًا». قَالَ: لاَ أَجِدُ. قَالَ: «أَعْطِهَا وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ». فَاعْتَلَّ لَهُ. فَقَالَ: «مَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ؟». قَالَ: كَذَا وَكَذَا. قَالَ: «فَقَدْ زَوَّجْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ»[1].

**٥٠٢٩-سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەو خۆی بەخشیوە بەخوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((من هیچ پێویستیەکم بە ئافرەتان نییە ))، ئینجا پیاوێك وتی (ئەی پێغەمبەر ﷺ) مارەیکە بۆ من، فەرمووی: ((پۆشاکێکی (بەمارەی) پێ بدە))، پیاوەکە وتی: نیمە، فەرمووی: ((شتێکی پێ بدە ئەگەر ئەموستیلەیەکی ئاسنیش بێت))، پیاوەکە لەبەر ئەوە (ی هیچی نەبوو) غەمبار و بێتاقەت بوو، ئینجا فەرمووی: ((لە قورئاندا چیت لەبەرە؟ )) وتی: ئەوە و ئەوەم (لەبەرە)، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((ئەوە دڵنیابە بەوەی لەبەرتە لە قورئان لێم مارەکردی)).**

## ٢٢- بَابُ الْقِرَاءَةِ عَنْ ظَهْرِ الْقَلْبِ

٥٠٣٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ جِئْتُ لأَهَبَ لَكَ نَفْسِي، فَنَظَرَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَعَّدَ النَّظَرَ إِلَيْهَا وَصَوَّبَهُ، ثُمَّ طَأْطَأَ رَأْسَهُ، فَلَمَّا رَأَتِ الْمَرْأَةُ أَنَّهُ لَمْ يَقْضِ فِيهَا شَيْئًا جَلَسَتْ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ فَزَوِّجْنِيهَا. فَقَالَ: «هَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ؟». فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ:

(١) بڕوانە: ٢٣١٠.

«اذْهَبْ إِلَى أَهْلِكَ فَانْظُرْ هَلْ تَجِدُ شَيْئًا». فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا وَجَدْتُ شَيْئًا. قَالَ: «انْظُرْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ». فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ، وَلَكِنْ هَذَا إِزَارِي -قَالَ سَهْلٌ: مَا لَهُ رِدَاءٌ- فَلَهَا نِصْفُهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا تَصْنَعُ بِإِزَارِكَ؟ إِنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا مِنْهُ شَيْءٌ وَإِنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ شَيْءٌ». فَجَلَسَ الرَّجُلُ حَتَّى طَالَ مَجْلِسُهُ، ثُمَّ قَامَ، فَرَآهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُوَلِّيًا، فَأَمَرَ بِهِ فَدُعِيَ، فَلَمَّا جَاءَ قَالَ: «مَاذَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ؟». قَالَ: مَعِي سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا. عَدَّهَا، قَالَ: «أَتَقْرَؤُهُنَّ عَنْ ظَهْرِ قَلْبِكَ؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «اذْهَبْ فَقَدْ مَلَّكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ»[1].

## ٢٢- باسی قورئان خوێندن بە لەبەر بوون

**٥٠٣٠-سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هاتووم خۆمت پێشکەش بکەم، پێغەمبەریش ﷺ سەیری کرد، ئینجا لە سەرەوە بۆ خوارەوە تەماشای کرد لە پاشان سەرداخست، جا کە ئافرەتەکە زانی پێغەمبەر ﷺ هیچ بڕیارێکی لە بارەیەوە نەدا دانیشت، ئینجا پیاوێك لە هاوەڵانی هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر تۆ داخوازی نیت، بۆ منی مارە بکە، فەرمووی: ((ئایا هیچت هەیە (بیکەیت بە مارەیی بۆی؟) )) وتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((بڕۆ بۆ ماڵەوەتان بزانە شتێك پەیدا دەکەیت؟)) ئەویش ڕۆشت پاشان گەڕایەوە و وتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا هیچم دەست نەکەوت، فەرمووی: ((سەرنج بدە با ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێت))، ئەوسا ڕۆشت لە پاشان گەڕایەوە و وتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیشم دەست نەکەوت، بەڵام**

---

(١) بڕوانە: ٢٣١٠.

ئەم پۆشاکەم [1] هەیە- سەهل دەڵێ: پیاوەکە پشتەماڵەی نەبوو - نیوەی بۆ ئەو ئافرەتەکە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((چی لە ئیزارەکەت بکات؟ ئەگەر تۆ بی پۆشی ئەو هیچی لەبەردا نابێ، وە ئەگەر ئەو (ئافرەتەکە) بی پۆشێ تۆ هیچت لەبەردا نابێ، ئیتر پیاوەکە دانیشت و دانیشتنەکەی درێژەی کێشا پاشان هەستا، پێغەمبەری خوا ﷺ کابرا بینی پشتی هەڵکردوو ڕۆشت، فەرمانی کرد و بانگ کرایەوە، ئینجا کە هات فەرمووی: ((چیت پێیە لە قورئان؟)) وتی: فلانە سورەت و فلانە سورەت، ژماردنی، فەرمووی: ((هەموویان لەبەر دەخوێنی؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((برۆ ئەوە بەڕاستی ئەو (ئافرەتەم) لێ مارە کردیت بەو (سورەتانەی) قورئان کە لەبەرتە)).

## ٢٣- بابُ اسْتِذْكَارِ الْقُرْآنِ وَتَعَاهُدِهِ

٥٠٣١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ صَاحِبِ الإِبِلِ الْمُعَقَّلَةِ إِنْ عَاهَدَ عَلَيْهَا أَمْسَكَهَا، وَإِنْ أَطْلَقَهَا ذَهَبَتْ».

## ٢٣- باسی قورئان وە بیرخۆهێنانەوە و دەور کردنەوەی [2]

٥٠٣١-ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی نموونەی خاوەنی قورئان وەك خاوەنی وشتری بەستراوە وایە، ئەگەر چاودێری بکات ڕایدەگرێت، ئەگەر بەرەڵاشی بکات دەڕوات)).

---

(١) (إزار): پۆشاکێکە بۆ نێوان ناوک و ئەژنۆ.

(٢) واتە: هەوڵدان بۆ لەبیر نەچوونەوەی قورئان دەور کردنەوە و پیاچوونەوەی تا لەبیریدا بمێنێتەوە، ئەوەی لەبەری کردوە لەبیر نەچێت.

٥٠٣٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «بِئْسَ مَا لأَحَدِهِمْ أَنْ يَقُولَ: نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ، بَلْ نُسِّيَ، وَاسْتَذْكِرُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنْ صُدُورِ الرِّجَالِ مِنَ النَّعَمِ».

حَدَّثَنَا عُثْمَان، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ مِثْلَهُ. تَابَعَهُ بِشْرٌ، عَنِ ابن المُبَارَكِ، عَنْ شُعْبَةَ. وَتَابَعَهُ ابن خرَيْجٍ، عَنْ عَبْدَةَ، عَنْ شَقِيقٍ: سَمِعْت عَبْدَ اللَّهِ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ[1].

**٥٠٣٢ -عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((چەند خراپ و ناشرینە بۆ کەسێکیان کە بڵێ: ئەو ئایەتە و ئەو ئایەتەم لەبیر چۆتەوە، بەڵکو لەبیری براوەتەوە، زۆر قورئان وە بیر خۆتان بێننەوە (دەوری بکەنەوە)، چونکە بێگومان ئەوەندە خێرا لەسینەی پیاوان دەردەچێت، کە وشتر بەو نەوعە لەدەست دەرناچێ (وە ڕا ناکات).**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ) عوسمان بۆی گێڕاینەوە وتی جەریر بۆی گێڕاینەوە لە مەنصورەوە بە وێنەی فەرموودەکەی پێشوو گێڕایەوە.**

**-بیشر ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە ئیبنو موبارەکەوە لە شوعبەوەو پاڵپشتی گێڕانەوەکەی موحەممەدی کوڕی عەر عەری کردوە.**

**-هەروەها ئیبنو جورەیج ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە عەبدە و ئەویش لە شەقیقەوە وتی: لە عەبدوڵڵام ﷺ بیست وتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی موحەمەدی کوڕی عەرعەری کردوە.**

٥٠٣٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺقَالَ: «تَعَاهَدُوا الْقُرْآنَ، فَوَالَّذِى نَفْسِي بِيَدِهِ لَهُوَ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنَ الإِبِلِ فِي عُقُلِهَا».

---

(١) بڕوانە: ٥٠٣٩.

٥٠٣٣-ئەبو بوردە لە ئەبو مووساوە ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: ((دەوزی قورئان بکەنەوە (پیایدا بچنەوە)، سا سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، دەرچوونی قورئان (لە دڵی پیاوان دا) خێراترە لە بەرەڵڵا بوونی وشتر لەو پەتەی دەستی پێی بەستراوەتەوە)).

## ٢٤- بابُ الْقِرَاءَةِ عَلَى الدَّابَّةِ.

٥٠٣٤- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو إِيَاسٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مُغَفَّلٍ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ وَهْوَ يَقْرَأُ عَلَى رَاحِلَتِهِ سُورَةَ الْفَتْحِ[1].

## ٢٤- باسی قورئان خوێندن بەسواری وڵاخەوە (دروستە)

٥٠٣٤-عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککە دا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بە سواری وشتەرکەیەوە سوڕەتی فەتحی دەخوێند.

## ٢٥- بابُ تَعْلِيمِ الصِّبْيَانِ الْقُرْآنَ

٥٠٣٥- حَدَّثَنِي مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: إِنَّ الَّذِي تَدْعُونَهُ الْمُفَصَّلَ هُوَ الْمُحْكَمُ، قَالَ: وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا ابْنُ عَشْرِ سِنِينَ وَقَدْ قَرَأْتُ الْمُحْكَمَ[2].

## ٢٥- باسی منداڵان فێری قورئان کردن

٥٠٣٥-سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: بێگومان ئەو سوڕەتانەی ئێوە پێیان دەڵێن: موفەصصەل[1] ئەوانە ئەو سوڕەتانەن نەسخ نەبوونەوتەوە، (سەعید) دەڵێ:

---

(١) بڕوانە: ٤٢٨١.

(٢) بڕوانە: ٥٠٣٦.

**ئیبنو عەبباس ﷺ وتی: کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد من تەمەنم دە ساڵ بوو، ئەو سورەتانەم خوێند بوو کە موحکەمن (واتە: موفەصصەل).**

٥٠٣٦- حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: جَمَعْتُ الْمُحْكَمَ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ لَهُ: وَمَا الْمُحْكَمُ؟ قَالَ: الْمُفَصَّلُ[٢].

**٥٠٣٦-سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺسورەتە موحکەمەکانم لەبەر کردوە، (سەعید دەڵێ) وتم: موحکەم چییە؟ وتی موفەصصەلەکان.**

## ٢٦- بابُ نِسْيَانِ الْقُرْآنِ، وَهَلْ يَقُولُ: نَسِيتُ آيَةَ كَذَا وَكَذَا؟

وَقَوْلِ اللَّهِ تعالى: ﴿ سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴿٦﴾ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ﴿٧﴾ ﴾ الأعلى.

## ٢٦- باسی لە بیرچوونەوەی قورئان، وە ئایە کەسێک بڵێ ئەو ئایەتە و ئەو ئایەتەم لە بیر چۆتەوە؟

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی موحەممەد ﷺ قورئانت بەسەردا دەخوێنینەوە و هەرگیز بیرت ناچێتەوە، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێت).**

٥٠٣٧- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي رَجَاءٍ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سَمِعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلاً يَقْرَأُ فِي سُورَةٍ بِاللَّيْلِ فَقَالَ: «يَرْحَمُهُ اللَّهُ لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وَكَذَا آيَةً كُنْتُ أُنْسِيتُهَا مِنْ سُورَةِ كَذَا وَكَذَا»[١].

---

(١) بەو سورەتانە دەڵێن ئایەتەکان و سورەتەکانیان کورتن بە چاو سورەتەکان ترەوە، کە لەسورەتی (حجرات)ـەوە دەست پێ دەکات تا کۆتای قورئان. بڕوانە : إرشاد الساري: ١١/٢٠٩.

(٢) بڕوانە: ٥٠٣٥.

**٥٠٣٧- عائیشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ گوێی له پیاوێك بوو له مزگەوت دا قورئانی دەخوێند (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((ڕەحمەتی خوای لێ بێ سوێند بەخوا بەڕاستی ئەو ئایەته و ئایەتەی له فلانه سوڕەت وفلانه سوڕەت بیر خستمەوە)).**

٥٠٣٧م- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ بْنِ مَيْمُونٍ، حَدَّثَنَا عِيسَى، عَنْ هِشَامٍ وَقَالَ: أَسْقَطْتُهُنَّ مِنْ سُورَةِ كَذَا. تَابَعَهُ عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ وَعَبْدَةُ، عَنْ هِشَامٍ[٢].

**٥٠٣٧م- (هەمان فەرمووده بەم ڕێگەیه): محەممەدی کوڕی عوبەیدی کوڕی مەیمون بۆی گێڕاینەوه وتی: عیسا بۆی گێڕاینەوه له هیشامەوه (له عورووه له عائیشەوه فەرموودەکەی پێشووی گێڕایەوه له پێغەمبەرەوه ﷺ فەرمووی): ((ئەو ئایەتانەم پەڕاندبوو[٣] له فلاّنه سوڕەت)).**
**-هەریەك له عەلی کوڕی موسهیر و عەبده له هیشامەوه ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوه و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی موحەممەدی کوڕی عوبەیدیان کردوه.**

٥٠٣٨- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي رَجَاءٍ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سَمِعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلاً يَقْرَأُ فِي سُورَةٍ بِاللَّيْلِ فَقَالَ: «يَرْحَمُهُ اللَّهُ لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وَكَذَا آيَةً كُنْتُ أُنْسِيتُهَا مِنْ سُورَةِ كَذَا وَكَذَا»[٤].

**٥٠٣٨- عائیشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی له پیاوێك بوو بەشەودا (له مزگەوت)سوڕەتێکی دەخوێند، فەرمووی: ((ڕەحمەتی خوای لێ بێ سوێند**

---

(١) بڕوانه: ٢٦٥٥.
(٢) بڕوانه: ٢٦٥٥.
(٣) بەلەبیرچوون.
(٤) بڕوانه: ٢٦٥٥.

بەخوا بەڕاستی فلاّنە ئایەت و فلاّنە ئایەت کە من لەبیرم برابوویەوە، لە فلاّنە سوڕەت و فلاّنە سوڕەت بیری خسمەوە)).

٥٠٣٩- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "مَا لأَحَدِهِمْ يَقُولُ: نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ، بَلْ هُوَ نُسِّيَ"[1].

**٥٠٣٩ -عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بۆچی کەسێکیان دەڵێ: ئەو ئایەتە و ئەو ئایەتەم لەبیر چووەتەوە، وانیە بەڵکو ئەو کەسە لە بیری براوەتەوە)).**

## ٢٧- بابُ مَنْ لَمْ يَرَ بَأْسًا أَنْ يَقُولَ: سُورَةُ البَقَرَةِ، وَسُورَةُ كَذَا وَكَذَا

٥٠٤٠- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ، عَنْ عَلْقَمَةَ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الآيَتَانِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ مَنْ قَرَأَ بِهِمَا فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ»[2].

## ٢٧- باسی ئەوەی بەلایەوە هیچ زیانی نیە کەسێک بڵێ سوڕەتی بەقەرە، و سوڕەتی ئەوە و ئەوە

**٥٠٤٠- ئەبو مسعوودی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دوو ئایەتەکەی کۆتایی سوڕەتی بەقەرە هەر کەس لە شەودا بخوێنی بەسیەتی)).**

٥٠٤١- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ عَنْ حَدِيثِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدٍ الْقَارِيِّ، أَنَّهُمَا سَمِعَا عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ يَقُولُ:

---

(١) بڕوانە: ٥٠٣٢.

(٢) بڕوانە: ٤٠٠٨.

سَمِعْتُ هِشَامَ بْنَ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَاسْتَمَعْتُ لِقِرَاءَتِهِ فَإِذَا هُوَ يَقْرَؤُهَا عَلَى حُرُوفٍ كَثِيرَةٍ لَمْ يُقْرِئْنِيهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَكِدْتُ أُسَاوِرُهُ فِي الصَّلَاةِ، فَانْتَظَرْتُهُ حَتَّى سَلَّمَ فَلَبَّبْتُهُ فَقُلْتُ: مَنْ أَقْرَأَكَ هَذِهِ السُّورَةَ الَّتِي سَمِعْتُكَ تَقْرَأُ؟ قَالَ: أَقْرَأَنِيهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ. فَقُلْتُ لَهُ: كَذَبْتَ، فَوَاللَّهِ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَهُوَ أَقْرَأَنِي هَذِهِ السُّورَةَ الَّتِي سَمِعْتُكَ، فَانْطَلَقْتُ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَقُودُهُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي سَمِعْتُ هَذَا يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ عَلَى حُرُوفٍ لَمْ تُقْرِئْنِيهَا، وَإِنَّكَ أَقْرَأْتَنِي سُورَةَ الْفُرْقَانِ. فَقَالَ: «يَا هِشَامُ اقْرَأْهَا». فَقَرَأَهَا الْقِرَاءَةَ الَّتِي سَمِعْتُهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَكَذَا أُنْزِلَتْ». ثُمَّ قَالَ: «اقْرَأْ يَا عُمَرُ». فَقَرَأْتُهَا الَّتِي أَقْرَأَنِيهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَكَذَا أُنْزِلَتْ». ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ»[1].

**٥٠٤١- زوهری دەڵێ: عوروە فەرموودەکەی میسوەری کوڕی مەخرەمەو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدولقادری بۆ گێڕامەوە کە هەردووکیان لە عومەری کوڕی خەتتابیان ﷺ بیست دەیوت: لە هیشامی کوڕی حەکیمی کوڕی حیزامم بیست ﷺ لە ژیانی پێغەمبەری خوادا سوڕەتی فورقانی دەخوێند، منیش گوێم گرت بۆ قورئان خوێندنەکەی، جا دەبینم ئەو بە چەند شێوەیەك دەیخوێنێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوە بەمنی نەخوێندبوو، بۆیە خەریك بوو لە نوێژەکەدا پەلاماری بدەم[2]، بەڵام ئارامم گرت تا سەلامی دایەوە (لە نوێژەکە)، ئینجا یەخەی جلەکانیم گرت و وتم: کێ ئەم سوڕەتەی پێ خوێندووی بەو شێوەی کە من گوێم لێ بوو دەتخوێند؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خوێندووم، وتم: درۆ دەکەیت،**

---

(١) بڕوانە: ٢٤١٩.

(٢) سەری بکرم.

وەڵڵاهی بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خۆی ئەم سوڕەتی پێ خوێندووم کە لە تۆم بیست (جیاواز لەوەی تۆ خوێندت)، ئینجا دامەبەر و بردم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: (ئەی پێغەمبەر ﷺ) من گوێم لەم پیاوە بوو سوڕەتی فورقانی بە شێوازێك دەخوێندەوە کە جەنابت بەو شێوازە بە من نەخوێندووە، وە بێگومان جەنابت سوڕەتی فورقانت بەمن خوێندووە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەی هیشام بیخوێنە))، هیشامیش بەو شێوەی کە من گوێ بیستی بووم خوێندیەوە، پێغەمەبری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئا بەو جۆرە دابەزێنراوە))، لە پاشان فەرمووی: ((ئەی عومەر بیخوێنە)) منیش بەو شێوە خوێندنەی کە پێغەمبەر ﷺ خۆی پێی خوێندووم خوێندمەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئا بەو جۆرە دابەزێنراوە))، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەم قورئانە لەسەر حەوت شێوە (خوێندەوە) دابەزێنراوە، بۆیە بەکام لەو حەوتە ئاسانە (بۆتان) بیخوێنن)).

٥٠٤٢- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ آدَمَ، أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ قَارِئًا يَقْرَأُ مِنَ اللَّيْلِ فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ: «يَرْحَمُهُ اللَّهُ لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وَكَذَا آيَةً أَسْقَطْتُهَا مِنْ سُورَةِ كَذَا وَكَذَا»[1].

٥٠٤٢- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوت دا گوێی لە پیاوێك بوو لە شەودا قورئانی دەخوێند فەرمووی: ((خوا ڕەحمی پێ بکات بەڕاستی ئەوەندە و ئەوەندە ئایەتی بیرخستمەوە، کە من لەو سوڕەتە و لەو سوڕەتە دەمپەڕاندن)).

(١) بڕوانە: ٢٦٥٥.

## ٢٨- بَابُ التَّرْتِيلِ فِي الْقِرَاءَةِ

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ ﴾ المزمل، وَقَوْلِهِ: ﴿ وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ ﴿١٠٦﴾ ﴾ الإسراء. وَمَا يُكْرَهُ أَنْ يُهَذَّ كَهَذِّ الشِّعْرِ. ﴿ فِيهَا يُفْرَقُ ﴿٤﴾ ﴾ الدخان. يُفَصَّلُ. قَالَ ابن عَبَّاس ﷺ: ﴿ فَرَقْنَٰهُ ﴿١٠٦﴾ ﴾: الإسراء، فَصَّلْنَاهُ.

٥٠٤٣- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا مَهْدِيُّ بْنُ مَيْمُونٍ، حَدَّثَنَا وَاصِلٌ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: غَدَوْنَا عَلَى عَبْدِ اللَّهِ، فَقَالَ رَجُلٌ: قَرَأْتُ الْمُفَصَّلَ الْبَارِحَةَ. فَقَالَ: هَذًّا كَهَذِّ الشِّعْرِ، إِنَّا قَدْ سَمِعْنَا الْقِرَاءَةَ، وَإِنِّي لَأَحْفَظُ الْقُرَنَاءَ الَّتِي كَانَ يَقْرَأُ بِهِنَّ النَّبِيُّ ﷺ: ثَمَانِيَ عَشْرَةَ سُورَةً مِنَ الْمُفَصَّلِ، وَسُورَتَيْنِ مِنْ آلِ حم[1].

## ٢٨- باسی لەسەرخۆیی لە قورئان خوێندندا[2]

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە دەوری قورئان بکەرەوە بە لەسەر خۆیی)، وە ئەم فەرمایشتەش: (وە قورئانمان بەش بەش بۆت ناردووە بۆ ئەوەی بیخوێنیتەوە بەسەر خەڵکیدا بە لەسەر خۆیی و هێواشی)، وە ئەوەش کە ناپەسەندە قورئان بە پەلە بخوێنرێتەوە وەك خوێندنەوەی هۆنراوە بە پەلە.**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ﴿ فِيهَا يُفْرَقُ ﴿٤﴾ ﴾: ڕوون دەکرێتەوە، جیا دەکرێتەوە.**

**-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ﴿ فَرَقْنَٰهُ ﴿١٠٦﴾ ﴾: ڕوونمان کردوەتەوە.**

**٥٠٤٣- ئەبو وائیل لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕاویەتیەوە (ئەبو وائیل) دەڵێ: بەیانی زوو[1] ڕۆیشتین بۆ لای عەبدوڵلا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ پیاوێك وتی: ئەم شەو**

---

(١) بڕوانە: ٧٧٥.

(٢) واتە: قورئان خوێندن بە لەسەر خۆی و پەلە نەکردن بۆ ئەوە بەڕێک و پێکی بخوێنرێتەوە، مافی هەموو پیت و وشەیەکی بدرێ و بیری لەماناکەی بکرێتەوە.

هەموو سوڕەتەکانی ئایەتە کورتەکانم خوێند[٢]، (عەبدوڵڵاش) وتی: خوێندنەوەیەکی بەپەلە وەك خوێندنەوەی هۆنراوە و بەپەلە بوو؟ بێگومان و بەدڵنیاییەوە گوێمان لە قورئان خوێندن بووە، وە بەڕاستی من ئەو سوڕەتانەی هاوشێوەی یەکن[٣] دەزانم کە پێغەمبەر ﷺ (لە نوێژدا) دەیخوێند: هەژدە سوڕەت بوون لە موفەصصەل، وە دوو سوڕەت لە کۆمەڵەی (حم)ـەکان.

٥٠٤٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مُوسَى بْنِ أَبِي عَائِشَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما فِي قَوْلِهِ: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ ﴾ القيامة. قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا نَزَلَ جِبْرِيلُ بِالْوَحْيِ، وَكَانَ مِمَّا يُحَرِّكُ بِهِ لِسَانَهُ وَشَفَتَيْهِ، فَيَشْتَدُّ عَلَيْهِ، وَكَانَ يُعْرَفُ مِنْهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ الآيَةَ الَّتِي فِي: ﴿ لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿١﴾ ﴾ القيامة. ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ القيامة. فَإِذَا أَنْزَلْنَاهُ فَاسْتَمِعْ ﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾ ﴾ القيامة. قَالَ: إِنَّ عَلَيْنَا أَنْ نُبَيِّنَهُ بِلِسَانِكَ. قَالَ: وَكَانَ إِذَا أَتَاهُ جِبْرِيلُ أَطْرَقَ، فَإِذَا ذَهَبَ قَرَأَهُ كَمَا وَعَدَهُ اللَّهُ[٤].

**٥٠٤٤- ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما لە بارەی ئەم فەرمایشتەی خواوە (زمانت مەجوڵێنە بە خوێندنەوەی نیگا تا پەلەی تێدا بکەیت)، (عەبدوڵڵا) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ جیبریل عليه السلام نیگا بۆ دابەزاندایە، پێغەمبەر ﷺ بەدابەزینی نیگا زمان و لێوەکان بە خوێندنەوەی بەپەلە دەجوڵاند، ئەوەش قورس و گران بوو بەلایەوە**

---

(١) دوای ئەوەی نوێژی بەیانیمان کرد.

(٢) لە سوڕەتی حوجوراتەوە بۆ کۆتایی قورئانە.

(٣) لە درێژی و کورتی دا.

(٤) بڕوانە: ٥.

پێوەی دەبینرا و دەزانرا بەو هۆیەوە خوا ئەو ئایەتەی کە لە سورەتی ﴿ لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١ ﴾دا: کە بریتییە لە: ﴿ لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ ١٦ إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ ١٧ فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ ١٨ ﴾[١] جا ئەگەر قورئانمان دابەزاند گوێی لێ بگرە ﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا بَيَانَهُۥ ١٩ ﴾ وتی: بێگومان لەسەر ئێمەیە لەسەر زمانی تۆ دەری ببڕین (بیخوێنیتەوە). (عەبدوڵلا) دەڵێ: ئیتر کاتێ جیبریل ﷺ دەهات بۆ لای (نیگای دەهێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ) سەری دادەخست، جا کە جیبریل ﷺ دەڕۆیشت پێغەمبەر ﷺ قورئانەکەی دەخوێندەوە وەك چۆن خوا بەڵێنی دابوو.

## ٢٩- بابُ مَدِّ القِرَاءَةِ

٥٠٤٥- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ الأَزْدِيُّ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، عَنْ قِرَاءَةِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: كَانَ يَمُدُّ مَدًّا[٢].

## ٢٩- باسی درێژکردنەوەی دەنگ لە خوێندنی قورئاندا

٥٠٤٥-قەتادە دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ کرد دەربارەی قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ ئەنەس وتی: (پێغەمبەر ﷺ) هەمیشە دەنگی درێژ دەکردەوە بەدرێژ کردنێکی چاك، (بۆ ئەو پیتانەی دەنگیان درێژە) [٣].

---

(١) واتە: (زمان مەجوڵێنە بە خوێندنەوەی نیگا تا پەلەی تێدا بکەیت، بە ڕاستی لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەی لە سنگتدا و خوێندنەوەی، ئینجا کاتێ کە قورئانمان بۆ خوێندیتەوە (بەهۆی جیبریلەوە) تۆش شوێن خوێندنەوەی ئەو بکەوە).

(٢) بڕوانە: ٥٠٤٦.

(٣) وەک (ا، و، ی) کە پێیان دەوترێت پیتی درێژکردنەوە.

٥٠٤٦- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سُئِلَ أَنَسٌ: كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ ﷺ؟. فَقَالَ: كَانَتْ مَدًّا. ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۝١ ﴾ الفاتحة. يَمُدُّ بِبِسْمِ اللَّهِ، وَيَمُدُّ بِالرَّحْمَنِ، وَيَمُدُّ بِالرَّحِيمِ[١].

**٥٠٤٦- قەتادە دەڵێ: پرسیار لە ئەنەس ﷺ كرا: قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ چۆن بوو؟ ئەنەسیش وتی: قورئان خوێندنەكەی بەدەنگ درێژكردنەوە بوو. پاشان ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۝١ ﴾ی خوێندەوە بە ﴿ بِسْمِ اللَّهِ ﴾ دەنگی درێژ دەكردەوە[٢] وە بە ﴿ الرَّحْمَٰنِ ﴾[٣] و ﴿ الرَّحِيمِ ﴾[٤] یش دەنگی درێژ دەكردەوە.**

## ٣٠- بَابُ التَّرْجِيعِ

٥٠٤٧- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو إِيَاسٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مُغَفَّلٍ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ وَهْوَ عَلَى نَاقَتِهِ -أَوْ جَمَلِهِ - وَهْيَ تَسِيرُ بِهِ وَهْوَ يَقْرَأُ سُورَةَ الْفَتْحِ -أَوْ مِنْ سُورَةِ الْفَتْحِ- قِرَاءَةً لَيِّنَةً، يَقْرَأُ وَهْوَ يُرَجِّعُ[٥].

## ٣٠- باسی (قورئان خوێندن) بە ئاوازەوە [٦]

**٥٠٤٧-عەبدوڵڵای كوڕی موغەففەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی بەسەر مێ وشترەكەیەوە - یان وشترەكەیەوە - قورئانی دەخوێند و وشترەكەی ئەو سواری بوو دەڕۆیشت، پێغەمبەریش ﷺسورەتی فەتحی- یان بەشێك لە سورەتی فەتح - بە هێواشی دەخوێند، بە ئاواز و دەنگ لاواندنەوە دەیخوێند.**

---

(١) بڕوانە: ٥٠٤٥.
(٢) دەنگی بە ئەلیفی پێش (ە) وشەی (اللَّهِ) درێژ دەكردەوە.
(٣) بە پیتی ئەلفی پێش نونی (الرَّحْمَنِ).
(٤) بە پیتی یای پێش میم (الرَّحِيمِ) درێژ دەكردەوە، هەر سێ پیتە پیتی درێژكردنەوەن.
(٥) بڕوانە: ٤٢٨١.
(٦) یان دەنگ لاواندنەوە بە قورئان.

## ٣١- بَابُ حُسْنِ الصَّوْتِ بِالْقِرَآن

٥٠٤٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ خَلَفٍ أَبُو بَكْرٍ، حَدَّثَنَا أَبُو يَحْيَى الْحِمَّانِيُّ، حَدَّثَنَا بُرَيْدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ جَدِّهِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ لَهُ: «يَا أَبَا مُوسَى لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ».

## ٣١- باسی دەنگ خۆش كردن بە قورئان خوێندن

**٥٠٤٨-ئەبو بوردە لە ئەبو مووساوە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە بە ئەبو مووسای فەرمووە: ((ئەی ئەبو مووسا بێگومان بە دڵنیاییەوە سازێك لە سازەكانی بنەماڵەی داوود ﷺ پێ بەخشراوە)).**

## ٣٢- بَابُ مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَسْمَعَ الْقُرْآنَ مِنْ غَيْرِهِ

٥٠٤٩- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنِ الأَعْمَشِ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: «اقْرَأْ عَلَيَّ الْقُرْآنَ». قُلْتُ: اقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟! قَالَ: «إِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي»[1].

## ٣٢- باسی ئەو كەسەی پێی خۆشە گوێی لە قورئان خوێندنی كەسێكی تر بێت

**٥٠٤٩-عەبدوڵڵا (ی كوڕی مەسعوود) ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی پێم: ((قورئانم بۆ بخوێنە))، وتم: قورئان بۆ تۆ بخوێنم كە بۆ تۆ دابەزێنراوە؟ فەرمووی: ((بێگومان من پێم خۆشە كە لە غەیری خۆمەوە بیبیستم)).**

---

(١) بڕوانە: ٤٥٨٢.

## ٣٣- بابُ قَوْلِ الْمُقْرِئِ لِلْقَارِئِ: حَسْبُكَ

٥٠٥٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: «اقْرَأْ عَلَيَّ». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟! قَالَ: «نَعَمْ». فَقَرَأْتُ سُورَةَ النِّسَاءِ حَتَّى أَتَيْتُ إِلَى هَذِهِ الآيَةِ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ ﴾ النساء. قَالَ: «حَسْبُكَ الآنَ». فَالْتَفَتُّ إِلَيْهِ فَإِذَا عَيْنَاهُ تَذْرِفَانِ[1].

## ٣٣- باسی ئەوەی داوای خوێندنی قورئان دەکات بە قورئان خوێنەکە بڵێ بەسە ڕاوەستە

**٥٠٥٠-عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێم: ((قورئانم بۆ بخوێنە))، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا قورئان بۆ تۆ بخوێنم کە بۆ تۆ دابەزێنراوە؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) منیش سورەتی نیسائم خوێند تا گەیشتمە ئەم ئایەتە: (ئینجا (حاڵی کافران) چۆن بێت کاتێك لە هەموو ئوممەتێك شایەتێکمان هێنا (کە پێغەمبەرەکەیانە) تۆشمان هێنا (ئەی موحەممەد ﷺ) بە شایەت بەسەر ئا ئەوانەوە). پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئێستا بەسە ڕاوەستە))، ئینجا لام کردەوە بەلایدا دەبینم چاوەکانی فرمێسکیان پیادا دێتە خوارەوە.**

## ٣٤- بابٌ: فِي كَمْ يُقْرَأُ الْقُرْآنُ؟ وَقَوْلُ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ﴿٢٠﴾ ﴾ المزمل

٥٠٥١- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ لِي ابْنُ شُبْرُمَةَ: نَظَرْتُ كَمْ يَكْفِي الرَّجُلَ مِنَ الْقُرْآنِ، فَلَمْ أَجِدْ سُورَةً أَقَلَّ مِنْ ثَلاَثِ آيَاتٍ، فَقُلْتُ: لاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَنْ يَقْرَأَ أَقَلَّ مِنْ ثَلاَثِ آيَاتٍ.

---

(١) بڕوانە: ٤٥٨٢.

٥٠٥١م- قَالَ سُفْيَانُ: أَخْبَرَنَا مَنْصُورٌ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، أَخْبَرَهُ عَلْقَمَةُ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ: وَلَقِيتُهُ وَهْوَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، فَذَكَرَ النَّبِيَّ ﷺ: "أَنَّ مَنْ قَرَأَ بِالآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ البَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ"[1].

## ٣٤- باسێک: لەماوەی چەند (ڕۆژدا) قورئان هەمووی بخوێنرێتەوە؟ وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (دەی ئەوەندەی کە بۆتان ئاسانە قورئان بخوێنن)

**٥٠٥١-عەلی دەڵێ: سوفیان بۆی گێڕاینەوە وتی: ئیبنو شوبرومە پێی وتم: سەرنجم داوە کەسێك چەندێ قورئان خوێندنی بەسە، سورەتێکم دەست نەکەوت لە سێ ئایەت کەمتر بێت، بۆیە وتم: نابێ کەسێك لە سێ ئایەت کەمتر بخوێنێت.**

**٥٠٥١م- عەلقەمە لە ئەبی مەسعوودەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: بە ئەبی مەسعوود گەشتم تەواف دەکرد بە دەوری کەعبەدا، جا باسی پێغەمبەری ﷺ کرد و (وتی: فەرموويەتی:) ((بێگومان هەر کەسێك دوو ئایەتەکەی کۆتای سورەتی بەقەرە لە شەوێکدا بخوێنێت بەسیەتی)).**

٥٠٥٢- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ مُغِيرَةَ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: أَنْكَحَنِى أَبِي امْرَأَةً ذَاتَ حَسَبٍ، فَكَانَ يَتَعَاهَدُ كَنَّتَهُ فَيَسْأَلُهَا عَنْ بَعْلِهَا، فَتَقُولُ: نِعْمَ الرَّجُلُ مِنْ رَجُلٍ، لَمْ يَطَأْ لَنَا فِرَاشًا وَلَمْ يُفَتِّشْ لَنَا كَنَفًا مُذْ أَتَيْنَاهُ. فَلَمَّا طَالَ ذَلِكَ عَلَيْهِ ذَكَرَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «الْقَنِي بِهِ». فَلَقِيتُهُ بَعْدُ، فَقَالَ: «كَيْفَ تَصُومُ؟». قَالَ: كُلَّ يَوْمٍ. قَالَ: «وَكَيْفَ تَخْتِمُ؟». قَالَ: كُلَّ لَيْلَةً. قَالَ: «صُمْ فِي كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةً وَاقْرَإِ الْقُرْآنَ فِي كُلِّ شَهْرٍ». قَالَ: قُلْتُ أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ. قَالَ: «صُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ فِي الْجُمُعَةِ». قُلْتُ: أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ

---

(١) بڕوانە: ٤٠٠٨.

ذَلِكَ. قَالَ: «أَفْطِرْ يَوْمَيْنِ وَصُمْ يَوْمًا». قَالَ: قُلْتُ: أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ. قَالَ: «صُمْ أَفْضَلَ الصَّوْمِ صَوْمِ دَاوُدَ، صِيَامَ يَوْمٍ وَإِفْطَارَ يَوْمٍ، وَاقْرَأْ فِي كُلِّ سَبْعِ لَيَالٍ مَرَّةً». فَلَيْتَنِي قَبِلْتُ رُخْصَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَذَاكَ أَنِّي كَبِرْتُ وَضَعُفْتُ فَكَانَ يَقْرَأُ عَلَى بَعْضِ أَهْلِهِ السُّبْعَ مِنَ الْقُرْآنِ بِالنَّهَارِ، وَالَّذِي يَقْرَؤُهُ يَعْرِضُهُ مِنَ النَّهَارِ؛ لِيَكُونَ أَخَفَّ عَلَيْهِ بِاللَّيْلِ، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَتَقَوَّى أَفْطَرَ أَيَّامًا وَأَحْصَى وَصَامَ مِثْلَهُنَّ؛ كَرَاهِيَةَ أَنْ يَتْرُكَ شَيْئًا فَارَقَ النَّبِيَّ ﷺ عَلَيْهِ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: وَقَالَ بَعْضُهُمْ: فِي ثَلَاثٍ وَفِي خَمْسٍ، وَأَكْثَرُهُمْ عَلَى سَبْعٍ[1].

**٥٠٥٢- موجاهید لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: باوکم ژنێکی خانەدانی ڕەسەنی بۆ هێنام، ئینجا ناو بەناو عەمر بووکەکەی بەسەر دەکردەوە و پرسیاری مێردەکەی لێ دەکرد ژنەکەش دەیوت: ئای چ پیاوێکی چاکە خۆیەتی پیاو، لەو کاتەوەی هاتووین بۆ لای نەپێی ناوەتە سەر نوێنم[2] نە چمکی پەردەکەی هەڵداومەتەوە[3] جا کە ئەم حاڵەتە درێژەی کێشا، عەمر بۆ پێغەمبەری ﷺ باس کرد ئەویش فەرمووی: ((بمگەیەنە پێی))، جا دواتر من بەخزمەتی گەشتم و فەرمووی: ((چۆن بەڕۆژوو دەبیت؟)) (عەبدوڵڵا) وتی: هەموو ڕۆژ (بەڕۆژوو دەبم)، فەرمووی: ((چۆن خەتمی قورئان دەکەیت؟)) وتی: هەموو شەوێك (خەتمێك دەکەم)، فەرمووی: ((لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە، وە لە هەموو مانگێکدا هەموو قورئان بخوێنە (خەتمێك بکە)، دەڵێ: وتم: لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: ((لە هەفتەیەکدا سێ ڕۆژ بەرۆژووبە))، وتم: لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: ((دوو ڕۆژ بەڕۆژوو مەبە و ڕۆژێك بەڕۆژووبە))، دەڵێ: وتم: لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: ((گەورەترین ڕۆژوو بگرە کە ڕۆژی داوودە ﷺ، ڕۆژوو گرتنی ڕۆژێك و**

(١) بڕوانە: ١١٣١.

(٢) واتە: سەرجێی لەگەڵ نەکردووم.

(٣) واتە: دەستی نە بردووە بۆ ناوەوەی ژێر جلەکانی ژنەکەی، مەبەستی ئەوە هێشتا هەر کچە و نەچووەتە لای و نەبووە بەژن.

ڕۆژوو نەگرتنی ڕۆژێك، وە لە حەوت شەویشدا جارێك هەموو قورئان بخوێنە))، جا خۆزگە کاتی خۆی ڕووخسەتەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ قەبوڵ بکردایە، ئەوە لەبەر ئەوەی من ئێستا چوومەتە تەمەنەوە و لاواز بووم (موجاهید دەڵێ:) جا حەوت یەکی قورئان بەرۆژدا لای یەکێ لە کەس و کارەکەی دەخوێندەوە و دەوری دەکردەوە، ئەوەی دەیخوێند (بە شەودا) بەرۆژدا دەیخوێندەوە (بۆ کەسێکی) تا بەشەودا خوێندنەوەی ئاسان بێ بۆی، وە ئەگەر بیویستایە هێز و گوڕی تێ بێتەوە چەند ڕۆژێك بەڕۆژوو نەدەبوو و دەیژماردن و جا بە ئەندازەیان بەڕۆژوو دەبوو[1]، چونکە پێی ناخۆش بوو واز بێنێ لە هیچێك (لە خواپەرەستیەی) لەسەری بووە کە پێغەمبەر ﷺ لە دونیا دەرچووە وەفاتی کردوە.

ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: هەندێ لە ڕاویەکان وتوویەتی: (قورئان بخوێنە) لە سێ ڕۆژدا، لە پێنج ڕۆژدا، بەڵام زۆربەیان: لە حەوت ڕۆژدا (هەموو قورئان بخوێنە).

٥٠٥٣- حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: «فِي كَمْ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟»[2].

٥٠٥٣-ئەبی سەلەمە لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە گێڕاویەتیەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێم: ((لە چەند (ڕۆژدا) هەموو قورئان دەخوێنی؟)).

٥٠٥٤- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ شَيْبَانَ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ -مَوْلَى بَنِي زُهْرَةَ- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ -قَالَ: وَأَحْسِبُنِي قَالَ: سَمِعْتُ أَنَا مِنْ أَبِي سَلَمَةَ

---

(١) چەند ڕۆژ بەڕۆژوو نەبووایە دەیژمارد بە ژمارەی ئەو ڕۆژانە دواتر بەڕۆژوو دەبوو.
(٢) بروانە: ١١٣١.

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْرَإِ الْقُرْآنَ فِي شَهْرٍ». قُلْتُ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، حَتَّى قَالَ: «فَاقْرَأْهُ فِي سَبْعٍ وَلاَ تَزِدْ عَلَى ذَلِكَ»(١).

**٥٠٥٤-یەحیا لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کە ئازادکراوی بەنی زوهرە بوو لە ئەبی سەلەمەوە دەگێڕێتەوە - یەحیا دەڵێ: وا گومان دەبەم وتی: من لە ئەبی سەلەمەم بیست - ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە ﷺ گێڕایەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (لە مانگێدا هەموو قورئان بخوێنە))، منیش وتم: من هێز و توانام هەیە، تا فەرمووی: ((کەوابوو لە حەفتەیەکدا بیخوێنە لەوە زیاتری مەکە)) (٢).**

## ٣٥- بابُ الْبُكَاءِ عِنْدَ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ

٥٠٥٥- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ، أَخْبَرَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ يَحْيَى: بَعْضُ الْحَدِيثِ عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ. حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ. قَالَ الأَعْمَشُ: وَبَعْضُ الْحَدِيثِ حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، وَعَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْرَأْ عَلَيَّ». قَالَ: قُلْتُ: أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟! قَالَ: «إِنِّي أَشْتَهِي أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي». قَالَ: فَقَرَأْتُ النِّسَاءَ حَتَّى إِذَا بَلَغْتُ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ ﴾ النساء، قَالَ لِي «كُفَّ" أَوْ "أَمْسِكْ". فَرَأَيْتُ عَيْنَيْهِ تَذْرِفَانِ(٣).

---

(١) بڕوانە: ١١٣١.

(٢) واتە: لە هەفتەیەک کەمی مەکەرەوە، قورئان خوێندنەکەت زیاتر کەمتر لە هەفتەیەک خەتمێک بکەیت.

(٣) بڕوانە: ٤٥٨٢.

## ٣٥- باسی گریان لە کاتی قورئان خوێندندا

**٥٠٥٥-عەبدوڵڵا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((قورئانم بۆ بخوێنە))، دەڵێ: وتم: قورئان بخوێنم بۆ تۆ کە بۆ تۆ دابەزێنراوە؟ فەرمووی: ((بەڕاستی من حەزم لێیە کە لە غەیری خۆم بیبیستم ))، دەڵێ: منیش سورەتی نیسائم بۆ خوێندەوە تا گەشتەمە: (ئینجا (حاڵی کافران) چۆن بێت کاتێك لە هەموو ئوممەتێك شایەتێکمان هێناوە (کە پێغەمبەرەکەیانە)، تۆشمان هێنا (ئەی موحەممەد ﷺ) بەشایەتی بەسەر ئا ئەوانەوە)، فەرمووی پێم: ((بەسە)) - یان ((ڕاوەستە)) - جا چاوەکانیم دی فرمێسکیان پیادا دەهاتە خوارەوە.**

٥٠٥٦- حَدَّثَنَا قَيْسُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبِيدَةَ السَّلْمَانِيِّ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: «اقْرَأْ عَلَيَّ». قُلْتُ: أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟! قَالَ: «إِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي»[١].

**٥٠٥٦- عەبدوڵڵا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێم: (قورئانم بۆ بخوێنە))، وتم: قورئان بۆ تۆ بخوێنم کە بۆ تۆ دابەزێنراوە؟ فەرمووی: ((بێگومان من پێم خۆشە کە لە غەیری خۆمەوە بیبیستم)).**

## ٣٦- بابُ إِثم مَنْ راءى بِقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ أَوْ تَأَكَّلَ بِهِ أَوْ فَجَرَ بِهِ

٥٠٥٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ خَيْثَمَةَ، عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ قَالَ عَلِيٌّ ﷺ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «يَأْتِي فِي آخِرِ الزَّمَانِ قَوْمٌ حُدَثَاءُ الأَسْنَانِ،

---

(١) بڕوانە: ٤٥٨٢.

سُفَهَاءُ الأَحْلاَمِ، يَقُولُونَ مِنْ خَيْرِ قَوْلِ الْبَرِيَّةِ، يَمْرُقُونَ مِنَ الإِسْلاَمِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، لاَ يُجَاوِزُ إِيمَانُهُمْ حَنَاجِرَهُمْ، فَأَيْنَمَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ، فَإِنَّ قَتْلَهُمْ أَجْرٌ لِمَنْ قَتَلَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

## ٣٦- باسی تاوانی ئەو کەسەی بە قورئان خوێندن ڕیای بکات، یان داوای خواردنی پێ بکات، یان خراپەی[٢] پێ بکات

**٥٠٥٧- سوەیدی کوڕی غەففەلە دەڵێ: عەلی ﷺ وتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((لە ئاخیر زەماندا کەسانێك دێن و پەیدا دەبن هەرزەکار و نەفامن و کەم عەقڵن، بەوتەی چاکترینی مرۆڤەکان (کە پێغەمبەرە ﷺ) قسەدەکەن و دەیڵێن[٣]، لە ئیسلام دەردەچن هەرچۆنێك تیر لە نێچیر دەردەچێت، باوەڕیان لە گەروویان تێپەڕ ناکات، بۆیە لە هەر کوێدا پێیان گەشتن بیانکوژن، چونکە بێگومان لە کوشتنیاندا لە ڕۆژی دواییدا پاداشتی گەورە هەیە بۆ ئەو کەسەی دەیانکوژێت)).**

٥٠٥٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ الْحَارِثِ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «يَخْرُجُ فِيكُمْ قَوْمٌ تَحْقِرُونَ صَلاَتَكُمْ مَعَ صَلاَتِهِمْ، وَصِيَامَكُمْ مَعَ صِيَامِهِمْ، وَعَمَلَكُمْ مَعَ عَمَلِهِمْ، وَيَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، يَنْظُرُ فِي النَّصْلِ فَلاَ يَرَى شَيْئًا، وَيَنْظُرُ فِي الْقِدْحِ فَلاَ يَرَى شَيْئًا، وَيَنْظُرُ فِي الرِّيشِ فَلاَ يَرَى شَيْئًا، وَيَتَمَارَى فِي الْفُوقِ»[٤].

---

(١) بڕوانە: ٣٦١١.

(٢) ئەگەر (فَجَرَ) بێت بەڵام ئەگەر (فَخرَ) بێت واتە: فەخر و شانازی پێوە بکات.

(٣) کە قورئانە دەڵێن (لاحكم إلاّ لله).

(٤) بڕوانە: ٣٣٤٤.

**٥٠٥٨-ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: (گەلێك لە ناوتاندا پەیدا دەبن، نوێژتان لە بەرانبەر نوێژی ئەواندا و ڕۆژووتان لە بەرانبەر ڕۆژوویاندا و کردەوە (چاك) تان لە بەرانبەر (چاکی) ئەواندا بە کەم و هیچ دادەنێن، (بەڵام ئەو گەلە) کە قورئان دەخوێنن لە گەروویان تێناپەڕێ[1]، لە ئیسلام دەردەچن وەك چۆن تیر نێچیرەکە کوناو دەر دەکات، هیچ لەگەڵ خۆی نابات (تیرهاوێژەکە) سەیری پەیکانەکە دەکات هیچ شتێکی پێوە نابینێ، سەیری کلکی تیرەکە دەکات هیچ شتێك نابینێ، سەیری پەڕەی تیرەکە دەکات هیچ شتێك نابینێ، وە گومانیش دەکات لە شوێنی ژێیەی کەوانەکەش))** [2].

٥٠٥٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمُؤْمِنُ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَعْمَلُ بِهِ كَالأُتْرُجَّةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَرِيحُهَا طَيِّبٌ، وَالْمُؤْمِنُ الَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَعْمَلُ بِهِ كَالتَّمْرَةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَلاَ رِيحَ لَهَا، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَالرَّيْحَانَةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَالْحَنْظَلَةِ، طَعْمُهَا مُرٌّ -أَوْ خَبِيثٌ- وَرِيحُهَا مُرٌّ»[3].

**٥٠٥٩- ئەبو مووسا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (( (نموونەی) ئەو باوەڕدارەی قورئان دەخوێنێت وکاریشی پێ دەکات وەك ترنج وایە، تامی خۆشە و بۆنیشی خۆشە، وە (نموونەی) ئەو باوەڕدارەی قورئان ناخوێنێت بەڵام کاری پێ دەکات، وەك خورما وایە، تامی خۆشە و بۆنی نییە، وە نموونەی ئەو دوو ڕووەی کە قورئان دەخوێنێت، وەك ڕیحانە وایە، بۆنی**

خۆشه و تامی تاڵه، وه نموونەی ئەو دوو ڕووەی قورئان ناخوێنێت، وەك گوژاڵكه وایه، تامی تاڵه - یان پیسه - و بۆنی تاڵه (ناخۆشه).

## ٣٧- بَابٌ: اقْرَءُوا القُرْآنَ مَا ائْتَلَفَتْ قُلُوبُكُمْ

٥٠٦٠- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَبِي عِمْرَانَ الْجَوْنِيِّ، عَنْ جُنْدَبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اقْرَءُوا الْقُرْآنَ مَا ائْتَلَفَتْ قُلُوبُكُمْ، فَإِذَا اخْتَلَفْتُمْ فَقُومُوا عَنْهُ»[1].

## ٣٧- باسێك: قورئان بخوێنن ئەوەندەی دڵتان لەسەری ڕێك و كۆك بێت

**٥٠٦٠-جوندەبی كوڕی عەبدوڵلا ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كه فەرموویەتی: ((قورئان بخوێنن ئەوەندەی دڵتان (لەسەری) ڕێك و كۆك بێت، بەڵام ئەگەر ناكۆك بوون ئەوە هەستن (و دەستی) لێ هەڵگرن)).**

٥٠٦١- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، حَدَّثَنَا سَلَّامُ بْنُ أَبِي مُطِيعٍ، عَنْ أَبِي عِمْرَانَ الْجَوْنِيِّ، عَنْ جُنْدَبٍ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اقْرَءُوا الْقُرْآنَ مَا ائْتَلَفَتْ عَلَيْهِ قُلُوبُكُمْ فَإِذَا اخْتَلَفْتُمْ فَقُومُوا عَنْهُ»[2].

تَابَعَهُ الْحَارِثُ بْنُ عُبَيْدٍ وَسَعِيدُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَبِي عِمْرَانَ وَلَمْ يَرْفَعْهُ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ وَأَبَانُ. وَقَالَ غُنْدَرٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِي عِمْرَانَ سَمِعْتُ جُنْدَبًا قَوْلَهُ. وَقَالَ ابْنُ عَوْنٍ: عَنْ أَبِي عِمْرَانَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الصَّامِتِ، عَنْ عُمَرَ قَوْلَهُ، وَجُنْدَبٌ أَصَحُّ وَأَكْثَرُ.

**٥٠٦١-جوندەب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قورئان بخوێنن تا دڵتان لەسەری ڕێك و جووت بوو، بەڵام ئەگەر جیاواز بوون هەستن له خوێندنی)).**

---

(١) بڕوانه: ٥٠٦١، ٧٣٦٤، ٧٣٦٥.

(٢) بڕوانه: ٥٠٦٠.

-هەریەك لە حاریسی كوڕی عوبەید و سەعیدی كوڕی زەید گێڕاویانەتەوە لە ئەبی عیمرانەوە و پاڵشتی سەللامی كوڕی ئەبی موتیعیان كردوە، لە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا.

-حەممادی كوڕی سەلەمە و ئەبان ئەم فەرموودەیان نەبردۆتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ.

-غوندەر گێڕاویەتیەوە لە شوعبەوە، ئەویش لە ئەبی عیمرانەوە دەڵێ: لە جوندەبم ﷺ بیست بە وتەی جوندەب دەگێڕێتەوە.

-ئیبنو عەون دەگێڕێتەوە لە ئەبی عیمرانەوە ئەویش لە عەبدوڵلای كوڕی صامیتەوە، لە عومەر (ی كوڕی خەتتابەوە) بەوتەی عومەر دەیهێنێ، بەڵام گێڕانەوەكەی جوندەب ڕاسترە و زۆرتریش ئەوانەی گێڕاویانەتەوە.

٥٠٦٢- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَيْسَرَةَ، عَنِ النَّزَّالِ بْنِ سَبْرَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ سَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ آيَةً، سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ خِلاَفَهَا، فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ فَانْطَلَقْتُ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «كِلاَكُمَا مُحْسِنٌ فَاقْرَآ" أَكْبَرُ عِلْمِي قَالَ: "فَإِنَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمُ اخْتَلَفُوا فَأَهْلَكَهُمْ»[1].

٥٠٦٢-عەبدوڵلا (ی كوڕی مەسعوود) ﷺ دەگێڕێتەوە كە ئەو (عەبدوڵلا) گوێی لێ بوو پیاوێك ئایەتێكی دەخوێند، عەبدوڵلا پێچەوانەی ئەو خوێندنەوەی لە پێغەمبەر ﷺ بیستبوو، بۆیە دەستیم گرتوو بردم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (( (خوێندنی) هەردووكتان چاك و جوانە، كەواتە هەردووكتان بەو شێوەیە بیخوێنن))، جا (شوعبە) وتی: بەزۆری وا دەزانم فەرمووی: (( (جیاواز مەبن) چونكە بەڕاستی ئەو گەلانە لە پێش ئێوەدا بوون جیاواز و ناكۆك بوون، بەو هۆیەوە لە ناو چوون)).

(١) بڕوانە: ٢٤١٠.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٦٧- كِتابُ النِّكَاحِ

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٦٧- پەڕاوی هاوسەرگیری[1]

## ١- بابُ التَّرْغِيبُ فِي النِّكَاحِ

لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴿٣﴾ ﴾ الآية، النساء.

**٥٠٦٣-** حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، أَخْبَرَنَا حُمَيْدُ بْنُ أَبِي حُمَيْدٍ الطَّوِيلُ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: جَاءَ ثَلاَثَةُ رَهْطٍ إِلَى بُيُوتِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ يَسْأَلُونَ عَنْ عِبَادَةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمَّا أُخْبِرُوا كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا، فَقَالُوا: وَأَيْنَ نَحْنُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ؟ قَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ. قَالَ أَحَدُهُمْ: أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَدًا. وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلاَ أُفْطِرُ. وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلاَ أَتَزَوَّجُ أَبَدًا. فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا؟ أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ، لَكِنِّى أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِى فَلَيْسَ مِنِّي».

## ١- باسی هاندان دەربارەی هاوسەر گیری

**بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (مارە بکەن ئەو ئافرەتانەی حەڵاڵن بۆتان).**

(١) ژن هێنان و ژن مارەکردنیشی پێ دەڵێن.

**٥٠٦٣-ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: كۆمەڵێكی سێ كەسی هاتن بۆ ماڵی خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ پرسیاریان لە پەرستشی پێغەمبەر ﷺ دەكرد، ئینجا هەواڵیان پێدرا وەك بڵێی بەكەمی بزانن وابوو، بۆیە لە ناو خۆیاندا وتیان: ئێمە لە كوێین لە چاو پێغەمبەردا ﷺ بێگومان ئەو لە گوناهی ڕابردوو داهاتووی بوراوە، یەكێكیان وتی: من بەدڵنیاییەوە هەموو شەو (ناخەوم) شەونوێژ دەكەم هەتا ماوم. یەكێكی كەیان وتی: من ڕۆژەكانی ساڵ هەموو بەڕۆژوو دەبم. ئەوی تریان وتی: من كەنار دەگرم لە ژن هێنان و هاوسەر گیری ناكەم. ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە و فەرمووی: ((ئێوە ئەو كەسانەن وا و واتان وتووە؟ دەی سوێند بەخوا بێگومان من لە هەمووتان زیاتر لە خوا دەترسم، لە هەمووشتان پارێزگارترم، بەڵام (لەگەڵ ئەوەشدا) ڕۆژوو دەگرم و بەڕۆژووش نابم، شەونوێژ دەكەم و دەشخەوم، هاوسەرگریش دەكەم، ئینجا ئەو كەسەی لە سوننەت و ڕێبازی من لابدات ئەوە لە پەیڕەوانی من نییە)).**

٥٠٦٤- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، سَمِعَ حَسَّانَ بْنَ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ يُونُسَ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ﴿٣﴾ ﴾ النساء. قَالَتْ: يَا ابْنَ أُخْتِي، الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِي حَجْرِ وَلِيِّهَا، فَيَرْغَبُ فِي مَالِهَا وَجَمَالِهَا، يُرِيدُ أَنْ يَتَزَوَّجَهَا بِأَدْنَى مِنْ سُنَّةِ صَدَاقِهَا، فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوهُنَّ إِلاَّ أَنْ يُقْسِطُوا لَهُنَّ فَيُكْمِلُوا الصَّدَاقَ، وَأُمِرُوا بِنِكَاحِ مَنْ سِوَاهُنَّ مِنَ النِّسَاءِ[١].

**٥٠٦٤-زوهری دەڵێ: عوروە بۆی گێڕامەوە كە ئەو پرسیاری لە عائیشە ﵂ كرد دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرزو بڵد: (وە ئەگەر ترسان دادپەروەر نەبن لە (مارەیی) ئەو ئافرەتە بێ باوكانەدا (مارەیان مەكەن)، ئەوە مارە بكەن لەو**

(١) بڕوانە: ٢٤٩٤.

ئافرەتانەی حەڵاڵن بۆتان، دوو دوو یان سیان سیان یان چوار چوار، جا ئەگەر ترسان دادگەر نەبن ئەوە یەك ئافرەت (مارە بكەن لە ئازادان)، یان ئەو كەنیزەكانەی كە موڵكتانن ئەوە نزیكترە كە ستەم نەكەن یان هەژار نەكەون)، عائیشە ﵂ وتی: ئەی خوشكەزای خۆم (مەبەست بەو ئایەتە) ئەو كچە هەتیوەیە لای سەرپەرشتیارەكەیەتی، ئینجا حەزی لە سامان و جوانی كچە هەتیوەكەیە، دەیەوێ مارەی كات بەكەمتر لە مارەیی هاوشێوەی خۆی، بۆیە ڕێگریان لێ كرا كە ئەو كچە هەتیوانە مارە بكەن مەگەر دادگەری بكەن لەگەڵیانداو مارەیی یەكەیان بە تەواو پێ بدەن، وە فەرمانیان پێكرا بە مارەكردنی ئافرەتانی تر جگە لەو كچە هەتیوانە.

## ٢- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: "مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ البَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فإنه أغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ". وَهَلْ يَتَزَوَّجُ مَنْ لَا أَرَبَ لَهُ فِي النِّكَاحِ؟

٥٠٦٥- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ، عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ فَلَقِيَهُ عُثْمَانُ بِمِنًى فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِنَّ لِي إِلَيْكَ حَاجَةً. فَخَلَيَا، فَقَالَ عُثْمَانُ: هَلْ لَكَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ فِي أَنْ نُزَوِّجَكَ بِكْرًا تُذَكِّرُكَ مَا كُنْتَ تَعْهَدُ؟ فَلَمَّا رَأَى عَبْدُ اللَّهِ أَنْ لَيْسَ لَهُ حَاجَةٌ إِلَى هَذَا أَشَارَ إِلَيَّ فَقَالَ: يَا عَلْقَمَةُ، فَانْتَهَيْتُ إِلَيْهِ وَهْوَ يَقُولُ: أَمَا لَئِنْ قُلْتَ ذَلِكَ لَقَدْ قَالَ لَنَا النَّبِيُّ ﷺ: «يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ»[1].

---

(١) بڕوانە: ١٩٠٥.

## ٢- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ((ئەی کۆمەڵی گەنجان هەر کەسێک لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەبوو ئەوە با ژن بێنێت، وە هەر کەسێک نەیتوانی (ژن بێنێت) ئەوە با بەڕۆژوو بێت، چونکە بۆی دەبێتە قەڵغان))، وە ئایا کەسێک توانا و پێویستی ژن هێنانی نەبوو ژن بێنێت یانا؟

٥٠٦٥-عەلقە دەڵێ: من لەگەڵ عەبدوڵلادا ﷺ بووم لە مینا، عوسمان پێی گەیشت و عوسمان وتی: ئەی باوکی عەبدوڕەحمان من کارێکی پێویستم بە تۆیە، ئینجا هەردووکیان بە تەنها بوونەوە و عوسمان وتی: ئەی باوکی عەبدوڕەحمان دەتەوێت کچێکت بۆ مارەکەم کاتی ڕابردوو (گەنجێتی)ـت وەبیر بێنێتەوە؟ جا کە عەبدوڵلا زانی کە پێویستی بەو ژن هێنانە نییە، ئاماژەی بۆ من کرد وتی: عەلقەمە وەرە، منیش ڕۆشتم بۆلای و دەیوت: ئەگەر تۆ ئەوە دەڵێیت، سوێند بەخوا بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە ئێمە: ((ئەی کۆمەڵی گەنجان هەرکەسێك لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەبوو ئەوە با ژن بێنێت، وە هەر کەسێك نەیتوانی (ژن بێنێت) ئەوە با بەڕۆژوو بێت، چونکە بۆی دەبێتە قەڵغان)).

## ٣- بَابٌ: مَنْ لَمْ يَسْتَطِعِ البَاءَةَ فَلْيَصُمْ

٥٠٦٦- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُمَارَةُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ عَلْقَمَةَ وَالأَسْوَدِ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ شَبَابًا لاَ نَجِدُ شَيْئًا، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ»[1].

---

(١) بڕوانە: ١٩٠٥.

## ٣- باسێک: هەرکەسێک نەیتوانی ژن بێنێت با بەڕۆژوو بێت

**٥٠٦٦-عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزید دەڵێ: لەگەڵ عەلقەمە و ئەسوەددا چووین بۆ لای عەبدوڵلا ﷺ، عەبدوڵلا وتی: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین هیچمان نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێمان: ((ئەی کۆمەڵی گەنجان هەرکەسێك لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەبوو با ژن بێنێت، چونکە بەڕاستی چاکترین هۆکارە بۆ چاو پارێزی و داوێن پارێزی، وە هەرکەسێك نەیتوانی (ژن بێنێت) ئەوە با بەڕۆژوو بێت، چونکە بۆی دەبێتە قەڵغان)).**

## ٤- بَابُ كَثْرَةِ النِّسَاءِ

٥٠٦٧- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَنَّ ابْنَ جُرَيْجٍ، أَخْبَرَهُمْ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ قَالَ: حَضَرْنَا مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ جَنَازَةَ مَيْمُونَةَ بِسَرِفَ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: هَذِهِ زَوْجَةُ النَّبِيِّ ﷺ، فَإِذَا رَفَعْتُمْ نَعْشَهَا فَلاَ تُزَعْزِعُوهَا وَلاَ تُزَلْزِلُوهَا وَارْفُقُوا، فَإِنَّهُ كَانَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ تِسْعٌ، كَانَ يَقْسِمُ لِثَمَانٍ وَلاَ يَقْسِمُ لِوَاحِدَةٍ.

## ٤- باسی زۆری ژن (هاوسەر)

**٥٠٦٧-عەتا دەڵێ: لەگەڵ ئیبنو عەبباسدا ﷺ ئامادەی ناشتنی تەرمی مەیمونە بووین لە سەریف[١]، ئیبنو عەبباس وتی: ئەم ئافرەتە هاوسەری پێغەمبەرە ﷺ، کە تەرمەکەیتان هەڵگرت لەرەلەر و جوڵە جوڵی پێ مەکەن، بە هێواشی بیبەن، چونکە بێگومان پێغەمبەر ﷺ نۆ هاوسەری هەبوو لای هەشتیان بەنۆرە دەمایەوە، بەڵام یەکێکیان لای نەدەمایەوە.**

---

(١) سەریف شوێنێکە دوازدە میل لە مەککەوە دوورە. بڕوانە : إرشاد الساري، ١١/٣٤٠.

٥٠٦٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ فِي لَيْلَةٍ وَاحِدَةٍ، وَلَهُ تِسْعُ نِسْوَةٍ.
وَقَالَ لِي خَلِيفَةُ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، أَنَّ أَنَسًا حَدَّثَهُمْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٥٠٦٨-ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە یەك شەودا دەسوڕایەوە بەسەر هاوسەرەكانی دا (سەرجێی لەگەڵیان دەكرد)، نۆ هاوسەریشی هەبوو.**
**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) خەلیفە پێی وتم: یەزیدی كوڕی زورەیع بۆی گێڕاینەوە وتی: سەعید بۆی گێڕاینەوە لە قەتادەوە، كە ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەم فەرموودەی بۆ گێڕانەوە.**

٥٠٦٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْحَكَمِ الأَنْصَارِيُّ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ رَقَبَةَ، عَنْ طَلْحَةَ الْيَامِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ: هَلْ تَزَوَّجْتَ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ: فَتَزَوَّجْ، فَإِنَّ خَيْرَ هَذِهِ الأُمَّةِ أَكْثَرُهَا نِسَاءً.

**٥٠٦٩-سەعیدی كوڕی جوبەیر وتی: ئیبنو عەبباس ﷺ پێی وتم: ئایا ژنت هێناوە؟ وتم: نەخێر، وتی: كەواتە ژن بێنە، چونكە بەڕاستی چاكترینی ئەم ئوممەتە (كە پێغەمبەرە ﷺ) خێزانی لە هەمووان زۆرتر بوو.**

## ٥- بابٌ: مَنْ هَاجَرَ أَوْ عَمِلَ خَيْرًا لِتَزْوِيجِ امْرَأَةٍ فَلَهُ مَا نَوى

٥٠٧٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ قَزَعَةَ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَقَّاصٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الْعَمَلُ بِالنِّيَّةِ،

(١) بڕوانە: ٢٦٨.

وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ ﷺ وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوِ امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ»[1].

## ٥- باسێک: هەر کەسێک کۆچ بکات یان چاکە یەک بکات لەبەر مارەکردنی ئافرەتێک، ئەو نیەتی چی بووە ئەوەی بۆ هەیە[2].

**٥٠٧٠- عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەموو کردەوەیەك (ڕاستی و دروستی) بەنیاز و نیەتەوە پەیوەستە، وە بێگومان هەرکەسێك نیەتی چی بووە (لە کارەکەیدا) ئەوەی بۆ دەنوسرێ، جا هەر کەسێ کۆچ کردنەکەی بۆلای خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بوو بێت، ئەوە (پاداشتی) کۆچ کردنەکەی لای خوا و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، هەر کەسیش کۆچ کردنەکەی بۆ بەدەست هێنانی دونیا بێت یان بۆ مارەکردنی ئافرەتێك بێت، ئەوە کۆچ کردنەکەی تەنها بۆ ئەوەیە لە پێناویدا کۆچی کردوە)).**

## ٦- بابُ تَزْوِيجِ المُعْسِرِ الذي مَعَهُ القُرْآنُ وَالإِسْلَامُ

فِيهِ سَهْل عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

**٥٠٧١-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، قَالَ: حَدَّثَنِي قَيْسٌ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَغْزُو مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَلَيْسَ لَنَا نِسَاءٌ فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَا نَسْتَخْصِي؟ فَنَهَانَا عَنْ ذَلِكَ[3].

---

(١) بڕوانە: ١.

(٢) ئەوەی بۆ دەنوسرێت.

(٣) بڕوانە: ٤٦١٥.

## ٦- باسى ژن مارەكردن بۆ پياوى بێ پارە كە قورئانى لەبەر بێ و مسوڵمان بێ

-لەم باسەدا فەرموودەكەى سەهل ﷺ هەیە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە[1].

٥٠٧١-ئيبنو مەسعوود ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ غەزامان دەكرد، ژنمان نەبوو بۆیە وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا خۆمان نەخەسێنین؟ بەڵام (پێغەمبەر ﷺ) ڕێگری ئەوەی لێ كردین.

## ٧- بابُ قَوْلِ الرَّجُلِ لأَخِيهِ: انْظُرْ أَيَّ زَوْجَتَيَّ شِئْتَ حَتَّى أَنزلَ لَكَ عَنْهَا

رَوَاهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ[2].

٥٠٧٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ حُمَيْدٍ الطَّوِيلِ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ: قَدِمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، فَآخَى النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَهُ وَبَيْنَ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ الأَنْصَارِيِّ، وَعِنْدَ الأَنْصَارِيِّ امْرَأَتَانِ، فَعَرَضَ عَلَيْهِ أَنْ يُنَاصِفَهُ أَهْلَهُ وَمَالَهُ، فَقَالَ: بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ، دُلُّونِي عَلَى السُّوقِ، فَأَتَى السُّوقَ، فَرَبِحَ شَيْئًا مِنْ أَقِطٍ وَشَيْئًا مِنْ سَمْنٍ، فَرَآهُ النَّبِيُّ ﷺ بَعْدَ أَيَّامٍ وَعَلَيْهِ وَضَرٌ مِنْ صُفْرَةٍ، فَقَالَ: «مَهْيَمْ يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ؟». فَقَالَ تَزَوَّجْتُ أَنْصَارِيَّةً. قَالَ: «فَمَا سُقْتَ؟». قَالَ: وَزْنَ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ. قَالَ: «أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ»[3].

## ٧- باسى پياوێک بە براكەى بڵێ: سەیرى كە كام لە دوو هاوسەرەكەمت دەوێ تا وازى لێ بێنم بۆت

-ئەو فەرموودە عەبدوڕەحمانى كوڕى عەوف گێڕاویەتیەوە[4].

---

(١) لە بوخاريدا بە ژمارە (٢٣١٠) هاتووە.
(٢) بڕوانە: ٢٠٤٨.
(٣) بڕوانە: ٢٠٤٨، ٢٠٤٩.
(٤) لە صەحيحى بوخاريدا بە ژمارە (٢٠٤٨، ٢٠٤٩) هاتووە.

**٥٠٧٢-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ هات (بۆ مەدینە)، جا پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان عەبدوڕەحمان و سەعدی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاری یەوە ﷺ، پیاوە ئەنصاریەکە دوو هاوسەری هەبوو، جا سەعد پێشنیاری کرد کە هاوسەرانی و ماڵەکەی لەگەڵدا بکات بە دوو بەشەوە، عەبدوڕەحمانیش وتی: خوا فەڕ و بەرەکەت بخاتە هاوسەر و سامانەکەتەوە، بازاڕم نیشان بدەن (نیشانی دا و) ڕۆشت بۆ بازاڕ، ئینجا هەندێ کەشك و هەندێ ڕۆنی قازانج کردوو، جا پێغەمبەر ﷺ پاش چەند ڕۆژێك عەبدوڕەحمانی بینی و ئاسەواری زەعفەرانی پێوە بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دەنگ و باس و حاڵت چۆنە عەبدوڕەحمان؟)) ئەویش وتی: ئافرەتێکی ئەنصاریم مارە کردوە، فەرمووی: ((ئەی چەند مارەییت داوە؟)) وتی: کێشی ناوکەیەك ئاڵتوون، فەرمووی: ((خواردنی زەماوەند دروست بکە با بەمەڕێکیش بێت)).**

## ٨- بَابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ التَّبَتُّلِ وَالْخِصَاءِ

٥٠٧٣- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، أَخْبَرَنَا ابْنُ شِهَابٍ، سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ يَقُولُ: سَمِعْتُ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ يَقُولُ: رَدَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ التَّبَتُّلَ، وَلَوْ أَذِنَ لَهُ لَاخْتَصَيْنَا[1].

## ٨- باسی ئەوەی کە ناپەسەندە لە ژن نەهێنان و یەکلا بوونەوە بۆ عیبادەت و خۆ خەساندن

**٥٠٧٣-سەعیدی کوڕی موسەیيەب دەڵێ: لە سەعیدی کوڕی ئەبی وەققاصم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ژن نەهێنان و یەکلابوونەوە بۆ بەندایەتی**

(١) بڕوانە: ٥٠٧٤.

**لە عوسمانی کوڕی مەزعون قەدەغە کرد، وە ئەگەر ڕێگەی پێ بدایە خۆمانمان دەخەساند.**

٥٠٧٤- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ أَنَّهُ سَمِعَ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ يَقُولُ لَقَدْ: رَدَّ ذَلِكَ - يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ عَلَى عُثْمَانَ، وَلَوْ أَجَازَ لَهُ التَّبَتُّلَ لَاخْتَصَيْنَا[1].

**٥٠٧٤-سەعیدی کوڕی موسسەیب دەگێڕێتەوە کە لە سەعیدی کوڕی ئەبی وەققاصی ﷺ بیست دەیوت: سوێند بەخوا بێگومان پێغەمبەر ﷺ ژن نەهێنان و یەکلابوونەوە بۆ بەندایەتی لە عوسمان (ی کوڕی مەزعون) ﷺ قەدەغە کرد، وە ئەگەر ڕێگری ژن نەهێنان و یەکلابوونەوە بۆ بەندایەتی پێ بدایە، بێگومان ئێمەش خۆمانمان دەخەساند.**

٥٠٧٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: كُنَّا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَلَيْسَ لَنَا شَيْءٌ فَقُلْنَا: أَلَا نَسْتَخْصِي؟ فَنَهَانَا عَنْ ذَلِكَ، ثُمَّ رَخَّصَ لَنَا أَنْ نَنْكِحَ الْمَرْأَةَ بِالثَّوْبِ، ثُمَّ قَرَأَ عَلَيْنَا: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ المائدة[2].

**٥٠٧٥-عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا غەزامان دەکرد و هیچمان نەبوو، بۆیە وتمان: ئایا خۆمان نەخەسێنین؟ بەڵام پێغەمبەر ڕێگری ئەو (خۆ خەساندنە)ی لێ کردن، لە پاشان ڕێگەی داین بە پۆشاکێك ئافرەت مارە بکەین، لە پاشان عەبدوڵڵا ئەم ئایەتەی بۆ خوێندینەوە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان**

(١) بڕوانە: ٥٠٧٣.

(٢) بڕوانە: ٤٦١٥.

**هێناوه ئەو شته پاك و خۆشانەی كه خوا حەڵاڵی كردوه بۆتان یاساغی مەكەن له خۆتان و سنوور مەشكێنن، چونكه بێگومان خوا سنوور شكێنەرانی خۆش ناوێ).**

٥٠٧٦- وَقَالَ أَصْبَغُ أَخْبَرَنِي ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي رَجُلٌ شَابٌّ، وَأَنَا أَخَافُ عَلَى نَفْسِي الْعَنَتَ وَلاَ أَجِدُ مَا أَتَزَوَّجُ بِهِ النِّسَاءَ. فَسَكَتَ عَنِّي، ثُمَّ قُلْتُ مِثْلَ ذَلِكَ، فَسَكَتَ عَنِّي ثُمَّ قُلْتُ مِثْلَ ذَلِكَ، فَسَكَتَ عَنِّي ثُمَّ قُلْتُ مِثْلَ ذَلِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، جَفَّ الْقَلَمُ بِمَا أَنْتَ لاَقٍ، فَاخْتَصِ عَلَى ذَلِكَ أَوْ ذَرْ».

**٥٠٧٦-ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من پیاوێكی گەنجم و من له خۆم دەترسن تووشی زینا ببم، هیچیشم نی یه ژنی پێ بێنم، پێغەمبەریش ﷺ[1] لێم بێدەنگ بوو، پاشان هەمان قسەم كردەوە، هەر بێدەنگ بوو وەڵامی نەدامەوە، پاشان هەمان قسەم كردەوە، هەر بێدەنگ بوو لێم، پاشان هەمان قسەم كردەوە، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی ئەبی هوڕەیرە ئەوەی توشت بێت (لەسەرت نوسراوە و مرەكەبی) قەڵەمەكە وشك بۆتەوە، جا ئەوەی (وتت)[2] بیكە یان وازی لێ بێنە (و ئەوەی من وتم بیكە)[3].**

## ٩- بابُ نِكَاحِ الأَبْكَارِ

وَقَالَ ابن أَبِي مُلَيْكَةَ: قَالَ ابن عَبَّاسٍ لِعَائِشَةَ: لَمْ يَنْكِحِ النَّبِيُّ ﷺ بِكْرًا غَيْرَكِ.

٥٠٧٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَخِي، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ لَوْ نَزَلْتَ وَادِيًا وَفِيهِ شَجَرَةٌ قَدْ

---

(١) لەگێڕانەوەكەی (حرملة)ـدا ئەم زیادەی هەیە: (موڵەتم بدە خۆم بخەسێنم) (إرشاد الساري: ٣٤٧/١١).

(٢) له خۆخەساندن.

(٣) نەكردنی خۆخەساندن.

أُكِلَ مِنْهَا، وَوَجَدْتَ شَجَرًا لَمْ يُؤْكَلْ مِنْهَا، فِي أَيِّهَا كُنْتَ تُرْتِعُ بَعِيرَكَ؟ قَالَ: «فِي الَّذِي لَمْ يُرْتَعْ مِنْهَا». تَعْنِي: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَتَزَوَّجْ بِكْرًا غَيْرَهَا.

## ٩- باسی مارەکردنی کچان

**ئیبنو ئەبی مولەیکە دەڵێ: ئیبنو عەبباس ﷺ بە عائیشەی ﷺ وت: پێغەمبەر ﷺ جگە لە تۆ کچی مارە نەکردوە.**

**٥٠٧٧- عائیشە ﷺ وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا پێم بڵێ: ئەگەر تۆ لە شیوێکدا دابەزی لەو شیوەدا درەختی تیا بێت لێی خورابێت، وە درەختیش ببینی لێ نەخورابێت، تۆ وشترەکەت لە کامیان دەلەوڕێنیت؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لەومیان کە لێی نەلەوڕا بێت))، مەبەستی عائیشە ﷺ ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لەو کچی نەهێناوە و مارە نەکردوە.**

٥٠٧٨- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُرِيتُكِ فِي الْمَنَامِ مَرَّتَيْنِ، إِذَا رَجُلٌ يَحْمِلُكِ فِي سَرَقَةِ حَرِيرٍ فَيَقُولُ: هَذِهِ امْرَأَتُكَ، فَأَكْشِفُهَا فَإِذَا هِيَ أَنْتِ، فَأَقُولُ: إِنْ يَكُنْ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ يُمْضِهِ»[1].

**٥٠٧٨- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە خەودا دووجار تۆم بینی، دەبینم پیاوێك تۆی لە ناو پارچە ئاوریشمێکی چاکدا هەڵگرتووە و دەڵێ: ئەمە ژنی تۆیە منیش سەری لادەدەم دەبینم ئافرەتەکە تۆیت، منیش وتم ئەگەر ئەمە لە خواوە بێت بە جێی دێنێ)).**

(١) بڕوانە: ٣٨٩٥.

## ١٠- بابُ نكاح الثَّيِّبات

وَقَالَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: "لَا تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ وَلَا أَخَوَاتِكُنَّ".

٥٠٧٩- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، حَدَّثَنَا سَيَّارٌ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَفَلْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ غَزْوَةٍ، فَتَعَجَّلْتُ عَلَى بَعِيرٍ لِي قَطُوفٍ، فَلَحِقَنِي رَاكِبٌ مِنْ خَلْفِي، فَنَخَسَ بَعِيرِي بِعَنَزَةٍ كَانَتْ مَعَهُ، فَانْطَلَقَ بَعِيرِي كَأَجْوَدِ مَا أَنْتَ رَاءٍ مِنَ الإِبِلِ، فَإِذَا النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «مَا يُعْجِلُكَ؟». قُلْتُ كُنْتُ حَدِيثَ عَهْدٍ بِعُرُسٍ. قَالَ: «بِكْرًا أَمْ ثَيِّبًا؟». قُلْتُ: ثَيِّبٌ. قَالَ: «فَهَلاَّ جَارِيَةً تُلاَعِبُهَا وَتُلاَعِبُكَ!». قَالَ: فَلَمَّا ذَهَبْنَا لِنَدْخُلَ قَالَ: «أَمْهِلُوا حَتَّى تَدْخُلُوا لَيْلاً -أَيْ: عِشَاءً- لِكَيْ تَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ، وَتَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ»[1].

## ١٠- باسی مارەکردنی بێوەژنان

**ئوممو حەبیبە ﵂ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کچەکانتان وخوشکەکانتان پێشنیار مەکەن بۆم (مارمیان کەم)**[2]**.**

**٥٠٧٩-جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ لە غەزایەك گەڕاینەوە، جا من بەسواری وشترێکی تەمەڵەوە پەلەم دەکرد، ئینجا لە دوامەوە سوارێك پێم گەشت و نەقیزەیەك کە پێی بوو ژەند بە وشترەکەمەوە، ئیتر وشترەکەم بە تیژی ڕۆشت وەك چاکترین وشتر کەتۆ بینیبێتت، جا دەبینم (ئەو کەسە) پێغەمبەرە ﷺ فەرمووی: ((بۆچی پەلە دەکەیت))، وتم: تازە ژنم هێناوە، فەرمووی: ((کچ (هێناوە) یان بێوە ژن؟)) وتم: بێوە ژن، فەرمووی: ((ئەی بۆ کچێکت نەهێنا یاری لەگەڵدا بکەیت و ئەویش یاریت لەگەڵ بکات؟))، وتی: جا کاتێك ڕۆشتین بڕۆینە ناو شاری مەدینەوە فەرمووی: ((پەلە مەکەن**

---

(١) بروانە: ٤٤٣.

(٢) چونکە مارەکردنیان بۆی حەڵاڵ نییە، چونکە دوو خوشک یان دایک و کچ دروستن نی یە لە یەک کاتدا ژنی یەک پیاوبن.

**تا بەشەو - واتە: عیشا - بڕۆنە شارەوە تا ئەو ئافرەتەی قژ بژ و ئالۆسکاوە قژی شانەکات، وە ئافرەتی مێرد لەماڵەوە نەبووش بەری بتاشێ)).**

٥٠٨٠- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا مُحَارِبٌ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ تَزَوَّجْتُ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا تَزَوَّجْتَ». فَقُلْتُ تَزَوَّجْتُ ثَيِّبًا. فَقَالَ: «مَا لَكَ وَلِلْعَذَارَى وَلِعَابِهَا». فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَمْرِو بْنِ دِينَارٍ فَقَالَ عَمْرٌو سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَلاَّ جَارِيَةً تُلاَعِبُهَا وَتُلاَعِبُكَ».

**٥٠٨٠- موحاریب دەڵێ: لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵام ﷺ بیست دەیوت: ئافرەتێکم مارەکرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی پێم: ((چیت مارە کردوە؟)) منیش وتم بێوەژنێکم مارەکردوە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((بۆچی لە کچ و لیکی دەمی خۆت بە دوور گرت؟))، (موحاریب وتی:) منیش ئەوەم بۆ عەمری کوڕی دینار باسکرد، عەمریش وتی: لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵام ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێم: ((بۆ کچێکت نەهێنا یاری لەگەڵ بکەیت و یاریت لەگەڵ بکات؟)).**

## ١١- بابُ تَزْوِيجِ الصِّغَارِ مِنَ الكِبَارِ

٥٠٨١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ، عَنْ عِرَاكٍ، عَنْ عُرْوَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَطَبَ عَائِشَةَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّمَا أَنَا أَخُوكَ، فَقَالَ: «أَنْتَ أَخِي فِي دِينِ اللَّهِ وَكِتَابِهِ وَهْيَ لِي حَلاَلٌ».

## ١١- باسی مارەكردنی كچانی منداڵ لە پیاوانی گەورە

**٥٠٨١- عوروە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ خوازبێنی عائیشەی لە ئەبو بەكر ﷺ كرد، ئەبو بەكریش وتی: بێگومان من براتم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((تۆ برای منی لە ئاینی خوا و قورئانەكەیدا، وە ئەو (عائیشە)یش بۆ من حەڵاڵە)).**

## ١٢- بابٌ: إلَى مَنْ يَنْكِحُ وَأَيُّ النِّسَاءِ خَيْرٌ؟ وَمَا يُسْتَحَبُّ أَنْ يَتَخَيَّرَ لِنُطَفِهِ مِنْ غَيْرِ إِيجَابٍ

٥٠٨٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَيْرُ نِسَاءٍ رَكِبْنَ الإِبِلَ صَالِحُو نِسَاءِ قُرَيْشٍ، أَحْنَاهُ عَلَى وَلَدٍ فِي صِغَرِهِ، وَأَرْعَاهُ عَلَى زَوْجٍ فِي ذَاتِ يَدِهِ»[1].

## ١٢- باسێك: بۆ ئەو كەسەی دەیەوێ ژن بێنێ وە كام ژن چاكە (بێنێتی)؟ وە ئەوەی كە سوننەتە (بۆ پیاو) نەك واجب لە هەڵبژاردنی هاوسەریدا

**٥٠٨٢- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((ئافرەتە چاكەكانی قورەیش باشترینی ئافرەتانن سواری وشتر بووبن، دڵسۆزترینی (ئافرەتانن) بۆ منداڵ لە ساوایی دا، وە مشورخۆرترینی ئافرەتانن بۆ مێرد دەربارەی ماڵ و سامانەكەی)).**

---

(١) بڕوانە: ٣٤٣٤.

## ١٣- بابُ اتِّخَاذِ السَّرَارِيِّ وَمَنْ أَعْتَقَ جَارِيَتَهُ ثُمَّ تَزَوَّجَهَا

٥٠٨٣- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ، حَدَّثَنَا صَالِحُ بْنُ صَالِحٍ الْهَمْدَانِيُّ، حَدَّثَنَا الشَّعْبِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّمَا رَجُلٍ كَانَتْ عِنْدَهُ وَلِيدَةٌ فَعَلَّمَهَا فَأَحْسَنَ تَعْلِيمَهَا، وَأَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ تَأْدِيبَهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا فَلَهُ أَجْرَانِ، وَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ وَآمَنَ بِي فَلَهُ أَجْرَانِ، وَأَيُّمَا مَمْلُوكٍ أَدَّى حَقَّ مَوَالِيهِ وَحَقَّ رَبِّهِ فَلَهُ أَجْرَانِ». قَالَ الشَّعْبِيُّ: خُذْهَا بِغَيْرِ شَيْءٍ، قَدْ كَانَ الرَّجُلُ يَرْحَلُ فِيمَا دُونَهُ إِلَى الْمَدِينَةِ.. وَقَالَ أَبُو بَكْرٍ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ «أَعْتَقَهَا ثُمَّ أَصْدَقَهَا»[1].

## ١٣- باسی كەنیزەک هەبوون، وە كەسێک كەنیزەكەی ئازاد بكات پاشان مارەی بكات

**٥٠٨٣-ئەبو بوردە لە باوكیەوە (كە ئەبو مووسای ئەشعەریە) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر پیاوێك كەنیزەكێكی هەبوو، ئینجا بەجوانترین شێوە فێری (ئاینی) كرد، وە بەجوانی ئەدەبی دادا، پاشان ئازادی كرد و مارەی كرد (بۆ خۆی و مارەیی پێدا)، ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە، وە هەر كەسێك لە نامەدارەكان باوەڕی هێنابێ بە پێغەمبەرەكەی خۆی و باوەڕیشی بەمن هێنابێ، ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە، وە هەر كۆیلەیەكیش ئەرك و مافی گەورە و خاوەنەكەی بەجێ هێنابێ و ئەركی خواشی بەجێ هێنابێ، ئەوە دوو پاداشتی هەیە)).**

**شەعەبی وتی: (بەصاڵحی كوڕی صاڵح) وەریگرە بە بێ كرێ، بێگومان جاران كەسێك بۆ فەرموودەیەكی كەمتر لەمە دەڕۆشت بۆ مەدینە (ی مونەوەرە).**

---

(١) بڕوانە: ٩٧.

**-ئەبو بەکر لە ئەبی حوصینەوە دەگێڕێتەوە، لە ئەبی بوردەوە لە باوکیەوە (ئەبو مووسا) لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە فەرموویەتی: ((ئازادی کرد و مارەیی پێدا)) [١].**

٥٠٨٤- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ تَلِيدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ وَهْبٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ.

حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ عَنْ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَمْ يَكْذِبْ إِبْرَاهِيمُ إِلاَّ ثَلاَثَ كَذَبَاتٍ بَيْنَمَا إِبْرَاهِيمُ مَرَّ بِجَبَّارٍ وَمَعَهُ سَارَةُ -فَذَكَرَ الْحَدِيثَ- فَأَعْطَاهَا هَاجَرَ قَالَتْ: كَفَّ اللَّهُ يَدَ الْكَافِرِ وَأَخْدَمَنِي آجَرَ». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَتِلْكَ أُمُّكُمْ يَا بَنِي مَاءِ السَّمَاءِ[٢].

**٥٠٨٤-ئەبو هورەیرە[٣] ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئیبراهیم ﷺ تەنها سێ درۆی کردوە: لە کاتێکدا تێپەڕی بەلای (پادشایەکی) زۆرداردا و سارە (ی هاوسەری) شی لەگەڵدا بوو... ئینجا فەرموودەکەی گێڕایەوە... جا (پادشاکە) هاجەری دا بەسارە، سارە وتی: خوا دەستی ئەو (پادشا) کافرەی لێ دوور خستەوە، وە هاجەرەیشی بۆ خزمەتکاری پێدام)).**

**ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئەو (هاجەر)ـە دایکتانە ئەی نەوەی ئاوی ئاسمان[٤].**

---

(١) جیاوازی ئەم گێڕانەوەیان لەگەڵ ئەوەی پێشوودا ئەوەیە لێرەدا مارەیی پێداوە، بەڵام لەوەی پێشوودا باسی مارەیی نەکردوە، وا لێیوە بەدەردەکوێ کە ئازاد کردنەکە مارەیی یەکەی بووبێت، بەڵام ئەم ڕوونی دەکاتەوە کە مارەیی بۆ دابنێ. بڕوانە : إرشاد الساري: ١١/٣٥٤.

(٢) بڕوانە: ٢٢١٧.

(٣) ئەم فەرموودەیە بە دوو ڕێگە و سەنەد گێڕدراوەتەوە.

(٤) زۆربەی زانایان دەڵێن مەبەست بە (بني ماء السماء) عەرەبە لەبەر پاک و ڕوونی ڕەچەڵەکیان، وە هەندێ دەڵێن چونکە زۆربەیان خاوەن ئاژەڵ و ماڵاتن ژیانیان لە سەر لەوەڕگایە و ئەوەی بە ئاوی باران سەوز دەبێت. قازی عیاض دەڵێ: مەبەست پێی ئەنصارە بەتایبەتی، چونکە باپیرەیان عامری کوڕی حاریسە بە (ماء السماء) ناسراو بوو. خەتتابیش دەڵێ: مەبەستی ئاوی زەمزەمە خوا بۆ هاجەری هەڵقوڵاند، ئیتر عەرەبەکان بەو ئاوە ژیان

٥٠٨٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ خَيْبَرَ وَالْمَدِينَةِ ثَلاَثًا يُبْنَى عَلَيْهِ بِصَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ، فَدَعَوْتُ الْمُسْلِمِينَ إِلَى وَلِيمَتِهِ فَمَا كَانَ فِيهَا مِنْ خُبْزٍ وَلاَ لَحْمٍ، أُمِرَ بِالأَنْطَاعِ فَأَلْقَى فِيهَا مِنَ التَّمْرِ وَالأَقِطِ وَالسَّمْنِ فَكَانَتْ وَلِيمَتَهُ، فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ: إِحْدَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ، أَوْ مِمَّا مَلَكَتْ يَمِينُهُ؟ فَقَالُوا: إِنْ حَجَبَهَا فَهْيَ مِنْ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ، وَإِنْ لَمْ يَحْجُبْهَا فَهْيَ مِمَّا مَلَكَتْ يَمِينُهُ. فَلَمَّا ارْتَحَلَ وَطَّى لَهَا خَلْفَهُ وَمَدَّ الْحِجَابَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ النَّاسِ[١].

**٥٠٨٥-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نێوان خەیبەر و مەدینەدا سێ ڕۆژ مایەوە، صەفییەی کچی حویەیی بۆ گوێزرایەوە (چووە پەردەی زاوایەتی)، جا مسوڵمانانم بانگ کرد بۆ خواردنی زەماوەندەکەی (پێغەمبەر ﷺ)، جا ئەو خواردنە نە نان و نەگۆشتی تیا نەبوو، فەرمان کرا پارچە چەرمێك دانرا و جا خورما و کەشك و ڕۆنی کرایە سەر، ئەوە خواردنی زەماوەندەکەی بوو، مسوڵمانان وتیان: (ئەم هاوسەرە) یەکێکە لە دایکی باوەڕداران، یا لەو کەنیزەکانەیە کە بۆتە خاوەنی؟ ئینجا وتیان: ئەگەر حیجابی بۆ کرد (شاردیەوە) لەوە یەکێکە لەدایکی باوەڕداران، بەڵام ئەگەر حیجابی بۆ نەکرد ئەوە لەو کەنیزەکانەیە کە بووەتە خاوەنی، جا کاتێ (ویستیان بەڕێکەون و) بڕۆن لە پاشکۆی خویەوە جێکایەکی بۆ (صەفییە) ئامادەکرد و پەردەیەکی لە نێوان صەفییە و خەڵکەکەدا گێڕایەوە.**

---

وەک ئەوە وایە هەموویان منداڵی ئەو ئاوی زەمزەمەبن. بڕوانە: صحیحی البخاري، خرج أحادیثه وعلق علیه: عزالدین ضلي وعماد الطیار ویاسر حسن: ل ٨٧٠ پەراوێزی:5.

(١) بڕوانە: ٣٧١.

## ١٤- بَابٌ مَنْ جَعَلَ عِتْقَ الْأَمَةِ صَدَاقَهَا

٥٠٨٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ حَدَّثَنَا حَمَّادٌ عَنْ ثَابِتٍ وَشُعَيْبِ بْنِ الْحَبْحَابِ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَعْتَقَ صَفِيَّةَ وَجَعَلَ عِتْقَهَا صَدَاقَهَا.

## ١٤- باسی کەسێک ئازاد کردنی کەنیزەکەکە بکاتە مارەیی یەکەی

**٥٠٨٦-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ صەفییەی ئازاد کرد و وئازادکردنەکەی کردە مارەیی بۆی.**

## ١٥- باب تَزْوِيجِ الْمُعْسِرِ

لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿إِن يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ ﴿٣٢﴾﴾ النور.

٥٠٨٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، جِئْتُ أَهَبُ لَكَ نَفْسِي قَالَ: فَنَظَرَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَعَّدَ النَّظَرَ فِيهَا وَصَوَّبَهُ، ثُمَّ طَأْطَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَأْسَهُ، فَلَمَّا رَأَتِ الْمَرْأَةُ أَنَّهُ لَمْ يَقْضِ فِيهَا شَيْئًا جَلَسَتْ فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ فَزَوِّجْنِيهَا. فَقَالَ: «وَهَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ؟». قَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ: «اذْهَبْ إِلَى أَهْلِكَ فَانْظُرْ هَلْ تَجِدُ شَيْئًا». فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ مَا وَجَدْتُ شَيْئًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «انْظُرْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ». فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَلاَ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ وَلَكِنْ هَذَا إِزَارِي -قَالَ سَهْلٌ: مَا لَهُ رِدَاءٌ- فَلَهَا نِصْفُهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا تَصْنَعُ بِإِزَارِكَ؟! إِنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا مِنْهُ شَيْءٌ وَإِنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ شَيْءٌ». فَجَلَسَ الرَّجُلُ حَتَّى إِذَا طَالَ مَجْلِسُهُ قَامَ، فَرَآهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مُوَلِّيًا فَأَمَرَ بِهِ فَدُعِيَ، فَلَمَّا جَاءَ قَالَ: «مَاذَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ؟». قَالَ: مَعِي سُورَةُ

كَذَا وَسُورَةُ كَذَا عَدَّدَهَا. فَقَالَ: «تَقْرَؤُهُنَّ عَنْ ظَهْرِ قَلْبِكَ؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «اذْهَبْ فَقَدْ مَلَّكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ»[1].

## ١٥- باسی مارەکردنی ژن بۆ پیاوی نەبوو و هەژار

**بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەگەر ئەوان (پیاوە بێ ژنەکان) هەژار و کەم دەست بن، خوا لە بەخشندەیی و بەهرەی خۆی دەوڵەمەند و بێ نیازیان دەکات).**

**٥٠٨٧- سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەگێڕێتەوە، کە ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هاتووم خۆمت پێشکەش بکەم، پێغەمبەریش ﷺ سەیری کرد ئینجا لە سەرەوە بۆ خوارەوە تەماشای کرد، لە پاشان سەری داخست، جا کە ئافرەتەکە زانی پێغەمبەر ﷺ هیچ بڕیارێکی لە باریەوە نەدا دانیشت، ئینجا پیاوێك لە هاوەڵانی هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر تۆ پێویستت پێی نییە، بۆ منی مارە بکە، فەرمووی: ((ئایا هیچت هەیە (بیکەیت بە مارەیی بۆی؟) ))، وتی: نەوەڵڵا ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((بڕۆ بۆ ماڵەوەتان بزانە هیچ شتێك پەیدا دەکەیت؟))، ئەویش ڕۆشت پاشان گەڕایەوە و وتی: نە بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا هیچم دەست نەکەوت، فەرمووی: ((سەرنج بدە ئەموستیلەیەکی ئاسنیش بێت))، ئەوسا ڕۆشت لە پاشان گەڕایەوە و وتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ئەموستیلەیەکی ئاسنیشم دەست نەکەوت، بەڵام ئەم پۆشاکەم [2] هەیە - سەهل دەڵێ: پیاوەکە پشتەماڵەی نەبوو - نیوەی بۆ ئەو ئافرەتە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((چی لە ئیزارەکەت بکات؟ ئەگەر تۆ بی پۆشی ئەو هیچی لە**

(١) بڕوانە: ٣٣١٠.

(٢) (إزار): پۆشاكێكه بۆ نێوان ناوك و ئەژنۆ.

بەردا نابێ، وە ئەگەر ئەو (ئافرەتەکە) بی پۆشێ تۆ هیچت لە بەردا نابێ))، ئیتر پیاوەکە دانیشت و دانیشتنەکەی درێژەی کێشا، پاشان هەستا، پێغەمبەری خوا ﷺ کابرا بینی پشتی هەڵکرد و ڕۆشت، فەرمانی کرد و بانگ کرا، ئینجا کە هاتەوە فەرمووی: ((چیت پێیە لە قورئان؟))، وتی: فلانە سورەت وفلانە سورەت و فلانە سورەت، ژماردنی، فەرمووی: ((هەموویان لەبەر دەخوێنی؟))، وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((برۆ ئەوە بەڕاستی ئەو (ئافرەتەم) لێ مارە کردیت بەو (سورەتانەی) قورئان کە لەبەرتە)).

## ١٦- بابُ الأَكْفَاءِ فِي الدِّينِ

وَقَوْلِهِ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾ ﴾ الفرقان.

٥٠٨٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ أَبَا حُذَيْفَةَ بْنَ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ، وَكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ تَبَنَّى سَالِمًا، وَأَنْكَحَهُ بِنْتَ أَخِيهِ هِنْدَ بِنْتَ الْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ وَهْوَ مَوْلًى لِامْرَأَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ، كَمَا تَبَنَّى النَّبِيُّ ﷺ زَيْدًا، وَكَانَ مَنْ تَبَنَّى رَجُلاً فِي الْجَاهِلِيَّةِ دَعَاهُ النَّاسُ إِلَيْهِ وَوَرِثَ مِنْ مِيرَاثِهِ حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ ﴿ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۚ ﴿٥﴾ ﴾ الأحزاب. فَرُدُّوا إِلَى آبَائِهِمْ، فَمَنْ لَمْ يُعْلَمْ لَهُ أَبٌ كَانَ مَوْلًى وَأَخًا فِي الدِّينِ، فَجَاءَتْ سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو الْقُرَشِيِّ ثُمَّ الْعَامِرِيِّ -وَهْيَ امْرَأَةُ أَبِي حُذَيْفَةَ- النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا كُنَّا نَرَى سَالِمًا وَلَدًا وَقَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِ مَا قَدْ عَلِمْتَ. فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[1].

---

(١) بڕوانە: ٤٠٠٠.

# ١٦- باسی هاوشانی لە ئایندایە

وە باسی ئەم فەمایشتەی خوای گەورە: (وە ئەو (خوایە) زاتێکە ئادەمیزادی لە ئاو (ی مرۆڤ) دروست کردوە، ئینجا ئەو (ئاوە)ی کردۆتە هۆی ڕەچەڵەك[١] و خزمایەتی[٢]، وە پەروەردگارت هەمیشە بە دەسەڵات و توانایە).

٥٠٨٨-عوروەی کوڕی زوبەیر، لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدی شەمس -کە لەو کەسانە بوو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بەشداری غەزای بەدری کردبوو - سالیمی کردبوویە کوڕی خۆی[٣]، کچی براکەشی کە ناوی هیندی کچی وەلیدی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە بوو مارەی کرد بۆی، سالیمیش ئازاد کراوی ئافرەتێکی ئەنصاری بوو[٤]، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ زەیدی کردبوو بە کوڕی خۆی، وە لە سەردەمی نەفامیدا هەرکەسێك کوڕێکی بکردایە بە کوڕی خۆی، خەڵکی بەناوی ئەو کەسەوە بانگیان دەکرد، (پاش مردنی کەسەکە) لە میراتی کەسەکەی دەبرد، تا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: (ئەو بەکوڕ کراوانە بەناوی باوکیانەوە بانگیان بکەن)، تا فەرمایشتە کە دەگاتە (وە دۆست و خۆشەویستانن) ئەو (بە کوڕ کراوەکان) گێڕدرانەوە بۆلای باوکانیان، ئەوەیش نەزانرا باوکی کێیە ئەو دۆست وخۆشەویست و برای ئاینی بوو، ئینجا سەهلەی کچی سوهەیلی کوڕی عەمری قوڕەیشی دواتر عامری - کە خێزانی ئەبی حوزەیفە بوو - هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە جاران سالیمان بە کوڕی خۆمان دەزانی، وە بێگومان ئێستاش خوا لەو بارەیەوە ئەوەی دابەزاندووە کە بێگومان جەنابت دەزانی و ئاگاداری، ئیتر فەرموودەکەی بە درێژی گێڕایەوە[٥].

---

(١) پشت کە بە ڕێگەی نێرینە دەگەن بە مرۆڤ، وەک کوڕ.

(٢) کە بەڕێگەی ئافرەت دەگەنەوە بە مرۆڤ، وەک کچەزاو خوشکەزا.

(٣) کە لە ڕاستی دا کوڕی ئەو نەبوو بەڵکو کوڕی پیاوێکی تر بوو.

(٤) ناوی سەهلە بوو کە خێزانی ئەبو حوزەیفە بوو ﷺ.

(٥) تەواوی فەرموودەکە ئەبو داوود گێڕاویەتیەوە (إرشاد الساري: ٣٦٢/١١)

٥٠٨٩- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى ضُبَاعَةَ بِنْتِ الزُّبَيْرِ فَقَالَ لَهَا: «لَعَلَّكِ أَرَدْتِ الْحَجَّ». قَالَتْ: وَاللَّهِ لاَ أَجِدُنِي إِلاَّ وَجِعَةً. فَقَالَ لَهَا: «حُجِّي وَاشْتَرِطِي، قُولِي: اللَّهُمَّ مَحِلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي». وَكَانَتْ تَحْتَ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ.

**٥٠٨٩- عائیشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشت بۆ لای زوباعەی کچی زوبەیر ﵄ و فەرمووی پێی: ((لەوانەیە نیازی حەجت بوبێت؟))، زوباعە وتی: سوێند بەخوا بەڕاستی نەخۆشم[1]، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی پێی: ((حەجەکەت بکە و مەرج دانێ و بڵێ: خوایە لە هەر جێگایەکدا (نەخۆشی) ڕێگرم بوو، لەو جێگادا ئیحرام دەشکێنم)). زوباعە هاوسەری میقدادی کوڕی ئەسوەد بوو.**

٥٠٩٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ أَبِي سَعِيدٍ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا وَجَمَالِهَا، وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ».

**٥٠٩٠-ئەبو هوڕەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((ئافرەت لەبەر چوار شت مارە دەکرێت: لەبەر ماڵ وسامانەکەی، وە لەبەر خانەدانیەکەی، وە لەبەر جوانیەکەی، وە لەبەر دینداریيەکەی، کەواتە ئافرەتی دیندار بێنە، هەردوو دەست خۆڵاوی بێت (هەژارکەوی)** [2].

٥٠٩١- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حَمْزَةَ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَهْلٍ قَالَ: مَرَّ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «مَا تَقُولُونَ فِي هَذَا؟». قَالُوا: حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَأَنْ يُنْكَحَ، وَإِنْ شَفَعَ

(١) یان: وڵڵاهی دەترسم نەخۆش بکەوم.
(٢) ئەگەر گوێڕایەڵی فەرمانەکەی من نەبیت.

أَنْ يُشَفَّعَ، وَإِنْ قَالَ أَنْ يُسْتَمَعَ. قَالَ: ثُمَّ سَكَتَ فَمَرَّ رَجُلٌ مِنَ فُقَرَاءِ الْمُسْلِمِينَ فَقَالَ: «مَا تَقُولُونَ فِي هَذَا؟». قَالُوا: حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ أَنْ لاَ يُنْكَحَ، وَإِنْ شَفَعَ أَنْ لاَ يُشَفَّعَ، وَإِنْ قَالَ أَنْ لاَ يُسْتَمَعَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَذَا خَيْرٌ مِنْ مِلْءِ الأَرْضِ مِثْلَ هَذَا»[1].

**٥٠٩١-سەهل ﷺ دەڵێ: پیاوێك بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ تێپەڕی، ئەویش فەرمووی: ((دەربارەی ئەم پیاوە چی دەڵێن؟)) وتیان: شیاوی ئەوەی خوازبێنی ئافرەتی کرد پێی بدەی (بۆی مارەکەیت)، وە ئەگەر تکای کرد قەبوڵ بکرێت، وە ئەگەر قسەی کرد گوێی بۆ بگیرێت. (سەهل) دەڵێ: پاشان (پێغەمبەر ﷺ بێدەگ بوو، ئینجا پیاوێك لە هەژارە مسوڵمانەکان تێپەڕی، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: ((دەربارەی ئەم پیاوە چی دەڵێن؟))، وتیان: شیاوی ئەوەیە خوازبێنی ئافرەتی کرد پێی نەدەیت، وە ئەگەر تکای کرد تکای وەرنەگرێت، وە ئەگەر قسەی کرد گوێی بۆ نەگرێت. ئەوسا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەمە (هەژارەکە) چاکترە لە پڕ بەزەوی لە ئەو (دەوڵەمەندە)ی تریان)).**

## ١٧- بابُ الأَكْفَاءِ فِي المَالِ، ونكاحِ المُقِلِّ المُثْرِيَةَ

٥٠٩٢- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﵂ ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ ﴿٣﴾ ﴾ النساء، قَالَتْ: يَا ابْنَ أُخْتِي، هَذِهِ الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِي حَجْرِ وَلِيِّهَا فَيَرْغَبُ فِي جَمَالِهَا وَمَالِهَا، وَيُرِيدُ أَنْ يَنْتَقِصَ صَدَاقَهَا، فَنُهُوا عَنْ نِكَاحِهِنَّ إِلاَّ أَنْ يُقْسِطُوا فِي إِكْمَالِ الصَّدَاقِ، وَأُمِرُوا بِنِكَاحِ مَنْ سِوَاهُنَّ، قَالَتْ: وَاسْتَفْتَى النَّاسُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ ذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ ۖ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ فِي يَتَامَى النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ

---

(١) بڕوانە: ٦٤٤٧.

وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴿١٢٧﴾ ﴾ النساء. فَأَنْزَلَ اللَّهُ لَهُمْ أَنَّ الْيَتِيمَةَ إِذَا كَانَتْ ذَاتَ جَمَالٍ وَمَالٍ رَغِبُوا فِي نِكَاحِهَا وَنَسَبِهَا فِي إِكْمَالِ الصَّدَاقِ، وَإِذَا كَانَتْ مَرْغُوبَةً عَنْهَا فِي قِلَّةِ الْمَالِ وَالْجَمَالِ، تَرَكُوهَا وَأَخَذُوا غَيْرَهَا مِنَ النِّسَاءِ، قَالَتْ: فَكَمَا يَتْرُكُونَهَا حِينَ يَرْغَبُونَ عَنْهَا، فَلَيْسَ لَهُمْ أَنْ يَنْكِحُوهَا إِذَا رَغِبُوا فِيهَا، إِلاَّ أَنْ يُقْسِطُوا لَهَا وَيُعْطُوهَا حَقَّهَا الأَوْفَى فِي الصَّدَاقِ[1].

## ١٧- باسی هاوشانی لە ماڵ و سامان دا، وە پیاوی هەژار ئافرەتی دەوڵەمەند مارە بکات

**٥٠٩٢-ئیبنو شیهاب دەڵێ: عوروە بۆی گێڕامەوە کە ئەو پرسیاری لە عائیشە ﵂ کرد (لەبارەی ئەم ئایەتەوە): (وە ئەگەر ترسان دادپەروەر نەبن لە (مارەیی) ئەو ئافرەتە بێ باوکانە (مارەیان مەکەن)، عائیشە ﵂ وتی: ئەی برازای خۆم ئەوە (ی ئایەتەکە دەیفەرموێ) کچێکی هەتیوە لە لای سەرپەرەشتیارەکەیەتی و حەزی لە جوانی و سامانەکەیەتی و دەیەوێت کەمتر لە مارەی خۆی بداتێ (و مارەی کات)، بۆیە ئەو سەرپەرەشتیارانە ڕێگری کران لە مارەکردن ئەو کچە هەتیوانە، مەگەر دادگەر بن لە پێدانی مارەییەکەیان بەتەواوی، وە پیاوان فەرمانیان پێ کرا بەمارەکردنی ئافرەتانی تر جگە لەوان، (عائیشە ﵂) دەڵێ: خەڵکی لە پاش ئەوە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ( (ئەی موحەممەد ﷺ) پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ئافرەتان) تا دەگاتە (وە حەز ناکەن مارەیان بکەن)، جا خوا ئایەتی بۆ دابەزاندن: کچی هەتیو ئەگەر جوان بوو سامانی هەبوو حەزیان لە مارە کردن و ڕەچەڵەکێتی مارەیییەکەی بۆ تەواو دەکەن[2]، وە ئەگەر حەزی لێ نەکرا لەبەر کەم ماڵی و کەم جوانی وازی لێ دێنن وجگە لەو ئافرەتانی تر مارە دەکەن. عائیشە ﵂**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٩٤.

(٢) وەک هاوشێوەکانی.

دەڵێ: جا هەر چۆنێ ئەگەر حەزیان لێ نەکرد وازی لێ دێنن بە هەمان شێوە بۆیان نییە مارەی کەن ئەگەر حەزیان لێی بوو، مەگەر دادگەر بن لەگەڵێدا و مافی خۆی پێ بدەن لە مارەییەکەی بە تەواوی و تێر و تەسەلی)).

## ١٨- بابُ مَا يُتَّقَى مِنْ شُؤْمِ المَرْأَةِ

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَـٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ ﴿١٤﴾﴾ التغابن.

٥٠٩٣- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ حَمْزَةَ وَسَالِمٍ ابْنَىْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الشُّؤْمُ فِي الْمَرْأَةِ وَالدَّارِ وَالْفَرَسِ»[1].

## ١٨- باسی ئەوە خۆی لێ دەپارێزرێ لە شوومی ئافرەت

وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بەڕاستی هەندێ لە ژنان و منداڵانتان دوژمنی ئێوەن).

٥٠٩٣-عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((شووم و چارەڕەش لە ئافرەت و خانوو و ئەسپ و ماین دایە)).

٥٠٩٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ مُحَمَّدٍ الْعَسْقَلَانِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ ذَكَرُوا الشُّؤْمَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنْ كَانَ الشُّؤْمُ فِي شَيْءٍ فَفِى الدَّارِ وَالْمَرْأَةِ وَالْفَرَسِ»[2].

(١) بڕوانە: ٢٠٩٩.
(٢) بڕوانە: ٢٠٩٩.

**٥٠٩٤-ئيبنو عومەر ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ باسی شومییان کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر شوومی لە شتێکدا ببێت، ئەوا لە خانوو و ئافرەت و ئەسپ و ماییندا هەیە)).**

٥٠٩٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ فَفِي الْفَرَسِ وَالْمَرْأَةِ وَالْمَسْكَنِ»[١].

**٥٠٩٥-سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەگەر (شومی) لە شتێکدا هەبێت، ئەوە لە ئەسپ و مایین وئافرەت و خانوودا هەیە)).**

٥٠٩٦- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا عُثْمَانَ النَّهْدِيَّ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا تَرَكْتُ بَعْدِي فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ».

**٥٠٩٦-ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((لە پاش خۆم هیچ بەڵایەکم بەجێ نەهێشتووە زەرەر و زیانی زیاتر بێت بۆ پیاوان لە ئافرەتان)).**

## ١٩- بابُ الحُرَّةِ تَحْتَ العَبْدِ

٥٠٩٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ فِي بَرِيرَةَ ثَلاَثُ سُنَنٍ عَتَقَتْ فَخُيِّرَتْ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ». وَدَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَبُرْمَةٌ عَلَى النَّارِ، فَقُرِّبَ إِلَيْهِ خُبْزٌ وَأُدْمٌ مِنْ أُدْمِ الْبَيْتِ فَقَالَ: «أَلَمْ أَرَ الْبُرْمَةَ؟». فَقِيلَ: لَحْمٌ تُصُدِّقَ عَلَى بَرِيرَةَ، وَأَنْتَ لاَ تَأْكُلُ الصَّدَقَةَ قَالَ: «هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ، وَلَنَا هَدِيَّةٌ»[٢].

---

(١) بروانە: ٢٨٥٩.

(٢) بروانە: ٤٥٦.

## ١٩- باسی (دروستە) ئافرەتی ئازاد ژنی پیاوی کۆیلە بێت[١]

**٥٠٩٧- عائيشه ﵂ له بەریرەدا سێ سوونەت هەبوو ئازادبوو[٢] جا سەرپشك كرا، وه پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خاوەنداریێتی بۆ ئەو کەسەیە (کۆیلەکەی) ئازاد کردوە، وه پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشتە ژوورەوە و قابلەمەیەك[٣] بەسەر ئاگرەوە بوو، ئینجا لە پێ خۆری ماڵەوە نان و پێخۆریان نزیکی کردەوە، فەرمووی: ((ئەی قابلەمەکەم نەدی[٤]؟)) پێی وترا: ئەو گۆشتی خێرە دراوە بە بەریرە و تۆش گۆشتی خێر و زەکات ناخۆیت، فەرمووی: ((ئەو گۆشتە بۆ بەریرە زەکاتە، بەڵام بۆ ئێمە دیارییە)).**

## ٢٠- بابٌ لا يَتَزَوَّجُ أكْثَرَ مِنْ أرْبَعٍ

لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ﴿٣﴾ ﴾ النساء. وَقَالَ عَلِيُّ بْنُ الحُسَيْنِ: يَعْنِي مَثْنَى أَو ثُلَاثَ أَوْ رُبَاعَ. وَقَوْلُهُ تعالى: ﴿ أُوْلِيٓ أَجۡنِحَةٖ مَّثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۚ ﴿١﴾ ﴾ فاطر، يَعْنِي: مَثْنَى أَوْ ثُلَاثَ أَوْ رُبَاعَ.

٥٠٩٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﴿ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تُقۡسِطُواْ فِي ٱلۡيَتَٰمَىٰ ﴿٣﴾ ﴾ النساء. قَالَتِ: الْيَتِيمَةُ تَكُونُ عِنْدَ الرَّجُلِ وَهْوَ وَلِيُّهَا، فَيَتَزَوَّجُهَا عَلَى مَالِهَا، وَيُسِيءُ صُحْبَتَهَا، وَلاَ يَعْدِلُ فِي مَالِهَا، فَلْيَتَزَوَّجْ مَا طَابَ لَهُ مِنَ النِّسَاءِ سِوَاهَا مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ[٥].

---

(١) ئەگەر ئافرەتەکە ڕازی بوو.

(٢) عائيشه ﵂ ئازادی کرد.

(٣) گۆشتی کوڵاوی تیابوو.

(٤) بەسەر ئاگرەوە گۆشتی تیابوو.

(٥) بڕوانە: ٢٤٩٤.

## ٢٠- باسێک: (پیاو) دروست نییه له چوار ژن زیاتر ماره بکات

**به بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (دوو دوو یان سێ سێ یان چوار چوار (ژن ماره بکەن) ).**

**-عەلی کوڕی حوسەین دەڵێ: مانای ئایەتەکە: دوو دوو یان سێ سێ یان چوار چوار.**

**وه ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ( (فریشتەکان) خاوەنی (چەند جۆر) باڵن: دووان و سیان و چوار)، واته: دوو دوو یان سێ سێ یان چوار چوار.**

**٥٠٩٨-هیشام له باوکیەوه ئەویش له عائیشەوه ﷺ دەربارەی ئەم ئایەتە: (وه ئەگەر ترسان دادپەروەر نەبن له (مارەی) ئەو ئافرەته بێ باوکاندا (مارەیان مەکەن) )، عائیشه ﷺ دەڵێ: کچێکی هەتیوه لای پیاوێکه سەرپەرشتیاریەتی، جا مارەی دەکات لەبەر سامانەکەی، بەڵام به خراپی هاوڕێیەتی کچەکه دەکات له ماڵی (مارەییه) کەیدا دادگەر نییه لەگەڵیدا، ئەوه با جگه لەو کچه هەتیوه ئافرەتانی تر ماره بکات دوان یان سیان یان چوار.**

### ٢١ - بابٌ: ﴿وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِيٓ أَرۡضَعۡنَكُمۡ ﴿٢٣﴾﴾ النساء

وَيَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ

٥٠٩٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَتْهَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ عِنْدَهَا، وَأَنَّهَا سَمِعَتْ صَوْتَ رَجُلٍ يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِ حَفْصَةَ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذَا رَجُلٌ يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِكَ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أُرَاهُ فُلَانًا». لِعَمِّ حَفْصَةَ مِنَ الرَّضَاعَةِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: لَوْ كَانَ فُلَانٌ حَيًّا -لِعَمِّهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ- دَخَلَ عَلَيَّ؟ فَقَالَ: «نَعَمِ الرَّضَاعَةُ تُحَرِّمُ مَا تُحَرِّمُ الْوِلَادَةُ»[1].

---

(١) بڕوانه: ٢٦٤٦.

## ٢١- باسێک: (دەربارەی حوکمی شیر خواردن) (ئەو دایکانەتان کە شیریان پێ داوون)[١]

**ئەوەی بەرەچەڵەك حەرامە بووە بەشیر پێدانیش حەرام دەبێت.**

**٥٠٩٩- عەمرەی کچی عەبدورەحمان دەگێڕێتەوە کە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی ئەو (عائیشە) بوو، عائیشە گوێی لە دەنگی پیاوێك بوو داوای مۆڵەتی دەکرد بۆ چوونە ژوورەوە لە ماڵی حەفصە، عائیشە دەڵێ منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە پیاوێکە داوای مۆڵەت دەکات بێتە ماڵی تۆ، دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((وا بزانم فڵانە کەسە)) مەبەستی مامەی شیری حەفصە بوو، عائیشەش وتی: ئەگەر فڵانە کەس زیندوو بوایە (مەبەستی مامەی شیری خۆی بوو) بهاتایە بۆ ماڵی من (دروست بوو)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ دروست بوو بێگومان ئەوەی بە ڕەچەڵەك و لەدایك بوون حەرام بێت، بە شیر خواردنیش حەرام دەبێت)).**

٥١٠٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ أَلاَ تَزَوَّجُ ابْنَةَ حَمْزَةَ؟ قَالَ: «إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ». وَقَالَ بِشْرُ بْنُ عُمَرَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، سَمِعْتُ قَتَادَةَ، سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ زَيْدٍ مِثْلَهُ[٢].

**٥١٠٠-ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: بە پێغەمبەر ﷺ وت: بۆ کچی حەمزە ﵄ مارە ناکەیت؟ فەرمووی: ((بێگومان ئەو کچی برای شیریمە)).**

**بیشری کوڕی عومەر دەڵێ: شوعبە بۆی گێڕاینەوە وتی: لە قەتادەم بیست وتی: وێنەی ئەم فەرموودەیەم لە جابیری کوڕی زەید ﵁ بیست.**

---

(١) مارەکردنیان حەرامە بۆتان.

(٢) بڕوانە: ٢٦٤٥.

٥١٠١- حَدَّثَنَا الْحَكَمُ بْنُ نَافِعٍ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ زَيْنَبَ ابْنَةَ أَبِي سَلَمَةَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ بِنْتَ أَبِي سُفْيَانَ أَخْبَرَتْهَا أَنَّهَاقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، انْكِحْ أُخْتِي بِنْتَ أَبِي سُفْيَانَ فَقَالَ: "أَوَتُحِبِّينَ ذَلِكِ؟ ". فَقُلْتُ: نَعَمْ، لَسْتُ لَكَ بِمُخْلِيَةٍ، وَأَحَبُّ مَنْ شَارَكَنِي فِي خَيْرٍ أختِي. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "إِنَّ ذَلِكِ لَا يَحِلُّ لِي". قلْت: فَإِنَّا نحَدَّثُ أَنَّكَ تُرِيدُ أَنْ تَنْكِحَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ. قَالَ: "بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ؟ ". قلْتُ: نَعَمْ. فَقَالَ: "لَوْ أَنَّهَا لَمْ تَكُنْ رَبِيبَتِي فِي حَجْرِي مَا حَلَّتْ لِي، إِنَّهَا لَابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، أَرْضَعَتْنِي وَأَبَا سَلَمَةَ ثُوَيْبَةُ، فَلَا تَعْرِضْنَ عليَّ بَنَاتِكُنَّ وَلَا أَخَوَاتِكُنَّ". قَالَ عُرْوَةُ: وَثُوَيْبَةُ مَوْلَاةٌ لأبِي لَهَبٍ، كَانَ أَبُو لَهَبٍ أَعْتَقَهَا فَأَرْضَعَتِ النَّبِيَّ ﷺ، فَلَمَّا مَاتَ أَبُو لَهَبٍ أُرِيَهُ بَعْضُ أَهْلِهِ بِشَرِّ حِيبَةٍ، قَالَ لَهُ: مَاذَا لَقِيتَ؟ قَالَ أَبُو لَهَبٍ: لَمْ أَلْقَ بَعْدَكُمْ غَيْرَ أَنِّي سُقِيتُ فِي هذِه بِعَتَاقَتِي ثُوَيْبَةَ[1].

**٥١٠١- عوروەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە زەینەبی کچی ئەبی سەلەمە بۆی گێڕایەوە، کە ئوممو حەبیبەی کچی ئەبی سوفیان ﷺ بۆی گێڕایەوە، کە ئەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خوشکەکەم کە کچی ئەبی سوفیانە مارە بکە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەو کارەت پێ خۆشە؟)) منیش وتم بەڵێ: من بەتەنها هاوسەرت نیم[2] وە خۆشەویسترین، کەسێك هاوبەشم بێت لە چاکەدا خوشکەکەمە، پێغەمبەریش ﷺ فەمووی: ((بێگومان ئەوە دروست نییە بۆ من))، وتم: ئێمە لە نێوان خۆماندا دەڵێین تۆ دەتەوێ کچی ئەبی سەلەمە مارە بکەیت، فەرمووی: ((کچی ئوممی سەلەمە؟)) وتم بەڵێ، فەرمووی: ((ئەو کچە ئەگەر کۆڵەبەستم نەبوایە لە ماڵی خۆمدا حەڵاڵ نەبوو بۆم، بێگومان ئەو کچە (ی ئوممو سەلەمە) کچی برای شیریمە، سوەیبە شیری داوە بە من و ئەبی سەلەمە، کەواتە (لە مەولا) کچ و خوشکەکانتانم بۆ پێشنیار مەکەن)).**

(١) بڕوانە: ٥١٠٦، ٥١٠٧، ٥١٢٣، ٥٣٧٢.

(٢) واتە: هەوێی هەیە خۆی بەتەنها نییە کە هاوسەری ئەوە.

عورووه دەڵێ: سوەیبە کەنیزەکی ئەبی لەهەب بوو، ئەبو لەهەب ئازادی کرد بوو ئینجا شیری دا بە پێغەمبەر ﷺ، ئینجا کاتێ ئەبو لەهەب مرد کەسێك لە خزمانی لە خەودا ئەبو لەهەبی بینی بەحاڵێکی خراپەوە پێی وت: چیت تووش بووە؟ ئەبو لەهەب وتی: لەپاش ئێوە هیچ خۆشیەکم نەدیوە، تەنها بەڕێگەی ئائەمەوە[1] ئاوی خواردنەوەم پێ دراوە، بەهۆی ئازاد کردنم بۆ سوەیبە.

## ٢٢- بابُ مَنْ قالَ: لَا رَضَاعَ بَعْدَ حَوْلَيْنِ

لِقَوْلِهِ ﷻ: ﴿ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴿٢٣٣﴾ ﴾ البقرة. وَمَا يُحَرِّمُ مِنْ قَلِيلِ الرَّضَاعِ وَكَثِيرِهِ.

٥١٠٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَشْعَثِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا رَجُلٌ، فَكَأَنَّهُ تَغَيَّرَ وَجْهُهُ، كَأَنَّهُ كَرِهَ ذَلِكَ، فَقَالَتْ: إِنَّهُ أَخِي. فَقَالَ: «انْظُرْنَ مَا إِخْوَانُكُنَّ، فَإِنَّمَا الرَّضَاعَةُ مِنَ الْمَجَاعَةِ»[2].

## ٢٢- باسی ئەوەی دەڵێ: شیر خواردن پاش دوو ساڵ حوکمی شیر خواردنی نییە

بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (دوو ساڵی تەواو (ئەمە) بۆ کەسێکە کە بیەوێت شیری تەواو بدات)، وە ئەوەی لە کەم و زۆری شیر خواردن حەرامی دەکات.

٥١٠٢- عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ چوویە ژورەوە بۆ لای (عائیشە) و پیاوێکی لابوو وەك بڵێی ڕەنگی ڕووخساری گۆڕابوو، وە دیاربوو

---

(١) ئاماژەی کرد بۆ ئەو چاڵاییە لە ژێر پەنجە گەورەی دایە، یا لە نێوان پەنجە گەورە و پەنجەی تەنشتیدا.

(٢) بڕوانە: ٢٦٤٧.

**ئەوەی پێ ناخۆش بوو، بۆیە عائیشەش وتی: ئەمە برامە، پێغەمبەریش فەرمووی: ((بڕوانن برایانتان کێن؟ چونکە بێگومان شیردان لە برسێتیدا دەبێت)) [١].**

## ٢٣- باب لَبَنِ الفَحْلِ

٥١٠٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ أَفْلَحَ أَخَا أَبِي الْقُعَيْسِ جَاءَ يَسْتَأْذِنُ عَلَيْهَا -وَهْوَ عَمُّهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ- بَعْدَ أَنْ نَزَلَ الْحِجَابُ، فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ، فَلَمَّا جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَخْبَرْتُهُ بِالَّذِى صَنَعْتُ، فَأَمَرَنِي أَنْ آذَنَ لَهُ[٢].

## ٢٣- باسی شیری پیاو[٣]

**٥١٠٣- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە ئەفلەحی برای ئەبی لقوعەیس هات و مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی خواست بۆ لای عائیشە ﵂ - کە مامی عائیشە بوو لە شیرەوە- پاش ئەوە حوکمی حیجاب دابەزیبوو، منیش ڕێگر بووم لەوەی کە مۆڵەتی پێ بدەم، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە و هەواڵم پێدا کە چیم کردوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردم کە مۆڵەتی بدەم.**

## ٢٤- بابُ شَهَادَةِ المُرْضِعَةِ

٥١٠٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي عُبَيْدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الْحَارِثِ -قَالَ: وَقَدْ سَمِعْتُهُ

---

(١) واتە: منداڵەکە لەکاتی شیرخواردندا برسی بێت، وە تەنها شیر بخوات و تەمەنی لە دوو ساڵ زیاتر نەبێت.
(٢) بڕوانە: ٢٦٤٤.
(٣) مێردی ئافرەتە شیردەرەکە.

مِنْ عُقْبَةَ لَكِنِّي لِحَدِيثِ عُبَيْدٍ أَحْفَظُ- قَالَ: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً، فَجَاءَتْنَا امْرَأَةٌ، سَوْدَاءُ فَقَالَتْ: أَرْضَعْتُكُمَا. فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: تَزَوَّجْتُ فُلاَنَةَ بِنْتَ فُلاَنٍ، فَجَاءَتْنَا امْرَأَةٌ سَوْدَاءُ فَقَالَتْ لِي: إِنِّي قَدْ أَرْضَعْتُكُمَا. وَهْيَ كَاذِبَةٌ، فَأَعْرَضَ، فَأَتَيْتُهُ مِنْ قِبَلِ وَجْهِهِ، قُلْتُ: إِنَّهَا كَاذِبَةٌ. قَالَ: «كَيْفَ بِهَا وَقَدْ زَعَمَتْ أَنَّهَا قَدْ أَرْضَعَتْكُمَا؟! دَعْهَا عَنْكَ» وَأَشَارَ إِسْمَاعِيلُ بِإِصْبَعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى يَحْكِي أَيُّوبَ[1].

## ٢٤- باسی شایەتی دانی ئافرەتی شیردەر

**٥١٠٤-عەبدوڵلای کوڕی ئەبی مولەیکە دەڵێ: عوبەیدوڵلای کوڕی ئەبی مەریەم بۆی گێڕامەوە لە عوقبەی کوڕی حاریسەوە - (عەبدوڵلای کوڕ ئەبی مولەیکە) وتی: بێگومان ئەم فەرموودەم لە عوقبەش بیستووە بەڵام فەرموودەکەی عوبەیدوڵلام چاکتر لەبەرە - دەڵێ [2]: ئافرەتێکم مارە کرد و هێنام، ئینجا ئافرەتێکی ڕەش پێست هات بۆ لامان و وتی: من شیرم داوە بە هەردووکتان [3]، منیش هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتم فلانە ئافرەتی کچی فلانە کەسم مارە کردوە، ئینجا ئافرەتێکی ڕەش پێست هات بۆ لامان و وتی بە من: بێگومان من شیرم داوە بە هەردووکتان کە درۆ دەکات، پێغەمبەریش ﷺ ڕووی لێ وەرچەرخاندم ئینجا ڕوو بە ڕووی چوومەوە خزمەتی وتم: بێگومان درۆ دەکات فەرمووی: ((تۆ چی دەکەیت بەو ئافرەتە کە بێگومان ئەو ژنە دەڵێ: شیری داوە بە هەردووکتان؟ وازی لێ بێنە)).**

**(عەلی مەدینی دەڵێ:) ئیسماعیل بە پەنجەی شایەتوومان و ناوەڕاستی ئاماژەی کرد کە ئاماژەکەی ئەییوبی گێڕایەوە [4].**

---

(١) بڕوانە: ٨٨.

(٢) عوقبەی کوڕی حاریس دەڵێ.

(٣) بە عوقبە و ژنەکەی.

(٤) تا دەگاتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ کە ئەویش بەو دوو پەنجەی ئاماژەی کرد و بە زمانی فەرمووی: وازی لێ بێنە، ئیتر هەموو ڕاویەک ئەوەی گێراوەتەوە.

## ٢٥- بابُ مَا يَحِلُّ مِنَ النِّسَاءِ وَمَا يَحْرُمُ

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ ﴿٢٣﴾ ﴾ إِلَى آخِرِ الآيَتَيْنِ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٢٤﴾ ﴾ النساء. وَقَالَ أَنَسٌ: ﴿ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ﴿٢٤﴾ ﴾ النساء. ذَوَاتُ الأَزْوَاجِ الحَرَائِرُ حَرَام. ﴿ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ﴿٢٤﴾ ﴾ النساء. لَا يَرَى بَأْسًا أَنْ يَنْزِعَ الرَّجُلُ جَارِيَتَهُ مِنْ عَبْدِهِ. وَقَالَ ﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ﴿٢٢١﴾ ﴾ البقرة. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: مَا زَادَ على أَرْبَعٍ فَهْوَ حَرَامٌ، كَأُمِّهِ وَابْنَتِهِ وَأُخْتِهِ.

٥١٠٥ - وَقَالَ لَنَا أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ سُفْيَانَ، حَدَّثَنِي حَبِيبٌ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: حَرُمَ مِنَ النَّسَبِ سَبْعٌ، وَمِنَ الصِّهْرِ سَبْعٌ. ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ ﴿٢٣﴾ ﴾ الآيَةَ: النساء.

وَجَمَعَ عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ بَيْنَ ابْنَةِ عَلِيٍّ وَامْرَأَةِ عَلِيٍّ. وَقَالَ ابْنُ سِيرِينَ: لاَ بَأْسَ بِهِ. وَكَرِهَهُ الْحَسَنُ مَرَّةً ثُمَّ قَالَ: لاَ بَأْسَ بِهِ. وَجَمَعَ الْحَسَنُ بْنُ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ بَيْنَ ابْنَتَيْ عَمٍّ فِي لَيْلَةٍ، وَكَرِهَهُ جَابِرُ بْنُ زَيْدٍ لِلْقَطِيعَةِ، وَلَيْسَ فِيهِ تَحْرِيمٌ لِقَوْلِهِ تَعَالَى ﴿ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ ﴿٢٤﴾ ﴾ النساء. وَقَالَ عِكْرِمَةُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: إِذَا زَنَى بِأُخْتِ امْرَأَتِهِ لَمْ تَحْرُمْ عَلَيْهِ امْرَأَتُهُ. وَيُرْوَى عَنْ يَحْيَى الْكِنْدِيِّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ وَأَبِي جَعْفَرٍ، فِيمَنْ يَلْعَبُ بِالصَّبِيِّ: إِنْ أَدْخَلَهُ فِيهِ فَلاَ يَتَزَوَّجَنَّ أُمَّهُ، وَيَحْيَى هَذَا غَيْرُ مَعْرُوفٍ، لَمْ يُتَابَعْ عَلَيْهِ. وَقَالَ عِكْرِمَةُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: إِذَا زَنَى بِهَا لَمْ تَحْرُمْ عَلَيْهِ امْرَأَتُهُ. وَيُذْكَرُ عَنْ أَبِي نَصْرٍ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ

حَرَّمَهُ. وَأَبُو نَصْرٍ هَذَا لَمْ يُعْرَفْ بِسَمَاعِهِ مِنِ ابْنِ عَبَّاسٍ. وَيُرْوَى عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، وَجَابِرِ بْنِ زَيْدٍ، وَالْحَسَنِ، وَبَعْضِ أَهْلِ الْعِرَاقِ: تَحْرُمُ عَلَيْهِ. وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: لاَ تَحْرُمُ حَتَّى يُلْزِقَ بِالأَرْضِ. يَعْنِي: يُجَامِعَ. وَجَوَّزَهُ ابْنُ الْمُسَيَّبِ وَعُرْوَةُ وَالزُّهْرِيُّ. وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: قَالَ عَلِيٌّ: لاَ تَحْرُمُ. وَهَذَا مُرْسَلٌ.

## ٢٥- باسی ئەو ئافرەتانەی مارەکردنیان حەڵاڵە و ئەوانەشیان کە مارەکردنیان حەرامە

**وەئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (قەدەغە کراوە لەسەرتان (مارەکردنی) دایکانتان و کچەکانتان و خوشکەکانتان و پورەکانتان[1] پورەکانتان[2] و کچانی برا و کچانی خوشك) تا کۆتای هەردوو ئایەتەکە، تا ئەم فەرمایشتە (بەڕاستی خودا هەمیشە زانای کار دروستە).**

**-ئەنەس ﷺ دەڵێ: (وە (حەرامکراوە لێتان) ئەو ئافرەتانەی مێردیان هەیە)، مەبەست: ئەو ئافرەتە ئازادانەیە مێردیان هەیە حەرامن لێتان (جگە لەوانەی کە بوونەتە موڵکتان (کەنیزەك) )، بەلایەوە هیچ خراپەیەکی تیا نییە کە پیاو کەنیزەکەکەی لە کۆیلەکەی بسەنێتەوە (و خۆی مارەی کات) [3]، وە خوا دەفەرموێ: (ژنانی هاوبەش پەیداکەر مارە مەکەن تا بڕوا دەهێنن).**

**-ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: لە چوار هاوسەر زیاتر حەرامە (بۆ پیاو)، وەك دایکی و کچی و خوشکی خۆی وان.**

---

(١) پیاوێک کچ و ژنی پیاوێکی تر هاوسەری بن، ئەگەر کچەکە کچی ژنەکە نەبێت بەڵکو لە ژنێکی تری پیاوەکە بێت.

(٢) کە خوشکی دایکتانن.

(٣) بەڵام زۆربەی زانایان ڕایان وایە مەبەست بەوە ئەو ئافرەتانەیە کە بەدیلی گیراون و مێردیان هەیە، لە (دار الکفر)ـدا ئەو ئافرەتانە حەڵاڵن بۆ جەنگاوەرە موسڵمانەکان. **بڕوانە : إرشاد الساری: ١١/٣٨٤.**

**٥١٠٥- سەعید لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: بەهۆی ڕەچەڵەکەوە حەوت جۆر ئافرەت (مارەکردنیان) حەرامە، وە بە هۆی ژن و ژن خوازیشەوە حەوت جۆر ئافرەت (مارەکردنیان) حەرامە، لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (قەدەغە کراوە لەسەرتان (مارەکردنی) دایکانتان) تا کۆتایی ئایەتەکە.**

**-عەبدوڵلای کوڕی جەعفەر (زەینەبی) کچی عەلی و هاوسەری عەلی ﷺ هەردووکیان (وەك هاوسەری خۆی) پێکەوە کۆ کردبوویەوە[1].**

**-ئیبنو سیرین دەڵێ: ئەوە هیچ تیا نییە قەیناکات[2]. بەڵام حەسەن (ی بەصری) جارێ بەنا پەسەندی دانا، وە لە پاشان وتی: هیچ خراپەیەکی تیا نییە.**

**-حەسەنی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی لە شەوێکدا دوو کچی ئامۆزای یەکتری وەك هاوسەری خۆی کۆکردۆتەوە.**

**-ئەو (کارەی حەسەن) جابیر کوڕی زەید بەلایەوە ناپەسەند بووە لەبەر پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی نێوانیان، هیچ حەرامیەکی تیا نییە بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە بێجگە لەوانە (کەباسکران حەرامن) هەمووی حەڵاڵە بۆتان).**

**-عیکریمە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەگەر پیاوێ زینای کرد لەگەڵ خوشکی هاوسەرەکەیدا، هاوسەرەکەی حەرام نابێت لەسەری.**

**-وە گێڕدراوتەوە لە یەحیای کیندیی یەوە ئەویش لە شەعبیی و ئەبی جەعفەرەوە دەربارەی هەر پیاوێك یاری بکات لەگەڵ مێرد منداڵێکدا، ئەگەر چووکی بردە ناو**

---

(١) واتە: ئەو ئافرەتە کە دەکاتە کۆکردنەوەی ژن و کچی پیاوێک لای پیاوێکی تر، لە کاتێکدا دایکی و کچی یەکتری نین بەڵکو کچ و باوەژنن.

(٢) پیاوێك ژن و کچی پیاوێکی تر مارە بکات کە ژنکە باوەژنی کچەکەیە نەك دایکی. **بڕوانە : إرشاد الساري:** ٣٨٥/١١.

**پاشیەوە ئەوە ئەو پیاوە نابێت دایکی ئەو مێرد منداڵە مارە بکات، ئەم یەحیا ناوە، ناسراو نییە و کەسی تر پاڵپشتی گێڕانەوەکەی نەکردوە لە شەعبیەوە.**

**-عیکریمە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەگەر پیاوێ زینای کرد لەگەڵ دایکی هاوسەرەکەیدا، هاوسەرەکەی حەڕام نابێت لێی.**

**-وە گێڕدراوەتەوە لە ئەبی نەصرەوە کە ئیبنو عەباس (ئەوەی پێشووی) حەڕام کردوە [1] وە ئەو ئەبو نەصر ناوەش زانراو نییە کە هیچ لە ئیبنو عەبباس بیستبێت.**

**-وە گێڕدراوەتەوە لە عیمرانی کوڕی حوصەین و جابری کوڕی زەید و حەسەن و هەندێ لە زانایانی عێراق هەریەکەیان دەڵێ: حەرام دەبێت لەسەر مێردەکەی.**

**-وە ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: هاوسەرەکەی حەرام نابێت لەسەری تا نەنوسێ بەزەویدا، واتە لەگەڵی جووت ببێت.**

**-ئیبنو موسەییەب و عوروە ڕێگەیان داوە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بمێنێتەوە [2].**

**-زوهری دەڵێ: عەلی (ی کوڕی ئەبی تالیب) ﷺ دەڵێ: لەسەری حەڕام نابێت.**

**٢٦- ﴿ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ ﴿٢٣﴾ ﴾ النساء**

وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: الدُّخُولُ وَالْمَسِيسُ وَاللِّمَاسُ هُوَ الجِمَاعُ. وَمَنْ قَالَ: بَنَاتُ وَلَدِهَا مِنْ بَنَاتِهَا (من بناتها)[3] فِي التَّحْرِيمِ؛ لِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ لأُمِّ حَبِيبَةَ: "لَا تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ". وَكَذَلِكَ حَلَائِلُ وَلَدِ الأَبْنَاءِ هُنَّ حَلَائِلُ الأَبْنَاءِ، وَهَلْ تُسَمَّى الرَّبِيبَةَ. وَإِنْ لَمْ تَكُنْ فِي حَجْرِهِ؟ وَدَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ رَبِيبَةً لَهُ إِلَى مَنْ يَكْفُلُهَا، وَسَمَّى النَّبِيُّ ﷺ ابن ابنتِهِ ابنا.

---

(١) ئەگەر زینا بکات لەگەڵ دایکی هاوسەرەکەیدا.

(٢) ئەو پیاوەی زینای کردبێ لەگەڵ دایکی هاوسەریدا.

(٣) لە نوسخەیەکی صەحیحی بوخاریدا بەو جۆرە هاتووە ( هُنَّ مِنْ بَناتِها) واتە: حوکمی وەك حوکمی کچی خۆی وایە. بڕوانە: **بڕوانە : إرشاد الساری: ١١/**

٥١٠٦- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ زَيْنَبَ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ لَكَ فِي بِنْتِ أَبِي سُفْيَانَ؟ قَالَ: «فَأَفْعَلُ مَاذَا؟». قُلْتُ: تَنْكِحُ. قَالَ: «أَتُحِبِّينَ؟». قُلْتُ: لَسْتُ لَكَ بِمُخْلِيَةٍ، وَأَحَبُّ مَنْ شَرِكَنِي فِيكَ أُخْتِي. قَالَ: «إِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لِي». قُلْتُ: بَلَغَنِي أَنَّكَ تَخْطُبُ. قَالَ: «ابْنَةَ أُمِّ سَلَمَةَ». قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: «لَوْ لَمْ تَكُنْ رَبِيبَتِي مَا حَلَّتْ لِي، أَرْضَعَتْنِي وَأَبَاهَا ثُوَيْبَةُ، فَلاَ تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ وَلاَ أَخَوَاتِكُنَّ». وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ: دُرَّةُ بِنْتُ أَبِي سَلَمَةَ[1].

## ٢٦- باسێک: (وە کچانی ژنانتان کە لە مێردی تریان بن ئەوانەی کە لە ماڵی ئێوەدا دەژین، لەو ژنانەتانن کە چوونەتە لایان)

**-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئەم ووشانە: (الدُّخُولُ) و (الْمَسِيسُ) و (اللِّمَاسُ) بەمانای جووت بوون و چوونە لای ژنە و هاوسەرە.**

**-ئەو کەسەی کە دەڵێ: کچی کوڕی ژن وەك کچی خوودی ژنەکە وایە لە حەرامی (مارەکردن) دا، بە بەلگەی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بەئوممو حەبیبەی فەرموو: ((کچەکانتانم بۆ پێشنیار مەکەن (مارەیان کەم) )).**

**هەروەها هاوسەری کوڕی کوڕ وەکو هاوسەر کوڕ وایە (لە حەرامی مارەکردندا)، وە ئایا پێی دەوترێت کوڵە بەس با لە ماڵی مێردی دایکیشیدا نەبێت[2].**

**-پێغەمەبەر ﷺ کۆڵە بەسێکی خۆی دا بە لای کەسێکە دەسبەری و سەرپەرشتی بکات.**

**-وە پێغەمبەر ﷺ کوڕی کچی خۆی بە کوڕی خۆی ناو بردووە.**

---

(١) بڕوانە: ٥١٠١.

(٢) زۆربەی زانایان دەڵێن پێی دەوترێت (الربيبة) کۆلبەس لە ماڵیدا بێت یان نەبێت، بەڵام عەلی و عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێن: ئەگەر کۆلەبەس لە ماڵی مێردی دایکی دا نەبوو حەرام نابێ.

**٥١٠٦-زەینەب لە ئوممو حەبیبەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا حەزت لە کچی ئەبی سوفیان هەیە؟ فەرمووی: ((چی بکەم؟)) وتی: مارەیکەو بیهێنە، فەرمووی: ((پێت خۆشە؟))، وتم: من بەتەنها خێزانی تۆ نیم [1]، وە خۆشەویسترین کەسێك پێم خۆشە هاوبەشم بێت دەربارەی تۆ [2] خوشکەکەمە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەو خوشکەت حەڵاڵ نییە بۆ من))، وتم: پێم گەیشتووە تۆ خوازبێنی ئافرەت دەکەیت (بۆ خۆت)، فەرمووی: ((کچی ئوممو سەلەمە دەڵێی؟)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((ئەگەر کۆلەبەسیشم نەبوایە حەڵاڵ نەبوو بۆم، سوەیبە شیری داوە بە من و باوکی (ئەو کچە)، دەی کەوابوو کچەکانتان وخوشکەکانتان پێشنیار مەکەن بۆم (مارەیان بکەم) ))، لەیس دەڵێ: هیشام بۆی گێڕاینەوە (کە ناوی ئەو کچە) دوڕڕەی کچی ئەبی سەلەمە بوو.**

## ٢٦- بابٌ ﴿وَأَن تَجۡمَعُواْ بَيۡنَ ٱلۡأُخۡتَيۡنِ إِلَّا مَا قَدۡ سَلَفَۗ ﴿٢٣﴾﴾ النساء

٥١٠٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ أَخْبَرَهُ، أَنَّ زَيْنَبَ ابْنَةَ أَبِي سَلَمَةَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، انْكِحْ أُخْتِي بِنْتَ أَبِي سُفْيَانَ. قَالَ: «وَتُحِبِّينَ». قُلْتُ: نَعَمْ، لَسْتُ بِمُخْلِيَةٍ، وَأَحَبُّ مَنْ شَارَكَنِي فِي خَيْرٍ أُخْتِي. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ ذَلِكَ لاَ يَحِلُّ لِي». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَوَاللهِ إِنَّا لَنَتَحَدَّثُ أَنَّكَ تُرِيدُ أَنْ تَنْكِحَ دُرَّةَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ. قَالَ: «بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ». فَقُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: «فَوَاللهِ لَوْ لَمْ تَكُنْ فِي حَجْرِي مَا حَلَّتْ لِي، إِنَّهَا لاَبْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، أَرْضَعَتْنِي وَأَبَا سَلَمَةَ ثُوَيْبَةُ، فَلاَ تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ وَلاَ أَخَوَاتِكُنَّ»[3].

---

(١) واتە: هەوێم هەیە، تۆ هاوسەری ترت جگە لە من هەیە.

(٢) ببێتە هاوسەری تۆ لەگەڵ مندا.

(٣) بڕوانە: ٥١٠١.

## ٢٧- باسێک: (وە (قەدەغە کراوە لەسەرتان) کۆکردنەوەتان لە نێوان دووخوشک (لە مارەکردن)دا، مەگەر ئەوەی پێش (ئەم حوکمە لە نەفامیدا) کرابێ)

**٥١٠٧-زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە دەڵێ: ئوممو حەبیبە ﵂ بۆی گێڕایەوە و وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا: کچی ئەبی سوفیانی خوشکم مارە بکە، فەرمووی: ((حەز دەکەیت؟)) وتم: بەڵێ، چونکە تەنها من هاوسەری تۆ نیم، بۆیە خۆشەویسترین کەس کە پێم خۆش بێ هاوبەشم بێت لە چاکەدا خوشکمە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەو کارە بۆ من دروست نیە))ك وتم: ئەی پێغەمبەری خوا دەی سوێند بەخوا ئێمە لەناو خۆماندا دەڵێین: کە تۆ دەتەوێ دوڕڕەی کچی ئەبو سەلەمە مارە بکەیت، فەرمووی: ((کچی ئوممو سەلەمە؟)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((دەی سوێند بەخوا ئەگەر ئەو کچە لە ماڵی منیشدا نەبوایە حەڵاڵ نەبوو بۆم، بێگومان ئەو کچە برازای شیری منە، چونکە سووەیبە شیری داوە بە من و ئەبو سەلەمە، کەواتە ئیتر کچەکانتان و خوشکەکانتان پێشنیار مەکەن بۆم (مارەیان بکەم) )).**

## ٢٨- بابٌ لَا تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا

٥١٠٨- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا عَاصِمٌ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، سَمِعَ جَابِرًا ﵁ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تُنْكَحَ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا أَوْ خَالَتِهَا. وَقَالَ دَاوُدُ وَابْنُ عَوْنٍ عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

## ٢٨- باسێک: ئافرەت بەسەر پوریدا[1] مارە ناکرێت (بۆ پیاوێک)

**٥١٠٨-جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد کە ئافرەت مارە بکرێت بەسەر پوریدا (خوشکی باوکی)، یان بەسەر پوریدا (خوشکی دایکی)[2].**

**-داوود و ئیبنو عەون لە شەعبی یەوە لە ئەبی هورەیرە ﷺ ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە [3]**

٥١٠٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺقَالَ: «لاَ يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَلاَ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا»[4].

**٥١٠٩-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئافرەت و پورەکەی کۆناکرێتەوە (لای پیاوێك)، جا خوشکی باوك بێت یان خوشکی دایك)).**

٥١١٠- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي قَبِيصَةُ بْنُ ذُؤَيْبٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ تُنْكَحَ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا وَالْمَرْأَةُ وَخَالَتُهَا. فَنُرَى خَالَةَ أَبِيهَا بِتِلْكَ الْمَنْزِلَةِ[5].

**٥١١٠-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد ژن مارە بکرێت بەسەر پورەکەیدا (کە خوشکی باوکێتی)، وە بەسەر پورەکەیدا (کە خوشکی دایکێتی) )).**

**(زوهری دەڵێ) ئێمە پوری باوکی ئافرەتەکەش هەر ئەو پلەیەی هەیە لامان[6].**

---

(١) پورە کە خوشکی باوک بێت یان خوشکی دایک.

(٢) بە پێچەوانەشەوە دروست نییە: نابێ ئافرەت مارە بکرێت بەسەر خوشکەزا و برازای خۆیدا.

(٣) ئەمە سەنەد و ڕێگای دووەم بۆ فەرموودەکە لە ڕێگەی ئەبو هورەیرەوە ﷺ.

(٤) بڕوانە: ٥١٠٨.

(٥) بڕوانە: ٥١٠٨.

(٦) واتە: بەلای زوهریەوە دروستە نیە پوری باوکی ئافرەتەکە لەگەڵ ئافرەتەکەدا ژنی پیاوێ بن، یان ئەگەر یەکێکیان ژنی بوو نابێ ئەوەی کەیان مارە بکات.

٥١١١- لِأَنَّ عُرْوَةَ حَدَّثَنِي، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: حَرِّمُوا مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ[1].

**٥١١١- چونکە عوروە بۆی گێڕامەوە لە عائیشەوە ﵂ وتی: ئەوەی بەڕەچەڵەك حەرام دەبێت (مارەکردنی) ئێوە بە شیر خواردنیش حەرامی بکەن.**

## ٢٩- بابُ الشِّغَارِ

٥١١٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الشِّغَارِ، وَالشِّغَارُ أَنْ يُزَوِّجَ الرَّجُلُ ابْنَتَهُ عَلَى أَنْ يُزَوِّجَهُ الآخَرُ ابْنَتَهُ، لَيْسَ بَيْنَهُمَا صَدَاقٌ[2].

## ٢٩- باسی ژن بە ژن

**٥١١٢-ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ژن بە ژنی قەدەغە کردوە، (الشِّغَارُ) ئەوەیە پیاوێك کچەکەی مارە بکات بۆ پیاوێك، بە مەرجێ پیاوەکەی بەرانبەریشی کچەکەی مارە بکات لەم پیاوە لە نێوانیاندا مارەیی نەبێت (بۆ کچەکان)[3].**

## ٣٠- بابٌ هَلْ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَهَبَ نَفْسَهَا لِأَحَدٍ؟

٥١١٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَامٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ كَانَتْ خَوْلَةُ بِنْتُ حَكِيمٍ مِنَ اللَّائِي وَهَبْنَ أَنْفُسَهُنَّ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: أَمَا تَسْتَحِي الْمَرْأَةُ أَنْ

---

(١) بڕوانە: ٢٦٤٤.

(٢) بڕوانە: ٦٩٦٠.

(٣) بەڵکو هەر وەک گۆڕینەوە دوو کچەکە و هیچی تر.

تَهَبَ نَفْسَهَا لِلرَّجُلِ؟ فَلَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ تُرْجِى مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ ﴾ الأحزاب. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَرَى رَبَّكَ إِلاَّ يُسَارِعُ فِي هَوَاكَ.

رَوَاهُ أَبُو سَعِيدٍ الْمُؤَدِّبُ، وَمُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ، وَعَبْدَةُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ. يَزِيدُ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ[1].

## ٣٠- باسێک: ئایا دروسته بۆ ئافرەت خۆی ببەخشێت بە پیاوێک؟

**٥١١٣-هیشام لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: خەولەی کچی حەکیم لەو ئافرەتانە بوو کە خۆیان بەخشی بە پێغەمبەر ﷺ، عائیشەش ﷺ وتی: دەی ئایا ئافرەت شەرم ناکات کە خۆی دەبەخشێت بە پیاو؟ ئینجا کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ تُرْجِى[2] مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ ﴾ واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ سەرەی هەر یەکێ لە خێزانەکانت ویست دوای بخە)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا وا بزانم ئەوەی حەزت لێی بوو پەروەردگارت زوو بۆی بەدی هێناوی.**

**- (ئەم فەرموودەیە) هەریەك لە ئەبو سەعیدی موئەددیب و موحەممەدی کوڕی بیشر و عەبدە لە هیشامەوە گێڕاویانەتەوە لە باوکیەوە ئەویش لە عائیشەوە ﷺ، هەندێکیان لە گێڕانەوەکەیدا زیادەی هەیە لە هەندێکیان.**

## ٣١- بابُ نِكَاحِ المُحْرِمِ

٥١١٤- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، أَخْبَرَنَا عَمْرٌو، حَدَّثَنَا جَابِرُ بْنُ زَيْدٍ قَالَ: أَنْبَأَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: تَزَوَّجَ النَّبِيُّ ﷺ وَهْوَ مُحْرِمٌ[3].

---

(١) بڕوانە: ٤٧٨٨.

(٢) بەشێک لە قورئان خوێنەکان بە ﴿ تُرجِئُ ﴾ خوێندوویانەتەوە بەشێکی تریان بە ﴿ تُرجی ﴾ خوێندوویانەتەوە.

(٣) بڕوانە: ١٨٣٧.

## ٣١- باسی ژن مارەکردنی ئیحرامدار[١]

**٥١١٤-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ژنی مارە کرد لە کاتێکدا لە ئیحرامدا بوو[٢].**

## ٣٢- بابُ نَهْيِ النبي ﷺ عَنْ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ أخيرًا

٥١١٥- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ أَنَّهُ سَمِعَ الزُّهْرِيَّ يَقُولُ: أَخْبَرَنِي الْحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ وَأَخُوهُ عَبْدُ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِمَا، أَنَّ عَلِيًّا ﷺقَالَ لِابْنِ عَبَّاسٍ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُتْعَةِ وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ زَمَنَ خَيْبَرَ[٣].

## ٣٢- باسی پێغەمبەری خوا ﷺ دواجار سیغەکردنی قەدەغە کرد[٤]

**٥١١٥-حەسەنی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی و عەبدوڵڵای برای لە باوکیانەوە گێڕایانەوە کە عەلی ﷺ بە ئیبنو عەبباس ﷺ وت: بێگومان پێغەمبەر ﷺ سیغە و گۆشتی کەری ماڵی قەدەغەکرد لە کاتی (غەزای) خەیبەردا.**

٥١١٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي جَمْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ سُئِلَ عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاءِ فَرَخَّصَ، فَقَالَ لَهُ مَوْلًى لَهُ: إِنَّمَا ذَلِكَ فِي الْحَالِ الشَّدِيدِ وَفِي النِّسَاءِ قِلَّةٌ أَوْ نَحْوَهُ. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ نَعَمْ.

---

(١) واتە کەسێک لە ئیحرامی حەج یان عومرەدا بێت و ژن مارەبکات.

(٢) بە ئیحرامی عومرەوە مەیموونەی خێزانی مارەکرد، کە ئیحرامی شکاند چووە لای، (إرشاد الساري: ٣٩٦/١١) بەڵام جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە دروست نییە، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەی موسلیم گێڕاویەتیەوە (لاَ يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ، وَلاَ يُنْكَحُ، وَلاَ يَخْطُبُ) بە ژمارە (٣٤٤٦).

(٣) بڕوانە: ٤٢١٦.

(٤) واتە کۆتا بڕیاری حەرام کردنی سیغە بوو.

**٥١١٦-ئەبو جەمرە دەڵێ: لە ئیبنو عەبباسم ﷻ بیست کە پرسیاری سیغەکردن لەگەڵ ئافرەتانی لێ کرا، ئیبنو عەبباس ڕێگەی دا بکرێ، ئینجا غوڵامێکی خۆی پێ وت: بێگومان ئەو ڕێگە دانە لە کاتی بەهێز و زاڵی ئارەزوودا بوو، ئافرەتەکانیش کەم بوون[1] -یان وتەی لەو جۆرە - ئیبنو عەبباسیش وتی: بەڵێ وایە.**

٥١١٧- ٥١١٨- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ عَمْرٌو: عَنِ الْحَسَنِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ وَسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالاَ: كُنَّا فِي جَيْشٍ فَأَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّهُ قَدْ أُذِنَ لَكُمْ أَنْ تَسْتَمْتِعُوا فَاسْتَمْتِعُوا».

**٥١١٧- ٥١١٨- جابیری کوڕی عەبدوڵلا و سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷻ هەردووکیان دەڵێن: ئێمە لە لەشکرێکدا بووین و پێغەمبەری خواش ﷺ هات بۆ لامان و فەرمووی: ((بێگومان مۆڵەت دراون کە سیغە بکەن، کەواتە سیغە بکەن)).**

٥١١٩- وَقَالَ ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، حَدَّثَنِي إِيَاسُ بْنُ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّمَا رَجُلٍ وَامْرَأَةٍ تَوَافَقَا فَعِشْرَةُ مَا بَيْنَهُمَا ثَلاَثُ لَيَالٍ، فَإِنْ أَحَبَّا أَنْ يَتَزَايَدَا أَوْ يَتَتَارَكَا تَتَارَكَا». فَمَا أَدْرِي أَشَيْءٌ كَانَ لَنَا خَاصَّةً أَمْ لِلنَّاسِ عَامَّةً. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: وَبَيَّنَهُ عَلِيٌّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ مَنْسُوخٌ.

**٥١١٩- سەلەمەی کوڕی ئەکوەع لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر ژن و پیاوێك (لەسەر مارەکردن بەڕەهایی) ڕێککەوتن، ئەوە سێ شەو ماوەی هەڵس وکەوت سەرجێی نێوانیانە، ئینجا ئەگەر حەزیان کرد ماوەکە زیاد دەکەن (با زیادی کەن)، یان واز لەیەکتری بێنن واز بێنن)) (سەلەمەی کوڕی ئەکوەع دەڵێ:) جا نازانم ئەمە شتێکە تایبەتە بەئێمەوە یان بۆ هەموو خەڵکە بەگشتی.**

(١) لە گێڕانەوەیەکی بوخاریدا ئەوە لە کاتی جیهاددا بووە ئافرەتیش کەم بووە (إرشاد الساري: ٣٩٨/١١)

**ـئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: عەلی لەسەر زمانی پێغەمبەرەوە ﷺ ڕوونی کردەوە کە ئەو (سیغە کردنە) سڕاوەتەوە (حەرام کراوە).**

## ٣٣- بابُ عَرْضِ المَرْأَةِ نَفسَهَا عَلى الرَّجُلِ الصَّالِحِ

٥١٢٠- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا مَرْحُومٌ قَالَ: سَمِعْتُ ثَابِتًا الْبُنَانِيَّ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ أَنَسٍ وَعِنْدَهُ ابْنَةٌ لَهُ، قَالَ أَنَسٌ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ تَعْرِضُ عَلَيْهِ نَفْسَهَا، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَكَ بِي حَاجَةٌ؟ فَقَالَتْ بِنْتُ أَنَسٍ: مَا أَقَلَّ حَيَاءَهَا وَاسَوْأَتَاهْ وَاسَوْأَتَاهْ! قَالَ: هِيَ خَيْرٌ مِنْكِ، رَغِبَتْ فِي النَّبِيِّ ﷺ فَعَرَضَتْ عَلَيْهِ نَفْسَهَا[1].

## ٣٣- باسی ئافرەت (بەخشینی) خۆی پێشنیار بکات بۆ پیاوی چاک

**٥١٢٠-سابیتی بونانی دەڵێ: من لای ئەنەس بووم ﷺ کچێکی خۆی لابوو، ئەنەس وتی: ئافرەتێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، خۆی بۆ پێغەمبەر ﷺ پێشنیار کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا پێویستیت بە من هەیە (مارەم کەیت)؟ کچەکەی ئەنەسیش وتی: چەند بێ شەرمە ئای چەند کارێکی ناشیرینە، ئای چەند کارێکی ناشرینە! (ئەنەس) وتی پێی: ئەو ئافرەتە لە تۆ چاکترە حەزی لێیە (هاوسەری) پێغەمبەر بێ ﷺ، بۆیە خۆی بۆ پێشنیار کردوە (مارەی کات).**

٥١٢١- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلٍ أَنَّ امْرَأَةً عَرَضَتْ نَفْسَهَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، زَوِّجْنِيهَا. فَقَالَ: «مَا عِنْدَكَ؟». قَالَ: مَا عِنْدِي شَيْءٌ. قَالَ: «اذْهَبْ فَالْتَمِسْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ». فَذَهَبَ ثُمَّ

---

(١) بڕوانە: ٦١٢٣.

رَجَعَ فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ مَا وَجَدْتُ شَيْئًا، وَلاَ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ، وَلَكِنْ هَذَا إِزَارِي وَلَهَا نِصْفُهُ - قَالَ سَهْلٌ: وَمَا لَهُ رِدَاءٌ -فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَمَا تَصْنَعُ بِإِزَارِكَ، إِنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا مِنْهُ شَيْءٌ، وَإِنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ مِنْهُ شَيْءٌ». فَجَلَسَ الرَّجُلُ حَتَّى إِذَا طَالَ مَجْلَسُهُ قَامَ، فَرَآهُ النَّبِيُّ ﷺ فَدَعَاهُ أَوْ دُعِيَ لَهُ فَقَالَ: «مَاذَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ؟». فَقَالَ مَعِي سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا -لِسُوَرٍ يُعَدِّدُهَا- فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَمْلَكْنَاكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ"[١].

**٥١٢١- ئەبو حازیم وتی: سەهل ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئافرەتێك خۆی پێشنیار کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ (مارەی بکات)[٢]، ئینجا پیاوێك عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مارەی کە بۆ من، ئەویش فەرمووی: ((چیت هەیە؟)) [٣] وتی: هیچم نییە، فەرمووی: ((بڕۆ هەوڵ بدە با ئەموستیلەیەکی ئاسنیش بێت))، ئەویش ڕۆشت پاشان گەڕایەوە و وتی: نە بەخوا هیچم دەست نەکەوت هەتا ئەموستیلەیەکی ئاسنیش، بەڵام ئەمە پۆشاکەکەمە[٤] (ئیزارەکەمە) نیوەی بۆ ئەو- سەهل وتی: پیاوەکە ڕیدای[٥] نەبوو- پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەو (ئافرەتە) چی لە ئیزارەکەت بکات؟ ئەگەر تۆ بیپۆشیت ئافرەتەکە هیچی لە بەردا نابێ، وە ئەگەر ئافرەتەکە بیپۆشیت تۆ هیچت لە بەردا نابێ))، ئیتر پیاوەکە دانیشت و دانیشتەکەی درێژەی کێشا، ئینجا هەستا، پێغەمبەر ﷺ بینی و بانگی کرد- یان بۆی بانگ کرا- فەرمووی پێی: ((لە قورئان چیت لەبەرە؟)) پیاوەش عەرزی کرد، ئەو سوڕەتە و ئەو سوڕەتەم لەبەرە- چەند سوڕەتێکی ژمارد- پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەو ئافرەتەمان مارەکرد لێت بەو سوڕەتانەی قورئان کە لەبەرتە)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٣١٠.

(٢) پێغەمبەر ﷺ سەیری کرد و سەری داخست و هیچی نەوت.

(٣) وەک مارەیی پێی بدەیت.

(٤) ئیزراکەم: پۆشاکێکە بۆ نێوان ناوک و ئەژنۆیە.

(٥) (رداء) پۆشاکێکە لە ناوکی مرۆڤ بۆ سەرەوە بەکاردێت، پێشی دەڵێن پشتەماڵ.

# پێڕستی بەرگی حەوتەم

## ٦٦- پەڕاوى فەزڵ و گەورەيى قورئـان ٥١٩